ژیر

# کوردایەتی
## بیروبزاڤە

### بەرچەدانەوەکانی بۆ بەرپێزان:

١- فریاد رەواندزی
٢- د. کوردۆ عەلی
٣- شێرکۆ بێکەس
٤- رێبین هەردی
٥- د. کەمال مەزهەر
٦- ئەحمەد حامید
٧- د. حسەین عەزیز

### وەڵامەکان بۆ بەرپێزان:

١- شۆرش قادر
٢- هیمدادی حسەین
٣- گۆڤاری تایم
٤- گۆڤاری جەماوەر
٥- پەیامی مرۆڤایەتی
٦- رۆژنامەی هاوبیر
٧- د. جەمال نەبەز
٨- عەتا قەرەداغی
٩- د. عوسمان بەرزنجی
١٠- زانیار قرگەیی
١١- ئاسۆس هەردی
١٢- کاندیش
١٣- رۆژنامەی هەواڵ
١٤- راية الحرية
١٥- سیروان کاوسی
١٦- مەلا بەختیار
١٧- جێنەر جۆڵا
١٨- بۆتان جەلال

### لەگەڵ شەش بابەت:

١- بارزانیو کاژیك
٢- خاوەن فایلەکان
٣- گەمەی عێراق
٤- دەستووری عێراقو کوردستان
٥- کێشەی کوردو یاسای نێودەوڵەتی
٦- خۆپیشاندنەکەی ٢٠٠٤/٢/١٤و شتی تریش

- ناوی کتێب: کوردایەتی بیرو بزاڤە
- نوسەر: کامیل ژیر
- ساڵ: ٢٠٠٦ ز ـ ٢٧٠٦ ک
- مونتاژی کۆمپیوتەر: سەیران ئەمین
- چاپ: چاپخانەی بابان / سلێمانی / ٠٧٧٠١٤٤٤٠٠٠
- تیراژ: ١٠٠٠
- ژمارەی سپاردنی ( ١٨ )
- لەسەر ئەرکی حەوتەی مژدەبەر چاپکراوە

# وشەیەکی پێویست

پێشەکی سوپاسی هەموو ئەو رۆژنامەنووسە بەڕێزانە ئەکەم، کە هەریەکەو بەژمارەیـــەك پرســـیارەوە، ســـەردانیان کـــردووم‌و وەڵامـــەکان ئـــەم بەرهەمـــە بیرمەندییانەیەی خستە ناو بازاڕی هزری کوردییەوە.

لەڕاســـتیدا ژمـــارەی پرســـیارو وتووێـــژەکان زیـــاترن. مـــن هـــەر ئەمەنـــدەم بـــۆ کۆکراوەتـــەوە. هیـــوادارم لەئاینـــدەدا ئەوانیکـــەش بـــەکۆکراوەیی بخرێنـــە بـــەر دیـــدی خوێنـــەوەری خۆشەویـــست، سەرباری وتووێـــژە رادیـــۆیی‌و تەلەفیزیۆنییـــەکان، ئەگـــەر لەئەرشیفدا مابن.

شایانی وتنە، هەندێ (لەیەکچوون) لەوەڵامەکانمدا هەیە. هۆی ئـەوە ئەگەڕێتـەوە بۆ لەیەکچوونی ژمارەیەك لەپرسیارەکان کە هەر یەکەو لەکاتێك‌و لەبەرێزێکەوە بـۆ سەرچاوەیەکی بڵاوکردنەوەی جیاواز بووەو هەر سەرچاوەیەش خوێنـەرەوەی خـۆی هەیە، هەر چۆنێ بێ، عـەرەب وتـەنی: (فی الإعـادە إفادە) واتـا: دووبـارە کردنـەوەش سوودی خۆی هەیە.

لەلایەکیکـــەوە، ئەشـــێ تێکـــەڵکردنی هەنـــدێ لەوەڵامـــەکان بەبەشـــێك لەبیرەوەرییـــەکانم لـــەم بەرهەمـــەدا ئـــەویش ســـوودی خـــۆی هـــەبێ، بەتایبـــەتی بـــۆ مێژونووسان، وەك سەرچاوەیەك.

بـــۆ رونکردنـــەوەش، بەهـــەڵی ئـــەزانم لێـــرەدا ئـــەوە بڵـــێم کـــە زۆربـــەی بەرهەمـــە چاپکراوەکانی من، سەرناوی (کوردایەتی)یان لەناو رۆژێکدا پێوەیە. وەك:

١. کوردایەتیی بیروباوەڕمانە، ئامانجی نزیك‌و دوورمانە ١٩٦٠.

٢. هەڵبەستەکانی ژیر: کوردایـەتی، جـوانیی رەوشـت، جـوانیی سروشـت، جـوانیی ئافرەت ١٩٩٢.

٣. کوردایەتیی‌و دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ ١٩٩٤.

٤. کوردایەتیی‌و سەربەخۆیی ۲۰۰۲.

٥. کوردایەتی بیروبزاڤە ـ ئەم بەرهەمە.

ئەم پێداگرتنە لەسەر کوردایەتی، بەلای خۆمەوە، دۆگمابوون، واتا وشکەپێداگرتن نیە. بەڵکو من ئەوە بەپێویستییەکی نەتەوەیی‌و نیشتمانی‌و مێژوویش ئەزانم. چونکە وەك گەلێجار لەنوسینەکانی پێشوومدا روونمکردۆتەوە، هۆی دروست نەبوونی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ، لەپلەی یەکەمدا، ئەگەڕێتەوە بۆ نەبوون، یا نزمی ئاستی هوشیاریی نەتەوەییمان کە کورد (نەتەوایەتی) بە (کوردایەتی) ناو ئەبا. لەراستیشدا، کوردایەتی جۆرە نەتەوایەتییەکی تایبەتە بەکورد خۆی‌و جیاوازە لەنازیەتی ئەڵمان‌و ناسیونالیزمی رۆژئاواو عروبەی عەرەب. بۆیە هەرچیچەندێ هەوڵبدەین بۆ بەرزکردنەوەی ئەو ئاستەو دەرخستنی رووگەشەکانی کوردایەتی، هێشتا هەر کەمە. بەتایبەتی پێش رزگاربوون‌و سەربەخۆیی کوردستان. رۆژەکەش، بەنیشانەی گەشبینی ئەزانم‌و هێمایەکیشە بۆ رۆژەکەی ناو ئاڵای کوردستان‌و ئەوە سەرگروشتەیەکیشی بەدواوەیە کە لەنێوان بیروەرییەکانمدا، بۆ رۆژنامەی تایم، ئەیخوێننەوە.

لەبارەی رێنووسەوە، هەوڵمداوە ئەوەندەی بۆم کرابێ، وشە لێکدراوەکان‌و وشەو پێشگرو پاشگرەکانیان، بەسەریەکەوە بنووسم‌و کورتیانکەمەوە. بەڵام هەندێ لەوتووێژەکان، لەسەرچاوەکانیانەوە بەچاپکراوی، گوێزراونەتەوە بۆ ئێرە، بۆیە وەك خۆیان ماونەتەوە. ئەشێ لەچاپێکی تری ئەم بەرهەمەدا، هەمووی بکرێ بە یەك رێنووس.

رۆژنامەیەکی سیاسیی لیبراڵە
مانگی دوو جار دەردەچێت

NO. (26)- 4 Aug 2002

## کامیل ژیر
## یادگارە سیاسییەکانی
## بیری نەتەوایەتی و
## کازیک و
## پاسۆک
## دەگێڕێتەوە

لەزنجیرەیەک چاوپێکەوتندا لەگەڵ تایم ڕوناکبیرو پارێزەر (کامل ژیر) یادگارەکانی خۆی لەڕەوتی بزوتنەوەی کوردایەتی دلو چۆنیەتی دروست بوونی کازیکو بیرو بۆچوونی ئێستای سەبارەت بەبزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد باس کرد، لەچوارچێوەی ئەو زنجیرە چاوپێکەوتنانەدا بەچاوی ڕەخنەوە ئەو قۆناغانەی تاوتوێکردووە.

لەژمارەی داهاتووەوە تایم دەست دەکات بەبلاوکردنەوەی ئەو گێڕانەوەیە چاوەڕوان بن.

# ماموستا کامل ژیر دەفتەرەکانی بیرەوەریی بۆ تایم دەکاتەوە:
# گۆڤاری (گەلاوێژ) بیری نەتەوایەتیمانی گەڵاڵە کرد

وەکو لەژمارەی پێشووی تایم بەڵێنمان پێ دابوون بەمەبەستی تۆمارکردنی یادەوەرییەکانی ماموستا کامل ژیر چاوپێکەوتنێکی دوورودرێژمان لەگەڵدا کردووەو بەزنجیرە ئەڵقەیەك بلاوی دەکەینەوە.

لەو چاوپێکەوتنەدا کامل ژیر رەوشی ئەو کاتەی کوردستانو دامەزراندنی کاژێك دەگێڕێتەوە، هەروەها هۆکارەکانی چوونی بەرەو بیری نەتەوایەتیو کوردایەتی روونده‌کاتەوە.

ماموستا کامل ژیر هۆی چوونی گەنجو رۆشنبیرانی کوردی ئەو سەردەمە بۆ ناو ریزەکانی حزبی شیوعی وا لێکدەداتەوەو دەڵێ کە:

((خەڵکانێ کە دەچوونە ناو حزبی شیوعیو من یەکێك بووم لەوانە وام دەزانی کەوا کلیلی مافی چارەنووسی کورد وا لەیەکێتی سۆڤیەتە)).

ماموستا کامل ژیر لەو چاوپێکەوتنەدا ئاماژەی بەوە دا کە:

(نزیکەی ٨-٩ ساڵ گفتوگۆ بوو لەنێوان پارتیو حزبی شیوعی لەسەر ئەوەی ئایا کورد نەتەوەیە یان نا؟)

**مامۆستا کامل ژیر دەفتەرەکانی بیرەوەری بۆ تایم دەکاتەوە:**

*** لەسەردەمی ئینگلیزدا تورکچێتی و ئینگلیزچێتی و کوردایەتی هەبو.**

*** گۆڤاری (گەلاوێژ) بیری نەتەوایەتیمانی گەلاڵە کرد.**

*** دەمانزانی روسەکان کۆماری مەهابادیان دروست کردووە، بەڵام نەماندەزانی هەر ئەوانیش بەگورگان خواردویان داوە.**

*** رەفیق حیلمی لەئاستی سەرکردایەتی کردنی حزبی هیوادا نەبو.**

**چاوپێکەوتنی: شۆرش قادر**

(تایم) چاوپێکەوتنێکی دوورودرێژی لەگەڵ مامۆستا کامل ژیر کردووە بەمەبەستی تۆمارکردنی رووداوەکانی سەردەمی ژیانی سەبارەت بەهەست و سۆزی کوردایەتی و چۆنیەتی گەلاڵە بوونی بیری کوردایەتی و رەوشی سیاسی ئەو سەردەمەو ململانێی نێوان رێبازە سیاسیەکانی ئەو کاتەی کە لەناو کورددا و بەتایبەتی لەسلێمانیدا هەبون.

تایم بەمەبەستی خستنە بەرچاوی رووداوەکانی ئەو سەردەمە بۆ خوێنەرانی کورد هەوڵدەدات ئەو چاوپێکەوتنە بەزنجیرەیەك ئەڵقەی یەك لەدوای یەك بڵاوبکاتەوە.

*** مامۆستا کامل ژیر هەستی نەتەوایەتی لای جەنابت چۆن دەستیپێکرد، هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئەو هەستە چی بون و چۆن و لەچ چوارچێوەیەکدا گەڵاڵە بوو؟**

— بەحوکمی ئەوەی نەتەوەی کورد نیشتمانەکەی داگیرو دابەشکراوە، هەمیشە زوڵم و چەوساندنەوەی لەسەربووە، تاکەکانی کۆمەڵگای کورد وەکو هاوڵاتی پلەدوو سەیرو مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە لەهەموو پارچەکانی کوردستاندا کە ئێستاش وەکو واقیعێکی تاڵ ماوە، ئەمانە هەمووی وایانکردوە زۆربەی زۆری خەڵکی کورد، بەتایبەتی رۆشنبیران لە دەرگای سیاسەت بدەن و سەرەتاتێیەکی لەگەڵدا بکەن و بگەڕێنەوە بۆ هەستی نەتەوایەتی.

ئەوەندەی خەڵکی کورد خەریکی سیاسەتە ئەوەندە خەڵکی ئەوروپا پێیەوە خەریك نییە، ئەویش هۆیەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خەڵکی ئەورووپی کێشەی نەتەوەییان نییە، خەڵکی خەریکی ژیان، سەنعەت، خوێندن و زانستە، بەڵام کوردەکە چاری نییە، بیەوێ و نەیەوێ دەبێ روبکاتە سیاسەت، چونکە کێشەی نەتەوایەتی هەیەو سیاسەتەکەش لەکێشەی نەتەوایەتییەوە سەرچاوەی گرتوە.

زۆربەی ئەو کوردانەی دەستیان بەسیاسەت کردوە، بەبیرۆکەی مارکسیزم دەستیان پێ کردووە، هەرچەندە پاڵنەرەکە چەوساندنەوەی نەتەوایەتی‌و ئامانجیش چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی بوە.

من وەك بیرەوەری خۆم، کە لەدایك بووی ساڵی ١٩٣٤م، رووداوێکی بچوکی ئەو کاتە سەرنجی راکێشاموتا ئێستاش هەر لەیادمە، رەنگە یەکێك بووبێ لەو هۆکارانەی کە دواتر بەرەو ئاراستەی نەتەوایەتی بردم. ئەویش ئەوەیە کاتێ تەمەنم پێنج ساڵان بوو، ساڵی ١٩٣٩ فڕۆکەیەکی ئینگلیز هاتە سەر سلێمانی، من ئەو کاتە لەدوکانەکەی باوکم دانیشتبووم، فڕۆکەکە دەورەیەکی کرد بەسەر سلێمانیدا و سوڕایەوە، بەڵام هیچی نەکرد، کەچی کاتێکم زانی خەڵك دەرابی دوکانەکانی داتەدایەوەو رایدەکرد، هەموویان شپرزەببوون‌و بەڕاستو چەپ خۆیان بەیەکتردا ئەکێشاو رایاندەکردو خۆیان ئەکوتا تا زوو بگەنە ماڵەوە، هەندێکی تریان هەوڵیان ئەدا بچن بۆ دەرەوەی شار، ئێمەش بەهەمان شێوە بەرەو ماڵ کشاین، تا فڕۆکەکە دوورکەوتەوە. دوای چەند ساڵێك ئەم رووداوەم هەر لەخەیاڵدا بوو، باشە ئەو فڕۆکەیە هیچی نەکرد، بۆ ئەو خەڵکە شپرزەبوون؟! دواتر کە تۆزێ گەورەتر بووم وەڵامی پرسیارەکەمم دۆزییەوەو تێگەیشتم ئەو شپرزەیی‌و راکردنی خەڵك بەو قەرەباڵغییە رەنگدانەوەو درێژبوونەوەی کارەسات‌و مەرگەساتی بۆردومانی فڕۆکەکانی ئینگلیز بوو بۆ سلێمانی لەکاتی شۆڕشی شێخ مەحموددا، چونکە خەڵکەکە چاوی ترسابوو، ئەوانەی هەر لەبیرمابوو، ساڵی ١٩٣٩ش زۆر نەبوو، چونکە ساڵی ١٩٣٢ دوا بۆردومانی سلێمانی کرابوو. خەڵك وەها لەفڕۆکە تێگەیشتبوو کە هات دەتکوژێ، ئەمە مۆرکێك بوو لەمێشکی منی منداڵیشدا چەسپی.

دەڵێن ئەوەی مرۆڤ لەکاتی ئاساییدا بەساڵێك فێری دەبێ، لەکاتی شەڕو ئاژاوەدا بەرۆژێك فێری دەبێ.

من چاوی منداڵیم، جگە لەو کارەساتی فڕۆکەیە، بەدەنگوباسەکانی شەڕی جیهانی دووەم کە ساڵی ١٩٣٩ دەستی پێکرد کرایەوە. کە شەڕ دەستی پێکرد من وردە وردە گەورە دەبووم، وەکو خەیاڵ لەیادمە خەڵك دائەنیشتن‌و باسی ئەو شەڕەیان دەکردو گوێیان لەرادیۆ دەگرت‌و دەنگوباسی شەڕیان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە.

شتێکی خۆشی کە لەبیرم ماوە لەو بارەیەوە بیگێڕمەوە، کابرایەك هەبوو ناوی غەفور بوو، پێیان دەگوت (کەرەی شەریەت) بەحساب کەڕولاڵ بوو، شەربەتی دەفرۆشت لەبازاڕ، کوپەیەکی بەسەر سنگەوە بوو، ئەو کابرایە مەشهورە لەسلێمانی پێیی دەڵێن کەرەی شەریەت، ئێستاش مەسەلەی پێدەهێنرێتەوەو یەك بەیەکێ دەڵێ: (خۆی لێکردووم بەکەرەی شەریەت). ئەو کابرایە هەموو دەنگوباسەکانی شەڕی دەزانی، تەنانەت ئەوانەی گوێ‌و زمانیان هەبوو ئەوەندەی ئەو دەنگوباسی شەڕیان نەدەزانی، ئەو هەموو بەیانییەك بەدەم فرۆشتنی شەربەتەوە دەهاتە بەردەم

* چاوپێکەوتنەکە، بەسەرپێوەو بەهۆی ریکۆردەرموە بوو، شێوازی رێنووس‌و خاڵبەندییەکە، هی رۆژنامەکەیەو لێرەدا هەر وەك خۆی دووبارەی ئەکەمەوە.

دوکانی باوکمو بەئیشارەتو غەڵبەغەڵبو وردە دەنگێ کە دەری دەبڕی، گشت دەنگوباسەکانی ئەو شەوەی شەڕی بۆ باوکم دەگێڕایەوە.

**• مامۆستا وەکو لەیادەوەری فرۆکەکەدا باست کرد، وادیارە خەڵکی کورد بەرامبەر بەئینگلیز هەڵوێستیان هەبوە، ئایا ئەو کاتە خەڵکی سلێمانی لایەنگری ئینگلیزەکان بون یان بەرەکەی تر؟**

– لەڕاستیدا ئەو سەردەمە سێ ڕێباز هەبوو لەسلێمانی، ئەوانیش تورکچێتی، ئینگلیزچێتیو کوردایەتی بون، ئەوانەی کە هەستی ئاینییان هەبو بەلای تورکچێتیدا ڕۆیشتبوون، خەڵکانێك هەبون هەلپەرست بون ئینگلیزو حکومەتی ئەوسای عێراق هەوڵی ڕاکێشانیان بۆ لای خۆی دەدلو چاویان لەکورسی بو، ئەوانە مقۆمقۆی ئەوەیان دەکردو ئینگلیزیان بەرزگارکەرو باش ناودەبرد، دەیانگوت ئینگلیزەکان چەندان وڵاتیان لەژێر دەستی عوسمانیەکان رزگار کردووەو سەربەخۆ کراون.

خەڵکانیش هەبون دەیانگوت ئێمە کوردینو دەمانەوێ سەربەخۆ بین، نابێ کلکی کەس بین، بەڵام بەدلخەوە ژمارەیان کەم بوو، کەسایەتییەکانی ئەم ڕێبازەش ئەمانە بوون، تۆفیق ئەفەندی ئاغا فەتحوڵڵای باوکی دلزا تۆفیقی ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی، تۆفیق قەزاز، بێکەس، رەمزی مەلا فەتاحو عەبدولواحید نوریو کۆمەڵێ خەڵکی تر، لەڕاستیدا ئەمانە زۆر مەردانە لەقسەکانیاندا باسی کوردو سەربەخۆیی کوردیان دەکرد.

دوای ئەوە حزبایەتی وردە وردە پەیدابوو، سەرەتا، حزبی هیواو حزبی رزگاری هەبوو، دواتر گۆڕان بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان.

* مامۆستا جەنابت چ کاتێك هەستت بەو ئینتمایە کردو بیرۆکەی نەتەوەو هەستی نەتەوایەتی بوو بەفکر لەلات؟

– دەتوانم بڵێم تا رادەیەك ژمارەیەك خەڵکی تریش، گۆڤاری گەلاوێژ، زۆر کاری تێدەکردین. گۆڤاری گەلاوێژ گۆڤارێکی چاك بوو، زۆر بابەتی دەربارەی مەسەلەی نەتەوایەتی دەنوسیو ڕۆشنبیرییەکی باشی بڵاودەکردەوە، ئەمە بو بەهاندەرێکمان بۆ گەلاڵە بونی فکری نەتەوایەتی لەلامان. فاکتەری دوەمیش دامەزراندنی کۆماری مهاباد بوو کە دەنگی دایەوە لەلای ئێمەو کاریگەری زۆری لەسەرمان هەبوو، چونکە شتێکی نوێ بوو لەناو کورددا، دەمانگوت خەریکە کورد ببێ بەشتو دەوڵەتی هەیە. هەرچەندە کۆماری مهاباد ساڵێکی خایاند، بەڵام خەڵك هەر دڵی خۆش بو بەوە، هەرچەندە ئەو کۆمارەش لەکیس چوو، بەڵام دامەزراندنی نیشانەیە کە بۆ ئەوەی کە سەر هەڵدانەوەی تریش دەبێ. فاکتەری سێیەم بۆ گەلاڵە بونی ئەو بیری نەتەوایەتییە لەلامان، ڕەوی بارزانییەکان بوو بۆ یەکێتی سۆڤیەتی جاران دوای تێکچوونی کۆماری مهاباد، کە دەنگی دایەوەو خەڵك باسیان دەکرد، خەڵك چاوەڕوانی ئەوە بون ڕۆژێ لەڕۆژان بگەڕێنەوەو سەر لەنوێ شۆڕشی کوردستان دەست پێبکاتەوە، بەتایبەتی لەکاتی چونیان بۆ سۆڤیەت توشی شەڕوشۆڕی زۆربونو وازانرا بوو کە هێزێکی دەست وەشێنو چەکدارو شەڕکەرو شارەزان.

جگە لەم هۆکارانەش شۆڕشەکانی شێخ مەحمود سەرچاوەیەکی دڵنیاکەری بیری نەتەوایەتی بوون بۆ سەردەمی خۆی‌و بۆ دوای خۆشی، ئێمە مانان نەوەی دوای ئەو قۆناغە بووین، بۆیە ڕەنگدانەوەی شۆڕشەکەی لەهەست‌و سۆزی ئێمەدا کاریدەکردو دەیبزواندین‌و دەیبوژاندینەوە.

لەلایەکی تریش چەندان گەل‌و وڵات لەژێر دەستی عوسمانیەکان ڕزگاریان ببو، ببوبوون بەدەوڵەت، ڕۆشنبیرو گەنجانی کوردیش چاویان لەوەوە بو، چاویان کرابوەوەو دەیانگوت خۆ کوردیش لەژێر دەستی عوسمانی ڕزگاری بوە، بۆ ئەویش حکومەت‌و دەوڵەتی خۆی نەبێ؟

**• باشە مامۆستا ئەگەر وابێ، ئەی بۆچی (تحرر) کە نوێنەری حزبی شیوعی دەکردو هێشتان حزبی شیوعی نەبو بو، لەسلێمانی بەهێزتر بوو پارتی خۆی هێڵی نەتەوایەتی کرابوەبەر، ئایا ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بیری نەتەوایەتی لاواز بوا**

– نەخێر، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ هەندێ دیاردەی تر کە لەو کاتەدا هەبوو، خەڵک ئەو سەردەمە یەکێتی سۆڤیەتیان بەرزگارکەری میللەتان دەزانی، پڕوپاگەندەی کۆمۆنیستەکان لەو سەردەمەدا وەهابوو کە یەکێتی سۆڤیەت پشتوپەنای میللەتانەو حزبی شیوعیش خۆی بەتەولوکەری یەکێتی سۆڤیەت دەزانی، لەلایەکیتر دروستبونی کۆماری مهاباد تا ڕادەیەک بەپشتیوانی یەکێتی سۆڤیەت شتێك بوو کە خەڵکی کوردی لەشیوعی نزیك دەکردەوەو خەڵك دەیگوت فەرموو یەکێتی سۆڤیەت فرسەتی هێناو کۆمارێکیان بۆ کورد دروستکردوە، ئنجا ئێمەش ئەو کاتە دەمانزانی کەوا یەکێتی سۆڤیەت ئەو کۆمارەی دروستکردوە، بەڵام نەماندەزانی هەر یەکێتی سۆڤیەت بو بەگورگان خواردوی دا بۆ بەرژەوەندی خۆی لەگەڵ قەوامی سەڵتەنەت سازشی کردو کوردی فرۆشت بەرامبەر بەپێدانی ئیمتیازاتی نەوتی ئێرانی بەیەکێتی سۆڤیەت، شایانی باسە ئەو سەردەمە قەوام سەرۆك وەزیرانی ئێران بوو، بەڵام دواتر کاتێ کۆماری مهاباد ڕوخێنراو ئێران گەڕایەوە بۆ ئەو ناوچانە، کۆمەڵکوژی‌و لەسێدارەدانێکی زۆری کردو قەوام دەستی لەکارکێشایەوە. یەکێتی سۆڤیەتیش بۆ ئەو پەیمانانەی کە لەگەڵ قەوام ئیمزای کردبو ملی ئێرانی گرت، ئەوانیش گوتیان ئەو پەیماننامانە کەسێك ئیمزای کردوە کە ئێستا لەسەر حوکم نییە، بەمجۆرە یەکێتی سۆڤیەت لەلایەك بەو سازشەی وازی لەکۆماری مهاباد هێناو لەلایەکی تریش ئیمتیازاتی نەوتی ئێرانی لەدەستچوو.

لێرەدا خاڵێکی تریش هەیە لەمەسەلەی کۆبونەوەی خەڵك لەدەوری (تحرر) ئەویش خەڵکی چوونی بارزانیەکانی بۆ یەکێتی سۆڤیەت وائیکدەدایەوە کە ئەمە یارمەتییەکی یەکێتی سۆڤیەتە بۆ کورد. ئەمانە هەمووی وایان کردبو کە خەڵك یەکێتی سۆڤیەتی خۆش بوێ، هەڵبەت دڵخۆش بونەکەش سەرچاوەکەی هەر بۆ هەستە نەتەوەییەکە دەگەڕێتەوە. کاتێك خەڵکیش دەچوونە ناو حزبی شیوعی کە من یەکێك بووم لەوانە وامدەزانی کەوا کلیلی مافی چارەنوسی کورد وا لەیەکێتی سۆڤیەتە. بەمانا بەو هۆکارەو مەبەستە من چوویومە ناو حزبی شیوعی، نەك بەوەی ببم بەکۆمۆنیست‌و خەباتی چینایەتی بکەم، ئەسڵەن چین لەکوردا نەبوە، ئێستاش چین بەپێی چەمکی مارکسیزم واتە چینی

کرێکارو چینی سەرمایەدار لەناو کورددا دروست نەبوە. لەم روانگەیەوە خەڵکانێ کە روویاندەکردە رێکخستنی (تحرر) یان کۆمۆنیست زیاتر بەدافعی نەتەوەیی بوو.

**• ئایا هیچ ململانێیەك لەو سەردەمەدا لەنێوان پارتیو (تحرر)دا هەبو، ململانێیەکە لەسەر چی بوا**

– بەڵێ، ململانێ زۆر بو، ئەویش لەسەر ئەوەی کە ئایا کورد نەتەوەیە یان نەتەوە نییە، ٨–٩ ساڵیش خەڵكو گەنجانی کورد لەو سەردەمەدا لەسلێمانی بەوەوە خەریك بون ئایا کورد نەتەوەیە یان نەتەوەی نییە؟ چونکە ستالین بۆ پێناسەی نەتەوە کۆمەڵێ مەرجو پێوانەی دانابو، دەبێ خاکی هاوبەش، مێژوی هاوبەش، ئابوری هاوبەش، زمانی هاوبەش، مێژوی هاوبەشو هەستی هاوبەشیان هەبێ. بەکورتی ستالین ٥–٦ مەرجی لەم بابەتەی دانابو، ئەگەر هەر میللەتێك تێیدابوایە ئەوە نەتەوەو ئەگەر تێیدا نەبوایە بەنەتەوە دانەدەنرا. ئنجانەو سەردەمە بەپێی مەرجەکانی ستالین کورد دەبوایە بەنەتەوە دانەنرێ. چونکە هەر هیچ نەبێ کورد ئابوری هاوبەشی نەبوەو ئێستاش ئابوری هاوبەشی نییە، لەبەر ئەو پارچە پارچەییەو داگیرکراوەییەی بەدەست چەندان دەوڵەتەوە، بۆیە کۆمۆنیستەکان دەیانگوت کورد نەتەوە نییە. لەبەرامبەردا پارتییەکان رایان وابوو کە کورد نەتەوەیە. بەلام لێرەدا شتێك هەیە پێویستە بگوترێ. سەیر لەوەدابوو پارتییەکانیش بەگەزی کۆمۆنیستەکان جاوی کوردلیەتیان دەپێوا. یاخود بەمانایەکی تر بەتەرازوی ئەوان کێشەی کوردیان دەکێشا، ئەمانیش بەگوێرەی قسەکانی ستالین کۆمەڵێ بەلگەیان دەهێنایەوەو دەیانگوت نەخێر کورد نەتەوەیە. لەبیرمە ئەو کاتە من لایەنگری حزبی (تحرر) بوم، کە دەهاتینە سەر مەسەلەی ئایا کورد نەتەوەیە یان نا، من رام جیاواز بو لەکۆمۆنیستەکانو رام لەگەڵ پارتییەکان بو کەوا بەڵێ کورد نەتەوەیە. ئەو کاتە من خۆم لەگەڵ خۆمدا بیرم دەکردەوەو دەمگوت کاتێ من خۆم بەکورد بزانمو ملیۆنانی وەکو من خۆیان بەکورد بزانن‌و هەموومان خۆمان بەیەك نەتەوە دابنێین‌و خالێو هەستی هاوبەشمان هەبێ، با ئابوری هاوبەشیشمان نەبێ، هەر نەتەوەین، لەگەڵ خۆشمدا دەمگوت: من هەقم چییە بەسەر سەنگو تەرازووی ستالینەوە، خۆ ستالین دانەنیشتوە یاساکانی جیهان بەدەست ئەویێو ئەو دایبنێ.

**• مامۆستا ئایا ئەو ململانێیەی لەسلێمانی هەبوو لەشارەکانی تری کەرکوك‌و هەولێریش هەبوا**

– بەڵێ، بەلام کەمتر، چونکە بەڕاستی سلێمانی سەرچاوەی سیاسەت بو، سەرچاوەی دروستبون‌و سەرهەڵدانی ئەو حزبانە بو. هەروەها خەڵکەکەی ئێرە کراوەترو رۆشنبیرتر بون، بەلام بێگومان درێژبونەوەی ئەم ململانێیە چوو بو بۆ شارەکانی تریش، بەتایبەتی لەکۆیەو ناوچەی بادینان، چونکە هەمزە عەبدوڵلای سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان خۆی بادینی بو لەسلێمانی دەژیاو ناوەندی ململانێکەش سلێمانی بو.

لەلایەکی تر وەکو رێکخستنیش پێش ئەو سەردەمە حزبی هیوا هەبو، کە حزبێکی زۆر فراوان‌و گەورەبو، دروشمەکەی سەربەخۆیی بو، سەرۆکەکەی خوالێخۆشبوو رەفیق حیلمی بو.

**• مامۆستا کامل وا بزانم ئەو کاتە نامیلکەیەك دەرچو بو فەهد نوسیبوی لەسەر حزبی هیوا بەناوی (هل نحن بحاجة الی حزب عمل ام حزب أمل؟).**

- بەلێ، مەبەستی حزبی هیوا بو، ئەم بەحساب گوایە حزبی شیوعی حزبی عەمەلەو ئیش دەکاتو حزبی هیوا حزبی ئەمەلەو هەر بیردەکەنەوەو ئیش ناکەن. ئەمەی نوسیبو. لەڕاستیدا ئەو نامیلکەیە تارادەیەك دەنگدانەوەی هەبو تا ئاستێکیش ڕاستی تێدا بو، چونکە بەڕاستی سەرکردایەتییەکەی حزبی هیوا حاکم نەبو بەسەر ئەو خەڵکە زۆرەی کە ڕژابونە ناو حزبەکەوە، واتە وەکو فەهد دەیگوت ئەگەر سەرکردایەتی حزبی هیوا سەرکردایەتی عەمەلو لێهاتو بوایە ئەوە شتێکی زۆر گەورەی لێدەکەوتەوە، بەڵام بەدڵخەوە هەرچەندە ڕەفیق حیلمی وەکو شتێکی پیرۆز سەیری دەکراو پیاوێکی زۆر باش و لەڕوی فیکریشەوە ئاستی زۆرباش بو، بەڵام لەڕوی ڕێکخستنەوە ئەو توانا زۆرەی نەبو، کە سەرۆکایەتی ئەو حزبە گەورەیە بکات، بۆیە زۆری لەخایاند ئەوحزبە لەئاست خۆیەوە توایەوەو هەرەسی هێناو لەجێی ئەو چەند حزبێکی تر دروست بون.

دواتر بزوتنەوەی کوردایەتی بو بەدوو کەرتەوە، کەرتێکی ڕوی کردە مارکسیەتو کەرتەکەی تریشی ڕوی کردە جۆرێك لەنەتەوایەتی کە ناتوانین بڵێین نەتەوایەتی تەواو (صرف)بو، چونکە تا دەنگ کاتێکیش پارتی دیموکراتی کوردستان هەر مارکسیانە بیری دەکردەوە، لەپەیڕەوو پرۆگرامیاندا دەقێکی ئاشکرا هەبو بەعەرەبی دەیاننوسی (ننتفع من الماركسية ـ اللينية). تەنانەت تا کۆنگرەی پانزەی پارتیش کە ساڵی ١٩٩٢ لەهەولێر گیرا خۆم تێیدا بەشداریم کرد ئەو دەقە هەر مابوو کرابو بە (ننتفع من النظرية العلمية)و مەبەستیان مارکسیزم بو، بەڵام لەو کۆنگرەیەدا من چومە لیژنەی پەیڕەوو پرۆگرامو لامبردو نوسیمەوەو کەس نەبو تەدقیقی بکاتو پێیدا بچێتەوە، ئیتر بەم جۆرە ئەو دەقەم لەپەیڕەوو پرۆگرامدا نەهێشتو چاپ کراو تێپەڕیو لەو خاڵە ڕزگارمان بو.

*** عەبدولکەریم قاسم پیاوێکی نیشتمانی و دیموکراتیخوازبوو.**
*** شیوعیەکان بەمەعاریفی کوردستانیان دەگوت مەعاریفی قلیاسان.**
*** دە سالی تەمەنم لەناو حزبی شیوعی بەفیڕۆدا.**
*** ویستیان بۆ بەسرە نەفیم بکەن، ئەبوغرێبم هەلبژارد..**

لەم ئەلقەیەی گێڕانەوەی یادەوەرییەکانیدا بۆ تایم مامۆستا کامل ژیر باسی لەئەزمونی ١٠ سالەی خۆی لەناو حزبی شیوعیو رلو هەلوێستی شیوعیەکان بەرامبەر بەکوردستان کرد.

لەمیانەی باسەکەیدا دەربارەی هێزو توانای ئەو سەردەمەی حزبی شیوعی دوای شۆڕشی ١٤ی تەموزی سالی ١٩٥٨ ئاماژەی بەوە دا کە (یەکێك لەهەلە گەورەکانی حزبی شیوعی دەیانتوانی بەئاسانی دەسەلات بگرنە دەست، بەلام سەرکردایەتیەکەیان بودەلە بوو نەیکرد).

لەبەشێکی تری یادەوەریەکانیشیدا باسی لەدوکانەکەی بەشیر موشیرو بەشیریاتو بەشیرچییەکان کرد.

**• مامۆستا کاتێ پارتی دیموکراتی کوردستان دروست بو، زۆربەی ئەوانەی هەستی کوردایەتیان هەبوو بەرەو پارتی چوون و خۆشت وازت لە (تحرر) هێنا. ئایا پارتی تا چەند توانی بەرجەستەی بیری نەتەوایەتی بکات؟ خوێندنەوەی خۆت بۆ ئەو قۆناغانە، واتە پێش شۆڕشی ١٤ی تەموزی سالی ١٩٥٨ چۆنە؟**

– من لەسالی ١٩٥٨ وازم لە (تحرر) هێنا. پێشتر لەسالی ١٩٤٨ تەمەنم بچوك بو، ١٤ سالان بووم، بەلام بەحوکمی ئەوەی مامەکانم سەید نوری، سەید مەجیدو سەید تەها شیوعی بون، بەرەو حزبی شیوعی چومو بومە لایەنگریان، ئەو سەردەمە سەید تەها وتاربێژی شیوعییەکان بو، دەنگێکی زۆر چاکی پێوەبو. کامەران موکریش وتاربێژی پارتی بو، ئەم دوانە ئەو کاتە زۆر دەرکەوتوبون لەسلێمانی.

لەڕاستیدا من تا سالی ١٩٥٨ لەگەل حزبی شیوعی بوم، بەلام بەپچڕپچڕی، چونکە من لەسالی ١٩٥٢ وە ئیتر ناسرام لەلایەن دەزگاکانی ئەمنەوە بەوەی کە کەسێکی سیاسی بزێوم، لەبەر ئەوەی هەر ناڕەزایی دەربڕینێك هەبوایەو ٤ کەس بگیرابایە من سەری پێنجەم بوم. بەم جۆرە تا سالی ١٩٥٤ چەند جارێك گیرام. سالی ١٩٥٤ کە لەقۆناغی ناوەندیدا بوم ٢٧–٢٨ قوتابی گیراین و خستینیانە ناو لۆری سەربازیو بردیانین بۆ شوعەیبە، لەوێ مەعسکەرێ کرابوە بۆ قوتابییە سیاسییەکان، کە سەیرمان کرد هەرچی قوتابی سیاسییە گیرابون و لەوێ کۆکرابونەوە. زۆرەی ئەو گرتنانەش بەو ناوەوە بون گوایە ئێمە عەسکەریمان لەسەرە، بەلام لەوێ خستینیانە زیندانەوەو یەکی ٧–٨ مانگ لەو زیندانە ماینەوە. کۆتایی سالی ١٩٥٥ گەڕامەوە بۆ سلێمانیو ماوەی سالێك زیاتر لەسلێمانی مامەوە. بەلام لەو

ماوەیەشدا چەند جارێك گیرام، یەك دو جار درام بەدادگا بەناوی كتێب گرتن لەماڵەكەمدا، بەڵام دادگای ئەو كاتە بەو توندییەی ئێستا نەبو.

**• مامۆستا ئایا ئەو كاتەی لەناو تحرر بویت بیری نەتەوایەتیت بەتەواوەتی لەلا گەڵاڵە بو؟**

– نەخێر، بەڵام حەزم پێدەكرد، ئەو سەردەمە جارجار دەكەوتمە ململانێ لەگەڵ خۆم‌و جارجار لەگەڵ حزبەكەشدا لەسەر مەسەلەی ئەوەی ئایا كورد نەتەوەیە یان ناو لەسەر ئەوەی رێگای نەتەوایەتی نەگرینەبەر؟! ئەم جۆرە پرسیارانەم لەخۆ دەكردو گفتوگۆم دەربارەیان لەگەڵ حزبیەكاندا دەكرد. مێڵی حزبیش ئەو كاتە كەمتر بنەمای فكری هەبو، زیاتر مەسەلەی رێكخستن بو، چونكە ئەو چاپەمەنییانەی كە لەپێش ساڵی ١٩٥٨ وە دەهاتنە عێراق، بەتایبەتی ئەو هەموو كتێبەی لەلوبنان‌و دەرەوەی عێراق چاپدەكران لایەنگری بیری شیوعیەت بو، نەیاندەهێشت لەعێراق بڵاوببێتەوە، بۆیە ئێمە سەرچاوەی فكریمان نەبو، تەنها رۆژنامەی قاعیدەی سەر بەحزبی شیوعی بو لەگەڵ ئەو قسانەی كە رێكخراوەكەمان لەرێگای رێكخەرەكانیانەوە بۆیان دەكردین، ئەوانەش بەگوێرەی دڵی ئێمە قسەیان دەكرد.

**• مامۆستا دەتوانین بڵێین جنابت بۆ گەڵاڵە بوونی زانستیانەی فكری نەتەوایەتی لەلات سوودت لەئەدەبیاتی ماركسیش وەرگرتووە؟**

– بێگومان، یەكێ كە چووە ناو سیاسەتەوە، هەر بیروباوەڕێك هەڵبژێرێ زۆر دەخوێنێتەوەو موتابەعە دەكا، لەئەنجامی ئەمەشدا زانیاری زۆری لا كەڵەكە دەبێ‌و دەبێتە زەخیرەو سەرچاوی فكری بۆی. لەلایەكی تریش مرۆڤ بەبیركردنەوەی خۆی دەگاتە رایەكی تایبەتی خۆی، كە لەوانەیە جیاواز بێت لەرای ئەو رێكخستنەی كاری تێدا دەكا. ئنجا بۆ من مەسەلەكە وابوو، ئەنجامی ئەو بیركردنەوەو خۆپڕچەك كردنە بەزانیاری‌و رۆشنبیری، منی گەیاندە راوبۆچوونی جیاواز لەحیزبەكەم كە دواتر دێمەسەری‌و باسی لێوە دەكەم.

ساڵی ١٩٥٧ دایەرەی ئەمن ناردی بەشوێنما، ئەو كاتە پێیان دەگوت (شعبة التحقیقات)، دوو كەس بەرپرسیاربون تێیدا یەكێكیان ئەفسەر بو ناوی مەسعودو ئەوی تریان مفەوەز بو بەناوی تاڵیبو هەردوكیان عەرەب بون، ئەو دووانە دڵێرەی ئەمنی سلێمانیان بەڕێوە دەبرد، ئەوانە پێیان وتم: ئیتر ئێمە لەگەڵ تۆدا گەیشتۆتە تینمان، تۆ دەبێ چارەسەرێكی خۆت بكەی‌و واز لەهەموو شت بهێنی، یاخود سێ رێگات لەبەردەمدایەو خۆت یەكێكیان هەڵبژێرە. وتم: كامانەن؟ وتیان یەكەم بەراءەت بكە لەحزبی شیوعی ئەگەر ئەوە ناكەیت ئەوە ٣–٤ ساڵ زیندانیت دەكەین، یان لەسلێمانی دوورت دەخەینەوە (نەفیت دەكەین)، ماوەشیان پێدام ٢–٣ رۆژ بیر بكەمەوەو وەڵامەكەیان لێ بگێرمەوە.

من سەیرم كرد ئیشەكەیان جدییەو گاڵتە نییە، بۆیە چوومەوە لایان‌و پێیانم گوت، مومكین نییە من بەراءەت بكەم، چونكە بەراءەت كردن كارێكی زۆر عەیبە بو، خەڵكانێ كە بەراءەتیان دەكرد زۆر بەچاوی سووك تەماشا دەكران، جگە لەمەش بەراءەت نەكردن لەلای من مەسەلەیەكی مەبدەئی بو، بۆیە پێیانم گوت پەتیشم بۆ هەڵواسن بەراءەت ناكەم، ئەوەشی كە ئێوە كێشەم بۆ دروست بكەن‌و ٣– ٤ ساڵ بمخەنە زیندانەوە خەیارێكی باش نییە، بەڵام بۆ نەفی كردنم كەیفی خۆتانە، ئەوانیش وتیان:

باشە نەفیت دەکەین. وتم: بۆ کوێ؟ وتیان: بۆ شوێنێکت نەفی دەکەین، لەوەشدا کەوتمە سەودلو معامەلە گەڵیاندا کە بۆ کوێم نەفی بکەن، لەدواییدا وتیان: خۆت بڵێ بۆ کوێت نەفی بکەین؟ وتم: بۆ بەغدا، وتیان: هەی وەڵڵا شتێکی جوانە، ئێمە لەسلێمانی نەفیت دەکەین، دەتوێ بچی بۆ بەغدا، وتیان بۆ بەسرە نەفیت دەکەین. منیش پێم گوتن: نا و پێشنیاری نەفی کردنم بۆ ئەبوغرێب کرد، ئەوانیش وتیان: باشە، ئەبو غرێب دوریشە لەبەغدلو کاتێ چوویتە ئەوێش لەژێر چاودێری پۆلیسدا دەبیتو بەیانیانو ئێواران دەبێ بچی لەپۆلیسخانە ئیمزا بکەیو نابێ بشچیت بۆ بەغدا، منیش گوتم: باشە.

من بۆیە ئەبوغرێبم هەڵبژارد، چونکە لەبەغدا نزیکەو ماڵە برایەکم فازڵ نیزامەدین ئەو کاتە لەئەبوغرێب بو، کاتێ کە نەفی کرام بۆ ئەبوغرێب لەڕێگاوە چووم بۆ ماڵی ئەوانو دواتر بۆ ڕۆژی دووەم چووم خۆم بەپۆلیسخانە ناساند، دیتم هەموو زانیارییەکیان لەسەر من لابو. ئەوانیش وتیان: زۆر چاکە ئیتر تۆ بزانە لێرە نەفیت، ناویان نوسیم، ئیمزایان لێ وەرگرتم، پەنجە مۆریان پێکردمو پێیان گوتم کە دەبێ هەموو ڕۆژێ بەیانیانو ئێواران بچم بۆ پۆلیسخانە ئیمزا بکەم.

بەم شێوەیە ماوەیەک بەیانیانو ئێوارانێ ئیمزام کرد. دواتر وردە وردە وای لێهات ئێوارانەکەی نەدەچومو بەیانیەکان هەردوو ئیمزاکەم بەسەریەکەوە دەکرد. وردە وردە ئەوانیش وایان لێهات زۆر بایەخدارنەبون بەئیمزاکردنو بەچوار پێنج ڕۆژ جارێ دەچوم ئیمزای هەموو ڕۆژەکانم دەکردو ئەوانیش چاوپۆشیان لێ دەکردم.

ئەم کەینو بەینە درێژەی کێشا، تا ڕۆژێکیان ڕۆژنامەی (ژین) کە لەسلێمانیەوە بۆیان دەناردم تیایدا گرمۆێکی شیعریم بەرچاو کەوت بۆ جوانترین شیعر لەسەر بەهای کوردستانو خەڵاتیان بۆ دانابو. ناونیشانیشیان دانابو کە ئەو بەرهەمە گرەوە پێشبڕکێیە بۆ کوێ بەڕێ بکرێ.

من ئەو کاتە زۆر نەبو دەستم دابوە شیعر، هاتم هەڵبەستێکم دانا لەسەر بەهاری کوردستانو بەپۆست بۆم ناردن،

لەڕاستیدا من ئومێدی ئەوەم نەبو کە هەر بیخوێننەوە، چونکە تەمەنی ئەدەبیم ئەوەندە نەبو، کەچی سەیرم کرد دوای نزیکەی مانگو نیوێك تا دوو مانگ هەر بەپۆستە نامەیەکم بۆ هات تیایدا دەڵێ پیرۆزباییت لێ دەکەین، شیعرەکەی تۆ یەکەم دەرچوو، وەرە بۆ وەرگرتنی خەڵاتەکەت، لیژنەی هەڵسەنگاندنی شیعری بەشداربوانی ئەو گرەوەش بریتی بور لەعەلائەدین سجادی، ڕەشید عارف، ئەنوەر سائیبو شەماڵ سائیب، ئەوانە زۆر پیرۆزباییان لێ کردمو خەڵاتەکەیان دامێ. بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەو شیعرە دەرگایەک بو بۆ من کرایەوەو لەکاتی وەرگرتنی خەڵاتەکەشدا لەبەغدا بەوانەم نەگوت کە من لەژێر چاودێری پۆلیسدامو بەدزی هاتوچۆی بەغدا دەکەم.

**• مامۆستا بەحوکمی ئەوەی بەرێزت هەڵگری بیری نەتەوایەتی بوی، ئایا ئەتوانی بەراوردێکمان بۆ بکەی لەنێوان هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی عێراق پێش شۆڕشی ١٤ی تەمموز پاش شۆڕشی ١٤ی تەمموز!**

– لەڕاستیدا مەسەلەی دژایەتی کردنی کورد لەلایەن عێراقەوە، مەسەلەیکە لەو ڕۆژەی کە ولایەتی موسڵ لەساڵی ١٩٢٥ وە خرایە سەر عێراق دروست بوە، ململانێیەك لەنێوان کوردو عەرەب دروست بوە، چونکە تێکڕای سیاسەتمەدارانی عەرەب بەهەموو ڕێبازەکانیانەوە چاویان لەوە بوە کورد لەناو خۆیاندا بتوێننەوەو مەرجەکانی خۆیان بەسەر کوردا بسەپێنن. بەڵام دەتوانم بڵێم دەسەڵاتدارانی عێراق پێش ١٤ی تەمموز نەرمترو زیرەکانەتر لەوانەی دوای خۆیان سیاسەتی دژایەتی کردنی کوردیان پەیڕەو دەکرد. ئەوانە هەر لەدوای ئەوەی کە ولایەتی موسڵ خرایە سەر عێراق هاتن کۆمەڵێك خەڵکی کوردیان هێنایە پێشەوەو کردنیان بەوەزیرو بەنائب، لەوانە محەمەد ئەمین زەکی، تۆفیق وەهبی‌و جەمال بابان‌و سەعید قەزازو مەحمود بابان.. هتد، تەنانەت جارناجار سەرۆك وەزیرانیش کورد دەبو، ئەمانە وایکرد کە تا ئاستێك خەڵك چەواشە بکرێ‌و دەیانگوت: فەرموون، ئەو هەموو وەزیرە کوردن، جاری وا هەیە سەرۆك وەزیرانیش کوردە. دانانی ئەو وەزیرە کوردانە لەڕاستیدا وەکو دەرزییەکی سڕکەر وابوو کە لەکوردیان دەدا و وای کرد کە کورد قەناعەت بەو وەزعە تاڵە بکا کە تێیی کەوتبو. بەشێکی خاکەکەی خرابوە سەر عێراق‌و بەو شێوەیە بەرپرسەکانیی کوردو کوردلیەتیان دەکردو ئەو مەسەلەیەیان لەبیر خەڵکی کورد دەبردەوە، بەڵام کاتێ شۆڕشی ١٤ی تەمموز ڕویداو عەبدولکەریم قاسم هاتە سەر حوکم‌و لەدەستوری عێراقیدا نوسی کوردو عەرەب شەریکن لەو وڵاتەدا، کورد ڕاپەڕین‌و بوژانەوەیەکی بەخۆوە بینی‌و وترا کە کورد نەمردووەو ئەوەتا کابرا شۆڕشی کردووەو یەکەم قسەی دەڵێ: کوردو عەرەب شەریکن لەم نیشتمانەدا.

**• ئەگەر بگەڕێینەوە سەر حەقیقەتەکان عەبدولکەریم قاسم شتێکی زیادی نەوتوە، چونکە کوردو عەرەب لەعێراقدا هەن، ئەمە واقیعێکە هەیە!**

– بەڵێ، بەس شتێك هەبو پێویستە باسی لێوەبکرێ، ئەویش ئەوەیە عەبدولکەریم قاسم کە هاتە سەر حوکم خۆی بەتەنیا نەبو، عەبدولسەلام عارفیش بو، عەبدولسەلام زیاتر نوێنەرایەتی ئاڕاستە نەتەوەییە عەرەبییەکەی دەکرد، هەرچی عەبدولکەریم قاسم بو زیاتر کابرایەکی دیموکراتیخوازو نیشتمانی بو، بایەخی بەقەومیەتی عەرەبی نەدەدا، بۆیە خەڵکەکە، بەتایبەتی کورد پشتگیری عەبدولکەریم قاسمی دەکرد، شیوعیەکانیش ئەوەیان قۆستەوەو وتیان عەبدولکەریم لەخۆمانە، ئەویش بواری زۆری دا بەشیوعیەکان‌و حزبی شیوعی بو بەحزبێکی ئاشکراو چەندان وەزارەتیان پێدراو خەڵك بەگشتی ڕووی تێکردن.

لەڕاستیدا لەدوای ١٤ی تەمموزدا کتێبو بڵاوکراوەی زۆر ڕژانە عێراق‌و بەغدا دەربارەی شیوعیەت‌و مارکسیزم‌و هەندێکیشیان ڕەخنە بون لەسەر مارکسیزم؟ لەلایەکی تریش منیش لەو کاتەدا گەیشتبومە تەمەنێك کە بتوانم زیاتر لەشت تێبگەم‌و زیاتر شت بخوێنمەوە، عەرەبییەکەشم بەهێزتربو. کاتێ ئەو کتێبانەم خوێندەوە کە ڕەخنەبون لەمارکسیزم بۆم دەرکەوت کە ئەوەی من شوێنی کەوتوم بەهەڵەدا چوم، من بەئومێدی نەتەوایەتی شوێن حزبی شیوعی کەوتبوم، وام زانی لەو ڕێگایەوە کورد ڕزگاری دەبێ.

لەم بارەیەوە کتێبەکەی لینین (حق الامم في تقریر مصیرها) ڕۆڵی زۆری هەبو بۆ ئەو ڕایەی کە پێی گەیشتم لەوەی کە سەرجەم ئەمانە لەڕووی تیۆرییەوە شتێك دەڵێن‌و لەڕووی پراکتیکیشەوە شتێکی تر دەکەن.

لەلایەکی تر کردەوەو هەڵسوکەوتی شیوعیەکان دوای ساڵی ١٩٥٨ لەبەکارهێنانی زەبرو زەنگ بەرامبەر بەخەڵکو خەڵك ڕاکێشان‌و کوشتنیان‌و گاڵتەکردنیان بەکوردایەتی‌و دژایەتی کردنی زۆری کورد لەکوردستاندا چاوی بەرامبەر حزبی شیوعی کردمەوەو حەقیقەتەکانیانم درك پێکرد. بۆ نمونە کۆمەڵێك مامۆستای نەتەوەیی دەولیان کرد مەعاریفی کوردستان دابنرێ. کەچی حزبی شیوعی دژی وەستاو کەوتنە گاڵتەپێکردنی‌و مەعاریفی کوردستانیان ناونابو مەعاریفی قلیاسان، وەکو گاڵتەپێکردن دەیانگوت: ئەوانە مەعاریفی قلیاسانیان دەوێ.

**• باشە مامۆستا شیوعیەکان پشتیان بە چ بیرۆکەیەك دەبەست لەدژایەتی کردنی کوردو داواکانی؟**

– شیوعیەکان لەو سەردەمەدا دەیانگوت کۆماری عێراق کۆمارێکی ساواو کۆرپەیە، ئەگەر بێتو لەم کاتەدا نەعراتی قەومی بوروژێنین لەکوردستاندا ئەوە زیانی دەبێ بۆ ئەو کۆمارە ساولیە، کارێکی لەو بابەتە دەستودەسیسەی ئەمریکاو ئینگلیزە کە ئەوان هاندەری بزوتنەوەی کوردایەتین، ئیتر هەرچی قسەی خراپ‌و ناشیرین بو بەکوردایەتی‌و هەڵگرانی بیروباوەڕەکەی دەوترا.

**• ئەو سەردەمە سکرتێری حزبی شیوعی عێراقی کورد بوا**

– بەڵێ، تا ماوەیەکی زۆریش، ماوەیەك بەهائەدین نوری‌و دوای ئەویش ماوەیەکی زۆر عەزیز محەمەد سکرتێری حزبی شیوعی بو. ئەمانە هەستی نەتەوایەتی کوردایەتیان نەبو. جگە لەمانەش خالید بەگداشیش لەسوریا هەر کورد بو. ئەوانە کاریان بۆ مەسەلەی چینایەتی دەکرد، بۆ شیوعیەت‌و مارکسیزم خەباتیان دەکرد، خۆ هەموویان وەکو من هەڵخەڵەتاوی ئەوە نەبون کە وابزانن مەسەلەکە کوردایەتییە. مەسەلەی کورد لای ئەوان هەرگیز مەبەست نەبو، ئەوانە بەمانای وشە گوێیان نەدەدایە مەسەلەی کورد، بەڵکو بەپێچەوانەوە زیاتر لەعەرەبەکان دژی بزوتنەوەی کوردایەتی بون، زیاتر لەمەلیك مەلەکیتر بون.

من کاتێ ئەوانەم بەچاوی خۆم بینی‌و درکم بەو هەڵوێستانەیان کرد تووشی حاڵەتێکی سایکۆلۆجی خراپ هاتم، هەستم دەکرد کە ١٠ ساڵە ڕەنجم بەخەسار چووە، ١٠ ساڵە بەهەڵە لەو ڕێکخستنە تێکەڵبووم، بۆیە یەکسەر وازم لێهێنا، بەڵام حەز دەکەم هەموو کەس بزانێ من لەڕۆژێکدا وازم لەحزبی شیوعی هێنا. خەڵکانێکی زۆر هەوڵی دەدا ببێتە شیوعی بۆ ئەوەی شوێنێك یان مەرکەزێك بۆ خۆیان پەیدا بکەن. چونکە ئەو کاتە خەڵك وای دەزانی کە ئیتر عێراق بەرەو شیوعیەت دەرواو حوکم بەدەست خۆیانەوە دەبێ.

**• وا زانراوە ئەو کاتە کە تۆ وازت هێنا حزبی شیوعی زۆر بەهێز بو، دەیتوانی دەسەڵاتیش بگرێتە دەستا**

– یەکێك لەهەڵە گەورەکانی حزبی شیوعی لەسەردەمی عەبدولکەریم قاسم ئەوەبو دەیانتوانی بەئاسانی دەسەڵات بگرنە دەست، بەڵام سەرکردایەتیەکەیان بودەڵەبو نەیکرد.

**• بەڕای تۆ باش بو دەسەڵاتیان نەگرتەدەست، یان ئەگەر دەسەڵاتیان بگرتایەتەدەست باشتر بو؟**

– ئەوەیان پیاو ناتوانی ئاینده بخوێنێتەوە، ئایا ئەگەر ئەوان دەسەڵاتیان بگرتایەتە دەست وڵات بەرەو کوێ دەچو. یان چۆن دەبو، لەهەموو حاڵەتێکدا ئەوان بەڕای من باشتر دەبون لەڕژێمی عەبدولسەلام عارفو ڕژێمی بەعس، لەو هەموو تاوانەی کەکران بەرامبەر بەکورد ئەوان بەمجۆرە نەدەبون، سەرەڕای ناکۆکیان بەرامبەر بەهەستو ڕێکخستنی نەتەوایەتی.

**• باشە مامۆستا کە وازت لەحزبی شیوعی هێنا چیت کرد؟**

– کە وازم هێنا، بێلایەن دانیشتم، ئەو کاتە لەبەغدا دەژیام. لەدوای ١٤ی تەمموزیش چاودێری پۆلیسم لەسەر لابرا، لەبەغدا ئیتر دەستم کرد بەنیشکردنو وەزیفە، ئەو کاتە دوکانی بەشیر موشیر لەبەغدا وەکو یانەیەکی فکری وەهابو، ڕۆشنبیرە کوردەکان بەهەموو جۆرەکانیانەوە سەردانیان دەکردو لەوێ کۆدەبونەوە. منیش لەگەڵ بەشیر موشیر زوو ئاشنایەتیم پەیدا کردو وام لێهات کە بتوانم لەو دوکانە دابنیشمو بوم بەموریدی بەشیر موشیر، چونکە ئەو ڕێگای بەهەموو کەسێك نەدەدا کە لەدوکانەکەی دابنیشن. زیاتر ڕێی بەوانە دەدا کە کوردێکی ساغ بون.

١٩٥٤

*** من پێشنیاری ناوی کاژێکم کرد**

*** دکتۆر عیززەدین مستەفا ڕەسوڵ لەبەشێرییات لایداوە**

*** موسا عەنتەر لەئەستەمبوڵ بینی**

لەدرێژەی ئەو چاوپێکەوتنەی کە تایم لەگەڵ مامۆستا (کامیل ژیر) کردویەتی‌و لەم بەشەیدا باسی لەدامەزراندنی کاژێك‌و چوونی بۆ تورکیاو سویسرا کردووە.

هەروەها ئاماژە بەوەدەدا کە لەئەستەمبوڵ چەندان جار موسا عەنتەری ڕۆژنامەنووسی بینیوەو لەگەڵ کۆمەڵێك ڕۆشنبیری تری کوردی دانیشتووی ئەستەمبوڵی تورکیا کۆبوونەوەی کردووەو باسی چۆنیەتی دامەزراندنی حیزب‌و ڕێکخراوی سیاسی بۆ کردوون.

لەم ئەڵقەیەی چاوپێکەوتنی مامۆستا کامل ژیر، باس لەوە دەکات ئەوو جەمال نەبەز دەستپێشخەری دامەزراندنی حزبێکی نەتەوەییان کردوەو لەسەر پێشنیاری جەمال نەبەز مامۆستا کامل گەڕاوەتەوە سلێمانی‌و دەستی بەدیتنی کەسانی هاوبیرکردوە.

هەروەها ئاماژە بەوە دەدا کە حزبی شیوعی‌و پارتی زۆر دژی دامەزراندنی حزبێکی نەتەوەیی سەربەخۆخواز بون‌و لەحکومەتی ئەوسای عێراق زیاتر دژایەتیان کردوە.

**• مامۆستا کامل لەسەر بەشیر موشیر، باس لەوە دەکرێ ناکۆکی لەگەڵ زۆر لەموریدەکانیدا بۆ دروست بوو؟**

– هیچ ناکۆکی، یان ناتەباییەك ڕوی نەداوە، کەس ناتەبایی لەگەڵ بەشیر موشیر نەبوە، بێجگە لە د. عیززەدین هەر ئەو بەتاقی تەنیا لایداو ئەو کتێبەی دەرکرد کە ڕەنگە بەڕای خۆی بەشیرییات بێ، بەڵام لەڕاستیدا نیشەکەی دژی بەشیر بوو، چونکە لەزۆر شوێنی کتێبەکەدا بەشیری شکاندوەو هەقی خۆی نەداوەتێ، بۆیە زۆر کەس وەڵامی کتێبەکەی دایەوە.

بێجگە لە د. عیززەدین ئەوانی ترمان لەمام جەلالەوە بگرە تا دەگەیتە د. کەمال فوئاد، د. ئیحسان فوئاد، د. جەمال نەبەز، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی‌و عەلائەدین سجادی کە ئەم دوانەی دواییان مردوون‌و خوا لێیان خۆشبێ، هەر هەمووومان لەسەر بەشیرییاتی خۆمان ڕۆیشتین.

بەشیرییاتەکە زیاتر سەر پۆشێك بو بۆ کارێکی ترو لەو دەرگایەوە دەمانتوانی نەتەوایەتی بکەین، ئەو ماوەیەی کە من تێکەڵی ئەو ڕۆشنبیرانە بوم لەدوکانی بەشیر موشیرو لەگەڵ برای خۆشەویستم د. جەمال نەبەزو عەلائەدین سجادی‌و مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی زیاتر ئاسۆی بیرم کرایەوە.

بەبیرم دێ ئەو سەردەمە ئێمە پێکەوە بەکۆمەڵ دادەنیشتین‌و ڕەخنەمان لەمارکسیزم دەگرت وەکو بیرو ڕەخنەمان لەحزبی شیوعی دەگرت وەکو ڕەفتارو هەڵسوکەوت. جگە لەمە لەو سەردەمەدا کەوتینە ڕەخنەگرتن لە (پارتی)یش، چونکە پارتیش ئەو کاتە لەئاستی ئەو کارەدا نەبو.

**• مامۆستا ئایا ڕەخنەکانتان لەپارتی ئەوە بو کە کەموکورت بو لەبواری هەستی نەتەوایەتیدا؟!**

– بەڵێ کەموکورت بو، وەکو لەسەرەتاشەوە باسم کرد پارتی تا ٨–٩ ساڵ لەمەوپێش هەر ئەو نزعە مارکسیەی تێدابو. ئەمەش بەلای ئێمەوە هەڵەبو، بەڕای ئێمە ئەو کاتە پێویست بو پارتی دەست

لەو نزعە مارکسیە بەردات، هەرچەندە تا ئێستاش ئاستی هۆشیاری نەتەوایەتی وەکو پێویست بەرزنەبۆتەوەو لەئاستی پێویستدا نییە، کە دەبوایە زۆر لەوە زیاتر بوایە.

بەرای من هۆکاری نزمیی ئاستی هۆشیاری، یان نەبونی هۆشیاری نەتەولیەتی بەئاستی پێویست دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێك هۆکار، لەوانە: تۆوی دوویەرەکی کە بەدرێژایی ۲۷۰۰ ساڵەی داگیرکردنی کوردستان لەلایەن بێگانەوە لەکوردستاندا نراوەتەوە، ئەو ڕێبازو ئایدیۆلۆجیا غەریبانەی کە کەوتونەتە ناو نەتەوەی کوردو دەماری نەتەوایەتییان سڕکردووە. بۆ نمونە ئایدیۆلۆجیای ئیسلام کە ڕێبازێکی ئینتەرناسیونالیستییە بەئسلوبی خۆی بەرەو نانەتەوەییت دەبا. چونکە ئەو ئایدیۆلۆجیایە وائلێدەکا زیاتر گوێ بەئایینو ئاخیرەت بدەی، کەمتر بیر لەدنیا بکەیتەوە.

بەم شێوە کارلێکردنەش بمانەوێو نەمانەوێ بایەخو هەستی نەتەولیەتی لەناو میللەتدا کەمدەبێتەوە. بەڵگەش بۆ ئەوە سەلاحەدینی ئەیوبییە، ئەو کابرا مەزنەی کە دنیای خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیو ڕۆژئاوای راوناو قودسی سەندەوە لەخاچپەرستەکانو خزمەتێکی گەورەی ئیسلامی کرد، هیچ هەستێکی نەتەولیەتی نەبو.

• **باشە، ئەوە بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە کە ئێمە ڕۆشنبیری نەتەوایەتیمان نییە!**

– ڕۆشنبیری نەتەوەییمان بۆ نییە؟ چونکە ئێمە دەرگای نەتەوایەتیمان پارتی بو، پارتیش هەر بەگەزی مارکسیزم دیاردەکانی دەپێوا، بۆیە هەستی نەتەولیەتی گەشەی نەسەند..

• **باشە، ئەی ڕۆڵی ئێوە چی بو؟**

– ساڵی ۱۹۵۹ حزبی شیوعی دەستی خستە ناو سەرکردلیەتی پارتی، کۆمەڵێ کادری پێشکەوتوی شیوعی وەکو دارا تۆفیق، خەسرەو تۆفیق، ساڵح حەیدەری، هەمزە عەبدولا کە خۆی لەسەرەتاوە کابرایەکی بەبیر مارکسی بو چونە ناو لیژنەی ناوەندی پارتی.

هەروەها د. موراد هەبو کە کوردێکی سۆڤیەتو عەمیلی سۆڤیەت بو، لەوێوە ناردیانو کەوتە ناو مەکتەبی سیاسی پارتییەوەو بو بەئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی، ئەو مارکسیەکی تەواو بو، خەریك بو پارتی بەتەواوی لەو تۆزە نەتەوایەتیەش بشواتەوە.

ساڵی ۱۹۵۹ ویستیان ڕێکخراوی لاوانی دیموکراتی کوردستان، یان قوتابیانی کوردستان کە ڕێکخراوێکی لاوانو قوتابیانی پارتی بو، هەڵوەشێننەوە، تا لەوێدا ئێمە گەیشتە تینمانو ئومێدمان بەپارتی نەما. بیرمان لەوە کردەوە کە کاتی ئەو هاتوە ئێمە خۆمان ڕێکخستنێکی نەتەوەیی دابمەزرێنین لەو کەسانەی کە ئاراستەو ڕەوتی نەتەوایەتیان هەبو.

ئەو بیرۆکەیە سەرەتا لەمنو د. جەمال نەبەزەوە لەدوکانەکەی بەشیر موشیر دەستیپێکرد. ساڵی ۱۹۵۹ ئێمە ئەو واقیعە تاڵەمان دەبینی لەناو پارتیدا، لەلایەکی تریش، ڕۆژنامەی (الثورة) ی عێراق کە هی یونس الطائي بو لەو کاتەدا کۆمەڵێ وتاری نوسی کە هەمووی بۆنی تواندنەوەی کوردی لێدەهات. لەڕاستیدا ئەوانە وەکو ڕێبازێکی قەومی کەوتنە دژایەتی کردنی کورد. بینیمان ڕێبازە قەومییە عەرەبییەکە دژی کوردە، هەروەها ڕێبازە چەپەکەش کە حزبی شیوعییە هەر دژی کوردە.

ئێمە تاکە ئومێدێکمان پارتی بو، پارتیش ئەوەبو شیوعی بەو جۆرەی کە لەسەرەوە باسمان کرد دەستی تێخستو ئێمەی هیوابڕاوکرد. بۆیە ئێمە ساڵی ۱۹۵۹ بڕیارماندا حزبێکی نەتەوەیی دابمەزرێنین.

ئەوەی راستی بێ سەرەتای بیرۆکەی دامەزراندنی حزبێکی نەتەوەیی لەمنەوە بوو. جەمال نەبەز دەستپێیکرد. من بیرۆکەکەم خستە بەردەم جەمال نەبەز، ئەو لەمن بەتەمەنترو رۆشنبیریشی زیاتربوو. مامۆستای دواناوەندی بوو، من ئەو کاتە لەقۆناغی خوێندنی ناوەندی بووم.

جەمال نەبەز بیرۆکەکەی منی بەدڵ بوو، وتی: منیش بیرم لەشتێکی وەها کردۆتەوە، بەڵام چیبکەین و چۆن دەستپێبکەین. منیش وتم: هەموو شتێك لەهەنگاوێکەوە دەستپێدەکا، بڕینی هەزار میل بەهەنگاوێك دەستپێدەکا. ئەو وتی: کۆمەڵێ کەس لەسلێمانی هەن بیر لەشتێکی وەها دەکەنەوە، من ناتوانم ئێستا بچمەوە سلێمانی لەبەر دەوامی مامۆستایەتیم تا پشوی هاوین، تۆ بڕۆرەوە بۆ سلێمانی و پەیوەندی بەو کەسانەوە بکەو بەناوی منیشەوە قسەیان لەگەڵدابکە.

من هاتمەوە سلێمانی و ناوەکانیشم پێبوو، لەوانە: ئەحمەد هەردی، عەبدوڵڵا جەوهەر، ئیحسان فوئاد، فایق عارف، فەرەیدون عەلی ئەمین و کۆمەڵێ ناوی تریش هاتنە پێش کە پێویست نییە ناویان بێنم، پەیوەندیم پێیانەوە کردو بیرۆکەکەم لەگەڵدا باسکردن. ئەوانیش پێیان باشبوو، وتیان کۆمەڵێ خەڵکی تریش هەن و ناوەکانیان پێدام، بەڵام من پەسەندم نەکردن، چونکە ئەوانە هەڵوێستی خراپیان هەبوو، هەندێکیان بۆ نمونە، کتێبیان دەردەکرد، کتێبێکی وەکو رێزمانی کوردی وێنەیەکی مەلیکیان دەخستە لاپەڕەی یەکەمی. هەروەها وتم: کەسێ کوردێکی چاکبێ، بۆ ئەوە بشێ ببێتە سەرکردایەتیی حزبێکی نەتەوەیی، نابێ رابردوویەکی وای هەبێ لەکتێبێکدا وێنەیەکی مەلیکی خستبێتە لاپەڕەی یەکەمی، یاخود هەڵوێستێکی هەبوبێ ببێتە مایەی ئەوەی خەڵك رەخنەی لێبگرێ.

لەبەر ئەوە جگە لەو پێنج کەسەی کە ناوم بردن کەسی ترم پەسەند نەکرد.

دواتر لەگەڵ ئەو پێنج کەسە دەستمان کرد بەگفتوگۆو کۆبونەوە کە هەمان رەوتی ئێمەیان هەبو، پێکهاتین لەسەر ئەوەی حزبێکی نەتەوەیی دابمەزرێنین. لەدوا کۆبونەوەماندا رێکەوتی ١٩٥٩/٤/١٤ لەماڵی ئەحمەد هەردی لەسلێمانی بڕیاری دامەزراندنی حزبێکی نەتەوەییماندا.

بۆ ناوی حزبەکە کۆمەڵێ ناومان پێشنیار کرد، لەوانە: (حزبی نەتەوەیی کورد، حزبی رزگاری، حزبی سەربەخۆیی، بەڵام هیچ ناوێکمان هەڵنەبژارد، چونکە دەبوایە کۆبوونەوەی فراوانتر بکەین، ئیتر من گەڕامەوە بۆ بەغداد ئەو ئەنجامانەم گەیاندە جەمال نەبەز.

دواتر لەپشوی هاوین دا لەگەڵ جەمال نەبەز پێکەوە گەڕاینەوە بۆ سلێمانی و کەوتینە بەستنی کۆبونەوەی فراوانتر کە (٧) کەس بوین، لەو کۆبونەوانەدا کۆمەڵێك شتمان دیاری کرد.

بەڕاستی ئەو پشوی هاوینی ساڵی ١٩٥٩یە ماوەیەکی زۆر دەوڵەمەندو بەپیت و بەرەکەت بو بۆ کارەکەمان، چونکە یەکەم: ناوی حزبەکەمان ناونا (کاژیك) کۆمەڵەی ئازادی و ژیانەوەو یەکێتی کورد، لەسەر پێشنیاری من ئەو ناوە هەڵبژێردرا. من وتم: با ناوی حزبەکەمان بنێین (کاژیك)، وتیان: کاژیك چییە؟ وتم: واتە (کۆمەڵەی ئازادی و ژیانەوەو یەکێتی کورد). ئەوانیش وتیان زۆر باشەو پێشنیارەکەمیان پەسەند کردو وتیان ناوەکە خۆشەو مۆسیقییەو گوزارشت لەکۆمەڵێ شت دەکا کە دواتر لەنوسینەکانماندا باسمان لێوەکردو لێکمان دایەوە.

دواتر نامیلکەی (کاژیك نامە) مان نوسی. کاژیك نامە بەیان و بانگی یەکەمی حزب بو، (کاژیك نامە) زۆر بەنرخ و بەهایە. دوای ئەمەش پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆمان دانا. شێوەی رێکخستنمان دانا، هەندێ لیژنەمان دروستکرد. لقی سلێمانیمان دامەزراند.

هەروەها لقی کۆیەمان دامەزراندو دلاوەری کوڕی کاکە زیاد بو بەبەرپرسیاری‌و منیش گەڕامەوە بۆ بەغداد بوم بەلێپرسراوی لقی بەغدا، لەئەنجامی کارو خەباتماندا بەماوەیەکی کەم گەشەمان کردو پەلمانهاویشت بۆ زۆر شوێن، تاولیلێهات برادەرێکمان کەسبکرد بەناوی (جەواد مەلا) لەکوردستانی ڕۆژئاوا کە ئێستا دکتۆرای هەیەو لەلەندەن نیشتەجێیە، سەرەتا جەواد مەلا هاتە بەغدا بۆ لای من. لەوێ دوای ئەوەی کە بیرۆکەکەمان زیاتر بۆ باسکرد باوەڕی هێناو بەگەڵمان کەوت. ئاڕاستەی ئێمە ئاڕاستەیەکی نەتەوەیی بو، بۆ هەر چوار پارچەکە بو، ئێستاش باوەڕمان وایە کە خەباتی کوردایەتی دەبێ ڕێکخستنێکی نەتەوەیی هەبێ بۆ سەرتاسەری کوردستان، نەک بەپچڕپچڕی ئەو سنورە دەستکردانەی دوژمنان دروستیان کردوە. پەکەکەش ئەو ڕەوتەی ئێمەی هەبو، بەڵام لەو دواییەدا خۆی دۆڕاند، ئەویش هاتەوە سەر خەباتی ناوچەیی‌و وازی لەخەباتی سەرتاسەری هێنا.

**• ئایا ئێوە پێش دامەزراندنتان بەئاشکرا کارتان دەکرد؟**

– لەڕاستیدا ئێمە زۆر بەنهێنی کارمان دەکرد، چونکە چارمان نەبو، یەکێك لەهۆیەکانی کە (کاژیك)یش پێش نەکەوت دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئسلوبی نهێنی کارکردنەمان، لەبەر ئەوەش خەڵك نەیدەزانی ئێمە کێین‌و چیمان دەوێ‌و بەرنامەو ستراتیجمان چییە.

**• بۆچی ئێوە بەنهێنی کارتان دەکرد؟**

– زۆر دژایەتی دەکراین، پارتی‌و شیوعی زیاتر لەحکومەتی ئەوسا دژمان بون، زۆریان بەربەرەکانی دەکردین، شیوعی دژی بیروباوەڕەکەی ئێمە بو، ئێمەش لەدوورەوە دژی شیوعی بوین، چونکە بیرۆکەی مارکسیزم لەگەڵ نەتەوایەتیدا ناگونجێ، نەتەوایەتی لەخەباتی چینایەتیدا دەتوێتەوە، بۆیە ئێمە وەکو بیرو وەکو ڕێکخستن دژیان بوین، چونکە هەڵسوکەوتی شیوعیەکان زۆر خراپ بو بەرامبەرمان.

لەلایەکی تر دەتوانم بڵێم پارتی، مردنی خۆی لەگەشەکردنی ئێمەدا دەبینی، ئەگەر ئێمە گەشەمان کردبا‌و خەڵکە نەتەوەییەکە بەگەڵ ئێمە کەوتبا ئەوە پارتی چی بەدەستەوە نەدەما. بۆیە ئەویش زۆر بەتوندی بەربەرەکانی‌و دژایەتی دەکردین.

ئەم هۆکارانە هەمووی وایکرد ئێمە زۆر بەنهێنی کاربکەین، جگە لەوەی کە حکومەتی ئەوسا لەسەر دواکردنی حوکمێکی زاتی دەیانگرتی‌و ئازاریان دەدای، ئەی ئەوەی داوای ڕزگاربونی هەموو پارچەکانی کوردستان بکات چی لێدەکا؟ دیارە بەتوندوتیژتر لێی دەدا.

**• مامۆستا کامل ئایا ئێوە چالاکیتان لەپارچەکانی تری کوردستان دەکرد؟ بۆ نمونە لەکوردستانی ئێران؟**

– نەگەیشتینە ئێران، بەڵام برادەرێك لەتورکیاوە هات (قەیا)ی ناوبو، ماوەیەك لەگەڵماندابو، هات لەبەغدا پەیوەندیی پێوەکردین‌و بیرۆکەکەی لێوەرگرتین‌و ئەو ماوەیەی لەلامانبو بەبیروباوەڕەکەمان گۆشمانکرد، بەڵام پاشان شوێنبزربو، دواتر بیستمان کە ئەو قەیایە لەلایەن حکومەتی تورکیاوە نێردراوەو موندەس بوە، گوایە موخابەراتی تورکیا بوە، ئەو کابرایە ئیتر نەهاتەوە بەلاماندا.

ساڵی ١٩٦٢ من چومە تورکیا، ئەو سەردەمە دیوانی شیعری کوردایەتیم پێشتر لەساڵی ١٩٦٠ دەرچوبو، ژمارەیەکی لێ گەیشتبوە تورکیاو کوردەکانی ئەوێ خوێندبویانەوە، لەڕێگای کۆمەڵێك خوێندکاری سلێمانی‌و هەولێر کە لەوێ دەیانخوێند لەشیعرەکانم گەیشتبون‌و کاری تێکردبون.

لەتورکیا یەکێك بەناوی جەمال عەلەمدار هەبو لێپرسراوی ڕێکخراوی پارتی بو، برادەری خۆشم بو، دەمناسی، من کە چوم بینیم، وتی وەرە، فرسەتە، زۆر لەکوردە ڕۆشنبیرەکانی ئێرە دیوانە شیعرەکەی تۆیان خوێندۆتەوەو زۆریان پێباشە، وەرە لەگەڵیان دانیشە، جگە لەمەش ئەوانە دەیانەوێ ڕێکخراوێك، حزبێك دروست بکەن، بەس هیچی لێنازانن، تۆ ئەگەر یارمەتیان بدەی پێیان خۆشدەبێ. منیش ئەوەم پێخۆشبو، قۆستمەوەو لەوێ دەستیانکرد بەدەعوەت کردنی من، تەنانەت ئەو دو هەفتەیەی کە لەئیستانبول بوم، بەحساب دەبوایە بەرەو ئەوروپا بچم، بەلام ئەو ماوەیە بێ شەویلاردن هەر شەوەی لەماڵی یەکێك لەکوردە ناودارەکانی ئەوێ دەعوەت بوم، بەهۆی ئەمەوە گەلێك شەخسیەتی کوردی ئەوێ کۆدەبونەوەو باس لەمەسەلەی کوردو ڕێگاچارەسەرو دروستکردنی ڕێکخراوی کوردی کرا.

بەبیرمدێ دو کەس لەوانەی کە ناوداربون لەو کۆبونەوانە ئامادە دەبون، یەکێکیان ناوی موسا عەنتەر بو، ڕۆژنامەنوسێکی بەناوبانگبو، بەم دواییە شەهیدیان کرد، ئەویتریشیان مەمۆ ناوێك بو، نازانم مەمۆ چی بەسەر هات. ئەم دوانە زۆر ڕۆڵی سەرەکییان بینی لەو کۆبونەوانەدا کە بەمەبەستی حزب دروستکردن‌و کوردایەتی بو.

**• باشە ئەوانە لەوێ بۆچی نەدەچونە ناو پارتی کە ئەو کاتە هەبو!**

– نازانم، بەلام ئەوان هەر لەسەرەتاوە ڕەوت‌و ئاڕاستەیان زۆر نەتەوەییانەبو، لەوانەیە پارتیان بەدڵنەبوبێ، بەلام کە شیعرو بیروباوەڕەکانی منیان بینیبو خوێندبویانەوە، زۆر کاری تێکردبون.

**• مامۆستا ئایا دەتوانین بڵێین دیوانی شیعری (کوردایەتی) گوزارشت لەبیری کاژێك دەکا!**

– بەڵێ، گوزارشتی لەبیری کاژێك دەکردو تەقینەوەیەکی بیری نەتەوەیش بو، واتە لەمەوپێش ئەو جۆرە قسانەیان نەبیستبو، زیاتر قسەی نەرمتر کرابون، بەلام ئەوەی من بەبیروباوەڕو بەشێوازو گوفتاریش کوردایەتیەکی زۆر نوێ بو، ئەمە تەقینەوەیەك بو بەنسبەت کوردەکانی ئەوێ.

لەبەر ئەوەی من ئەزمونی حزبایەتیم زۆربو، پێشتر لەناو حزبی شیوعی‌و دواتریش لەکاژێك، کە خۆم دەستی بالام تیایدا هەبو، دەمزانی ڕێکخستن چۆنەو حزب چییە، پرەنسیپ چییە، پەیڕەو پرۆگرام چییەو چۆن حزب دروست دەکرێ. بۆیە هاتم لەسەر شێوازی کاژێکی شێوەی دروست کردنی حزبێکی نەتەوەیم بۆ داڕشتن. پێم گوتن ئەوە (کاژێك)یش هەیە. وتیان: باشە ئێمە ئیتر دەستپێدەکەین‌و بەشێك بین لەکاژێك یان خۆمان شتێکی سەربەخۆ دروست دەکەین.

منیش ئیشەکەم وابو نەمدەتوانی زیاتر بمێنمەوە، نەخشەو شێوازی دروستکردنی حزب‌و کارکردنم بۆ داڕشتن وەکو سەرەتاو پێم وتن ئیتر ئێوە خۆتان بەرپرسیارن لەکاری خۆتان‌و خۆتان ئیشەکانتان بکەن، ئیتر من ڕۆیشتم بۆ سویسرا بەمەبەستی چون بۆ فەڕەنسا بۆ سەرپەرشتی کردنی ئەو رادیۆ کوردییەی کە بڕیاربو لەپاریس دابنرێ، کە د. کامەران بەدرخان ڕەزامەندی دانانی ئەو رادیۆیەی لەفەڕەنسییەکان وەرگرتبو، پێش منیش جەمال نەبەز چوبو بۆ سویسرا لەوێ د. کامەران بەدرخانی بینیبو.

**ڕۆژنامەی (تایم) ژمارە ٣٠ ی ڕۆژی ٢٠٠٢/١٠/٣**

*** یەکەکە متمانەی نەتەوەی کوردو دۆستەکانی کوردیشی لەدەست دا.**
*** مادام برۆنزینۆ حەزی دەکرد شوو بەبەشیر موشیر کات.**
*** سەفارەتی عێراق لەسویسرا بەدەرکردنی داین.**
*** دەمانویست چارلی چاپلن ببینین.**

لەدرێژەی چاوپێکەوتنەکەیدا لەگەڵ ڕۆژنامەی تایم مامۆستا کامیل ژیر ئاماژەی بەوەدا کە سەفارەتی عێراق لەسویسرا بەدەرکردنی دان. جگە لەوەش لەم ئەڵقەیەدا کۆمەڵێك یادەوەری پێکەنین ئامێزو سەرنجڕاکێشی گێڕاوەتەوە کە هەمووی پێکەوە دەتوانرێت تا ئاستێك ڕەوشی ئەو سەردەمەی کوردی دانیشتوی ئەورووپای تیادا ببینرێت.

**لەم ئەڵقەیەی یادەوەرییەکانیدا مامۆستا کامیل ژیر باسی لەمانەوەی لەسویسراو دواتر دەرکردنیان لەوێ بەفشاری حکومەتی عێراقی و کۆمەڵێك سەرگوزشتەی خۆش بۆ کردوین.**

*** باشە مامۆستا تۆ شارەزاییت لەبەڕێوەبردنی کاروباری رادیۆدا هەبوو؟**

– دوکتۆر کامەران بەدرخان و جەمال نەبەز، ساڵی ١٩٦٢ پێکهاتبوون لەسەر ئەوەی من بچم بۆ فەرەنسا بۆ بەڕێوەبردنی ئەو رادیۆ کوردییەی بڕیاربو لەپاریس دابمەزرێ. من هەندێك شارەزاییم هەبو لەکارەکانی ئێزگەی رادیۆدا بەهۆی ئەوەوە لەرادیۆی کوردیی بەغداد بەرنامەیەکم هەبو (لەهەر تەلەی دەنگێ) پێشتریش لەقۆناغی خوێندنی ناوەندیدا چالاکیی هونەریم هەبو لەبواری شانۆدا وەك ئەکتەرێك و وەك نوسەرێکی شانۆنامەو وەك دەرهێنەرێکیش کە ساڵێك لەپەیمانگەی هونەرە جوانەکانی بەغداد بەشی نواندن و دەرهێنان خوێندبووم. یەکێکیش بوم لەدامەزرێنەرانی کۆمەڵی ئاوازی کوردی لەگەڵ شەماڵ سائیب و ئەحمەد دەنگ گەورەو تایەر تۆفیق و کەسانیتر.

*** کامیان ئێوان هەڵبژارد بۆ ئەو کارە؟**

– جەمال نەبەز، ئەو پێش من بەشەش مانگ گەیشتبووە جنێف، بەو شەش مانگە فێری فەرەنسیەکە بوبو، ئەوەش بۆ من کار ئاسانییەك بو کاتێ گەیشتمە سویسرا.. ئەوەبو وەك وتم لەئەستەمبوڵ دوو هەفتە دواکەوتم، نازانم ئەو برادەرانەی ئەستەمبوڵ چییان کرد؟ بەڵام ئەوەی ئەمبیستەوە، هەستی نەتەوایەتی لەباکور لەپەرەسەندندا بو، دوای ساڵانێك یەکەکەش دروستبو. ئەمیش وەك چارلی پارتی، مارکیستی و نەتەوایەتیی تێکەڵ بەیەك کرد! کە ئەوە خاڵی لاوازی یەکەکە بو، ڕاستە یەکەکە زۆر پەرەی سەندو بەهێزبو، بەڵام لەگەڵ ئەو شکستییەدا کە بەسەری هات بەهۆی گرتنی ئۆجەلانەوە، یەکەکە لەخەباتی سەرتاسەرییەوە بۆ هەموو کوردستان و بۆ سەربەخۆیی، بایداوە بۆ خەباتی ناوچەیی و ملدان بۆ پێکەوە ژیان لەگەڵ تورکدا! بەوە یەکەکە متمانەی نەتەوەی کوردو متمانەی دۆستەکانی کوردیشی لەدەسدا.

**• ئینجا سەر رادیۆکە، چی بەسەر هات؟**

– بەڵێ، ئەو دواکەوتنەم لەئەستەمبوڵو سەفەرەکەشم بەشەمەندەفەریو لەبەغداوە، ئەوەش ماوەیەك دوایخستم. کاتێ گەیشتمە جنێڤ، دوکتۆر کامەران چوبو بۆ واشنتۆن بەنیازی ئەوەی دلخوازییەکانی شۆڕشی ئەیلول بخاتە بەردەم کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، دوو مانگی پێچو، منیش ئەو ماوەیە هەر لەجنێڤ مامەوە، سەفارەتی عێراقیش بەهەواڵی ئەو رادیۆیەی زانیبو، حکومەتی فەرەنسی لێپەشیمان کردبوەوە. هەر لەماوەی ئەو دواکەوتنەشدا، زەمالەیەکی خوێندن لەزانکۆی سۆربۆن کە خێزانەکەی دوکتۆر کامەران بۆ منی وەرگرتبوو، برادەرێکی کوردی رەواندزی بەخێزانەکەی دوکتر کامەرانی وتبوو کە گوایە من پەشیمانبوومەتەوە لەچوونم بۆ فەرەنسا، زەمالەکەی منی بۆ خۆی پچڕیبوو!، ئیتر من لەکوردەکەی هەردوو جەژنە بووم، ئەرادیۆکەو ئەزەمالەکە.

**• ئەی چیت کرد؟**

– ناچار لەجنێڤ مامەوە بەنیازی خوێندن لەسەر حیسابی خۆم، لەکۆلیجی ئابووری وەرگیرامو دەستمکرد بەهەوڵدان بۆ فێربوونی فەرەنسی، لەهەمان کاتدا، لەگەڵ ئەبەزدا دەستمانکرد بەچالاکیەکی زۆر لەدژی رژێمی عێراقو بڵاوکردنەوەی دەنگوباسەکانی شۆڕشی ئەیلول. ئێمە دەنگوباسەکانی شۆڕشمان بەوردیو بەدرێژی پێئەگەیشت. ئەویش بەهۆی ئەوەوەبو کە دکتۆر کامەران جۆرە مەرەکەبێکی دلبووینێ لەشووشەی ئاوی (مقطر)دا بو. ناردبومانەوە بۆ رێکخستنی کازێك لەبەغداد بۆ هاوبیرمان. (م.س) کە دولیی بو بەئەندازیارو بەڕێوەبەری گشتیی کارگەیەکو ئێستا بەهۆی ئەوەوە کە قاچەکانی لەکارکەوتوون، لەماڵەوە دانیشتووە. ئەو مەرەکەبە لەڕەنگی ئاودابو، لەسەر کاغەزەکە دەرنەئەکەوت. هەموو هەفتەیەك نامەیەکمان لەو هاوبیرەمانەوە بەپۆستەدا بۆ ئەهات کە بریتیی بو لەچەند وشەیەك وەك هەواڵپرسین، ئیتر ئەوی تری بەو مەرەکەبە پڕئەکردەوە بەدەنگوباسەکانی شۆڕش. ئێمەش جۆرە مەرەکەبێکی ترمان لەلابو بەفڵچەیەك ئەماندا لەکاغەزەکەو هەموو نوسینە نهێنییەکانی دەرئەخست. بەو جۆرە هەموو هەفتەیەك دەنگوباسەکانی شۆڕشمان پێئەگەیشتو بڵاونەکردەوە.

**• چۆن و بۆ کوێ ئەو دەنگوباسانەتان بڵاو دەکردەوە؟**

– یەکەمجار، ئەو دەنگوباسانەمان لەنامەکەوە ئەگواستەوە بۆ سەر کاغەزی ترو رێکمانئەخستن. وێنەیەکیمان ئەنارد بۆ دوکتۆر بەدرخان لەپاریسو وێنەیەکیش بۆ عیسمەت شەریف وانلی کە ئەوسا لەشاری لۆزان ئەژیا. هەندێ لەکوردەکانی رۆژهەڵاتیش کە لەجنێڤ ئەژیان وەك حەبیبوڵای رەشیدیو فوئادی ئاسەفمان لێئاگادارئەکرد. دوای ئەوە ئەبەز وەرینەگێڕانە سەر فەرەنسیو بریکاری دەنگوباسەکانو هەندێ رۆژنامەمان لێئاگادارئەکردن.

**• ئەمە تاکەی درێژەی کێشا؟**

– تا دەریانکردین لەسویسرا.

**• بۆ دەریانکردن؟**

ئەمەیان مەسەلەیەکی خۆشە، لەسویسرا یاسایەك هەبو، هەر بێگانەیەك پارەی پێ نەمایە. پۆلیس ئەچوو یەك سەلامی سەربازیانەی بۆ ئەکردو پێی ئەوت: ئەی گەورە، تۆ لەبەر ئەوەی پارەت پێنەماوە، کام سنور هەڵئەبژێری بۆ ئەوەی لەوێوە ئاودیوت بکەین؟

ئێمە لەنێو خۆماندا جارجار باسی ئەم یاسایەمان ئەکردو تێر پێئەکەنین‌و ئەمانوت: دەرکردنەکە بەهەرجیا، ئەو سەلامە سەربازی‌و پێبەئەرزدانە بۆ؟!

بەو جۆرە ئەمانگوزەران، تا من لەپشوویەکدا سەردانێکی نەمسام کرد. لەوێ رەشید عارف‌و دوکتۆر وریا رەواندزی‌و دورپە محەمەد عەلی عەونی‌و سەرداری رەمزی فەتاح‌و عومەر دزەییم دی.

لەگەڵ ئەم دولەی دواییدا، کۆڕو دانیشتنەکانمان خۆش بو، لەبەر ئەوە گەشتەکەم پازدە رۆژی خایاند. کە گەڕامەوە بۆ جنێف، کاك جەمال نەبەز پیاما هەڵشاخاو وتی ئەمە تۆ لەکوێیت؟ وتم بۆ ولتوڕەییت؟ وتی پۆلیس هات سەلامەکەی بۆ کردم!! وتم بۆ؟ خۆ ئێمە پارەمان پێماوە. ئەوسا لەکەسوکارەوە پارەمان بۆ ئەهات. وتی لەبەر ئەوە نیە، نازانم هاتن وتیان ئەی گەورە: لەبەر ئەوەی سویسرا وڵاتێکی بچووکە، جێگەی ئێوەی تیانابێتەوە، کام سنور هەڵئەبژێرن تا خۆت‌و برادەرەکەتی لێوە ئاودیو بکەین!؟ لەگەڵ ئەو هەواڵە ناخۆشەدا، دامە پرمەی پێکەنین. وتم بۆچی جێگەی ئێمەی تیانابێتەوە. خۆ نەئاوساوین؟ وتی کاتی پێکەنین نیە، ئەبێ مشووری خۆمان بخۆین‌و بڕۆین. وتی تەرم هەوڵداوە، بێسوودەو ئەبێ بڕۆین، تەنیا بەوە رازی بوون کە چاوەڕوانی هاتنەوەی تۆ بکەم‌و خۆشمان بڕۆین نەك ئەوان بەپۆلیس دەرمانکەن. ئیتر ناچار رووماں کردە نەمسا.

**• بەر لەوەی بڕۆین بۆ پرسیار لەبارەی نەمساوە، ئاخۆ هەندێ یادەوەریتان هەیە لەسویسرا؟!**

– بەڵێ وەك وتم نەبەز بەر لەمن گەیشتبووە، جنێف، لەناو ماڵێکدا ژوورێکی گرتبو بەکرێ، ماڵی مادام برۆنزینۆ. ئەم ئافرەتە مێردێك‌و کوڕێك‌و کچێکی هەبو، مێردەکەی لەشارێکیتر کاریئەکرد. کوڕەکەی کە ناوی کارلۆ بو، لەسەر ماتۆڕ پەڕیبوو، لەخەستەخانە کەوتبوو بۆ نەشتەرگەری. لەبەر ئەوە مادام پێویستی بەپارە بو، بۆیە ئەو ژوورەی دابو بەکرێ. کە منیش گەیشتم، ژوورێکی بەمنیش دا، بەڵام ئەو ژنە لەوە ئەچوو زۆرمان لێبترسێ. شەوان دەرگای ژوورەکەی خۆیان دائەخست‌و هەندێك شتیشی ئەدایەپاڵ. تومەز کوڕەکەی لەخەستەخانە پێی وتبو: بۆ ژوورت داوە بەکورد؟! ئەوانە میللەتێکی پیاوخۆرن! تۆ بیکوژمرێنە لەگەڵیاندا، کە من لەخەستەخانە دەرچووم ئەزانم چۆن دەریانئەکەم! ئێمە بەمەمان ئەزانیبو.

بەبۆنەی دەرچوونیەوە لەخەستەخانە، چووینە لای‌و هەندێك گوڵیشمان پێشکەشکرد، دیمان گرژ بو لەگەڵماندا. تەختەیەکی شەترەنج دانرابو. من شەترەنجم باش ئەزانی. وتم بایارییەك بکەین. وتی ئەوە یاریی تۆ نیە، ئەوە یاریی ئەقڵە!! قسەکەم لاگران بو. وتم باشە با ئەقڵی خۆمان تاقیبکەینەوە. وتی بۆچی تۆ یاریی وا ئەزانی؟ یارییەکمان کرد زوو لێمبردەوە. یاریی دووەم‌و سێهەمیش بەو جۆرە. ئەو تێری نەئەزانی. دوای چەند رۆژێك وتی من تێری نازانم، بابچین بۆ گازینۆی شەترەنجزانەکان. ئەگەر لەوێ یارییەکت بردەوە، ئەوا من رام ئەگۆڕێت‌و دەعوەتێکیشتان بۆ ئەکەم. لەوێش بردمەوەو

دەعوەتەکەی بۆ کردم‌و تێکەڵاویمان زیاتربو، ئەو تەمەنی پازدە ساڵێك بو، رۆشنبیرییەکی ئەوتۆی نەبو، ئێمە لەمریشکە رەشە بوبووینەوە.

ئنجا جارجار دوکتۆر کامەران‌و عیسمەت شەریف‌و رەشیدیش ئەهات بۆ لامان، کارلۆ بۆی روون بوەوە ئێمە پیاوخۆر نین، بەڵکو لەزۆر خەڵکی ئەوێ رۆشنبیرترین. ئیتر رۆژێك خۆی هات دڵنی پیانا کە هەڵە بووەو داوای لێبوردنی کرد. وتمان چی بووە؟ وتی من کتێبێکم لەسەر کورد خوێندبووەوە کە گوایە میللەتێکی کێوی‌و پیاوکوژن. کەچی ئێستا بۆم دەرکەوت ئێوە لەئێمەش تێگەیشتوترن. ئنجا ئەوەشی کە وای کردبو مادام برونزینۆ زۆر لێمان بترسێ، کاك جەمال لەگران پاساژ (گەورەترین سوپەر مارکێتی جنێڤ) کێرێکی گەورەی پڕ لە نەخشونیگاری کڕیبو لەژوورەکەی خۆیدا هەڵیواسیبو. مادام برونزینۆ، بەوە ئەوەندەی تر روحی چوبو!

ئیتر ئەو خێزانە ئێمەیان زۆر خۆشویست. ئەوەندەش باسی بەشیر موشیرمان کردبو، مادام برونزینۆ رەسمێکی بەشیری لەژوورەکەی خۆیدا هەڵواسی‌و ئەیوت ئەگەر لەمێردەکەم جیابوومەوە، شو بەبەشیر موشیر ئەکەم.

ئێمەش بەپەلە ئەم هەواڵەمان نارد بۆ مامۆستا بەشیر. کە گەڕامەوە بۆ بەغداد، مامۆستا بەشیر زوو زوو هەواڵی مادام برونزینۆی لێئەپرسیم.

لەهەمان کاتدا، ئەوەندەی باسی نەتەوەی کوردو زوڵمی داگیرکەران‌و شۆڕشی ئەیلولمان بۆ ئەو خێزانەکردبوو. کارلۆ لەگەڵ برادەرێکی خۆیدا کە ناوی تۆنی بو، بڕیاریاندا بچن بۆ کوردستان‌و ببن بەپێشمەرگە. یەکەم بۆ ئەوەی بەرگری لەکورد بکەن. دووەم ئەیانوت ئێمە لێرە لەم ژیانەی خۆمان بێزارین، حەز ئەکەین بچینە شاخ‌و وەك فلیمی عەسابەکان بجەنگین!.. بەڵام روانیمان ئەوانە هێشتا منداڵن‌و کەڵکی ئەوەیان پێوەنیە.

• **یادەوەری تریشت هەیە لەوێ؟**

– یادەوەریی دووەم، لەگەڵ رەشیدیدایە، ئەم برادەرە ناوی حەبیبوڵڵا رەشیدییە. خەڵکی شاری سنەیە، ئەو پێش ئێمە بە دە ساڵ لەجنێڤدا ئەژیا. باوکی ناردبووی بۆ خوێندن. بەڵام یەك کۆرسی نەبڕیبو! چونکە وەك خۆی ئەیوت کچان لێی ناگەڕێن. راستیشی ئەکرد، کوڕێکی قۆزو زۆریش قۆشمەبو. لای پروتستانتەکان کە لەجنێڤدا کەمینەیەکن‌و هەمیشە لەگەڵ کاسۆلیکدا ناکۆکن، وتبووی من پرۆتستانتی سنەم. ئەوانیش شوقەیەکی پڕ لەکەلو پەلیان دابویە. شەوی سەری ساڵی ١٩٦٢ لەگەڵ پروتستانتەکانی ناو باڵەخانەکەیان تێکئەچن لەسەر ئەوەی ئەو شەوە تابەرەبەیان ئەوان هەر زەمی کاسولیکەکان ئەکەن. ئەمیش بەسەرخۆشی لێیان رائەپەڕێ‌و لەوەش خۆی ئاشکرا ئەکات کە ئەم موسڵمانە!

ئەولنیش هەر ئەو شەوە دەرینەکەن. عیسمەت شەریف لەپۆڵۆنیا زەمالەیکی خوێندنی بۆ بەدەستخست. ئەو رۆژەی بەڕێمان کرد، زیاتر لەپەنجا کچی سویسری هاتبوونە ئیزگەی شەمەندەفەرو بەگریانەوە بەڕێیان کرد. کەچێ دوو هەفتەی نەخایاند بەفرۆکە گەڕایەوە. وتی لایبە.. کەی ئەوە وڵاتە. وتمان ئەی پارەی فرۆکەکەت لەکوێبوو؟ وتی کڵاوم نایەبان سەریان. پێموتن من پەیامنێری

ڕۆژنامەی لۆمۆندم. ئەگەر بەفڕۆکە نەمنێرنەوە، خەرلێتان لەسەر ئەنوسم. ڕەشیدی زوو زوو لەو جۆرە کلاوانەی ئەدرو. خۆی پیشاندابو کە نوێنەری بارزانییە، جارجار تەلەفۆنی بۆ ئەو گازینۆیە ئەکرد کە لێی دائەنیشت.

پێیئەوتن ئەوە بارزانی لەفڕۆکەخانەی جنێڤ لایداوەو داوای ڕەشیدی ئەکات. دوای ماوەیەك ئەچوو بۆ گازینۆکە. ئەوانیش بەپەلە مەواڵەکەیان پێئەگەیاند. ئنجا لای ئێمە ئەیوت ئەوە کلاوم نایەبان سەریان!

ئەو ڕۆژەی بڕیار بو من بگەمە ئێزگەی شەمەندەفەری جنێڤ. ئەبەزو ڕەشیدیو چەند کەسێکیتر چاوەڕوانیان کردبووم. بەلام من ٢٤ کاتژمێری دواکەوتم تەفسیری ڕەشیدی ئەوەبو کە لەئیتالیا گوێنییەکەیان لێفڕاندوم، منیش ڕامکردووە بەشوێنیدالو شەمەندەفەرکە بەجێیهێشتووم! تومەز خۆی ئەو لەجیاتی جانتان گوێنی پێبووە.

ڕەشیدی ژیـــــر ئەبـــــەز

* ئەی یادەوەریی سێهەم؟

– ئەمەیان یادەوەری نیە، بەڵکو خەفەتێکە. ئێمە سەرباری خەفەتی دەرکردنەکەمان لەسویسرا، زۆر نیگەران بووین بەوەی کە نەمانتوانی چارلی چاپلن ببینین. چاپلن لەگوندێکی جنێڤ ئەژیا. بڕیارماندا ڕۆژێك سەردانێکی بکەین بۆ ئەوەی مەسەلەی کوردی تێبگەیەنین‌و داوای لێبکەین هەڵبداتێ لەسەر کورد. بەلام ئەو دەرکردنە بواری نەدلین.

**• ئێستا ئەگری هۆی دەرکردنەکەمان پێڵێی!**

– ئەی بۆنا.. بێجگە لەمن و ئەبەز، کەسیتری باشور لەسویسرا نەبو، بۆیە سەفارەتی عێراقی لەسویسرا ئەو چالاکیانەی بەهی ئێمە ئەزانی و گوشاری خستبووە سەر حکومەتی سویسرا کە دەرمانکەن. ئەگینا پەیوەندیی دبلۆماسی ئەبڕن.

**• وتتان ٢٤ کاتژمێر دواکەوتن، بۆچی!**

– لەئەستمبوڵ کە سواری شەمەندەفەر بووم، لەگەڵ گروپێکی بەریتانی، بوم بەبرادەر، ڕێگاکە دوو شەوو دوو ڕۆژی خایاند پێشنەوەی بگەینە لۆزان، ئەوان وتیان ئەمشەو لەلۆزان لائەدەین، چونکە نامانەوێ بەم هیلاکیی و ژاکاویە بچینە جنێڤ. تۆش وابکە، چونکە خەڵکی سویسرا زۆر گوێ بەرێکوپێکی ئەدەن. با لەڕێوە سەرنجێکی خراپ وەرنەگرن بەرامبەرت. ئەمشەو لەلۆزان ئەچینە وتێلو خۆمان ئەشۆین و جل لەئوتو ئەدەین. سبەینێ بەنیو کاتژمێر ئەگەینە جنێڤ. وتم ئاخر من لەگەڵ لۆزان نەیارم. باسی پەیمانی لۆزانم بۆ کردن. وتیان هەقتە، بەڵام ئەوە ڕێ لەوە ناگرێ ئەمشەو بچینە ئوتێلێک.

ڕۆژی دوایی گەیشتمە جنێڤ و ناونیشانی ئەبەزم پێبو. هۆی دواکەوتنم بۆ باسکرد، ئەویش تەلەفۆنی بۆ ڕەشیدی کردو پێی وت ئەوە قسەکەی تۆ دەرچوو، ئێستا گەیشت، لەئیتالیا گوێنییەکەیان لێرفاندووە، ڕەشیدی هات و کردمان بەپێکەنین. لەقسە خۆشەکانی ڕەشیدی: ئەیوت من فرە قەشەنگم وەلێ سەرمدا پڕیاگە (واتا سەری رووتاوەتەوە) لەجیاتی ئەوەی بڵێ گوێنیگرە. ئەیوت گوێچکەبدە.. ژمارەی (٢١)ی زۆر لاپەسەند بو، بیوایە بەبرادەری هەر کچێك، ئەیوت تەمەنی (٢١) ساڵە. لەجنێف ئەوەندە ناوبانگی هەبو، بەختیار ئەوەبوو بیولیە بەدەزگیرانی ڕەشیدی: کەچی ڕەشیدی تەنیا بریجد باردۆی لەدڵەوە خۆشەئەویست. هەموو شوقەکەی بەوێنەکانی ئەو ڕازاندبووەوە. بریجد باردۆ ڕێی کەوتە جنێف بۆ ئەوەی لەگوێ دەریاچەکەی جنێف فلیمێك دەرکا. خەڵکی جنێف باسی ڕەشیدیان بۆ کرد. ئەویش ناردی بەشوێنیدا و نیو کاتژمێر پێکەوە قسەیان کردبو. ئەم هەواڵە لەجنێڤدا دەنگی دایەوە. بەداخەوە ئێستا سۆراغی ڕەشیدی نازانم. با ئەوەش بڵێم ئێستا بیرم کەوتەوە: بە ئەبەزی ئەوت ئەشێ ئەم جەماڵە پیاو ئەمریکا بێ. ئەموت بۆ؟ ئەیوت چونکە ئینگلیزییەکی فرە قەشەنگ ئەزانێ!

رۆژنامەی (تایم) ژمارە ٣١ ی رۆژی ٢٠٠٢/١٠/١٥

*** کورد تەنیا لەڕوی سۆزەوە کوردایەتی کردوە.**

*** وانەی زمانی کوردیم بەباڵیۆزی یۆگۆسلاڤیا لەبەغدا دوتەوە.**

**لەم ئەڵقەیەدا مامۆستا زۆر باسی چوونی بۆ سوریاو گەڕانەوەی بەغداو هۆیەکانی هەڵوەشانەوەی کاژیك ئەکات.**

**• دوای دەرکردنتان لەسویسرا، بۆچی نەمساتان هەڵبژارد!**

– وەك پێشتر وتم، بەهۆی ئەو سەردانەمەوە بۆ ڤیەنا، هەندێك شارەزاییم پەیداکردبوو لەبارەی نەمساوە. لەگەڵ ئەبەزدا بڕیارماندا لەڤیەنا نیشتەجێبینو بخوێنین. بەلام ئەو کاتەی گەیشتینە ڤیەنا، زانیمان وەرزی خوێندنو وەرگرتن لەزانکۆکان تێپەڕی کردووە. ئەبوایە شەش مانگێك چاوەڕوانمان کردایە. ئەوەش بۆ ئێمە نەئەگونجاو. زانیشم کاك جەمال نەمسای لاخۆش نەبو. ئەو پێشنیاری ئەڵمانیای کرد. من تورکیا، لەئەنجامدا هەر وامان کرد، ئەو ڕوویکردە شاری میونیخ لەئەڵمانیا. منیش بۆ ئەستەمبوڵ. بەو جۆرە لەیەك جیابووینەوە، لەئەستەمبوڵیش پێیان ڕاگەیاندم کە کات درەنگەو ئەبێ چاوەڕوانی ساڵی تازەی خوێندن بکەم. هەر لەوێ بیستم کە تەنیا لەدیمەشق ئەشێ وەرگیرێم بۆ خوێندن. ئیتر لەئەستەمبوڵیش نەمامەوەو خێرا خۆم گەیاندە شام. کات هەندەی نەمابو بۆ بەهاری ١٩٦٢، کە چوومە زانکۆی دیمەشق لەوێش وەرنەگیرامو وتیان ساڵ زۆر درەنگە. ئیتر بەنائومێدی ویستم ڕوو بکەمە یانەی زانکۆ بۆ ئەوەی نانێك بخۆمو بیرێك بکەمەوە. لەگەنجێکم پرسی یانەکەتان لەکوێدایە، لەوەڵامدا وتی: لەوەئەچێ تۆ عێراقی بیت؟ وتم بەڵێ، وتی خەڵکی کام شاریت، وتم سلێمانی، هەر کەوام وت باوەشی پیاکردمو ماچی کردم، زانیم هەردووچاوی پڕبو لەفرمێسك، لەگەڵما هات بۆ یانەکەو پێکەوە دانیشتین. هەواڵی کچێکی خەڵکی سلێمانی لێپرسیم کە ئەو کاتە لەزانکۆی بەغداد ئەیخوێند! وتم بەڵێ ئەیناسم. کوڕەکە کە ناوی (سمیر) بو، لەخۆشیدا شاگەشکەبو، وتی تۆ میوانی منیت. خێرا چوو خواردنی بۆ هێنام، وتی: من لەم زانکۆیەدا دەستم زۆر ئەڕوات. هەرچی پێویستییەکت بو بەمن بڵێ. کە بۆم باس کرد ئەوە یەکەم ڕۆژمەو وەریش نەگیراوم، وتی: کام کۆلیجت ئەوێ، وتم: یاسا، وتی ئەوە لەسەر من. ئەو شتانەی پێویست بون، لێی وەرگرتمو دوای کاتژمێرێك گەڕایەوە وەرەقەی قبوڵەکەی دایەدەستم.

**• ئەوە کێبو!**

– منیش ئەو ڕۆژە هەر ئەم پرسیارەم لەخۆم ئەکرد، ئەمە کێیە؟ بەقسەکردنیدا سوری بو، لەوەش نەئەچو لەکوردەکانی ئەوێبێ، داوام لیکرد خۆیم پێبناسێنێت. هەرنەوەندەی پێوتم کە ناوی (سمیر)ەو وتی لەهەلێکی تردا زیاتر خۆمت پێئەناسێنم هیوام وایە زوو زوو یەکتر ببینین!

چوومە کۆلیجی یاسا، چەند لاوێك بەکوردی قسەیان ئەکرد، خۆم پێناساندنو زانیم ئەوان ناوی منیان بیستبوو لەڕێگەی هەڵبەستەکانمو نوسینەکانمەوە لەگۆڤاری هیوادا، ئەوان هەموویان خەڵکی

ناوچەی هەولێر بوون و لەئاغاكانی دزەیی بون، ناویان: (حاجی، موحسن، كاكە، خدر) بو. لەگەڕەكی (أبورمانە) خانویەكیان گرتبو، من لەئوتێل بوم، بەڵام گەڵ شەو لەخانووەكەی ئەواندا كۆڕمان گەرم بو، هەواڵی سەمیرم لێ پرسین وتیان نایناسین.

• بەو درەنگ كاتە هیچ سوودێكت لەو ساڵەی خوێندن وەرگرت؟

– دەستوری ئەو كۆلیجی یاسایە وەك لای خۆمان نەبو، ئەو پۆلەی من زیاتر لەهەزار خوێندكاری تێدابو، وانەكانمان لەهۆڵێكی زۆر گەورەدا ئەخوێند. مامۆستا لەسەر شانۆیەكەوە بە میكرۆفۆن وانەكەی خۆی ئەوتەوە، ساڵی یەك ئیمتیحان هەبو وەك یەكەلۆری. هەموو وانەو سەرچاوەكانی ئەو ساڵەم پەیدا كردو خۆم بۆ تاقیكردنەوە ئامادەكرد. بەڵام بەر لەتاقیكردنەوەكە، لەبەغداد بریارێك دەرچوو هەموو خوێندكارانی عێراقی لەوڵاتە عەرەبییەكان ئەتوانن خۆیان بگوێزنەوە بۆ زانكۆی بەغداد. بەپەلە منو برادەرە دزەییەكانم خۆمان گواستەوە بۆ كۆلیجی ماف (حقوق)ی بەغداو لەوێ تاقیكراینەوەو دەرچووم بۆ پۆلی دووەم.

• هیچ یادەوەرییەكی سیاسیتان هەیە لەشام؟

– من وەك وتم، ماوەی مانەوەم ئەو ساڵە لەشام زۆر نەبو، بەڵام لەگەڵ ئەو ماوە كورتەشدا، توانیم دۆستایەتی لەگەڵ ژمارەیەك لەخوێندكارە كوردەكانی رۆژئاوای كوردستان كە لەدیمەشق ئەیانخوێند پەیدابكەم. بۆ ئاهەنگی نەورۆزی ئەو ساڵە بەنهێنی نزیكەی پەنجا خوێندكارێك چووینە ماڵێكو لەوێ دوای گوێگرتن لەهەندێك وتارو هەڵبەست لەبارەی نەورۆزەوە، بڵاوەمان لێكرد.

• ئەی دوایی، ئەو سەمیرە ئاشكرا نەبوو كێیە؟

– بەڵێ لەگەڵ سەمیردا زوو زوو یەكترمان ئەدی، بۆی باسكردم كە ئەو عەرەبەو خەڵكی سووریایەو ماوەیەك لەزانكۆی بەغداد خوێندكاربووە، بەڵام لەبەر هۆی سیاسی دەریانكردووەو ناردوویانەتەوە بۆ سوریا، ئنجا ئەوەشی بۆ باسكردم كە ئەو عاشقی ئەو كچەبووە كە یەكەم رۆژ هەواڵی ئەوی لێپرسیم! ! دیاربوو شەیداییەكەی بۆ ئەو كچە، لەناخی دەرونیەوە بو، هەمو جارێك كە ناوی ئەهێنا، هەناسەیەكی سارديشی بۆ هەڵئەكێشا. لەڕاستیشدا ئەو كچە لەشاجوانەكانی زانكۆی بەغداد بو، قەدەریش وای كرد شوو بكات بەعەرەبێكی خەڵكی بەغداد! !

• چۆن وڵرات بێتەوە بەغداد لەكاتێكدا بەدەمسبەستەی سەفارەتی عێراقی لەسوریا دەركرابێت!!

– ئەو كاتەی قاسم فەرمانڕەوابو، دەزگا مخابەراتییەكانی رژێم، ئەوەندە هۆشیارو زانیار نەبو، گەڵ شتی وایان بەسەردا تێنەپەڕی. جگە لەوە، دەركردنەكەی ئێمە تەنیا لەسەر بنچینەی گومانبو. هیچ بەڵگەیەكی نوسراومان لەسەر نەبو. ئنجا لەو تەمەنی لاوییەشدا، گەڵ موجازەفەی لەوە ترسناكترم ئەنجامئەدا بێئەوەی حسابێك بۆ سەلامەتیی خۆم بكەم.

• وەكو چی؟

– وەكو زۆرشت، لەوانە:

أ– ئەندامی سەركردایەتی كاژێك بووم، لێپرسراوی بەغدادیش بوم، كە گەیشتمەوە بەغداد، ئیتر من نامە نهێنییەكانم بۆ ئەبەر ئەنارد.

ب- هەندێك ئامێری چاپخانەیكی بچووكم بۆ كاژێك كڕیو لەو ژوورەدا كە گرتبووم بۆ خۆم لەماڵێكدا لەناوچەی حەیدەرخانە، ماوەی دوو مانگێك دامنا. خاوەن ماڵەكەش خێزانێكی كەربەلایی بوون و بەوەیان نەزانی! تا هاوبیران فایەق عارفو مەحمودی حاجیو ئەنوەری كەریمە فەنی ڕۆژێك بەجێبێكی لاندرۆڤەرەوە لەسلێمانیەوە هاتن بۆ چاپخانەكە. هەر لەبەردەرگای ماڵەكەدا پارچەكانی چاپخانەكەمان لەجێبەكەدا قایمكرد، هەندێك پارچەیمان بەست بەژێر جێبەكەوە. ئەوانیش مەردانەو بێترس گەیاندیانەوە سلێمانی.

ج- ساڵی ١٩٦٠ كە دیوانی هەڵبەستەكانم بەناوی (كوردایەتی بیروباوەڕمانە، ئامانجی نزیك و دوورمانە)م چاپكرد. بەرگی ئەو دیوانەم بەئالای چوار ڕەنگی كوردستان ڕازاندەوە. دیوانەكەم لەچاپخانەی (النجاح) چاپكرد. لەڕێی كارمەندانی چاپخانەكەوە هەواڵی ئەو بەرگە گەیشتبووە میری. بەر لەبڵاوكردنەوەی دیوانەكە، خوالێخۆشبوو عەزیز خانەقا كە ئەوسا لێپرسراوی ڕەقابەی چاپەمەنیی كوردی بو لەوەزارەتی ئیرشاد، بەهەڵەداوان منی لەدوكانەكەی بەشیر موشیر دۆزییەوەو وتی ئەوە چینكردووە؟ ئیتر كە زانیم كارەكەی من بۆ ئەویش مەترسییەك دروست ئەكات، چوومە چاپخانەو بەرگەكانم گۆڕی، بەلام ڕۆژی ئالاكەم هێشتەوە. لەو كاتەشەوە، هەموو چاپكراوەكانم بەوێنەی (ڕۆژ) ڕازاوەتەوە وەك هێمایەك بۆ ڕۆژی سەر ئالای كوردستان و وەك نیشانەیەكیش بۆ پیرۆزیی ڕۆژ لەئایینە دێرینەكانی نەتەوەی كوردو وەك سومبولێك بۆ گەشبینی. لەو بەرهەمانە: ١-جولنی ١٩٨٢ و ٢-هەڵبەستەكانی ژیر ١٩٩٢و ٣-گەورەپیاو ١٩٩٢ و ٤-كوردایەتیو دەوڵەتێكی كوردیی سەربەخۆ ١٩٩٤ و ٥-أفكار ٢٠٠٢ و كوردایەتیو سەربەخۆیی ٢٠٠٢.

بەو جۆرە لەبەغداد گوزەرانم تا كۆلێجی یاسام ساڵی ١٩٦٦ تەواوكرد.

**كۆلیجی ماف لەبەغداد ١٩٦٦**

**• جگە لەخوێندن، خەریکی چیتر بوون لەبەغدادا؟**

– گەلێ ئیشیتر، ساڵەکانی ١٩٥٧ و ١٩٥٨ سەرپەرشتیی گۆڤاری هیوام ئەکرد لەگەڵ خوالێخۆشبوو مامۆستا کەریم زانستیو مامۆستا محەمەد نوری عارفو مامۆستا حافظ قازیو ماوەیەکی کەمیش مامۆستا نەسرین فەخری. لەرادیۆی کوردی بەغداد بەرنامەیەکی وێژەییم هەبو، دوای ئەوە لەکۆمپانیای مەوادی بیناتی دامەزرام وەك فەرمانبەرێك. ساڵێك لەپەیمانگەی هونەرەجوانەکانی بەغداد خوێندم. بەدەم ئەو کارانەو خوێندنی کۆلێجیشەوە هەشت کۆرس زمانی ئینگلیزیم لەپەیمانگەی ئەمریکی لەبەغداد خوێند. یەك کۆرسی زمانی ئەڵمانی لەپەیمانگەی گۆتە لەبەغداد، ئنجا من لەو کاتانەدا کە بەو هەموو کارانەوە خەریکو ماندوبوم. خوالێخۆشبو رەشید عارف کە بەڕێوەبەری کۆمپانیاکەمان بو، وتی بەڵێنمداوە بەباڵیۆزی یوگوسلاڤی لەبەغداد کە تۆ دەرسی کوردیی پێبڵێیت! وتم کارم زۆرە ناتوانم. وتی بچۆ لەگەڵ خۆی قسە بکە، تازە من بەڵێنمداوەتێ. کە چووم بۆم رۆشنکردەوە من لەهەشتی بەیانیەوە تا درەنگکاتی شەو، بەکارو خوێندنو خوێندنەوەوە خەریکم. میستەر نیاز وتی من سوورم لەسەر فێربوونی زمانی کوردی، رەشید عارفیش ئەوەندە تاریفی تۆی بۆ کردووم. بەرۆکت بەرنادەم. وتم ئەی کات؟ وتی: شەشی بەیانیان!! ناچار داخوازییەکەیم جێبەجێکرد، ئەویش لەئەنجامدا، مانگی ٢٠ دیناری پێبەخشیم کە ئەو کاتە برێکی باشبو. تا بەوجۆرە ئەو هەموو کارانەم ئەنجام ئەدا سەرباری کارەکانی کاژێك.

**کۆلیجی ماف لەبەغداد ١٩٦٥**

• کەواتە بابگەڕێینەوە سەر کاژیك، کاژیك چی بەسەرهات؟

– کاژیك، ئەگەرچی لەسەرەتای دروستبوونیدا ژمارەیەك رۆشنبیرو خەڵکی تری لێکۆبوبوەوە. بەڵام ئەو ژمارەیە، ئەگەیشتە رادەیەك کە پارتییەکی وەك کاژێکی پێببڕێت بەڕێوەو سەرکەوتنی بۆ دەستەبەر بکات. هۆی ئەوەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم خاڵانە:

١- راستییەکەی ئەو کاتەی کاژیك دامەزرا ساڵی ١٩٥٩ و ئێستاش زەمینەی سەوزبوون و گەشەکردنی پارتییەکی نەتەوەیی باوەڕدار (عقائدی) وەك کاژیك لەناو کوردا دروستنەبوە. تا ئێستا، بزوتنەوە سیاسیە گشتیەکان. لەناو ئێمەدا لەخولگەی موسوڵمانێتی و مارکسیێتی و سۆزی کوردایەتی و بڕێوە دیموکراسییەکدا ئەسوڕێنەوە. ئەمانە هەر یەکەو پێشینەیەکی دێرینی هەیە. بەتایبەتی موسوڵمانێتی و مارکسیتیەکە کە هەردووکیان دووبیرۆکەی نێونەتەوەیی (أممی)ن هەریەکەو رەگێکی قووڵی بەناو بیری ژمارەیکی زۆر لەمرۆڤی کوردا داچاندووە. دیموکراسیش تەنیا وەك دەنگی دەمۆڵێکی دوور بەخۆشی بەر گوێی خەڵکی کوردستان کەوتووە. لەنزیکەوە کورد پێی ئاشنانەبووە. چونکە کورد خۆی ژێردەستەبوەو بواری ئەدراوە دیموکراسی پیادەکات. سەردەستەکانیشی فریان بەسەر دیموکراسی و مافی مرۆڤو حوکمی یاساوە نەبووە، ئەلەگەڵ ئێمەدا و نە لەناوخۆشیاندا. لەبەر ئەوە پیادەکردنی دیموکراسی لەپڕێکداو بێئەوەی کەشێکی گونجاوی بۆ ئامادەکەیت، ئەنجامدار نابێت، بۆیە من بەبڕوە دیموکراسی ناوم برد. بیری نەتەوەیش بەدەردێکی خراپتر لەدیموکراسی چووە لەناو کورددا لەدووروورەوە:

یەکەم: رووە گەشەکەی نەتەوایەتی دوور لەشۆڤێنی و فاشیتی، لەڕووی بیریاری (فکری)شەوە سامانێکە بیریارمان نەبووە وەك ئەوەی بیریارەکانی ئەڵمان نەتەوەی ئەڵمانیای پێگۆشکرد بەرلەوەی بیرۆکەی نەتەوایەتی بخەنە قاڵبی رێکخستنی پارتیانەوە. یا وەك جوولەکە کە ئاینەکەیان خستە خزمەتی نەتەوایەتییەکەیانەوە. یا وەك عەرەب کە ئیسلامەتی گەورەترین خزمەتی نەتەوەییانەی عەرەبی کرد.

کورد تەنیا لەڕووی سۆزەوە کوردایەتیی کردووە. واتا بێپێشینەیەکی بیریاریی وەك ئەو نەتەوانەی تر. لەبەرئەوە خەڵکی وەك پێویست لەدەوری کاژیك کۆنەبوونەوە.

٢- کاژیك خۆیشی خۆی کردبوە پارتیەکی هەڵبژاردە (حزب نخبوی) کە بوونە ئەندام لەکاژیکدا بۆ هەموو کەس نەبوو، ئەبوایە ئەندامێکی کاژیك هەموو مەرجەکانی جوامێری و خاوێنی تیابوایە کە ئەو جۆرە کەسە میسالیانە کەمن. لەبەر ئەوە کاژیك نەبووە پارتێکی جەماوەری.

٣- ئەوساو ئێستاش هەموو کەس ناوێرێ لەپارتییەکی وەك کاژیکدا کاربکات کە سەربەخۆیی و یەکخستنەوەی پارچەکانی کوردستان لەئامانجەکانی بێ. خەڵکی لەسەر داواکردنی مافێکی وەك رۆشنبیری ئەکوژران!

٤- ساڵی ١٩٦٤ کارەساتێکی دڵتەزێن لەسلێمانی روویدا کە بەکارەساتەکانی کانی ماسی ناوئەبرێ. کانی ماسی گوندێکە ئەکەوێتە دامێنی سلێمانەوە، ئەوساڵە شۆڕشی ئەیلول بەهۆی ئەوەوە لەوتووێژدا بو لەگەڵ رژێمی بەغداد، ئەو گوندە کرابووە بنکەیەکی شۆڕشو لێپرسینەوەی تیا ئەکرا

لەخەڵکی، هەر لەو ڕۆژگارەدا، ڕۆژێك ژمارەیەك شیوعی لەناو شاری سلێمانیدا بەناڕەوا کوژران. لەبارەی ئەو ڕووداوە دڵتەزێنەوە، من لەلاپەڕە هەشتی ژمارە ١٩٩١ی ڕۆژی ١٩٩٩/١١/٢ی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێدا، ئەوەم ڕوون کردۆتەوە کە کاژێك بەهیچ جۆرێك دەستی نەبووە لەو کارەساتەو لەڕوداوەکانی کانی ماسیدا، خاڵە حەمەش (محەمەدی عەزیز) کە ئەندامێکی سەرکردایەتی کاژێك بو، لەژمارە ٣ی ساڵی ١٩٩٩ی گۆڤاری باسکاردا کە لەلەندەن دەرئەچێت، بەدرێژی ئەو ڕووداوانەی ڕۆشنکردۆتەوەو ئەستۆپاکیی کاژێکی پیشاندلوە تیایاندا. بەلام ئەم ڕوونکردنەوانە لەدرەنگ کاتێکدا بون. سەردەمی ڕووداوەکانی کارەساتەکان بەپڕوپاگەندەی نەیاران خرانە ئەستۆی کاژێك. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی خەڵکی باری سەرنجێکی خراپ بەرامبەر کاژێك وەرگرێ‌و لێی کۆنەبنەوە.

٥- هەر نەیارانی کاژێك، ناوی گەلێ کەسی وەك دەربەگو کۆنەپەرستو پاشەڵپیس‌و گومانلێکراو پنهاوی بێگانەیان ئەخستە پاڵ سەرکردایەتی کاژێك. سەرکردایەتیە ڕاستیەکەی کاژێکیش، لەبەر تەوژمی زۆری نەیارانی کاژێك، نەئەکرا ناوی خۆیان ئاشکرا بکەن. لەلایەکیتریشەوە ئەو سەرکردایەتیە تا سەر لەپاڵ یەکدا نەمانەوە. ئیحسان فوئاد، بۆ گوزەرانندنی دوکتۆرا چو بۆ یەکێتی سۆڤیەت‌و پێشبڕاگەیاندین کە ئیتر ناتوانێ وەك ئەندامێکی سەرکردایەتیی بمێنێتەوە. جەمال نەبەزیش هەر بۆ دوکتۆرا ڕووی کردە ئەورووپا. خوالێخۆشبوان عەبدوڵڵا جەوهەرو فەرەیدون عەلی ئەمین هەریەکەو لەناوەختێکدا وازیان هێنا. خوالێخۆشبو شێخ محەمەد هەرسین‌و محەمەدی عەزیز کە چوونە پاڵ سەرۆك بارزانی، کاژێکیان بیرچووەوە. بەوجۆرە سەرکردایەتیەکە مایەوە هەردێ‌و عارف‌و ژیر، منیش لەبەغداد بوم، ئیتر کارەکە بەتەنیا بەو دوانە نەئەچوو بەڕێوە، پلەی خوالێخۆشبو عەبدولکەریم عارف بەرزکرایەوە بۆ سەرکردلیەتی، بەلام کەلێنەکان بەویش پڕنەکرانەوە.

هەموو ئەوانەش کاریگەریتی هەبو بۆ سەرنەکەوتنی کاژێك.

٦- لەڕووی داراییشەوە، کاژێك زۆر نەدارا بو جگە لەئابوونەی ئەندامەکانی، هیچ سەرچاوەیەکی دارایی نەبو.

٧- دوای بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلول، برەوی کاژێك وەك پێش شۆڕشەکە نەما. ئەو ترسەش ڕەوییەوە کە پارتی لەکوردایەتی لابدات. بەتایبەتی سەرکردایەتی پارتی لەچەپەکان پاکرابوونەوە. کەسێتی سەرۆك بارزانیش شاکۆڵەکەیەك بو بۆ ڕاگرتنی پارتی. خەڵکیش بەچاوی خۆیان ئەیاندی کە بارزانی‌و پارتی شۆڕشی چەکدارانە ئەکەن بۆ مافی کورد. ئیتر قسەی ئەزەریی کاژێك نەئەچووە بیری خەڵکیەوە، کاژێك خۆیشی زیاتر کوردایەتی لامەبەست بو وەك لەپارتایەتی. بۆیە کاژێك هەموو تواناکانی خۆی تێکەڵ بەشۆڕشەکە کرد. ئەو تێکەڵبوونە درێژەی کێشا تا هاوینی ١٩٧٤ کە کۆنفرانسی کاژێك لەشاری نەغەدە بەسترلو بڕیاری هەڵپساردنی کاژێکی تیادرا.

ئەمانە بەکورتی هۆی گەشەنەکردنی کاژێك بو وەك ڕێکخستن، هیوادارم لەهەولێکی تردا بەدرێژی بەو لایەنانەدا بچمەوە. تەنیا ئێستا ئەوەندە ئەڵێم کە کاژێك ئەگەرچی وەك ڕێکخستن سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا، بەلام وەك (بیر) سەرکەوتنی بەدەستهێنا. دوایی گەڕانەوەمان بۆ ئەم لایەنە ئەبێ.

**ڕۆژنامەی (تایم) ژمارە ٣٢ ڕۆژی ٢٠٠٢/١١/٣**

## وەڵامێکی کورت بۆ هاوڕێ ئەحمەد حامید

لەکامیل ژیرەوە

مامۆستا ئەحمەد حامد ــ ئەندامی کۆمیتەی پارێزگای سلێمانی حیزبی شیوعی کوردستان کە برادەرێکی خۆشەویست و دێرینمە، لەبارەی دیمانەکەی من لەڕۆژنامەی ڕێزداری تایم دا ئەڵێ: (چاوەڕوان نەبوم کاك کامیل کای کۆن بەبا بکات).

لەوەڵامدا ئەڵێم: من دەفتەری بیرەوەرییەکانی خۆمم بۆ تایم کردۆتەوە، دەی خۆکردنەوەی دەفتەرێکی لەو جۆرە، هەر ئەبێ کای کۆن بەبا کردن بێ، واتا گێڕانەوەی ڕووداوە کۆنەکان.. کاتێ ڕۆژنامەوانی بەڕێز پرسیارێکم ئاڕاستە ئەکات، ناکرێ بەڕاستی و بەئەمانەتەوە وەڵامی نەدەمەوە. من لەو دیمانەیەدا، تەنیا وەك ڕاگوزار بەلای حیزبی شیوعیدا تێپەڕم کردووە ژمارەیەکی کەم لەهەڵەکانیم باس کردووە، چونکە من تەنیا لەدەرگای هەندێ لەو لایەنانەم داوە کە پەیوەندیدار بوبون بەخودی خۆمەوە، وابزانم ئەوەش ئاشکرایە کە من باسی حیزبی شیوعی چلەکان و پەنجاکانم کردووە نەك هی دوای ئەو سەردەمانە، ئیتر ئەو حیزبە بەهەرناوێکەوە بووبێ، ئێمە کاتێ سەرکردایەتی پاسۆکمان، لەپێش ساڵەکانی ڕاپەڕیندا، لەناوچەی ئۆکان بو، دۆستایەتی و هەروەزییەکی زۆرمان هەبو لەگەڵ حیزبی شیوعیدا، هەموو لایەنە سیاسییەکانیش، هاوپەیمان و هاوسەنگەربون لەبەرەی کوردستانیدا. ئێستاش هاوبیرانی ئەتەوەیی کە خەریکی پڕۆژەی کۆنگرەی نیشتمانی باشووری کوردستانن، نامەی هاوکارییان ئاڕاستەی ژمارەیەك لایەنی سیاسی کردووە، یەکێك لەو لایەنانە، حیزبی شیوعی کوردستانە. لەبارەی ئەوەشەوە کە مامۆستا ئەحمەد ئەڵێ: (نەبیستووە من شیوعیی بوبم و من هەر بەنەتەوایەتی خوازی توندڕەو ناسرابم)، ئەوە قسەیەکی ڕاستە من خۆشم لەبیرەوەرییەکانمدا هەر وتوومە وەك بیروباوەڕ شیوعی نەبووم، بەڵام لەحیزبی شیوعیدا بوم. لەسەر ئەو حیزبە چەندجار زینـدانی کراوم، ساڵی ١٩٥٤/١٩٥٥ نەفی کرام بۆ شوعەیبە. ساڵی ١٩٥٧/١٩٥٨ نەفی کرام بۆ ئەبوغرێب. شایەتەکانی ئەم ڕاستیانە، ئەوانەی کە ماون ئەم بەڕێزانەن: قادری میرزا کەریم، جەزای میرزا حسەین، دکتۆر فوئادی مەجید بەگ، جگە لەوانە، بەڕێز دکتۆر کەمال فوئاد کە ساڵی ١٩٥٦ لێپرسراوی سلێمانی حیزبی شیوعی بو، لەیادی چلوشەش ساڵەی کۆچی دوایی مەلیك مەحمودا لەلاپەڕە (١١)ی ژمارە (٤٩٥)ی ڕۆژی ٢٠٠٢/١٠/١٨ ڕۆژنامەی الاتحادا ئەڵێ: "بعد ما علمت الشرطة بأن الطلبة ينشدون قصيدة گۆران حول الشيخ محود من مكبرة الجامع الكبير بلحن شجي مؤثر استمر حتى المساء، حاولوا القاء القبض على المنشدين ومنهم الأستاذ (كامل ژير) الذي كان في ذلك الوقت مع التنظيم الطلابي للحزب الشيوعي، لكنهم استطاعوا الافلات من ايدي الشرطة، وحسبما لتذكر فأن الأستاذ (كامل ژير) القي القبض عليه في ذلك المساء نفسه). ئنجا هەموو ئەمانە ڕێگە لەوە ناگرن باسی هەڵەکانی ڕابوردومان بکەین. بەپێچەوانەوە، دەرخستنی هەڵەکانی ڕابوردوو، ڕاستکردنەوە ئەنجام ئەدەن بۆ ئێستاو ئایندە. نەئەبو مامۆستا ئەحمەد بەرگری لەو هەڵانە بکات یا پاساویان بۆ بێنێتەوە، ئێمەش کە ئەو هەڵانەمان بەباکردووە، هەڵەکانی خۆشمان نەشاردۆتەوەو نایان شارینەوە. ڕێزیشمان

بۆ ئەو لایەنە ئیجابیانەی حیزبی شیوعی هەیە کە مامۆستا ئەحمەد لە وتارەکەی ژمارە ٣١ی رۆژی ١٨/١٠/٢٠٠٢ی تایم دا هێنای بۆ کردوون. لەوانەش گرنگتر بەلای ئێمەوە ئەوەیە کە شیوعیەکانی کوردستان خۆیان لەعێراقچێتی دەربازکردووەو بوونەتە حیزبی شیوعی کوردستان‌و یەکێك لەو ئامانجانەیان کە ئاشکرای ئەکەن، سەربەخۆیی کوردستانە. ئایا ئەم ئاراستە راستکارانەی هاوڕێیانی شیوعی، ئەمانەش هەر بەلگەی ئەوە نین کە ئاراستە جیاوازەکانی ئەوسایان هەڵەبوون؟ بۆ نمونە: ئەوسا کورد بەپێی بۆچوونی ئەوان نەتەوە (أمة) نەبو، ئێستا نەتەوەیەکی رەسەنە. ئەوسا کوردایەتی قۆناغ بو، ئێستا رەوتێکی دروستی بەردەوامە، ئەوسا هاوڕێ حەمە کوردایەتییەکەی منی بەلاوە کۆنەپەرستی بو، ئێستا هاوڕێ ئەحمەد ئەڵێ: (بەش بەحاڵی خۆم لەسەر ئەو سوربوون‌و پێداگیرتنەی سەبارەت بەنەتەوایەتی خوازییەکەی پیرۆزبایی لێ ئەکەم)، ئەوسا حیزبی شیوعیی عێراقی، ئێستا کوردستانی، ئەوسا معاریفی قلیاسان، ئێستا سەربەخۆیی کوردستان.. ئیتر ئا بەو جۆرە. خۆ ناشێ بڵێین ئەو ئاراستە جیاوازانە هەموویان هەر راستبوون!! چونکە بانی کوردستان هەریەك هەوایەو هەر یەك هەوا بووە.

لەپێشوازی رۆژنامەنووسێکی بیانیدا لەبارەگای پاسۆك.

لەراستەوە:

* مامۆستا سەعد
* د. مەحمود
* د. عەبدوڵڵا ئاگرین
* کامیل ژیر

**ڕۆژنامەی (تایم) ژمارە ٣٢ ڕۆژی ٢٠٠٢/١١/٣**

**هەرکات پارتی‌و یەکێتی لەیەکنزیکنەبنەوە، پارتییە بچوکەکان پشتگوێنەخەن، کە لەیەکیش دوورنەکەونەوە گرنگیان پێنەدەن.**

**لەم ئەڵقەیەشدا کامیل ژیر درێژە بەگێرانەوەی بیرەوەرییەکانی دەدات، باس لەکێشەکانی بەرەدەم‌و پاسۆک‌و پاشان یەکگرتن دەکات.**

**• باناوڕێک لەپاسۆکیش بدەینەوە؟**

– بەڵێ، بەڵام باجارێ شتێکی تریش لەبارەی کاژیکەوە بڵێین.. دوای ئەوەی بەبڕیارێکی کۆنفرانسی نەغەدە، چالاکیەکانی کاژیکمان هەڵپسارد، ژمارەیەک کوڕوکاڵی بێ ئاگا لەو کۆنفرانسەو نەشارەزا لەسەرکردایەتی کاژیک، بەهاندانی حیزبی شیوعی قیادە مەرکەزی، بەیانێکیان لەدژی سەرکردایەتی کاژیک نوسیبی‌و بڵاوکردەوە. گوایە ئەوان سەرکردایەتی کاژیکیان لەکارخستووەو خۆیان کردۆتە سەرکردایەتی کاژیک. بەڵگە بۆ نەشارەزاییان، ناوی هەندێ کەسیان بردبو کە گوایە ئەوان لەسەرکردایەتی کاژیکدان، کەچی لەڕاستیدا ئەوانە هەر پەیوەندیداریش نەبوون بەکاژیکەوە.

**• ئەوەی ناوی ئێوەی تێدا نەبو؟**

– با ناوی هەندێ لەئێمەشی تێدابو، بەڵام نەک هەموومان.

**• وەڵامتان دانەوە؟**

– نەخێر، چونکە ئێمە لەلایەک کاژیکمات هەڵپساردبو، لەلایەکی تریشەوە نەمانزانی ئەوانە بڵقێکی سەرئاون‌و هیچیتر. لەڕاستیشدا هەروادەرچوو. زۆری نەبرد لەناوخۆیاندا تێکچوون‌و هەریەک بەلایەکدا چوو، دوای ئەوەو هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، ژمارەیەک لاویتر، لە ١٩٧٥/٩/١١دا پاسۆکیان دامەزراند.

**• بەپرسی ئێوە؟**

– نەخێر، چونکە هەندێکیان لەوانەبوون کە بەیانەکەیان دژمان دەرکرد، ئەو چەند کەسە لەگەڵ پاسۆکیشدا زۆر نەمانەوەو بڵاوەیان لێکرد.

**• وەکو کێ؟**

– وەکو شێرکۆی هەژار، فەرهاد پاڵەوان، حسەینی شێخ محەمەد، ئەوانی تریان وەک ئازاد مستەفاو ملازم کەریم زۆری نەبرد، کەوتنە نامەناردن‌و پەیوەندی بەئێمەوە کە هاوکاریان بکەین. ئەو کاتە من‌و مامۆستا فایەق عارف گەڕابووینەوە سلێمانی، مامۆستا ئەحمەد هەردی هەر لەنەغەدە مابەوە. دکتۆر جەمال نەبەزیش لەئەڵمانیا. هەردی هاوکاری ڕاستەوخۆیکردن‌و ماوەیەکیش بو بەسکرتێری پاسۆک، بەڵام لەگەڵیان نەگونجاو وازی لێهانین. دووجار نامەیان بۆ من نوسی کە هاوکاریان بکەم، هەردوو نامەکە بەهۆی مەلا شوانەوە گەیشتە دەستم. منیش ئامادەیی خۆمم پیشاندا کە هاوکاریان بکەم، بەڵام زۆر بەنهێنی، چونکە من لەو کاتانەدا بەڕێوەبەری لقی کۆمپانیای زیوتی نەباتی بووم لەسلێمانی.

ماوەیەکیش بەڕێوەبەری کۆمپانیای ئەفریقی‌و دوای ئەو ماوەیەك بەڕێوەبەری کۆمپانیای مەوادی ئینشائی لەسلێمانی تا ساڵی ١٩٨٢ کە خۆم خانەنشین کردو بومە پارێزەر [*].

**• ئەو فەرمانبەرانەی دوای هەرەسی شۆڕش گەڕانەوە، زۆربەیان گواسترانەوە بۆ خواروی عێراق. چۆن لەسلێمانی مایتەوەو بوویشیتە بەڕێوەبەری ئەو کۆمپانیانە!**

–من بەر لەوەی پەیوەندیی بەشۆڕشەوە بکەم لەمانگی مارتی ١٩٧٤دا، خۆم هەر بەڕێوەبەری زیوتی نەباتی بوم لەسلێمانی. ئەو کاتە حاتم عبدالرشید کە زاوای احمد حسن بکر بو، بەڕێوەبەری گشتی زیوتی نەباتی بو لەبەغداد. حاتەم هاوکاری کۆلیجی حقوقم بو. برادەرلیەتیشمان خۆشبو ساڵەکانی ١٩٦٣ تا ١٩٦٦ لەبەغداد. پێکەوە حقوقمان تەواوکرد. هەر ئەویش کردمی بەبەڕێوەبەری زیوتی نەباتی لەسلێمانی ساڵی ١٩٧١. ئیتر ساڵی ١٩٧٤ کە بڕیارمدا پەیوەندی بەشۆڕشی ئەیلولەوە بکەم، هاتم هەرچی مەوادی زیوت هەبو فرۆشتم. سەرجەمی پارەکەی گەیشتە (١٣٠) سەدوسی هەزار دینار، ئەو کاتە ئەو پارەیە یەجگار زۆربوو، خەڵکی وا هەبو لەفەرمانبەرلن هەزار دینار لەقاسەکەی دائیرەکەیدا هەبوو ئەیخستە گیرفانی‌و ئەوسا ئەچووە ناو شۆڕش!

بەڵام من ئەو سەدوسی هەزارەم برد بۆ بانق. ئەوسا حاجی ئەکرەم‌و دلاوەر مەجید، ئەمین سنوق بون، زۆر سەریانسوڕما لەو هەموو پارەیە. ئنجا نامەیەکم بۆ حاتەم نوسیی لەگەڵ تەسیمەی پارەکەدا بەپۆستەدا ناردم بۆ حاتەم. لەنامەکەدا نوسیم: (من ئەرکی نیشتمانی‌و نەتەوەیی پاڵی پێوەنام کە بچمە ناو شۆڕشی میللەتەکەمەوە. ئەرکی ئەخلاقی‌و برادەرلیەتیش وای لێکردم کە خیانەت لەوەزیفەکەم نەکەم، بۆیە وا هەموو مەوادەکانی شەریکەم فرۆشتو پارەکەم بۆ خستنە بانقەوە).

حاتەم نامەکەی بردبو بۆ خەزوری ئەحمەد حەسەن بەکرو پێی وتبوو من فەرمانبەری وا پاکم هەیە. ئیتر دوای گەڕانەوەم حاتەم هاتە سلێمانی‌و سەردانی کردم‌و وتی تۆ لەجێگەی خۆت ئەمێنیتەوەو نایەڵم نەقڵت بکەن بۆ جنوب. هەرواش بو، ماوەیەك نەقڵ کرام بۆ شەریکەی ئەفریقی لەسلێمانی. دوایی گەڕامەوە بۆ زیوت، ئنجا زیوتو مەوادی غیزائی لەیەکدرلو من گوێزرامەوە بۆ مەوادی ئینشائی لەسلێمانی.

لەو ماوانەدا بەردەوام مەلا شوان.لەهاتوچۆدا بو، چاپکراوەکانی پاسۆکی بۆ ئەهێنام‌و منیش راسپاردەکانی خۆمم ئەنارد بۆ سەرکردلیەتی پاسۆك لەگەڵ هەندێك نوسینمدا. یوسفە لچە لەمەوادی ئینشائی پاسەوان بو، زوو زوو داوای مۆڵەتی ئەکرد. ئەمزانی ئەچێ بۆ سەرکردایەتی پاسۆك، رۆژێك پێموت بۆ ئەوێ ئەچیت. یوسف زۆر ترسا. وتم مەترسە منیش هەوم. ئیتر یوسفیش هەموو جارێ

---

[*] بەهەمان شێوە لەپاسۆکەوە نامەیان بۆ کاك عەبدوڵا ئاگرینیش نوسی، جێی خۆیەتی لێرەدا ئەو راستییە بڵێم کە ئەو قسانەی لەم دواییەدا، لەهەندەرانەوە، بۆ کاك عەبدوڵا هەڵبەسترا، دوور بوون لەراستیەوە، ئێمە (منو ئاگرین‌و کاك مژدە تایەر) لەناو شاری سلێمانیدا هەمیشە هاوبیرو هاوکاری یەکتر بووین تاڕاپەڕینیش، ئەوە بوو دوای راپەڕین، لەگەڵ هاوبیران مولازم کەریم‌و مولازم شوان، مەکتەبی سیاسیی پاسۆکمان ئاشکرا کرد.

نوسینەکانی پاسۆکی بۆ ئەهێنام. فریای ژنبرام ئەندامێکی چالاکی پاسۆك بو لەناو شاری سلێمانیدا. لەگەڵ ئەویشدا لەیەك ئاشکرا بووین. جارێك کتێبێکی عەرەبی بۆ هێنام لای ئەوانەوە کە بۆیان وەرگێڕم بۆ کوردی. کتێبەکە ناوی (الأسس) بو لەنوسینی دکتۆر عصمت سیف الدولة. دوای تێکدانی گوندەکانو ئەنفال، بەحەمە سالح هۆشمەندا ئەو هەڵبەستەم بۆ ناردن کە لەسەر گوندەکانو ئەنفال وتبووم، ئەمە هەندێکێتی:

ئەو گوندانە مەڕوخێنن

ئەو گوندانە مەسووتێنن

بەبێ وەرە، لەدووکەڵی ئەو گوندانە زیرە مەکەن

لەبەرپووری، تۆپی دەستی نامەردانە ئاگر مەدەن

ئەگەر سزای ئەو گوندانە سووتاندنە، چونکە گوندی جۆرە خەڵکێکی نەبەردن

کورە کوڕەی ئەو گوندانە، وان لەچیا، ئەڵێن ئێوە ئەگەر ئازان، ئەگەر مەردن

وەرن ئێمە جەنگاوەرین، دروستکەری ئەو گوندانەین، وەرن وەرن

ئێمەین گیانو چاوودەستی ئەو گوندانە، بەخەی ئێمەی لەسەر بگرن

وەرن لەمەیدانی جەنگدا دەرنەکەوێ کێ سوارییە، کێ پیادەیە.

کێ لەسەر مافی نەتەوەی، لەگەڵ ئێوەی ترسنۆکا، یەك بەدەیە

ئەگەر کێشەی ناڕەواتان، دەستەویەخە، لەمەیدانو کۆڕی جەنگدا

لەگەڵ ئەو خاوەن گوندانە، یا لەتاوان دەست هەڵگرتن، ئەنجام نەدەن

ئەوا لەجێی ئەو گوندانە، ئەو مەردانە، کە دەستێکیان پیادائێنان

لەکەللەی سەری پەڕیوتان، گوندی جوانو رازاوەتر دروست ئەکەن.

پێشبینیەکانی ئەم هەڵبەستە هاتنەدی، ئەوەبوو لەراپەڕیندا کەللەی سەریانپەڕیو گوندەکانیش تازەکرانەوە. ساڵی ١٩٩١ دوای راپەڕین، لەسلێمانی سەرکردایەتیەکی تازەمان پێکهێنا. ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پاسۆك بریتی بوین، لە: مولازم کەریم، مولازم شوان، مژدە تایەر، عەبدوڵلا ئاگرین، کامل ژیر.

لەهەموو شاروشارۆچکەکاندا لەسلێمانیەوە تا دهۆك بارەگامان کردەوە. هەموو بارەگاکان پڕ چەکو پڕ پێشمەرگە ون، ئەو کاتە ئێمە ٤٪ سەدی چواری دلهاتی گومرگمان بەرئەکەوت. بەو رێژە کەمە ئیدارەمان ئەکردو پاشەکەوتیشمان هەبو، بەلام لەچاو پارتیو یەکێتیدا جەماوەرێکی ئەوتۆمان نەبو. بۆیە بۆ هەڵبژاردنەکەی ١٩٩٢ لەگەڵ حسکدا لیستەیەکی هاوبەشمان پێکهێنا، کەچی تەنیا (٢,٥٧٢٪) دەنگمان هێنا.

• **واتا نەبوونە خاوەنی هیچ کورسیەك لەپەرلەماندا؟**

– ئەگەر مەرجە رێژەی ٧٪ نەبوایە، دوو تا سێ نوێنەرمان ئەبو لەپەرلەماندا، شیوعیش دوو نوێنەر. ئیسلامی چوار، گەل یەك تا دوو.

**• ئەو ڕێژەی ٧٪ بۆ؟**

– ڕاستییەکەی ئەوە پیلانێك بو دژی پارتییە بچوکەکان، بەڵام دوایی ئەنجامەکەی بەسەر پارتیو یەکێتیدا شکایەوە.

**• چۆن؟**

– ئەگەر ئەو ڕێژەیە نەبوایە، کێشەی پەنجا بەپەنجا دروست نەئەبو، ئاشکراشە کە یەکێك لەهۆکانی شەڕی ناوخۆ، کێشەی پەنجا بەپەنجا بو، تۆ تا دە نوێنەری ئەو حیزبانە لەپەرلەماندا بوونایە، کێشی هێزەکان ئەگۆڕا. بەتاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە هەر کات پارتیو یەکێتی لەیك نزیك ئەبنەوە، پارتییە بچووکەکان پشتگوێ ئەخەن، کە لەیەکیش دوورئەکەونەوە، گرنگیان پێئەدەن. ئەوەش دیاردەیەکی ڕاست نیە، ڕاست ئەوەیە هەمیشە یەك هەڵوێستی نەگۆڕیان هەبێ بەرامبەریان.

**• بەڵگەتان؟**

– دوای هەڵبژاردنو ڕێکەوتنی یەکێتیو پارتی لەسەر پەنجا بەپەنجا، داهاتی گومرگیان لەپارتییەکانی تر بڕی. کە تێکچوون لەجاران زیاتر لایان لێکردنەوە. ئەو بڕینی پارەی گومرگە لەپاسۆك، کاریگەرێتییەکی خراپی کردە سەرمان. چونکە پاسۆك جگە لەو پارەی گومرگە، هیچ داهاتێکی تری نەبو بەپێچەوانەی هەندێ لایەنی ترەوە!! جگە لەوە، دیاردەی هەڵگێڕانەوەی هەندێ لەکادرە سەربازییەکانمان بەخۆیانو چەکو ئوتومبیلەوە دەستپێکرد. ئێمەش مەسرەفمان قورسی بەستبو. ناچار کەوتینە بیرکردنەوە بۆ چارەسەری ئەو تەنگژەیە. پێشنیاری من ئەوەبو کە لەو بارودۆخەدا تەنیا خەباتی سیاسی بکەین. وتم ئەو بڕە پارەیەی ماومانە لەگەڵ پارەی ئەو ئوتومبیلو چەکانەی هەمانە ئەگەر پێویستی کرد بیانفرۆشین، ئەوا چەند ساڵێك پاسۆکی پێئەژی. چونکە لەلایەك مەسرەفی ئەو ئوتومبیلو بنکەسەربازیانەمان لەسەر نامێنێ، لەلایەکی تریشەوە دیاردەی ئەو ئوتومبیلو چەك ڕفاندنەش نامێنێ. دەستیشمان ڕەهاتر ئەبێ بۆ خەباتی بیرمەندیانە بەتایبەتی ئێمە خۆمان هەر پارتییەکی نەتەوەیی باوەڕدار (عقائدی) بووین، بەڵام بەداخەوە ئەم پێشنیارە پەسەندنەکرا[*].

**• لەلایەن کێوە؟**

– لەلایەن سەربازکارەکانمانەوە. ئنجا ئەو گوشارە خراپە سەرپارتییە بچووکەکانی تریش وەك حسكو گەل. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی بیرۆکەی یەکگرتنی ئەو سێ پارتییە بێتەئاراوە بەتایبەتی دوای دەنگنەهێنانیان لەهەڵبژاردندا.

**• ئایا ئەو دەنگە کەمانەی ئێوەو لەهەمان کاتدا ئەو دەنگە زۆرەی یەکێتیو پارتی، نیشانەی ئەوە نەبوو کە جەماوەر ڕەمزی ئێوەی کردووەو ئەوانی ویستووە؟**

– تاڕادەیەك ئەشێ وابووبێ، بەڵام ئەوە هەموو نهێنیی مەسەلەکە نیە، ڕاستیەکەی ئەو سێ پارتیە بەو ڕادەیە بێجەماوەر نەبون، بەتایبەتی پاسۆك. پاسۆك ناوبانگێکی باشی هەبو. ئەو جەماوەرەش کە

---

[*] هەردو بەڕێز عەلی بەگی جافو بەختیاری شەوکەت، شایەتی ئەو پێشنیارەی منن.

لەدەوری پاسۆك بو، زۆر لەو دەنگانە زیاتر بون. بەلام بەربەربەكانی نێوان پارتی‌و یەكێتی بەرادەیەك لەناو جەماوەردا رەنگیدابووەوە كە تێكرای خەڵكەكەشی كردبو بەدوو كەرتەوە بەجەماوەری پارتییە بچوكەكانیشەوە. هەندێ لەخەڵكەكە وای لێهاتبوو كە دەنگی بۆ ئەملا ئەدا بۆ ئەوەی ئەولا سەرنەكەوێ. یا دەنگی بۆ ئەولا ئەدا بۆ ئەوەی ئەملا سەرنەكەوێ. دوای هەڵبژاردن من لەهەندێك لەئەندامەكانی پاسۆك‌و حسكم پرسی كە دەنگیان بۆ پارتی یا بۆ یەكێتی داوە؟ كە ئەچوومە بنچو بناوانی وەلامە سەیرەكە، بۆم دەرئەكەوت كە هۆ، هەر ئەوەبو كە باسم كرد. ئنجا دیاردەی تەزویرو چەندجار دەنگدان بەهۆی سرینەوەی مەرەكەبە بێ كەڵكەكەوە، ئەوەش تارادەیەك هاوكیشەكەی گۆڕی. با پاڵەپەشتۆكەشمان بیرنەچێ. من نەك هەر خۆم‌و خێزان‌و كەسوكارم، بەڵكو ژمارەیەك لەپاڵێوراوەكانی تری لیستەكەی ئێمە، ئەوانیش خۆیان‌و خێزان‌و كەسوكاریان نەیانتوانی بگەنە سنوقەكان‌و دەنگبدەن. من كە ئەم قسانە ئەكەم. مەبەستم لەوە نیە كە بڵێم ئەگەر ئەو كۆسپ‌و دیاردانە نەبوایە، ئێمەش ئەوەندەی یەكێتی‌و پارتی دەنگمان ئەهێنا. مەبەستم ئەوەیە كە بەو رادەیە دەنگمان كەم نەئەبو.

راستییەكەی ئەو هۆكارە سەرەكیەی هێنام بۆ كرد لەبارەی بەئەنجامنەگەیشتنی كاژێكەوە، هەرهەمان هۆكاربو بۆ بەئەنجامنەگەیشتنی پاسۆكیش. ئەویش ئەوەیە كە بیروباوەڕی نەتەوایەتی هێشتا لەناو كوردا نەخەملیوە. ئەگینا ئەو هۆكارو رەخنانەی لەكاژێك ئەگیران وەك ئاشكرا نەبوونی سەركردەكانی، یا نەوێران بۆ چوونە ناو كاژێك، یا پروپاگەندەی كانی ماسی، یا كاریگەرێتی شۆڕشی ئەیلول.. هتد، ئەوانە بەرەنگاری پاسۆك نەبوونەوە، كەچی هەروەك پێویست خەڵكی لەدەوری كۆنەبوونەوە، چونكە بیروباوەڕەكە هێشتا بەتەواوی نەخەملیبو.

• ئەی دوایی.. پاسۆك چی بەسەرهات؟

— وەك وتم، پاسۆك‌و حسك زۆر لەیەكنزیكبوونەوە بۆ هەڵبژاردن لیستی هاوبەشیان هەبو، لیستی شین. دوای هەڵبژاردن، پارتی گەل بەسەرۆكایەتی بەرێز سامی عبدالرحمن، ئەوانیش هاتنە پاڵمان‌و بەهەرسێلا، حیزبی یەكگرتنمان پێكهێنا. حیزبی یەكگرتن هەر لەسەرەتای دروستبوونیەوە، خۆرەی مردنی خۆی پێبو!

* خۆرەی مردنی خۆی!!

— بەلێ، بابزانین چۆن؟

یەكەم، یەكێتی بیر، لەناو سەركردەكانی سێ پارتییەكەدا نەبو.

* دووەم: مەسەلەی سەرۆكایەتی (زەعامەت) كە دەردی زەبروەشێنەو زەبروەشێن بووە لەنەتەوەی كورد بەدرێژایی مێژووی سیاسیمان، لەحیزبی یەكگرتنیشدا كاری خراپی خۆی كرد. بەتایبەتی لەنێوان سەرۆكایەتی گەل‌و حسك دا. هەر دوای كۆنگرەی یەكگرتن رۆژانی ٢٠-١٩٩٢/٨/٢٧ ژمارەیەك لەوانەی دەنگیان كەمهێنا بۆ سەركردایەتی، وازیان لەحیزبە تازەكە (یەكگرتن) هێنا. ئەوانەش هەڵبژێردران، بەلام لەچاو هەندێكی تردا، دەنگەكانیان كەم بو.

**• وەکو کێ؟**

– وەکو خوالێخۆشبو رەسوڵ مامەند، شێخ محەمەدی شاکەلی، شیروان شێروەندی کە دوایی تێکەڵ بەیەکێتی نیشتمانی کوردستان بوون‌و هەریەکەشی ژمارەیەک لەکادران‌و جەماوەری حسکیان بەدواوەبو.

جێی خۆیەتی هەر لەمبارەیەوە نمونەیەکیتر بێنمەوە: لەکۆنگرەی یازدەی پارتیدا، دوای ئەوەی پارتی‌و یەکگرتن بون بەیەک، لەکاتی خۆپاڵاوتن بۆ سەرکردایەتی پارتی یەکگرتوو، یەکێك لەسەرکردەکانی حسك‌و یەکێك لەسەرکردەکانی گەل لێیان بو بەهەرا لەسەر ئەوەی ناوی کامیان لەسەر تەختەی رەش لەپێش ناوی کامیانەوە بنوسرێ!! هەر دوای کۆنگرەی یەکگرتن، بەڕێز دکتۆر مەحمود عوسمانیش وازی هێنا.

سێهەم: جگە لەوەی سەرچاوەی گومرگ لەهەرسێ حیزبەکە بڕابو، حسك‌و گەلیش بەگیرفانی بەتاڵەوە هاتنە ناو حیزبی یەکگرتنەوە. لەسەر ئەمە مشتومڕمان زۆربو. پاسۆك کە رێژەی گومرگی لەگەڵ‌و حسك زۆر کەمتربو، پاشەکەوتێکی باشی هەبو، کەچی ئەوان وتیان خاوەنی یەك فلس نین! لەوەڵامی ئەو قسەیەدا، من داوام لێکردن کە تۆماری حساباتیان بێنن‌و بەحساباتی هەرسێ پارتییەکەدا بچینەوە. کەچی گاڵتەیان بەقسەکەم هات‌و وتیان تۆماری چی؟ ئەوە لەکاتێکدا حساباتی پاسۆك هەمووی بەپێی تۆمارو وەسڵ‌و واژوو بوو تا رادەی فلس. ئیتر گەل‌و حسك چاویان بڕیە ئەو بڕە پارەیەی ئێمە مابوومان، ئێمەش بڕیارماندا کە یەك فلسیان نەدەینێ.

**• ئەی دوایی چیتان لەو پارانە کرد؟**

– ئێمە وەك وتم حساباتمان زۆر رێکوپێك بو، لەدوای راپەڕینەوە کە هاوڕێمان مولازم کەریم‌و مولازم شوان‌و ئەوانیتر لەشاخ هاتنەوە. ئەو پارانەی مابویان لەگەڵ خۆیان هێنایانەوە. دەستورێکی حساباتمان رێکخست. ماوەیەك هاوڕێ ئومێد‌و ماوەیەك هاوڕێ سمکۆ بوونە سندوق ئەمینی (خەزنەدار). دوای ئەوان خوالێخۆشبو مامۆستا هادی بو بەخەزنەدار. ئیتر پارەکان‌و هەندێك چەك‌و تەقەمەنی هەر لای مامۆستا هادی مانەوە تا دوای یەکگرتنیش لەگەڵ پارتیدا. ئەویش هەموو ئەوانەی لەماڵەکەی خۆیدا کە بەرامبەر لقی چواری سلێمانی بو، قایم کرد. خۆشی بو بەئەندامی لقی چواری پارتی، بەڵام لەکاتی شەڕی ناوخۆی مایسی ١٩٩٤دا، دایان بەسەر ماڵەکەی مامۆستا هادی دا‌و هەموویان برد. جگە لەو پارانە، پاسۆك نیوەی دەولجنێك‌و چاپخانەیەکەیشی لەسلێمانی کڕی. من ئاگاداری کڕینی دەواجنەکە نەبوم، بەڵام چاپخانەکە بەمن سپێردرا‌و لەلای دادنوسی سلێمانی بەناوی منەوە تۆمارکرا. من لەکاری چاپخانەدا شارەزاییم زۆربو، چاپخانەکەم هەستانەوە، هەر بەوردە دەستکەوتی چاپخانەکە، هەموو ئاتەوارییەکانیم تەواوکرد. وردە وردە یارمەتی ماڵە شەهیدەکانیشمان لێئەدا. ئێمە ئەو پارەو شتانەمان لای خۆمان هێشتەوە، وتمان بابزانین ئەو یەکگرتنانە بەچی ئەگات؟ بەڵام بەداخەوە دوای شەڕی ناوخۆ ئەوانە، بەچاپخانەکەشەوە، هەموویان دەستیان بەسەردا‌گیرا. بەڵام من چاپخانەکەم بەپێی لیستەو بەئیمزادا بەمامۆستا ئەحمەد لەیەکێتی نیشتمانی. ئەوانیش

چاپخانەکەیان گواستەوە بۆ گەڕەکی بەرلنان لەسلێمانیو ناویاننا (چاپخانەی کۆڕەو). شایانی وتنە من زۆر هاوارم کرد کە ئەوە هی پارتی نیە. بەلام کەس نەیبیست هاوبیر سەلام عەبدول کە محاسبی چاپخانەکە بو، گرتیان. سەیرم کرد ئەگەر منیش لەسەری بڕۆشتمایە ئەگیرام. ئیتر لەو کاتەدا هەر ئەوەندەم پێکرا تکای بەردانی سەلامیان لێ بکەم. ئەوانیش بەریاندا. ئەشێ لێرەدا ئەوەش بڵێم کە پێش گرتنی چاپخانەکە. واتا لەسەرەتای ١٩٩٤ ەوە هەموو شت بەرەو گرانیەکی خێراو زۆر ئەڕۆیشت، من لەگیرفانی خۆم بایی (١٢٠) سەدوبیست هەزار دینار کاغەزو کارتۆنم بۆ چاپخانەکە کڕی. وتم دوایی یا لەپاشۆکی وەرئەگرمەوە یا وردە وردە لەدەسکەوتی چاپخانەکە لەسەلام عەبدول وەرئەگرمەوە، بەلام فریا نەکەوتم لەهیچیانی وەرگرمەوەو ئەو پارەیەی منیش تیاچوو. من کۆڵنەدا، چەندجار هەوڵی وەرگرتنەوەی چاپخانەکەم دا. نامەم بۆ هەندێ لێپرسراوانی یەکێتی نوسی، لەوانە کاک نەوشیروان، کاک نەوشیروان وتی بچۆ شکاتیان لێ بکە !. منیش بەهۆی دادنوسی سلێمانیەوە ئینزارێکم بۆ مامۆستا ئەحمەدو بۆ لێپرسراوی بەشی دارایی نوسی، بەلام هیچ وەلامێکیان نەدامەوە.

بەو جۆرە کۆتایی بەپاسۆک هات. حیزبی یەکگرتنیش لەگەڵ پارتی یەکیان گرتو بەبڕیاری کۆنگرەی یازدە وشەی یەکگرتو خرایە دوای ناوی پارتییەوەو بوو بەپارتی دیموکراتی کوردستان — یەکگرتو. منیش لەکاتی ئەو کۆنگرەیەدا، لەگەڵ پارێزەران شیروان حەیدەریو کاکەڕەشو هەڤاڵێکیتر بەناوی نەجمەدین یوسفیەوە، کراینە لیژنەی لێپێچانەوە لەو شکاتانەی لەکۆنگرەدا دژی هەندێ لێپرسراوان بەرزکرایەوە. دوای تەواوکردنی ئەو کارە، ئیتر نەمن لەپارتیم پرسیەوە نەپارتیش لەمنی پرسیەوە تا دوای ٣١ی ئاب کە لقی چوار هاتەوە سلێمانیو کاک بروسک داوای گەڕانەوەی لێکردم. منیش دوو مەرجم دانا. ناوی حەفتا نوسەری هەژارم دانێ کە ئەبێ مانگانەیان بۆ ببڕنەوە. داواشم لێکردن کە سەنتەرێکی لێکۆڵینەوەی ستراتیجی لەلقی چوار بکەنەوەو من لەو سەنتەرەدا کاربکەم. بەلام فریای وەلام نەکەوتن. بروسکیش نامەکەی منی لەچاری مێزەکەیدا بەجێهێشت!! دوای ئەوە خۆم گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە من لەدەرەوەی حیزبایەتی ئەتوانم زیاتر خزمەت بکەم.

رۆژنامەی (تایم) ژمارە ٣٣ رۆژی ١٩/١١/ ٢٠٠٢

## بەشیر موشیر هەرگیز درۆی نەکردووە، راستیشی نەوتووە

• پرسیارەکان زۆرن، لەوانە: بۆچی کورد تائێستا قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆی نەبووە؟ چی بکرێ بۆ ئەو مەبەستە بەرای ئێوە؟ هەڵسەنگاندنی ئەو هەوڵانەی پێشتر دراون بۆ ئەو مەبەستە؟ ئایا سەربەخۆیی کوردستان کاریکردەیە؟ راتان بەرامبەر بەفیدراڵی؟ گەلێ پرسیاری تریش. بەڵام با جارێ هەڵوێستەیەک لەسەر مرۆڤێک بکەین کە زۆر کات ناوەکەی و قسەکانی و بیرۆکەکانی لەسەر زمانی گەلێ لەسیاسەتکارانی کوردە، لەوانە بەڕێزان د. کەمال فوئاد، د. جەمال نەبەز، د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ، د. ئیحسان فوئادو زۆر کەسیترو هەندێ گۆڤارو رۆژنامەش. بەتایبەتی گۆڤاری سیخوڕمە. لەلای ئێوەش بەهەمانشێوە. بەتایبەتی لەم دیمانەیەدا چەندجار ناوەکەی دووبارەبووەوە. ئەگەرێ ئێستا تیشکێکی زیاتر بخەنە سەر ئەم کەسێتیە؟ واتا بەشیر موشیر؟

– بەڵێ، من پارچەیەک هەڵبەستیشم بۆ وتووە.

• کامەیە؟

– ئەمە دەقەکەیەتی:

گەلێ ئازادیی لەیادو بیر بێ

خاوەنی رۆڵەی وەکو بەشیر بێ

بەشیر موشیر بێو کەلەڵو ژیر بێ

بۆ کوردستانی قەڵغانی شیر بێ

ئەو گەلە ئەبێ بگا بەئاوات

سەربەخۆ هەڵکا بەیداخی وڵات

• بۆ؟

– چونکە بەشیر خاوەنی خواستو ویستێکی پۆڵایین بو بۆ ئایندەی نەتەوەکەی.

• چۆن؟

– ئەم مرۆڤە شایستەی ئەوەیە زۆری لەسەر بنوسرێ، وەڵامی ئەو چۆنە؟ هەروا بەئاسانی نادرێتەوە! من نزیکەی حەوت ساڵی تەمەنم، رۆژی چەند کاتژمێرێك لەگەڵ ئەودا بەسەربرد، جێی خۆیەتی لەم بیرەوەریانەمداو لەنێوان وەڵامی پرسیارەکانی بەڕێزتانەوە، بەکورتی بەخوێنەرە بەڕێزەکانی رۆژنامەی رێزداری (تایم)ی بناسێنم.

• خەڵکی کوێ بوو؟

– سلێمانی، لەبنەماڵەی موتابچییەکان، بەپێی ئەو سەرگوزشتانەی کە خۆی ئەیگێڕایەوە. لەدایکبووی دەوروبەری ساڵی ١٨٨٠ بو، ئەکرێ بەسەربازو لەسوپای عوسمانیدا تا پلەی (زابت قوماندلنی) ئەڕوات، دوای تێکچوونی عوسمانی، روونەکاتە بەغداد، لەحەیدەرخانە دوکانێکی خەیاتی دائەنێ، وەستاو شاگردی چاك رائەگرێو ناوبانگ دەرئەکات بەخاوەنی مەقەستی زێڕین. وەزیرە کوردەکانو کەسێتیە کوردەکان لەبەغداد، لای ئەو جلوبەرگ ئەدەن بەدرون. کە تێی ئەگەن دوکانەکەی ئەکەن بەدیوەخان.

• بۆچی ئاسایی نەبوو؟

– چونکە دوو کەسێتی لەم مرۆڤەدا کۆبووبوەوە! یەکێکیان کەسێکی ئاساییو نەخوێندەوارو بەرگدرویەك، ئەویتریان: بەلای خۆیەوە کەسێکی هەڵکەوتووی بەهرەدار، گەورەی هەموو کورد، زانا، نووسەر، فەیلەسوف، ئازا، جوان، جەوامێر.

• دوو کەسێتی!

– بەڵێ، ئەوە لەدەروونناسیو پزیشکناسیدا پێی ئەوترێ، جوتکەسێتی، ئەوە نەخۆشییەکی دەروونیە، تووشی زۆرکەس ئەبێ، جا هەیە کاردانەوەی ئەو نەخۆشیەی نێسکی سووك ئەکات وەکو بەشیر. هەیشە نێسکی تاڵ دەکات وەك هەزاران (شێرە چەواشە)ی بەشیری ئەم زەمانەیە. تۆ سەرنج بدە: رۆژی دەیان کەس ئەبینی کە هەریەکەو بەوەزیفەیەك، یا بەپلەو پایەیەکی پارتایەتی، فووی تێئەکرێو لەخۆی ئەگۆڕێو کاردانەوەی ئەم بارە دەروونیەشیان بەزیانئەگەڕێتەوە بۆ خەڵکی ترو بۆ کۆمەڵ. رۆتین زیادئەکەن. کۆسپ ئەخەنە رێی کاری رەوای خەڵکەوەو ئاوا لەم جۆرە ئەنجامانە، ئەوانەشیان کە هیچیان بەدەست نیە، یا هەر پۆزلێئەدەن، یا هەمیشە پیش ئەخۆنەوە.

* ئەی بەشیر؟

– بەشیر وا نەبوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئەو سوودی ئەگەیان، خۆشیو پێکەنینی ئەنجامئەدا.

• وەکو؟

– وەکو ئەوەی ئەو لەبەرگدرووتییەکەیدا دەسکەوتێکی زۆری هەبو، پێی دەوڵەمەند بو، خانووی پێکری. بەلام چونکە خۆی بەگەورەی کوردو زاناو نوسەرو فەیلەسوف ئەزانی، ئەیویست بەهەر رێگەیەك بێ خزمەتی نەتەوەکەی بکا. لەو پێناوەدا ولزی لەبەرگدرووتییەکەی هێناو دوکانەکەی کردە کتێبخانەیەك بۆ فرۆشتنی چاپەمەنیە کوردییەکان. لەهەمانکاتدا دوکانەکەی کردە ناوەندێکی کۆبوونەوەو یەکتربینینی سیاسەتکارانی کورد. ئنجا لاریی لەوەنەبو کە هەر کەسێك نەیوێرایە کتێبێك یا وتارێك یا هەڵبەستێك بەناوی خۆیەوە چاپو بڵاوبکاتەوە، ئەو ئامادەبوو بەناوی خۆیەوە بڵاوی ئەکردەوەو لەسەر حسابی خۆی چاپی ئەکرد. ئەم پەڕاوانەی چاپکرد: سێپارەی هەق پەرستی ساڵی ١٩٣٠، بەدوای ئەودا: مصباح الدیوانو ناميلكەی ناوی کوردیو دەیان وتارو هەڵبەستی نیشتمانیو نەتەوەیی لەرۆژنامەو گۆڤارەکاندا.

• نموونەیەك لەو هەڵبەستانە!

– فەرموو:

مەیل دیسان مەیل، دڵ پڕە لەمەیل

دڵ کەیلە لەخەم لەبەر مەیلی لەیل

لەیلی من وەتەن منم مەجنونی

هەردوولا توشی بووین کزیو زەبوونی

هەرگیز لانەچوو مەیلی لەناو دڵ

وەتەن، وەتەنە بشچمە ناو گڵ

تاداپکی وەتەن دیلو بەخسیرە

دڵپەستو خەمبار بەشیر موشیرە

• ئەمە هی کێیە؟

– هی هەژاری موکریانیە کاتێك کە تازە بەنهێنی هاتبووە بەغدادەوەو بەبارەگاکەی بەشیر موشیر ئاشنابوبو. ئنجا لەڕاستیشدا چاپەمەنی فرۆشتنەکەی، دەسکەوتێکی وەهای نەبو کە خۆیو خێزانی بژێنێ. بەلام ئەو هەر کۆڵی نەدا تا وایلێهات هەرچی لەوەوپێش دەستیکەوتبوو، دلنیایەوەو لەدوا سالانی ژیانیدا کەمدەستو هەژار کەوت. ئەوە سەرباری ئەوەی کە پرۆی ستەمکاریەکانی رژێمی بەعس سالی ۱۹٦۳ بەشیریشی گرتەوە. لەو سالەداو لەتەمەنی هەشتا سالێدا گرتیان! ئەو گرتنەی لەرۆژانێکدا بو کە زۆربەی ئەو کوردانەی ئەگیران، یا ئەشکەنجەی زۆر ئەدران، یا بێ سەروشوێن ئەکران. ئەو ئەگەرچی زوو بەربو، بەلام لەو خوریەیە ئەخۆشکەوتو رۆژی ۱۹٦۳/٦/۳۰ گیانی پاکی سپارد.

• هیچ وەسیەتێکی نەکردبوو؟

– با، سێ وەسێت.

یەکەم: لەسلێمانی لەگردی مامەیارە لەتەنیشت پیرەمێردو مامەیارەوە بینێژن. بەلام بەدلخەوە رۆژانی نەخۆشکەوتنو مردنەکەی قەدەغەی هاتوچۆبو لەنێوان کەرکوكو سلێمانیدا. لەبەر ئەوە لەگۆڕستانی شێخ مەعروف لەکەرخ سپێردرا. ئێستاش ئەو وەسێتە لەئەستۆی رۆشنبیراندایە، بەتایبەتی هەوتەی مژدەبەرو بەشیر ویستەکان کە لەسەرمانە ئێسکوپروسکەکانی بهێنینەوە بۆ مامەیارە لەدەرفەتێکدا.

دووەم: پێشگرتنەکەی، من داوام لێکرد کە خانووەکەی وەقف بکات بۆ ئەوەی کرێی سالانەکەی تەرخان کرێت بۆ یەکەمەکانی ئامادەییەکانی سلێمانی، ئەویش رازی بو، بەلام فریای وەسێت نوسینەوەکەی نەکەوت.

سێهەم: سنوقەکە.

• سنوقەکە چیە؟

– ئەوە نهێنییەکی ترسناکە! لەبەشی پشتەوەی دوکانەکەیدا سنوقێکی گەورەی هەبو هەمیشە قفڵی لێدرابو. وانیار بوو چاپەمەنیو بەیانە نهێنییەکانو هەر بەڵگەنامەیەکی تری ئەخستە ئەو سنوقەوە. وەسێتی کرد کە دوای مردنی کەس ئەو سنوقە نەکاتەوە هەتا جەمال نەبەز نەگەڕێتەوە وڵاتو تەنیا ئەو بۆی هەیە بیکاتەوە، سنوقەکە برایە ماڵی فەوزیە خانی کچی لەگەڕەکی ئیسکانی ڕۆژئاوای بەغداد. چەندجار داوامان لەفەوزیە خان کرد ڕێگەمان بدا ئەو سنوقە بکەینەوە، وتی من خۆشم نایکەمەوە، ئەوە وەسێتی باوکمە، ئەبێ جەمال نەبەز بیکاتەوە.. ئەویش تا ئێستا هەر لەئەڵمانیایەو نەهاتۆتەوە.

• ئەی کوڕی نەبو!

– با، سێ کوڕ، شاملو هشامو نزار، بەڵام لێیان ڕازی نەبو، چونکە ئەیوت ئەمانە هیچیان وەکو خۆم فەیلەسوف دەرنەچون!

• فەیلەسوف!

– بەڵێ، ئاخر هەر لەسەر ئەوە لەگەڵ هەژار تێکچو، ڕۆژێك ئەبێتە مشتومڕیان، هەژار پێی ئەڵێ: تۆ فەیلەسوف نیت، بەشیریش لەوەڵامدا ئەڵێ: ڕۆحەکەم تۆش شاعیر نیت، تۆ شەعیریت. لەگەڵ دکتۆر مارف خەزنەداریش لەسەر ئەوە تێکچو، بەشیر وتی لەتارانەوە بەپاپۆڕ چوم بۆ ئەنکەرە. دکتۆر وتی ئەمە ڕاست نیە، چونکە لەنێوان تارانو ئەنکەرەدا دەریا نیە! بەشیر وتی تۆ من بەدرۆ ئەخەیتەوە!!؟ بۆ من نازانم ئێستا لەنێوان ئەو دووشارەدا دەریا نیە؟ من باسی ئێستا ناکەم، باسی پێش سەفەربەر ئەکەم!! کەسێکی تریش دڵی ئێشاندبو، ئەوسا شەڕی ساردی نێوان سۆفێتو چین لەگەرمیدا بو، هەریەك بەجۆرێك هۆی ئەو شەڕەی نێوان سۆفێتو چینی هاوسێو هاوبیروباوەڕی لێکئەدایەوە. ئەو واتا بەشیر وتی: ئێوە نایزانن ئەوە من ئەزانم هۆی ئەو شەڕە چیە.. هۆکەی ئەوەیە، فلان کەس لەمۆسکۆ بێ، چۆن شەڕی نێوان چینو رووس بەرپا نابێ؟

• ئەوە کێ بو!

– برادەرێکی خۆمانە، ناوی نابەم، چونکە دڵی زۆر ناسك بووە، نوکتەش بگێڕێتەوە، ئەو هەر تووڕە ئەبێ.. من مەبەستم لەگێڕانەوەی ئەو شتانە ئەوەیە کە هەڵسوکەوت لەگەڵ بەشیردا لێزانینی ئەویست، نەئەبو دڵی بئێشێنیت. چونکە ئەو شتانەی کە ئەیوت، بەلای خۆیەوە ڕاستبو، ئەبوایە بەلای تۆشەوە ڕاست بوایە. محەمەد تۆفیق وەردیش جارجار بەرپەرچی ئەدایەوە، بەشیریش بەوە تۆڵەی لێئەکردەوەکتێبەکانی وەردیی لەسەر ڕەفەکان داشەگرتو ئەیدایەوە بەسەریدا ئەیوت بڕۆ ئیتر کوردلیەتی ناکەمو کتێبی تۆ نافرۆشم! لەنووسەرێکیش تووڕەبو، پێیوت: تۆ نابێ دیماغت هەبێ؟ ئەتەوێ من کتێبیشت بۆ بفرۆشمو پارەشت بدەمێ!؟

• وەت ئەو خۆی ئەو قسانەی بەلاوە ڕاست بوا!

– بەڵێ، من لەوەڵامی وتارێکی دکتۆر ئیحسان فوئاددا کە ساڵی ١٩٨٥ لەگۆڤاری نوسەری کوردا بڵاوی کردبوەوە، وتومە: بەشیر هەرگیز درۆی نەکردووە، ڕاستیشی نەوتووە.

• چۆن چۆن؟!

– ئێوە ئەم قسەیەتان بەلاوە سەیر نەبێ، من هەر لەو وەڵامەدا وتومە: ئەم قسەیە هیچ ناکۆکیەکی تێدانیە، زانستی تازە، دوای بیرۆکەکانی ئەنیشتاین و پشکنینەکانی روزەرفورد، سەلماندی کە ڕەش پێچەوانەی سپی نیە، چونکە تواندرا ماددە لەسوکەوە بگۆڕێت بۆ قورس، لەشلەوە بۆ تونگە، لەڕەشەوە بۆ سپی، لەساردەوە بۆ گەرم و هەمووشیان بەپێچەوانەوە، بۆ تاقیکردنەوە: هەندێك ماددە بەگۆڕینی ژمارەو ڕێکخستنی توخمی گەردیلەکانیان، گۆڕان بۆ جۆرە ماددەیەکیتر. وەك گۆڕینی هەندێك گەردیلەی نیترۆجین بۆ گەردیلەی ئۆکسجین، هی پلاتین بۆ ئالتون و.. هتد، فەلسەفەی بەشەریش دەریخست کە ڕاستی و درۆ پێچەوانەی یەك نین. ئنجا ئەم دیاردەیە لەم ڕۆژانەدا زیاتر ئەبینرێ. بەتایبەتی لەبواری سیاسەتدا، تۆ بڕوانە ئەو هەموو درۆیانەی تێکەڵاو بەژمارەیەك ڕاستی ئەکرێن لەدنیای سیاسەتدا و کەسیش نقەی لێوە نایەت. گوێ لەو هەموو چەپڵەیە بگرە کە هیچیان لەدڵەوە نیە، دەی خۆ ئەوانەی بەشێر هەمووی لەدڵ و دەروونی سافی خۆیەوە بو، ئەو بەهرەیکی سروشتیی هەبوو کە خەوەخەیاڵی لێئەبو بەڕاست، خۆی لەبەسەرهاتی خەڵکیدا ئەدیەوە، خۆی لێئەبو بەپاڵەوانی داستانە جەنگیەکان، وێنە بینراوەکان و دەنگە بیستراوەکانی لێئەبوو بەهی خۆی، ئەگەر لەخەویدا، بۆ نمونە: زانایەکی فەرەنسی پرسیارێکی لێبکردایە، ئەو بۆ ڕۆژی دوایی لێیی ئەبوو بەڕاست و ماوەیەك لەوەو بەر ئەوەبووەو ئەویش وەڵامی داوەتەوە. ئەگەر باسی نەبەردێتییەکی پێشمەرگە بکرایە ئەویش نەبەردێتییەکی خۆی ئەگێڕایەوە کە لەزەمانی عوسمانیدا کردوێتی وەك ئەوەی وتی جارێك لەشکرێکی ئینگلیزی بەخاکەناز بەزاند.

**• بەخاکەناز!**

– بەڵێ، وتی ئێمە کەم و بێتفاق، ئەوان زۆرو پڕچەك، ناچار دیماغم بەکارهێنا، بەسەربازەکانم وت مەترسن، خاکەنازەکانتان بگرن بەرووتانەوەو هێرشبەرن و خاکەنازەکانتان بدەنە بەرگولەکانی ئەوان، ئیتر کە ئینگلیزەکان ئەم پیلانی شەڕەیان بینی، ئەو هەڵاتنەی هەڵاتن، ئێستاش خۆیان بۆ نەگێڕاوەتەوە. تا بەو جۆرە خەوەخەیاڵی لێئەبو بەڕاست و ڕوونەداوی لێئەبو بەڕوودراو لەدیمەنێکی پێکەنینهێنەرو خۆشدا ئەیدایەوە بەخەڵکی، ڕاستیەکانیشی هەر لەخزمەتی نەتەوەکەیدا بو، ئیتر لەمەوە ژیان و جیهانی بەشێر موشیر بۆ ئەوە ئەشێن کە زۆر زیاتر لەکەسێتیەکی وەك دۆنکیشۆت گرنگی پێبدرێ و بکرێنە چیرۆك و فلیم.

**• ئێوە لەو بارەیەوە چیتان بۆ کردووە!**

– من گەلێ وتارم لەسەر نوسیوە، لەکۆڕەکاندا توێژینەوەم لەسەرکردووە، شانۆنامەیەکم بەپەخشان لەسەر نووسیوە، هێشتا بڵاونەکراوەتەوە. شانۆنامەیەکم بەهەڵبەست لەسەر نوسیوە، ساڵی ۱۹۹۲ لەسوید بەناونیشانی (گەورەپیاو) چاپکراو بڵاوکرایەوە.

لەوانەدا زۆربەی ژیان و هەڵوێستەکانی و قسە خۆشەکانیم نوسیوە کە لێرەدا لەمە زیاتر ماوە نیە لەسەری بڕۆم، ئەگەر دەرفەت بو، ئەوانەو گەلێ شتی تریش هەمووی لەبەرگێکدا بەچاپ ئەگەیەنم، بەوشتانەشەوە کە نووسەرە بیانییەکان لەسەریان نوسیوە.

**• وەکو چی! ئەگەر بەکورتیش بێ، نمونەیەك!**

– بەڵێ.. ئەمە هەندێ رستەی هەڵبژاردەیە لەنوسینی نوسەرێکی ئەڵمانی: (هەندێ لەمیللەتەکان بۆ ماوەیەکی زۆر لەژێر ستەمدا ئەناڵێننو بەگەلێشێوە تێئەکۆشن تابتوانن بمێننەوە بێنەوەی کە رێگای زەبروزەنگ بەکاربهێنن. چیکەکان بۆ ئەم مەبەستە سەربازە ئازاکانیان بەکارئەهێنا کە پێیان ئەوتن شفیچك، بەڵام کوردەکان بەشیر موشیریان هەبو. لەهەموو جیهاندا قسەکانی وەکو قسەی سەفیرێکی گەورە وابو.. دەسەڵاتی ئەم پیاوە لەوەدا دەرئەکەوت کە بۆچوونەکانی زۆر نایاب بو.. ئەو رێگەیەی کە ئەو خەڵکی بۆ هان ئەدا تا ئێستاش هەر خەڵکی لێوەی ئەدوێنو دڵودەرونیان بۆ کوردایەتی بەهێز ئەکات).

لەچەپەوە: رەئیس مەدحەت ، بەشیر موشیر، جەمال نەبەز.
ریزی پشتەوە: د. عەلی تۆفیق، د. محەمەد نوری عارف، کامیل ژیر

لەچەپەوە: عەزیز عەلی، کامیلی کاکەمین، رەشید سدقی، ئیحسان شێرزاد ، بەشیر موشیر

• ناوی ئەوانی تر نازانرێت.

لەگەڵ ڕۆژنامەی (تایم) دا ژمارە ٣٤ ڕۆژی ٤/١٢/٢٠٠٢

**مامۆستا کامل ژیر دەفتەرەکانی بیرەوەری بۆ تایم دەکاتەوە:**

## کارەساتەکانی ئەنفال و کیمیاباران، جارێکی تر هانیاندام بگەڕێمەوە بۆ هەڵبەستی سیاسی و نەتەوەیی

لەدرێژەی چاوپێکەوتنەکەیدا لەگەڵ (تایم) لەم ژمارەیەدا کامل ژیر زیاتر باسی شیعرو هەڵبەستو ژیانی ئەدەبی خۆی دەگێڕێتەوە.

• **با لایەك لەوێژەو هەڵبەستیش بکەینەوە، یەکەمجار بەکام هەستیارەوە سەرسام بوویت؟**

– وەك ڕاستییەك، کوێرانە بەهیچ هەستیارێکەوە سەرسام نەبووم، زیاتر هەڵبەستێك یا چەند هەڵبەستێکی هەستیارێك، کاریان تێکردووم. لەهەستیارانی کۆن، ژمارەیەك لەهەڵبەستەکانی نالی و مەولەوی و کوردی و مەحوی و شێخ ڕەزاو ئەحمەد موختار کاریان تێکردووم.

• **خزمایەتی و ئاوەڵێتیت لەگەڵ هەستیاراندا؟**

– شێخ سەلام خاڵی باوکمە. أ . ب. هەوری ماممە، من وەك منداڵێكو ئەوان خاڵو مام، ئاوەڵێتیم لەگەڵیاندا نەبووە. پەیوەندیم لەگەڵیاندا پەیوەندیی خاڵو خوارزایی و مامو برازایی بووە. ژمارەیەکیش لەهەڵبەستەکانیان کاریان تێکردووم، هەردووکیشیان وەك دوو مرۆڤو دوو هەستیاری نەتەوەیی، کاریگەرێتیان زۆر بووە بەسەرمەوە لەفێربوونی سەرەتاکانی وانەی کوردایەتیدا، بەتایبەتی لەنێوان قسەو ڕاو بۆچوونەکانیانەوە لەدانیشتنە خێزانییەکانماندا.

• **ئەی هەستیارانی تر؟**

– زێوەرو پیرەمێردو فایەق بێکەسم دیوە، هەندێك لەهەڵبەستەکانیان کاریان تێکردووم. بەڵام بەهۆی جیاوازیی تەمەنەوە، ئاوەڵێتیم لەگەڵیاندا نەبووە.

• **ئەی گۆران؟**

– گۆران یەکەم هەستیارێکی گەورە بوو کە ئاوەڵێتیم لەگەڵیا پەیدا کرد، ئەویش بەهۆی ڕۆژنامەی ژینەوە کە ئەوسا، لەپەنجاکاندا سەرپەرشتی ژینی ئەکرد، من ئەو کاتە تازە وام لێهاتبوو کە هەڵبەستەکانم دەرخەم. ڕۆژێك چووم بۆ بارەگای ژینو هەڵبەستێك بەناوی (هەژار لەجەژنا)م دایە دەستی، چاوێکی پیاخشاندو وتی دانیشە. هەستم کرد هەڵبەستەکەی بەدڵە. ڕێزی لێگرتمو هانیدام بەردەوامبم، کە ژینی ئەو هەفتەیە دەرچوو، هەڵبەستەکەمی تیابڵاوکردەوە. ئەوە هانیدام کە دوای ئەوە هەڵبەستی ترو چیرۆكو نووسین بەرەو بۆ ژینو ئەویش هەمووی بڵاونەکردەوە. بەو جۆرە برادەرایەتیمان پەیدا کرد ئەگەرچی جیاوازیی تەمەنیشیان هەبوو، بەر لەوەش، من ژمارەیەك لەهەڵبەستەکانی گۆران کاریان تێکردبووم و لەبەرم بوون، بەتایبەتی سروودە نەتەوەییەکانی و ئەو هەڵبەستانەی بۆ وەسفی سروشت و ئافرەت وتبوونی.

**• ئەی هەڵبەستەکانی تری؟**

– نەخێر، بەڕای من گۆران بەهەڵبەستە سیاسییەکانی، ئاستی هەستیارێتی خۆی کەمکردەوە، ئەمە لەسەر ڕۆیشتنێکی زیاتری ئەوێ کە ڕەنگە لێرەدا ئەو ماوەیەمان نەبێ.

هەردی دووەم هەستیاری گەورەبوو کە لەنزیکەوە ناسیمو بووینە برادەرو هاوبیر. بەر لەناسینی، زۆربەی هەڵبەستەکانی کاریان تێکردبووم‌و لەبەرم بوون. ئنجا بەهۆی ئەوەوە کە ساڵانی ١٩٥٧ و ١٩٥٨ بوومە سەرپەرشتیاری گۆڤاری هیوا لەبەغداد، ئاوەڵێتیم لەگەڵ زۆربەی نووسەران‌و هەستیارانی ئەو سەردەمەدا پەیداکرد، لەوانە: جەمیل ڕۆژبەیانی، هەژاری موکریانی، شاکیر فەتاح، دیلان، کامەران، فەرەیدون عەلی ئەمین کە بۆ چلەی هەریەکێکیان هەڵبەستێکم بۆ وتوون، دوکانەکەی بەشیر موشیریش کردمی بەبرادەرو هاوبیری جەمال نەبەزو گەلێ نوسەرو هەستیاری تر.

**• بیری نەتەوایەتی، لەکەیەوەو تا چ ڕادەیەک لەهەڵبەستەکانتدا ڕەنگی داوەتەوە؟**

– لەڕۆژانێکەوە کە هێشتا لەسەر میلاکی حیزبی شیوعی بووم! بۆ نموونە: لەهەڵبەستی (بەهاری کوردستان)دا ساڵی ١٩٥٧ وتوومە:

تاکو ئەوسا کە کوردستان

بۆ خۆمان بێ‌و هەر بۆ خۆمان

هەروەها لەهەڵبەستی (بۆ جوانێکی دیل)دا

ساڵی ١٩٥٧ بانگەشەی ڕاپەڕین‌و شۆڕشم کردووە.

بۆ ئازادبوون‌و مافی کوردستان:

چار نیەو ئەبێ ڕەوان، پڕ بەدەم

بەنەڕەی پڵنگ شارو دێ پڕکەم

بۆ ڕاپەڕینێ، هەوڵێ، کۆششێ

لەخەو هەڵسانێ، دەنگێ، شۆڕشێ

بۆ ئازادبوون‌و مافی کوردستان

زۆردار، دەرمبەگ لەگۆڕ چاڵنان

سەرجەمی ئەم دوو هەڵبەستە لەبەشی یەکەمی دیوانی هەڵبەستەکانمدا، ساڵی ١٩٥٧ چاپ‌و بڵاوکراونەتەوە، هەروەها لەگۆڤاری هیوایش دا لەو ساڵەدا، ساڵی ١٩٥٨ پێش چواردەی تەموز وتوومە:

من کە دیم لەرەی شەپۆلی شنەی

ئاڵای کوردستان

تێکەڵاو ئەبێ لەگەڵ جریوەی

ئەستێرەی بەیان

ئەو کاتە هیواو ئامانجی دووردم

هەرلەوو پێکەوە

ئەبن بەپرشنگ، گوڵاڵەی سوورم ئەگەشێنێتەوە

ئنجا دیوانی (کوردایەتی) یەکەم، کە ساڵی ۱۹٦۰ چاپکرا هەڵبەستەکانی لەنێوان ۱۹۵۸-۱۹٦۰ دا وتراون، ئەوە وەك پێشتر وتمان، بانگی ئاشکرای بیرێکی نەتەوەیی نوێ بوو لەکوردستاندا.

• ئەی دوای دیوانی کوردایەتی؟

- راستییەکەی، دوای دیوانی کوردایەتی، چەند ساڵێك چالاکیی ویژەییم کزبوو، ئەویش زیاتر بەهۆی ئەوەوە بوو کە سەرقاڵی کاری پارتایەتی بووم لەکاژێکدا. ئەوە هەر وایە. گەلێ جار سیاسەتو پارتایەتی، هەستیارانی لەویژە دوورخستۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کارەساتەکانی ئەنفال کیمیاباران، جارێکی تر هانیان دام بۆ هەڵبەستی سیاسیو نەتەوەیی، بێ ئەوەی سڵ لەکاردانەوەی رژێمی بەغداد بکەمەوە. وەکو ئەو هەڵبەستەی لەسەر روخاندنی گوندەکانو ئەنفال پێشتر بۆم خوێندنەوە. جگە لەوە، بەبۆنەی کیمیابارانەکەی هەڵەبجەشەوە هەڵبەستی (بزێوی) م وتو هەر ساڵی ۱۹۸۸ ناردم بۆ رۆژنامەی هاوکاری لەبەغداد، بەڵام بڵاویان نەکردەوە. هەڵبەستەکە ئەگەرچی بەرەمزەوە بوو، بەڵام دیاربوو کە بۆ ئەو بۆنەیە وتبووم، بۆیە بڵاویان نەکردەوە.

• بەشێك لەو هەڵبەستە؟

- درێژەی هەڵبەستەکە لەلاپەڕە ۱۷۷-۱۸۰ی دیوانی هەڵبەستەکانمدا کە لەسوید ساڵی ۱۹۹۳ چاپکراوە، بڵاوکراوەتەوە، ئەمە نموونە یەکێتی:

لەپڕ هەورە بروسکە

کەوتە گرمەو تروسکە

کارێژڵەکەو ئەفراسیاو

تێ ڕلتەمان ناو بەناو

ئەم گرمەو ئەم بارانە

کەی وەکو هی جارانە!؟

شتی زل زل ئەبارێ

بە لێشاو دێتە خوارێ

بۆنێکی وەکو لیمۆ

باشە بۆنی وەها بۆ!؟

• جگە لەو دوو هەڵبەستە، چی ترتان وتووە؟

- زۆری تر، با جارێ ئەمەتان بۆ باس بکەم کە بیرەوەرییەکی لەگەڵدایە: ساڵی ۱۹۸٦ یەکێتی نوسەرانی کورد میهرەجانێکی بۆ هەڵبەست سازدا بەناوی سێهەم میهرەجانی هەڵبەستی کوردییەوە. میهرەجانەکە رۆژی ۱۹۸٦/۹/۱۰ لەهۆڵی میدیا دەستی پێکرد، لێپرسراوانی ئەو رۆژەی رژێم لەهەولێر بەئەمین عامەکانو ژمارەیەك جاشو موستەشارەوە ئامادەبوون. هەڵبەستەکەی من بەناوی (گورگانە

شەوێ)وە بوو، هەمووی تانەلێدان بوو لەوانە کە جاشێتیو سیخوڕیو نۆکەرێتی ئەکەنو خزمەتی بێگانە ئەکەن. هەڵبەستەکە زۆرە، لەلاپەڕە (٢٤٤-٢٥٠)ی دیوانی هەڵبەستەکانمدا کە لەسوید چاپکراوە، بلاوکراوەتەوە، ئەمە هەندێك کۆپلەیە لەو هەڵبەستە:

گورگانە شەوێ، گورگانە شەوێ
گورگە بۆرەکە لەتۆ سوورکەوێ
بچێتە ماڵی کەری گوێ درێژ
دێزی گێژو وێژ
بڵێ لەپای چی تۆ وا ئەزەڕی
خۆ نەبووی بەسەگ بەمانگ بوەڕی
تۆ دیارە شێنی مەرگی خۆت ئەکەی
بۆ ئەوەی زیان لەخێوت بدەی
کەری کەللە بۆش
گەلۆری بێ هۆش
ئێستا بۆ پەندی رۆژو زەمانە
ئەتکەمە شێوی شەوی گورگانە

* * *

بگرە شەپازلەی ئامۆژگاریی من
ئیتر وازبێنە لەپاسی دوژمن!

* * *

گورگانە شەوێ، گورگانە شەوێ
گورگە بۆرەکە لەتۆ دورکەوێ
دەردو بەڵای تۆ لەوانە کەوێ
نازانن زیان ئەوە ناهێنێ
مرۆڤ بایەخی خۆی بدۆڕێنێ
ئەوانە رسواو سووکو ناپیاون
شێر بەگوێ بگرن هەر گێلە پیاون
کەسێ گێل نەبێ ئەبێ بزانێ
لەوە زیاترە بۆ کورسیو نانێ
بێ بەپوان، بەدێز، بەسیخوڕ
یا تەنیا بژی بۆ ورگێکی پڕ
گێلە پیاوەکان
بێگانەی دژی باوە کوشتەتان
نابێ بەپەنا، بەجێگە باوەڕ
چاوتان نابینا، هەردوو گوێتان کەڕ

* * *

نابێ بەپەنا، بەجێگە باوەڕ
چاوتان نابینا، هەربوو گوێتان کەڕ
* * *
منداڵەکانتان پاکوخاوێنن
مەیانزڕکێنن
سبەی کە چوونە قوتابخانەوە
منداڵانی تر ئەیانناسنەوە
پەنجەی گومانیان بۆ درێژ ئەکەن
لەگۆڕەپانا کەناریان ئەخەن
ئەڵێن ئەوانیش ئەبا وەك ئێوە
لەپێشبڕکێدا بچەمێنەوە

دوای ئەوایبوونی میهرەجانەکە، فەرمانی گرتنی منو لەتیف قەرەداغیو حەمەومین پێنجوێنی دەرچوو. ئەو کاتە دوکتۆر نافع ئاکرەیی سەرۆکی نووسەرانی کورد بوو، کەوتە هەوڵدانێکی زۆرو فەرمانی گرتنەکەمانی هەڵوەشاندەوە.

راستە ئەوانەی لەشاخ شۆڕشیان ئەنجام ئەدا، گیانفیدابوون، بەڵام ئەوانەی لەشارەکاندا خەباتی ژێر زەمینیو کاری ڕووبەڕووبوونەوەیان ئەنجام ئەدا، لەوان گیانفیداتربوون. ئێمەومانان چارەنووسی دەیان کەسی وەك شاکیر فەتاحو دڵشاد مەریوانیمان بەچاوی خۆمان ئەدی، ئنجا لەگەڵ ئەوەشدا بەنووسینو هەڵبەستو هەڵوێستەکانمان درێغیمان نەئەکرد، ئەوە جگە لەخەباتی ژێرزەمینیمان هەریەکەو بۆ حیزبەکەی خۆی، من هەر وەك هەندێ نمونەی تر، هێما بۆ ژمارەیەك بەرهەمی ویژەیی ترم ئەکەم کە هەریەکێکیان بابی ئەوەندەبوون کە لەسەریان بگیرێمو بکوژرێم. بەتایبەتی ئەوانەی لەرۆژە ترسناکەکانی ساڵانی ١٩٨٣ تا ١٩٩٠ بلاوم کردوونەتەوە، لەوانە هەڵبەستەکانی:

١- بۆ جوڵانێکی هەنگاری - ل٧٦ دیوانی جوانی، چاپی ١٩٨٣.
٢- بۆ کچێکێ مهابادی - گۆڤاری نووسەری کورد، ژمارە ٣ ساڵی ١٩٨٥.
٣- تۆپەرێنی نازە - گۆڤاری نووسەری کورد، ژمارە ٥ ساڵی ١٩٨٦.
٤- بۆ خاوەن شەهید - لەکۆڕێکی ویژەییدا ساڵی ١٩٨٧ لەدهۆك خوێندراوەتەوە.
٥- پۆلێك فریشتە ئەکوژرێ - رۆژنامەی عێراق ١٩٨٧/٢/٢٦.
٦- رازی باخەوان - گۆڤاری کاروان - ژمارە ٦٨ ساڵی ١٩٨٨.
٧- باوەڕو بەرگە - گۆڤاری بەیان، ژمارە ١٣٢ ساڵی ١٩٨٧.
٨- هەندێك راستی - پاشکۆی عێراق - ژمارە ٥٥ رۆژی ١٩٨٨/١٠/٥.
٩- لەبیرەوەرییەکانی ساڵانی دێرین - گۆڤاری بەیان ژمارە ١٥٢ ساڵی ١٩٨٩.
١٠- من خاوەنی پێڵێ یارم - رۆژی ١٩٨٦/٣/٢١ لەکۆڕێکی ویژەییدا لەهۆڵی جەماوەری سلێمانی خوێندرایەوەو لە ل٢٥٩ی دیوانی هەڵبەستەکاندا بلاوکراوەتەوە.

١١- پەردەيەك لەچيرۆكى دڵدارێكى كۆن بۆ چلەى شاكير فەتاح وتراوە ـ رۆژنامەى هاوكارى ژمارە ١٠٦٢ رۆژى ١٩٨٩/٣/٢٧.

١٢- بۆ چلەى ماتەمى ديلان ـ لەچلەى ديلاندا ساڵى ١٩٩٠ خوێنرايەوە.

• **هەندێك نموونە لەو هەڵبەستانە؟**

- خۆى لەراستيدا، ئەو هەڵبەستانە هەركاميكيان بگريت، ئەبينى سەرجەمى هەڵبەستەكە يەكەيەكى نەپچڕاوە لەيەك. واتا بەخوێندنەوەى هەموو هەڵبەستەكە ئەنجامو مەبەست بەدى ئەكرێ. من بۆيە هێمام بۆ سەرچاوەكان كرد، بۆ ئەوەى ئەگەر كەسێ مەبەستى بێ بگەرێتەوە بۆ ئەو سەرچاوانە، لەگەڵ ئەوەشدا، فەرموون ئەمە هەندێك نموونە:

لەهەڵبەستى بۆ كچێكى مهابادى:

بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ: من باوەڕم، من پيرۆزم
من پەيكەرى كوردايەتيم، چرۆى دلستانى نەورۆزم
بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ: من ئەوينم بۆ كوڕى كورد
بۆ پێشمەرگە هاوبيرەكەم، لاوى ئازاى بەدەستو برد
بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ: من وەك جوانم نيازيشم پاك
سەرچاوەى بيرو فەلسەفەم خۆماڵييەو كردەوەم چاك
بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ: هەرچەن لەسەر رووى ئەم ئەرزە
لەسەر خاكێك ئەژيم پێ شێل، بێ دروشمەو بەبێ مەرزە
بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ: لەوەش زياتر خۆشم ديلم
بەلام شادم چونكە بەهەست كچە كوردى ورياو ژيرم
بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ: كە من هەستم هەبێو نەمرێ
رۆژێ ئەبێ دارى ئێمەش بەرى رەنجو گەنجى بگرێ
بەم گوارە شۆڕەوە ئەى جوان، ئەى كچە كورد، ئەى شۆخو شەنگ
بەقوربانى بەرى پێت بێ هەزار سەرى بۆشو دەبەنگ

لەهەڵبەستى (بيرەوەرييەكانى ساڵانى دێرين)دا وتوومە:

لەبيرم دێ بۆ ئيمزايەك بۆ (پاكانە) گەڵ گەڵ سزادرام
لەوەلاما، نەكو سزا، خنكانديش چاتر بوو لام
تێكۆشەرێك نينۆكى ريشەكێش كرا
پشكۆى ئاگر بەهەردوو دەستيدا نرا
نە وتى ئاخ، نەپاڕەنى، نەدانەوى، نەناوى وت
نە جێگەى دا بەدەستەوە
لەئاستى ئەو بەرگەيەدا، ديلەولنان ئەلەرزينو
پەنجەى خۆيان ئەگەستەوە

بارەگای دژ، بەهەڕەشە، بەترساندن، بەسامان و پایەو پیلان
تەقەلای دا کاریکاتە هەستی پاکی هەژارێکی بێ دەرەتان
هەر بۆ ئەوەی جاریەجارێ
بەنهێنی لەکەناری
هەواڵێکی ئەو مەردمە بەسەر پێوە بەرێ بۆیان
ئەو هەژارە جەوامێرە، تفی کردە پایەو سامان
وتی مردن بەخاوێنی بۆ نەتەوە لەبرسانا
نەکو ژیان بەناپاکی بۆ سامان یا لەترسانا
وێنە زۆرە، وێنە دیارە
مشتێ نمونەی خەروارە
ئێستاکە - ئێی
ئێستاکە .. هێی
کەر لەکوێیەو کونە لەکوێ
لای کەسانی ئەڵقە لەگوێ
لەلای ئەوەی، یا لەترسا، یا بێ شەرم
لەپێناوی پایەو سامانی ناپاکی
ئەکەوێتە پێشی دوژمن، بۆ تێکدانی
لانەی خۆیو باپیران و لانەی کاکی
تۆ ئەزانی باپیرانی جەوامێرو قارەمانت
لەمەیدانی نەتەوەدا، چ مەردێ بوون؟
تۆ ئەزانی براوی ئەم سەرزەمینە، پلەو پایە
نابن بەپارسەنگی تۆزێ لەئابڕوچوون!
ئەمانە نمونەی هەڵبەستەکانی بەر گرەی ئاگری سالانی پێش راپەڕینن کە بەناوی ئاشکرای خۆمەوە لەگۆڤارو رۆژنامەکاندا بڵاوم ئەکردنەوە، نەک هی ژێر سێبەری ئەمڕۆی ناوچەی ئازادی رزگارکراو!

**• بێجگە لەبواری سیاسی، لەبواری تردا هیچ بیرەوەریەکتان هەیە لەنێوان هەڵبەستەکانتەوە!**

- ساڵی ١٩٧٤ دوای پەیوەدیکردنم بەشۆڕشی ئەیلولەوە، وەک پشکنەرێکی دادوەری، لەبابەگرگاولوە هاتم بۆ ناوچەی سلێمانی بۆ پشکنینی دادگاکانی شۆڕش لەناوچەی بیارەو شارباژێر، لەگەڕانەوەدا کە گەیشتینە شاری مهاباد، لەشەقامێکدا لاوێکی مێرمنداڵ بەرەو روومان هاتو وتی جەنابتی ئاغای کامیل ژیر؟ وتم بەڵێ، وتی بابم دەفەرموێ ئەمشەو لای میوان بن. وتم بابت کێیە؟ وتی محەمەدی ماملێ. وتم بەسەرچاو زۆرم پێ خۆشە، ئەو شەوە تا بەرەبەیان من بەهەڵبەست و ئەو بەگۆرانی.

**• ئەو لاوە چۆن لێی ناسی؟**

– ئەوە لای منیش سەرەتا پرسیارێك بوو، دوایی دەركەوت برادەرێكم پێی وتبوو كە من لەمهابادم، ئەویش كوڕەكەی راسپاردبوو كە شەقامەكان بگەڕێ و لەسەر وەسفی ئەو بمدۆزێتەوە.

دوای چەند مانگێك، ڕۆژێك لەگەڵ مامۆستایان ئەحمەد هەردیو مستەفا سالح كەریمو فوئاد حەمە خورشید، لەنەغەدەوە سەردانێكی مهابادمان كرد، بۆ دیدەنی سەرێكی ماڵی مامليشماندا، كوڕەكەی وتی بابم لەزەماوەندەو بەزۆر بردینی بۆ زەماوەندەكە، بەڕاستی زەماوەندێكی ژن گواستنەوەی قەشەنگ بوو، لەچەند لاوە جوانەكانی مهاباد كوڕی ڕەشبەڵەكیان گەرم بوو، بەلام جگە لەماملێ، كێ ئێمەی ئەناسی؟! بەتایبەتی ئافرەتێكی زۆر جوان سەرنجی راكێشام، كەچی ئەو هەر ناوڕیشی لێ نەدأمەوە، منیش وتم:

دڵشكاوم ئەمڕۆ جوانێ وەك پێم بڵێ بەهارت چوو
تەلی هەستی ئاڵۆزانم، هەناسەم سوار، گەرووم پڕبوو
ڕوم تێكردو ڕووی لێ نەنام، تێگەیشتم كە ئەمریمەن
دەرگای بەختم لێ دانەخا، سەرنەكەوێ پلەی تەمەن
ئەی یادگار، كوا ڕۆژانی بەختەوەریم؟ من لاوێ بووم
بەنیگایە، ڕووم بنایە لەڤینۆسێ، ئەكەوتە دووم!
بەهەشتێ بوو جیهانی من، فراوان و بەبێ سنوور
پڕ فریشتەی قژی خاوو بەژنی رێك و لەشی بلوور
پیاڵەی مەیم بۆ هەرجارە چاوی مەستی نازدارێ بوو
مەزەی خۆشم، بزەی لێوو ماچی تەڕی ناو زارێ بوو

ئیتر دوای ئەوەی هەر لەم هەڵبەستەدا هەموو یادەوەرییەكانی خۆم لەڤیەناو بەرلین و جنێڤو ئەستەموڵ و شامو بەغداو سلێمانی و گەلێ جێگەی تر دێنەوە پێش چاوم و ئەیانگێڕمەوە، ئنجا ئەڵێم:

گەلێ گەڕام، لەزۆر باخا بۆنی خۆشی گوڵانم كرد
سەوزو زەردی بەری تازەی ئەونەمام و چڵانم برد
جێگەی داخە، درەنگ هاتم بۆ مهاباد، هەمووی پەری
بریا لێرە خونچەی دڵم بكرایەوە، گەڵای وەری!!

**ڕۆژنامەی (تایم) ژمارە ٣٥ ڕۆژی ١٩/١٢/ ٢٠٠٢**

## سالآنی زوو کۆبوونەوە لەتاریکیدا دەکراو چراکان تا دوای کۆبوونەوە دەکوژێنرایەوە
## کورد ئێستاش تاکوتەرایەك نەبێ، کچ بەعەرەب نادەن، ئیتر ئەم هەموو شێخە چۆن پەیدابووا؟

لەم بەشەی بەسەرهاتەکانی ژیانیدا کامل ژیر باسی باووباپیرانی خۆی دەکاتو هەروەها ئەو ماوەیەش دەگێڕێتەوە کە تێیدا بەزۆر لە بەسرە سەربازی پێکراوە، ئەوەی زیاتر جێی سەرنجە، ژیر لەبواری نمایش کردنیشدا ڕۆڵی خۆی بینیوەو ئەسپی خۆی ناودلوە کەچی لەخۆشەویستیدلو هەر بەهۆی سیاسەتەوە دلدارەکەی لەدەستچووەو شووی کردووە.

**• ئێوە هیچ باسی بنەمالەکەتا نەکرد، چین و خەڵکی کوێن؟**

– باوکم، شێخ نیزامەدین، ئەگەرچی هەموو ژیانی لەشاری سلێمانی بەکاسبیەوە بەسەربرد، بەلآم خوێندەوارێکی باشبوو، بڕوانامەی شەشی سەرەتایی زەمانی عوسمانیی هەبو، ئەوەندە خوێندەواری بۆ ئەو سەردەمە زۆربو، ماوەیەکیش فەقێیەتی کردبو. خەتی زۆر خۆشبو، ئەو ئەگەرچی دوکانداربو، بابەتی عەتاریی ئەفرۆشت، بەلآم سکالآ (عریضة)شی بۆ خەڵکی ئەنوسیو کومپیالەی بۆ پڕئەکردنەوە، باپیرم، شێخ جەلال، موفتیی شارباژێر بو، کوڕی شێخ تەهای شێخ سەلامی قازیی شارباژێر بو، باپیرانم، بەوەزیفە لەشارباژێر بون، بەلآم خۆیان خەڵکی چنارەی لای دەربەندیخان بون. ئارامگای باپیرە گەورەم کە ئەویش ناوی شێخ نیزامی بو، لەو گوندی چنارەیەیە خەڵك ئێستا زیارەتی ئەکەن. دایکیشم لەشێخەکانی قەرەدلخە.

**• کەواتە ئێوە شێخی تەواون!**

– من نازانم مەبەستت لەشێخی تەولو چیە؟ شێخی تەولو ئەگەر ئەوەبێ بەرەگەز بچێتەوە سەر پەیامبەری ئیسلام، بڕواناکەم شێخ لەکوردستاندا ئەوەندە هەبێ وەك ئێستە هەیە. کورد ئێستاش تاکوتەرایەك نەبێ، کچ بەعەرەب نادەن، ئیتر ئەم هەموو شێخە چۆن پەیدا بوون!؟ ڕاستییەکەی، ئەو سەردەمانەی شێخێتی زۆر لەبرەودابو، گەلێ کەس لەناو کورددا خۆیان کردووە بەشێخ، ئەویش یا لەڕێگەی بەرماڵەوە، یا کابرایەك پشتوێنێکی سەوزی بەستوەو ڕووی کردۆتە گوندێکی دوور. خەڵکە ساویلکەکەش کە بەو پشتوێنە سەوزەوە دیویانە، زۆر ڕێزیان لێگرتووەو دەستیان ماچکردووەو تەکێ، یا مزگەوتیان بۆ دروستکردووەو خێری دنیایان بەسەردا ڕشتووەو کچیان داوەتێو کردویانە بەشێخی گوندەکەی خۆیان.

**• بنەماڵەی ئێوە لەکام جۆریانە؟**

– نازانم. ئەوەندە ئەزانم، لەباوکەوە ئێمەو بنەماڵەی (مەولەوی) ئەچینەوە سەر (پیر خدری شاهۆ) کە خەڵکی ڕۆژهەلآتی کوردستان بووە، ئەوانەش کەوشەی (پیر) کەوتۆتە پێش ناوەکانیان، زۆربەیان لەپیرەکانی زەردەشت بون.

بنەماڵە
شێخ نیزامەدین
حەلاوە عەبدوڵا
عەبدولکەریم
فازیل
دولبەر
ئەختەر
هیوا
جەمیل
جەمال
کامیل
نەجات
چیا
چرا
ئارا
شارا

• سەرەتای خوێندنت؟

– لەحوجرەوە دەستمپێکرد، پێش تەمەنی شەش ساڵیم، ماوەیەك لەحوجرەکەی مەلا نەجمەدین لەبەرخانەقا خوێندم، دوای ئەوە ماوەیەکی تر لەحوجرەکەی مەلا بەکر لەگومرگە سوتاو. ئنجا بوم بەشاگرد خەیات. باوکم، ئەگەرچی خۆی خوێندەوارێکی باشیش بو، بەلام وای بەباش ئەزانی، کورەکانی، نیوەیان کاسبی بکەن‌و نیوەشیان خوێنن. من بەر کاسبیەکە کەوتم. خۆم ئارەزووم لەخوێندن بو، بەلام دەسەلاتم نەبو، تارۆژێك نانەوایەکی دراوسێی وەستاکەم، دەروێش عارفی خەیات، خەریکی گواستنەوە بو. وەستا عارف غیرەت گرتی‌و لەرمانی دا بەشاگردەکانی کە یارمەتیی نانەواکە بدەین. کەسیش نەیئەتوانی قسەی وەستا بشکێنێ، چونکە باوکی شاگرد بەوەستاکەی ئەوت: گۆشتەکەی بۆ تۆو ئێسقانەکەی بۆ من. یەکێك لەو شتانەی من گواستمەوە، لوولە دوکەڵکێشێکی رەشبو، نیوەڕۆ کە چوومەوە ماڵی دایکم وتی ئەوە بۆ سەرتاپات رەشبووە؟ بۆمگێرایەوە. ئەویش سوێندی خوارد کە ئیتر نابێ ئەو شاگردییە بکەم. باوکیشمی رازیکرد. منیش لەخوام ئەویست.

بەو جۆرە، چەند ساڵێك لەخوێندن دواکەوتم لەچاو هاوتەمەنەکانی خۆمدا. سەرەتا لەپۆلی دوو دامنام، مودیری خالیدیە مستەفا فەنی، ناسراو بەمستەفا گاڕووت، وتی پۆلی سێ، بەلام یونسە فەنی وتی با پۆلی دوویێ، بۆ ئەوەی بناغەکەی بەهێزبێ، لەپۆلی سێدا ئەبوایە من یەکەمبوومایە، بەلام نەجاتی کچی مستەفا فەنیان کرد بەیەکەم لەبەر ئەوەی ئەو ساڵە باوکی کۆچی دوایی کردبو ویستیان بەوە دڵخۆشیی بدەنەوە.

ئەوە زۆر نیگەرانی کردم، باوکیشم ئەو هەلەی قۆزتەوەو هانیدام کە ئیتر لەو قوتابخانەیە نەخوێنم‌و بچمە قوتابخانەی زانستیی شەو. بەرۆژیش بوومەوە بەشاگردی مەحمودی حەمە بانەیی خەیات لەو شەقامەی ئێستا پێی ئەڵێن مەولەوی. ئیتر لەو ساڵەوە من هەموو خوێندنم هەر بەئێواران بو. خەیاتییەکەشم گۆڕی بەشاگرد پێڵاودروو. ماوەیەك لای عەبدوڵلا زوهدی. ماوەیەکیش لای مەجید سوڵتان. دواتر برای گەورەم، شێخ کەریم دوکانی پێڵاو درووتنی داناو بووم بەشاگردی ئەو تا ساڵی ١٩٥٤ کە گیرامو ناردیانم بۆ شوعەیبە.

• بۆچی گیرایت؟

– ئەوە یەکەمجار نەبو بگیرێم، پێش ئەوە هەر موزاهەرەیەك بکرایە، من ئەگیرام لەسەری، چونکە وەك پێشتر وتم، ئەندامێکی چالاکی حیزبی شیوعی بوم، ئەندامی یەکێتی قوتابیان‌و نیقابەی کرێکارانی سەر بەحیزبی شیوعی بوم.

• کێ رێکخەرەکەت بو لەحیزبی شیوعیدا؟

– یەکەمجار برایمی مەلا عەبدوڵلا، ناسراو بەبلەجۆرج. دوای ئەو وەستا عارفی خەیات. ماوەیەکی کورتیش، وەستا عەولی بەنا. جارجارێکیش عوسمان خۆشناو کە ماوەیەك مەسئولی سلێمانی بو، کۆبوونەوەی پێئەکردین. ئەو کۆبوونەوانە، تەنیا بۆ کادرە پێشکەوتووەکان بو، هەرجارەی لەماڵێکدا. ئەویش بەمەرجێ، ئەبوایە چرای ماڵەکە بکوژاێتەوە، ئنجا ئەو بەتاریکی ئەهات، دوای ئەوەی قسەکانی تەواوئەکرد، ئەڕۆیشت، ئەوسا چرامان دائەگیرساندەوە.

**• وتتان گیرایت و ناردیانیت بۆ شوعەیبە؟**

– بەڵێ. ئەو ساڵە عومەر عەلی متەسەریفی سلێمانی بو، پۆلیسی سەرشەقام گرتمی، عەلی والی بەگ معاونی پۆلیسی سەرشەقام بو، عەلی بەگ خزممان بو، وتم بۆچی منتان گرتووە. وتی باوەڕبکە نازانم. هەرئەوەندە ئەزانم کە ئەبێ ئێستا بتنێرین بۆ سەکەنەی عەسکەری، لەوێ فەحسی پزیشکیانکردمو دەفتەری خزمەتی عەسکەریبیان بۆ پڕکردمەوەو خستمیانە پشتی لۆرییەکی عەسکەرییەوە. کە سەرکەوتم، روانیم چەند کەسێکی تریش لەلۆرییەکەدان، لەو کەینوبەینەدا پرسیمانو پێیان وتین ئێوە عەسکەریتان لەسەرە! وتمان ئێمە قوتابین، عەسکەری چی!؟ لۆری کەوتەڕێ بۆ کەرکوک، بۆ ئێزگەی شەمەندەفەر، بۆ بەغداد، بۆ سەر ئێزگەی سەمەندەفەری بەسرە. گەیشتینە بەسرە، لەوێوە براین بۆ شوعەیبە! بۆ کۆنە سەربازگەیەکی ئینگلیزەکان کە بریتیبو لەچەند کۆنە بەنگەڵەیەک، زیاتر لەزیندان ئەچوون، پانایییەکەی شەش مەترێکو درێژییەکەی نزیکەی سەدو هەشتا مەتر. نیوەی لەژێرزەمیندا بو، تەنیا لەپەنجەرە بەرزەکانەوە روناکیمان بۆ ئەهات. تا نزیکەی چوار مانگ دەرەوەی سەبازگەکەمان نەدیو مواجەهەشمان قەدەغە بو. جگە لەئێمە لەهەندێ شاری تریشەوە، بەهەمانشێوە، قوتابیی سیاسی تریان ئەهێنا، لەهەموو رێبازە سیاسییەکان: شیوعی، پارت، بەعسی، نەتەوەیی، ئیسلامی. سەرەتا نەئەبوو قسە لەگەڵ یەکبکەین، پاشتر هەموومان بووینە برادەر. لەعەرەبەکان، دولیی هەندێ کەسیان لێهەڵکەوتو چوونە سەرکردایەتیی بەعسەوە وەک عەبدولخالق سامەرائی، زوهێر قادریو مەعاز عەبدولڕەحیم.

لەم بەندیخانەیەدا کە بەناوی سەربازگەوە بۆ ئێمەی قوتابی کرایەوە، زیاتر چاوم کرایەوەو بەڕێبازە سیاسیەکانی تر ئاشنابوم. لەسەرەتاوە باری ژیانمان زۆر خراپبو، وەک خواردنو جێگەی نووستنو گەرماو بێخزمەتی، ئەوە جگە لەوەی نە ئێمە هەواڵی کەسوکارمان ئەزانیو نەئەوان هی ئێمە، بەلام چونکە ورەمان بەرزبوو، دەربەست نەبووین، دوای چوار مانگ، رێگەیاندا کەسوکار سەردانمان بکەن. هەفتەی جارێک سەری بەسرەمان ئەدا. خۆشمان بۆ هەموو بۆنەیەک، ئاهەنگمان ئەگێڕا. بەبۆنەی نەورۆزەوە، شانۆنامەیەکم ئامادەکرد، هەندێ کەسمان کردە لیژنەی سەرپەرشتیی ئاهەنگەکە، ئەکتەرەکانمان دیاریکرد، لەسەرپەرزاییەکی تۆزێ دوور لەقاوشەکەمان، شانۆمان رێکخست، عەبە عفریت دەوری ئەژدەهاکی بینی. شانۆگەرییەکەمان تێکەڵ سروودی نەورۆزو ئەی رەقیب کرد. باسی شوعەیبەو ناخۆشیو خۆشییەکانی باسێکی درێژە. کاک قادری میرزا کەریم کردوێتی بەکتێبێک بەناوی (بیرەوەری مێژوویەکی پڕ لەشانازی) ساڵی ٢٠٠١ لەسلێمانی چاپی کردووە.

**• قوتابییە کوردەکان کێوکێبوون؟**

– ئەوانەی بیرم ماونو ناوەکانیانم لەپەڕەیەکدا نوسیوە، ئەمانەن: ئەحمەد محەمەد، بابا عەلی بەرزنجی، بەشیر رەشید، بەهادین کابان، جەلالی مەلا کەریم، جەلالی میرزا کەریم، جەزای میرزا حسەین، جەلال عەزیز، جەودەت مستەفا، حسەینی حاجی ئەمین، حسەین عارف، حسەینی مەلا حەکیم، خالید سەعید، خەسرەو رۆستەم، رەئوف محەمەد ئەمین، روشدی عەلی شەریف، سدیقی شێخ مەحمود، سەلاحی حەمەی شێخەلی، سەلاحی عەلی ئایشەخان، سلێمانی مەجید بەگ، سمکۆ عەزیز،

عەبدوللا بەرزنجی، عەبدولی سۆران، عەبە عفریت، عوسمان بەکر، فەرەیدون ئەمین، فوئادی نوری خەفاف، قادری میرزا کەریم، کەمال مستەفا قادر، کەمال نوری، لەتیف خەزنەدار، محەمەد کاکە، محەمەد عەلی شەریف، محەمەد عەتا رەشید، مستەفا عەبدولرەحمان.

• چەندی لێمانەوە؟

– من رۆژی ۱۹٥٤/۱۰/۲٤ گیرامو ناوەراستی حوزەیرانی ۱۹٥٥ دوای ئەوەی سەد دینار بەدەلیان لێسەندم، بەربووم، ئەو پارەیەش بۆ ئەو رۆژە زۆربو! ئەوانی تریش، بەرودوا هەر بەوجۆرە.

• دوای ئەوە؟

– هاتمەوە سلێمانی، بوومەوە بەشاگردی کاکم. ئێوارانیش خوێندن چەندجاریتر گیرام، جاری وابوو تا سێ مانگ لەگرتوخانەدا ئەمامەوەو بەرئەدرام. ئێمە قوتابیانی ناوەندیی ئێواران، هەموو ساڵێك شانۆگەرییەکمان ئەکردو قازانجەکەیمان ئەدا بەکرێی ئەو قوتابیانەی ئێواران کە نەیانئەتوانی ئەو کرێیە بدەن. کرێکە ساڵی دە دینار بو، ساڵی ۱۹٥٦ دەستمانکرد بەپرلوەی شانۆگەریی ئوتێلۆ (عطیل). پراوەکە نزیکەی سێ مانگی خایان. مامۆستا ئەنوەر تۆفیق دەرهێنەرەکەی بو، نوری وەشتی دەوری ئوتێلۆی بینی، منیش دەوری (یاجۆ) کە ئەمیش وەك دەوری (ئوتێلۆ) دەورێکی سەرەکی بو، ئەوسا، شانۆگەری هەمیشە یەکەم رۆژ بۆ ئەشراف بو. کەچی من دەمەو ئێوارەی رۆژی پێش ئەو رۆژە، دایان بەسەر ماڵماندا و ژمارەیەك کتێبی قەدەغەکراویان گرتو خۆمیان راپێچی گرتووخانەکرد. من خەمی شانۆگەرییەکەم بو، ئەنوەر تۆفیش سەری دنیای لێهاتبووەوە یەك، بەلام تەها خەلیل، مەردانە، کێشەکەی چارەسەر کردبو، ئەو دەورێکی کومبارسی هەبو، تومەز بەدەم پراوەوە، هەموو دەورەکەی منی لەبەرکرد بو، یەکسەر دەورەکەی منی بەسەرکەوتوویی بینیبوو، لەوەوە تەها بەئەکتەرێکی سەرکەوتوو ناوی دەرکرد. هەر لەو سەردەمەدا، وا باوبوو لەگەڵ هەر شانۆگەرییەکی گەورەدا، شانۆگەرییەکی بچووکی قۆشمەش ئەکرا. من بۆ ئەو مەبەستە، شانۆنامەی (ئافرەت و نوشتە)م نوسیبوو. ئەویش پێشکەش کرابو، هەر ئەو ساڵە چاپیشم کرد، مامۆستا حەمە کەریم هەورامیش لەکتێبەکەیدا (درامای کوردی) ئەڵێ ئەوە یەکەم شانۆنامەی کوردیی کۆمێدی چاپکراوە.

دیمەنێکی شانۆیی
ساڵی ۱۹٥٤

**• ئەو گرتنەت چەندی خایاند؟**

– سێ مانگ، درام بەدادگای کەتن (جنح)و ئیفراج بوم، بەڵام کتێبەکانیان نەدامەوەو دەستیان بەسەرداگیرا. ئنجا بەهۆی ئەو گرتنانەوە، نەك هەر ژمارەیەك کتێبم لەدەستچوو، بەڵکو خۆشەویستێکیشم لەکیسچوو!

**• چۆن؟**

– بەر لەگرتنم بۆ شوعەیبە لەگەڵ کچێکدا کە ناوی سەبری بو، من ناوم نابوو نازەنین، سەرەتا دڵدارییەکمان دەسپێکردبو، ماڵەکەیان نزیك دوکانی کاکم بو، لەخێزانێکی هەژار بو، جوان‌و وریابو، دڵداریی ئەو کاتەش، بەزۆری بریتی بوو لەوەی لەدوورەوە سەیری یەکمان ئەکردو جارجارێکیش زەردەخەنەیەك، دووجار فرسەتی هێنا کە من بەتەنیا لەسەر دوکانی کاکم بووم، هات‌و هەندێك قسەمان کرد. ئەوە بو من گیرام‌و حەوت مانگ‌و بیست رۆژ لەشوعەیبە مامەوە. کە گەڕامەوە سلێمانی، رۆژێك هەر لەسەر دوکانی کاکم بەتەنیا بوم، ژنێك بەعەباو پەچەوە هات‌و زەرفێکی دایە دەستم کە هەندێك شیرینی‌و شوشەیەك عەترو دەسەسڕێکی جوانی تێدابو، کە پەچەکەی لابردو رووی نازەنینم دییەوە، شاگەشکەبووم، بەڵام کاتێ دەستی چەپی دەرخست ئەڵقەیەکم لەپەنجەیدا بینی، نەك هەر هاتمەوە سەر سفر! بەڵکو خورپەیەکی نیمچە کوشندە لێیدام! ئەویش گریاو وتی چیبکەم، تۆ دیارنەمایت‌و بەزۆریش دڵیانم بەکەسێك بەهیچ جۆرێك ناچێتە دڵمەوە!.

**• دوای ئەوە؟**

– دوای ئەوە، وەك پێشتر بۆم گێڕانەوە، ساڵی ١٩٥٧ نەفی کرام بۆ ئەبوغرێب، لەبەغداد یەکەم دیوانی هەڵبەستەکانم چاپکردو ناومنا: نازەنین.

**دیمەنێك لەشانۆگەری ئافرەت‌و نوشتە**

**ڕۆژنامەی (تایم) ژمارە ٣٦ کانونی دووەمی ٢٠٠٢**

**بەئێرانییەکانم وت کەی شۆڕش دەکەن وتیان هەر کات شا فەرمانی دا**

**لەم ئەڵقەیەدا کامیل ژیر هەندێ لایەنی شاراوەی ژیانی سیاسی خۆی دەگێڕێتەوە**

**• زۆرمان ماندوکردیت. ئەشێ پێویستمان بەوچانێک هەبێ. لەم وچانەدا من هیچ پرسیارێک ناکەم ئەگەر بکرێ، بەدەم خواردنەوەی قاوەیەکەوە، هەندێک سەرگوزشتەی خۆشیناو دەفتەری بیرەوەریەکانت بخەینەوە سەرلاپەڕەیەکی تایم؟**

–ئەمە گوایە وچانە!؟

**ئەشێ وچانی ڕۆژنامەنووس و نووسەر، هەروابێ!!**

– باوابێ. فەرموو ئەمە ژمارەیەك لەو سەرگوزشتانە:

١–ئێستا لەم کاتەدا، نایەتەبیرم کە پیرەمێردی نەمر، لەچ ساڵێکەوە دەستیکرد بەبوژاندنەوەی نەورۆز. بەڵام لەبیرمە ئەو دووساڵەی لەحوجرە ئەمخوێند، ١٩٣٩ و١٩٤٠، مەلای حوجرەکان لەمانگی نەورۆزدا ، نەورۆزنامەیان ئەنووسییەوە بۆ قوتابیەکانیان. دەستورەکەشوابوو، هەر قوتابیەك قاپێکی فەخفوری ئەبرد بۆ مەلا. ماڵی واش هەبوو هەندێك دیارییان لەو قاپەدا ئەنارد بۆ مەلای حوجرەی منداڵەکەیان. مەلاش بەقەڵەم و ئورچ و مەرەکەب، نەورۆزنامەیەکی لەسەر قاپەکە ئەنووسیەوەو بەمنداڵەکەدا ئەیناردەوە بۆ ماڵەکە، ئیتر ئەو قاپە بۆ ماوەیەك هەڵئەگیرا بۆ موبارەکی. یا بەئاوێك ئەشۆردراو ئاوەکە بۆ هەندێك مەبەستی پیرۆز بەکارئەهێنرا. ئیتر ئەوەبو پیرەمێرد دەستیکرد بەبوژاندنەوەی نەورۆز بەجۆرێکی تر. هەموو ساڵێك لەگردی مامەیارە لەسلێمانی، سەیرانێکی گەورەی ساز ئەکرد بۆ خەڵکی شار، یاپرلخی بۆ ئەکردن، ئەبو بەشایی و هەڵپەڕکێ. دوای ئەمانە ئەهاتە سەر مەبەستە سەرەکییەکەی کە هوشیارکردنەوەی نەتەوەیی بو. ئەویش بەبەستنی کۆڕی وتارو هەڵبەست خوێندنەوە.

یەکێك لەو کۆڕانە، ئەو کۆڕە بو کە فایەق بێکەس هەڵبەستی (بیست و حەوت ساڵە)کەی تیا خوێندەوە. بیرمە، ئەو ساڵانە زۆر ئارەزوی سەیرکردن و بیستنی ئەو کۆڕانەم ئەکرد. ئەو ساڵە چادرێك هەڵدرابو، لەبەردەم چادرەکەدا ژمارەیەك کورسی لەشێوەی نیوە ئەڵقەیەکدا دانرابو. ئەمۆنز لەسەر کورسییەك لەناوەڕاستی کورسییەکانی تردا دانیشتبو، جگە لەدانیشتوانی سەر کورسییەکان کە لەبیست، سی کورسییەك تێپەڕی نەئەکرد، خەڵکەکانی تر هەموو بەپێوەبون بەدەورو لەبەردەم کورسییەکاندا. من کەوتمە پشت کورسییەکەی ئەدمۆنزەوە. ئاوڕێکی لێدامەوەو بەکوردی لێی پرسیم: کوڕی کێیت؟ وتم فلان. وتی: نایناسم. وتم: برازای أ . ب. هەوریم، وتی: بەڵێ ئەیناسم. لەو کاتەدا بێکەس هەڵبەستەکەی خوێندەوەو دەستوپەنجەی (وەك هەڕەشە) راتەوەشاند. لەبیرمە جۆرە پشێوی و غەڵبەغەڵبێك کەوتە ناو ئامادەبوانەوە. من هەڵبەستەکەو دیمەنەکەی بێکەسم ئەوەندە پێخۆشبوو، هەر لەوێدا هەندێك لەهەڵبەستەکەم هاتەبەر.

بەو جۆرە جەژنەکانی نەورۆز درێژەی کێشا تا حیزبایەتی تێکەڵ بەو ئاهەنگانەی نەورۆز بو. یەکێك لەحیزبەکان کەوتە تاوانبارکردنی پیرەمێرد بەوەی (جاسوسی ئینگلیزە!!( میریش ئاهەنگەکانی نەورۆزی قەدەغەکرد. پیرەمێرد بەوە زۆر نیگەران بو. داماوە هەر ئەوەی بۆ مابوەوە، ئەیوت: "حیزبی حیزباب، ئاگری نەورۆزیشیان لێکردین بەسیاسەت!".

٢- پێشتر باسی ئەوەم کرد کە سەردەمێك دەمەقاڵێی پارتی‌و شیوعی لەسەر ئەوەبو کە ئایا کورد نەتەوە (أمة)یە یا (أمة) نیە، ڕۆژێك لەنزیك سەرقەبرانی سلێمانی، ئەحمەدی ئەولێ، ناسراو بەئەحەقازوو، لەکاتێکدا کە بەداسێك گیای بۆ ئەسپەکەی ئەبڕی، گوێی لەو مشتومڕە بو لەنێوان دوو کەسدا، ئەویش ئەچێ داسەکەی لەملی کابرای شیوعی گیرئەکاو ئەڵێ: ئێستا قسە بکە، کورد ئوممەیە یا ئوممە نیە!؟ کابرای داماو لەتاو گیانی خۆی ئەڵێ: بەقەبری باوکم ئەوەنی کورد هەیە، هەر ئوممە بووە!

٣- هەر لەو بارەیەوە، هەڤاڵێکی پارتی، بەڕێکخەرەکەی ئەڵێ: کاکە ئێمەش هەر بەگەڵ(ی) مارکسیەکان جاوی ئەم کیشەیە ئەپێوین! من بەم گەزە دەرەقەتی ئەوان نایەم. فەرموو ئەوە ستالین کۆمەڵێ مەرجی داناوە بۆ نەتەوە، یەکێکیان ئەوەیە کە ئەبێ نەتەوە ئابوورییەکی هاوبەشی هەبێ. دەی نەتەوەی کورد کوا ئابووریی هاوبەشی هەیە؟ ڕێکخەرەکەش، کەسێکی قۆشمەئەبێ، ئەڵێ ئەمجارە بچۆ بڵێ: من بەڵگەی زانستیم هەیە، ئەمەش بەڵگەکەیە:

یمامة في أعلى الشجرة

آمنة في عشها مستترة

واتا: کۆترێك لەسەر درەختەکە

دڵنیاو پارێزراوە لەهێلانەکەیدا

هەڤاڵەکە، عەرەبی نازانێ، بەتوڕەییەوە ئەگەڕێتەوە بۆ لای ڕێکخەرەکەیو ئەڵێ: تۆ بەمن ڕانەبوێری!؟ من چوم ئەوەم وت، ئەوانیش تێر پێکەنین، ئنجا مانای ئەو قسانەیان پێوتم!

٤-لەپەنجاکاندا کە ئێمەومانان تازە دەممان لەوێژەوە ئەدا، عەسران ئەچووینە تەکێ، کە باخی قەرەجیشی پێئەوترا، نزیك گردی سەیوان لەسلێمانی. بەدەم پاقلەو چاخواردنەوە، دەستمان ئەکرد بابەسی وێژەیی‌و شەڕەهەڵبەست. گەلێجار لەدەوری ئەورەحمانی خامەش کۆئەبووینەوەو گوێمان لەقسە خۆشەکانی ئەگرت. من پێموایە ئەگەر بمانەوێ چالاکییەکی وەك ئەوەی (مربد)ی عێراق ئەنجام بدەین، ئەوا ئەو جێگەیەی باخی تەکێ گونجاوە بۆ ئەو مەبەستە. لێرەدا، لای من سەرگروشتەکە ئەوەیە: کە هەڵبەستێکی تازەی خۆمم بۆ ئەخوێندنەوە، ئەیانوت: خراپ نیە! بەڵام ئەگەر بموتایە ئەمە هەڵبەستێکی تازەی گۆرانە، یا هی هەردییە، ئەیانوت: بەڕاستی جوانە!

٥- هەر لەپەنجاکاندا، لەسلێمانی، ماوەیەك شیوعی‌و پارتی، کاری سیاسی هاوبەشیان ئەنجام ئەدا وەك بەرەیەك. ڕۆژێك لەماڵی نەژادی ئەحمەد عەزیز ئاغا لەگەڕەکی سابونکەران، کۆبوونەوەیەکی بەرەییمان ئەنجامدا. من نوێنەری کرێکاران، نەژاد نوێنەری گەنجان، حیلمی عەل شەریف نوێنەری پارتی، وەستا عەول نوێنەری شیوعی. ماڵی نەژاد، مۆبیلەیان هەبو، ئەوسا کەم ماڵ مۆبیلەی هەبو،

وەستا عەول لەسەر مۆبێلەکان دانەنیشت. چولر مشقی لەسەر زەوییەکە دانیشت. وتمان فەرموو لەوێ دانیشە. وتی: نا، من نەفسیەتی پیتی بۆرجوام نیە، لەسەر مۆبێلە دانانیشم!

٦- دیارە ئەم سەرگوزشتانەی ئێستا ئەیانگێڕمەوە، زیاتر بۆ خۆشیو پێکەنینن. هەر لەپەنجاکاندا، کە من زوو زوو ئەگیرام لەدوای هەموو خۆپیشاندانێك. جارێك لەگرتوخانەی سلێمانی کە لەپشت سەرای سلێمانیەوە بو. ژمارەیەك گیراوی سیاسی بووین، بۆ ژەمی نیوەڕوان و ئێواران، لەکەسوکارەوە خواردنی باشمان بۆ ئەهات. بەڵام ژەمی بەیانیمان، هەندێ جار نیسکێنەکەی گرتوخانەکە بو، ئەو خواردنانەی ڕۆژی پێشوو بۆمان ئەهات، هەندێکی ئەمایەوە بۆ ژەمی بەیانیانی ڕۆژی دووەم. برادەرێکمان (ف.ك) ئەو ڕۆژانەی بیزلێنیایە نیسکێنەیە، زوو لەخەو هەڵئەساو خواردنەکانی ڕۆژی پێشووی سفر ئەکرد! کە ئەکەوتینە سەرزەنشتکردنی، ئەیوت: من حەزم لەنیسکێنە نیە، ئەگەر لەبرسانا بمرم نایخۆم! بەیانییەك خواردنەکانی ڕۆژی پێشووم لێ شاردەوە. کەنیسکێنەکە هات، توێژاڵێکی تەنك ئاوی سەروپێی ڕۆژی پێشووم بۆ کرد بەسەر قاپێك نیسکێنەداو وتم برلینە ئەم سەروپێیە بۆ کاك (ف). ئەویش هەمووی هەڵقوڕان. کردمان بەپێکەنینو خۆمان سەروپێکەمان خواردو ئیتر دزەخواردنی بەیانیانمان لێ قەدەغەکرد!

٧- ساڵی ١٩٥٤ کە گیراینو ناردیانین بۆ شوعەیبە، سەربازی ئەوەی ئێمە قوتابی بووینو نەئەبوو سەربازیمان پێ بکرێ، ئەشیاندلین بەبلدگای سەربازی بەتۆمەتی ئەوەی دواکەوتوو (متخلف)ین! دادگای سەربازیش لەشاری دیوانیە بو. هەر جارەی دە دوازدەیەکمان ئەکرلینە فارگۆنی سەربازیی شەمەندەفەری نێوان بەسرەو دیوانیەوەو لەگەڵ پاسەواندا بەڕێئەکرلین. ئێمەش ئەوەمان بەهەلئەزانی بۆ ئەوەی ئەو سەربازە ئاساییانەی تر کە لەفارگۆنەکەدا ئەبون، ڕۆشنبیر بکەینو بیانخەینە سەر بیری سیاسی دژی ڕژێم. گروپەکەی ئێمەش هەروایکرد تا باس هاتە سەر بەراوردکردنی یەکێتی سۆڤێتو ولاتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا. بێ ئەوەی هیچمان ئەو دوو ولاتەمان دیبێ، هەرچی زیادەپیاهەڵدان هەیە بەسەر یەکێتی سۆڤێتو تانەوتەشەر هەیە لەئەمریکا، ئەمانوت، هەندێ جار ئەوان بەسەرسامیەوە سەیری یەکیان ئەکرد وەك ئەوەی باوەڕ بکەنو نەکەن. بەو جۆرەو بەدەم ئەو قسانەوە، شەمەندەفەر ڕێگەی بڕی تا گەیشتینە کەناری شاری دیوانیە. شەمەندەفەرەکە دای بەلای خانویەکی دووقاتدا. خالید سەعید وتی: یەکێتی سۆڤێت ئەوەندە مەزنە، فڕۆکەی هەیە ئەتوانێ لەپەنجەرەی ئەو خانووەوە خۆی بکا بەژووردلو چەند دەورەیەك بەناو ژوورەکەدا بکاتو لەپەنجەرەکەی ئەو دیوەوە دەرچێت!! سەربازەکان وتیان کەواتە ئێوە ئەمە چەند سەعاتە بەئێمە ڕائەبوێرن! هەستانو دوورکەوتنەوە لێمان.

لەسلێمانی، هاوڕێ (غ) بەنهێنی نێردرابو بۆ یەکێتی سۆڤیەت، بیست ڕۆژێکی لێبوبو، کە گەڕایەوە، کەوتە کۆڕبەستنی نهێنی لەماڵاندا. هەر جارەی پڕ بەژوورێك خەڵکی بۆ کۆئەکرایەوە. ئەویش دەستینەکرد بەگێڕانەوەی گەشتەکەی خۆی. قسەکانی وائەکرد، ئەتوت لەبەهەشت گەڕاوەتەوە. هەندێ جار قسەکانی لەقسەکانی ناو شەمەندەفەرەکەی ئێمە ئەچو! سەیر ئەوەبو، بەجۆرێك وەڵامی پرسیارەکانی ئێمەی ئەدایەوە وەك دە ساڵ زیاتر لەیەکێتی سۆڤێت ژیابێو شارەزای هەموو قوژبنو

یاساو ژیانی ئەو خەڵکەی ئەوێ بن. قسەکانی، لەقسەی ئەو وشکە موسوڵمانانە ئەچوو کە هەموو وەلامێك لەبارەی ئەو دنیاوە ئەدەنەوە! بەلام باشە مامۆستا (غ) ئێستا ئەویش وەك من بیرئەکاتەوە.

ئنجا دوای چواردەی تەمموز، هەندێك بانگهێشت ئەکران بۆ یەکێتی سۆڤیێت، لەوانە دوکتۆر عەبدولرەزاق محیەدین، کە گەڕایەوە، لەرۆژنامەی (الحرية)ی بەغدادا وتارێکی بەناونیشانی: ئەو نەتەوەیەی لەیەك ژووردا ئەخواو ئەنوێو خۆی ئەشوات! (الأمة التي تأكل وتنام وتستحم في غرفة واحدة!).

ئنجا قسە قسە ئەهێنێ، من لەسەرەتای شەستەکاندا، لەگەڵ ئەو دوکتۆر عەبدولرەزاقە بوم بەبرادەر، ئەویش بەهۆی مامۆستا مەسعود محەمەدەوە کە هەردوکمان لەبەغداد فەرمانبەر بووین لەکۆمپانیای مەوادی بینائی، دوکتۆر، مامۆستای زانکۆ بو، ماوەیەکیش بو بەسەرۆکی کۆڕی زانیاری (المجمع العلمي) لەبەغداد. ساڵی ١٩٦٢ هەرچی بکەوتایەتە بەر شالاوی بەعس، ئەگەر نەکوژرایە، بەهیلاك ئەچو! بەیانیەك زوو پێش دەوام، رەفعەت ئەحمەد کە ئەویش لەکۆمپانیاکەی ئێمە فەرمانبەرێك بو، پێشتر لەسەردەمی پاشایەتیدا بەڕێوەبەری ئەمنی بەغداد جدیدە بو، دیم لەسەر رێگای من وەستابو، وتی کامل من وای بۆ ئەچم ئەمڕۆ دێن ئەتگرن!.. وتم چۆن ئەزانی؟ وتی دوێنێ هەواڵی تۆیان لەمن پرسی، پرسیارەکانیان هی ئەوەبو بتگرن. منیش بەپەلە خۆم کرد بەناو کۆمپانیاکەداو دلولیەکی مۆڵەتی هەفتەیەکم نووسیو لەسەر مێزی سکرتێر دامناو چوومە دەرەوە. کە گەیشتمە سەر شەقامەکە، هێزێکی چەکدار دای بەسەر کۆمپانیادا. منیان نەناسی. سواری تەکسیەك بومو ئەو رۆژە خۆمم شاردەوە. رۆژی دوایی بەهۆی هەندێك برادەرمەوە، کەوتمە سۆراخی رووداوەکە، وتیان بەڵێ ئەوانە بۆ گرتنی تۆ هاتبون، بەلام سکرتێر پێی وتبوون ئەوەتا لەرۆژێك لەوەوپێشەوە داوای مۆڵەتی کردووە.

دوای دوو رۆژ، دوکتۆر عەبدولرەزاقم بیرکەوتەوە، رۆژی سێهەم، بەیانیەکەی پێش دەوام چووم بۆ ماڵیانو بۆم گێڕایەوە. ئەویش وتی من رەشید ئەناسم، جارێ دانیشە بادەوام دەسپێبکا، مەبەستی رەشید موسلح بو، حاکمی عەسکەری کە قسەی لەگەڵ کرد، لەوەلامدا وتبووی ئێستا هیچ لەبارەی کێشەکەی ئەوەوە نازانم، بینێرە بۆ لام. دوکتۆر گلتی ئەوەی لێ وەرگرت کە ئەگەر نەشتوانێ رزگارم کا، نەمگرێت، کە چووم هەندێك خەڵکی سلێمانی لەوێ بوون. یەکێکیان خزمی خۆم بوو (ئافتاو خانی میرزا غەفور) وتی: تۆش ئەتەوێ بچیت بۆ سلێمانی؟ تومەزلەو رۆژانەدا هەرچی بچولیە بۆ کوردستان، ئەبوایە رەزامەندییەکی لەدائیرەی حاکمی عەسکەرییەوە وەرگرتایە!

کە چوومە ژوورەوە بۆ لای حاکمی عەسکەریو باسی کێشەکەی خۆمم بۆ کرد، ناردی ئەفسەرێك هاتو وتی بزانە ئەگەر فەرمانی گرتنی لای ئێمەوە دەرچووە، فایلەکەیم بۆ بێنە، زۆری پێ نەچوو، فایلەکەی هێنا، حاکم بەدەم خوێندنەوەیەوە سەری راتەوەشان! ئنجا وتی: ئەو رۆژەی لەموعەسکەر رەشید هەوڵی ئینقلابێك درابو، تۆ لەناو کۆمپانیاکەی خۆتاندا هاوارت کردووە: وا بەعس رووخا!! جگە لەوە کە مەلا مستەفای بارزانی گەڕاوەتەوە، تۆ قەمەرەیەکت بەدیاری بۆ بردووە! کە ئەوەی وت، خۆم بۆ نەگیراو دامە پرمەی پێکەنین!، وتم: من فەرمانبەرێکی بچووکم، باوەڕبکە ئەگەر بمبوایە،

پاسکیلێکم بۆ خۆم ئەکڕی بۆ ئەوەی هاتوچۆی کۆمپانیای پێبکەمو لەچاوەڕوانکردنی پاس ڕزگارم بێ. ئنجا وتم: تکایە پرسیارێکت لێ ئەکەم؟ وتی: گوول. واتا بڵێ وتم ئەوەی ئەو ڕاپۆرتەی لەسەر من نووسیوە، هادی عەزاوی نیە؟ وتی: شمدریك!؟ واتا چوزانیت!؟ وتم من جگە لەوەی لەکۆمپانیاکەماندا بەڕێوەبەری ئیدارەو زاتیەم، سەرۆکی لیژنەی موشتەریاتیشم. ئەم هادی عەزاوییە کە لێپرسراوی حەرەس قەومیەکانی کۆمپانیایە، دەمێکە هەوڵئەدات بۆ ئەوەی ئەو ببێ بەسەرۆکی لیژنەی کڕین. وتی: خاطر یبووگ، واتا بۆ ئەوەی بدزێت، وتم: باوەڕ بکە من چەند جار داوام لەمودیری مفەوەز کردووە کە ئەو ئیشەم لەکۆڵ بکاتەوە، بەڵام ئەو (کە لەو کاتەدا ڕەشید عارف بوو) ڕازی نابێو ئەڵێ من باوەڕم بەتۆیە، چونکە دز نیت، ئۆتومبیلەکەش لەڕاستیدا ڕەشید عارف کڕیبووی بۆ بارزانی.

دیاربوو، ڕەشید موسڵح، باوەڕی بەقسەکانم هێنا، تۆزێکیش لەبەرخۆیەوە وردە جوێنی بەبەعس داو وتی ئاوا ئەیانەوێ ملی خەڵك بشکێنن! وتی: بچۆرەوە سەر ئیشەکەی خۆت، بعد ماکو گواد یلزمك! واتا ئیتر گەوادێك نیە بتگرێ. وەرەقەیەکیشی بۆ نووسیم کە ئامادەبوومو بەردراوم. کەچی دوای نزیکەی مانگێك گیرامو بردیانم بۆ ئەمنی عامە. شەوێکی تیابووم، گیراوەکانی تر، هەموو کەلەپاچە کرابوون ئەوەندەیان ئەشکەنجەدابوون. بۆ ڕۆژی دوایی کە بانگیان کردم، گیراوەکان وتیان سەعاتەکەت لای ئێمە بەجێبێڵە با لەکاتی ئەشکەنجەداندا نەشکێ.

دەستیان کرد بەلێکۆڵینەوە لەگەڵمدا. وتیان ئەزانین تۆ بەفەرمانی حاکمی عەسکەری بەردراویت. بەڵام پێمانبڵێ ئەو ڕۆژەی هاتین بۆ گرتنت، تۆ چۆن زانیبووت، وا داوای مۆڵەتت کردبوو. وتم من نەمزانیبوو، ڕۆژێك پێشتر داوای مۆڵەتم کردبوو بۆ ئەوەی خۆم ئامادەکەم بۆ ئیمتیحانێکی کولیە (ئەو کاتە لەپۆلی دووی کۆلیجی ماف، ئێواران ئەمخوێند) چیرۆکەکەی هادی عەزاویشم بۆ گێڕانەوە. ئەوانیش بەریاندام.

٨- ساڵی ١٩٧٤ منو دوکتۆر کەمال مەزهەر، پێکەوە پەیوەندیمان بەشۆڕشی ئەیلولەوە کرد، من لەبەر ئەوەی بەڕێوەبەری کۆمپانیای زیوتی نەباتی بووم لەسلێمانیو لەماوەتو قەڵادزێو سەنگەسەر وەکیلمان هەبو، لەو سێ شارۆچکەیە بێ خانەخوێ نەبووین، لەماوەت عەزیز مجێدین، لەقەڵادزێ حاجی بابەکرو لەسەنگەسەر حاجی کاکەڕەش زۆر خزمەتیان کردین. بۆ ڕێگەی نێوان ماوەتو قەڵادزێ، کەرێکو یەسترێکمان بەکرێگرت. دوکتۆر کەمال وتی من ناوێرم سواری یەستر ببم، بەڵام لەڕێگە هەموو جارێك دووبارەی ئەکردەوە ئەیوت: خولێیداو بەسواری بەسترەوەنو منیش کەرسوار!!

لەو ماوەیەدا کە من کەوتمە ئەمانەتی عەدلو ئەوقافو کرام بەموفەتیش عەدلو زوو زوو ئەچووم بۆ پشکنینی دادگاکانی شۆڕش لەناوچەکانی سلێمانیو هەولێرو بادینان، گەلێ سەرگوزشتەی خۆشم لاکۆبووەوە، لەوانە:

- کە مامۆستا ئەنوەر تۆفی هاتە ناو شۆڕش، لێی کۆبوونەوەو پیرۆزبایی ئەو هەنگاوەیان لێکرد وەك هەڵوێستێکی نیشتمانیو نەتەوەیی. ئەو لەوەڵامدا وتی: ئەوانە هیچیان نیە. ڕاستییەکەی من لەدەس ژنەکەم هەڵاتووم!

– لەبابەکر ئاوا کە جێگەی کارو نوستنی ئێمەبو. شەوێك لەدرەنگ کاتێکدا لەدەنگە دەنگی دانوەرەکانی دادگای تەمیز خەبەرمان بووەوە کە خۆیان ئەھاویشتە کونە تەیارەکانەوەو ئەیانوت تەیارە ھات! دوایی دەرکەوت یەکێکیان بەدەم خەوەوە، ورێنەی کردووەو وتوییتی: ھات ھات!!

– لەشەوێکی بەھاردا، بایز ئاغای ئەندامی دادگای تەمیز ھاواری مەغدیدی ئەکرد، بەلام ھاوار ھاوارەکەی لەوەئەچوو کە شتێکی لێقەومابێ. ھەموو بەھەڵەداوان، لەگەڵ مەغدیدا، خۆمان گەیانە ژوورەکەی بایز ئاغا. مەغدید وتی فەرموو قوربان. بایز ئاغا وتی: ئا بزانە ھەورە یا سایەقەیە!

– کە لەئێرانییەکانمان ئەپرسی: ئەی ئێوە کەی شۆڕشێك ئەکەن، لەوەلامدا ئەیانوت: ھەر کات شا فەرمانی دا، ئێمەش شۆڕش ئەکەین!! تومەز ئەوە تەقەبوو لەئێمەیان ئەکرد، گوایە ئێمە بەفەرمانی شا ئەو شۆڕشە ئەکەین!.

– لەگەڵ مامۆستا ئەحمەد ھەردیدا، لەشاری شنۆ خانویەکمان پێکەوە بەکرێگرتبوو، خۆمان لەمدیو بووینو خێزان لەوێو جارجار سەرمان ئەدان. روانیمان خێزان زۆر بێزارن لەدەس جۆرە کرمێکی ورد لەژوورەکاندا کە ژیانی پێتالکردبوون!.. بڕیارماندا بگوێزینەوە. من وتم باچین بۆ شاری نەغەدە. وتیان بیستوومانە لەوێ بەھیچ جۆرێ خانوو دەسناکەوێ لەبەر ئەوەی بەھۆی بنەماڵەی بارزانییەوە کە لەوێن، خەلکەکەی تریش ھەموو رژاوەتە ئەوێ. وتم من سەرێك ئەدەم بەشکم دەستمکەوێ. کە چووم وتیان بچۆ بۆ لای حاجی سەید مستەفا، ئەو مولکی زۆرە. چوومە سەر دوکانەکەیو داوای خانووم لێکردو باسی خانووەکەی شنۆم بۆ کرد. ئەویش دەستیکرد بەگریان! تا ئەبوو گریانەکەی زیاتر ئەبو، من لەدڵی خۆمدا ئەموت: ئەوە بۆ ئاوارەییو دەربەدەریی کورد ئەگری! ھەرچۆنێبو، تۆزێك ھاتەوە سەرخۆیو لەچاوی مێزەکەیدا ھەندێ کلیلی دامێو وتی فەرموو ئەوە خانوو. وتم کرێکەی چەندە؟ جارێکیتر

دایەوە پرمەی گریانو وتی: کرێ بەکەیفی خۆتە. ھەرچەندت لەتواناداپێ ئەوەندە. ئەگەر نیشە، بەخۆڕایی. زۆر سوپاسم کردو دیسان لەدڵی خۆمدا وتم: میللەتێك ئەوەندە ھەستو ھۆشیاریی نەتەوەیی ھەبێ، چۆن سەرناکەوێو رزگاری نابێ. ئەو ھەڵوێستەی حاجی ئەوەندەی تر دڵی بەشۆڕشەکەمان پیێخۆشکردم. لەکاتی رۆیشتنمدا، جارێکیتر حاجی دەستی کردەوە بەگریان. منیش کەوتمە دلخۆشیدانەوەیو پێموت: حاجی گوێیمەدەرێ، خۆزێگەی خەبات بەگوڵو رێحانە ئەچێنرلوە، ئەوی بیەوێ میللەتەکەی رزگار کات، ئەبێ تاڵیو سوێریش بچێژێت. تکات لێئەکەم ئیتر مەگری. وتی چۆن نەگریم!؟ دنیا وای لێبێ سەیدێکی وەك جەنابت، ئەولادی پێغەمبەر، رۆحم بەقوربانی بێ، ئاوا دابمێنێ بۆ خانوویەك! ئاخر چۆن نەگریم!!؟

بەو جۆرە ھێنامیەوە سەر سفر، من بیرم بۆچی ئەچوو، ئەو بۆچی ئەگری!؟ دوایش بۆم دەرکەوت ئەو بۆیە پێی ئەوتم سەید، چونکە من پشتوێنێکی زەیتونیم لەسەر رانکوچۆغەکەم بەستبوو!.

**ڕۆژنامەی (تایم) ژمارە ٣٧ ڕۆژی ٢٠٠٣/١/١٨**

## هەرچی ڕێکەوتننامەو بەڵێن بۆ مافی کورد لەژێر سایەی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا بکرێت تەنیا مەرەکەبی سەرکاغەزەو هیچی تر

**لەدرێژەی گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی خۆیدا لەم ئەڵقەیەدا کامل ژیر بەدوورودرێژی باسی چوارچێوەی بیری نەتەوەیی کاژیك دەکات**

**• ئێوە هەمیشە وەك (قوتابخانەیەکی بیری نەتەوەیی) ناوی کاژیك ئەبەن، هۆو بنچینەی ئەو قوتابخانەیە چیبوو؟**

− هۆو بنچینەی ئەو قوتابخانەیە، مەترسی توانەوەی نەتەوەی کورد بو لەناو ئەو نەتەوانەی کوردستانیان دابەش‌و داگیرکردووە، لەناوەڕاستی چلەکانی چەرخی بیستەمەوە، بیرۆکەیەکی تازەی پڕلەمەترسی، کەوتە ناو دنیای بیرو سیاسەتی کوردییەوە. ئەویش بیرۆکەی پێکەوە ژیانبوو لەگەڵ داگیرکەراندا! ئەم بیرۆکەیە، لەسەر هەڵدانی لقێکی پارتی کۆمۆنیستی عێراق لەکوردستان (١٩٤٤) بەناوی یەکێتی تێکۆشین (وحدة النضال)و حیزبی ڕزگاری کوردستان (١٩٤٥) لەڕۆژهەڵات‌و پارتی دیموکراتی کورد کە دولیی بو بەکوردستان (١٩٤٦) هەر لەباشوری کوردستانەوە، هاتە ئارلوە.

بەپێی ئەم بیرۆکەیە، ستراتیجی کورد، لەسەربەخۆییەوە گۆڕا بۆ ئۆتۆنۆمی، ئۆتۆنۆمیش بۆ هەر پارچەیەکی کوردستان، واتا ڕازیبوون بەداگیرکردن‌و بەدابەشکردنی کوردستان.

**• ئەوە لەئەنجامی چیەوە بوو؟**

− ئەشێ کۆمەڵێ ئەنجام لەیەکیان دابێ‌و بوبنە هەوێنی دروستبونی ئەو بیرۆکەو ستراتیج گۆڕینە، لەوانە:

١− پەیدابوونی جۆرێك لەنائومێدی بۆ سەربەخۆیی کوردستان لەناو دڵ‌و دەرونی سیاسەتکارانی کوردا لەئەنجامی سەرنەکەوتنی شۆڕشەکانی کورد بەگشتی‌و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود بەتایبەتی.

٢− سەرهەڵدانی بیرۆکەی نێونەتەوەیی مارکسیانە لەجیهاندا بەگشتی‌و لەیەکێتی سۆڤیەت بەتایبەتی کە ئەم بیرۆکەیە هاندەرێکی کاریگەر بو بۆ پێکەوە ژیانی میللەتان لەناو یەك دەوڵەتدا، بگرە بۆ بەزاندنی سنور لەهەموو جیهاندا لەپێناوی بەرژەوەندی چینی کرێکاراندا بەپێی دروشمی (ئەی کرێکارانی جیهان یەکگرن). هەر لەچوارچێوەی ئەم بەرنەنجامەدا، هاتنە ئارای کۆماری کوردستان لەمهاباد بەپشتگیری یەکێتی سۆڤیەت، گورەوتینێکی زیاتری دا بەبیرۆکەکە. مەبەستم بیرۆکەی پێکەوەژیانەکەیە بەتایبەتی نەوەی سەرکردایەتییەکانی ئەو حیزبە کوردییانەی ئەو ڕۆژگارە، موتوربە کرا بوون بەبیرۆکەی مارکسیتی!.

٣− ئەم ستراتیج گۆڕینەو بیرۆکەی پێکەوەژیانە، لەبەرژەوەندی ڕۆژئاوا بەگشتی‌و بەریتانیا بەتایبەتی بو کە ئەوان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان، باشوری کوردستانیان بەزۆر لکان بەعێراقی عەرەبییەوە بۆ ئەوەی لەو عێراقە نوێیە دەوڵەتێکی فرەنەتەوەو فرەئاینی دروستبکەن تا خەلکەکانی

ناو ئەو دەوڵەتە لەبەر دوبەرەکی و ناکۆکیی نێوان خۆیان، نەیەرژێنە سەرلێدانی بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا بەپێی سیاسەتی کوتیکەو کزنیکە (فرق تسد)، لەهەمانکاتدا، ئینگلیز ویستی عەرەبی عێراق بکات بەپاسەوان بەسەر چاڵە نەوتەکانی کوردستانەوە.

٤- بیرۆکەی پێکەوە ژیان، لەبەرژەوەندی نەتەوە داگیرکەرەکانی کوردستانیش بو کە هەریەکەو پارچەیەکی پر لەخێروبێری کوردستانیان کەوتبوە ژێر چنگ.

ئاوا بەو جۆرە، کۆمەڵێ ئەنجام لەیەکیاندلو بونە هەوێنی دروستبونی بیرۆکەی پێکەوە ژیان و دەسبەرداربون لەبیرۆکەی سەربەخۆیی کوردستان.

**• هیچ لەو باروددۆخ و هەڵکەوتە ئالآنە، گۆڕرابو، تا قوتابخانەی بیری نەتەوەیی کاژێکی بۆ بێتەئاراوە؟**

- بەڵێ، زۆر شت لەوانە:

١- بەکردەوە دەرکەوت کە ئەو دروشمی پێکەوە ژیانە، بۆ کورد، لەماڵوێرانی بەولاوە هیچی تری لێ سەوز نابێ، ئاشکرابو هەرچی رێکەوتننامەو بەڵێن و پەیمان و یاسایەك بۆ مافی کورد لەژێرسایەی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستاندا بکرێت، تەنیا مەرەکەبی سەر کاغەزەو هیچی تر، بەڵکو دەرزیی سرکەرو بێهۆشدلرووە.

ئێمە ئەیزانین، کە کاتی خۆی باشوری کوردستان بەکۆمەڵێك مەرجەوە خرایە سەر عێراقی عەرەبی وەك: (ئەبێ کورد خودموختارییەکی هەبێ و داهاتی چاڵەنەوتەکانی کەرکوکیش بۆ کوردستان خەرج بکرێت). دوای سەرنخون (انقلاب)ی چواردەی تەموزیش، لەدەستوری کاتیدا نووسرا: (عەرەب و کورد هاوبەشن لەنیشتمانی عێراقدا). بەلآم ئەوانە هیچیان لێ سەوز نەبو.

٢- دوای سەرنخوونەکەی چواردەی تەممز، ئیتر ئەو پەرۆشییەی رۆژئاواو ئینگلیز بۆ یەکێتی خاکی عێراق نەما. نەك هەر پەرۆشی نەما، بەڵکو لەوەوە کە بەچەکو فرۆکەکانی ئینگلیز، شۆرشەکانی شێخ مەحمودو بەرزان سەرکوتنەکران، کەوتنە هاندانی کورد بۆ دژایەتیکردنی عێراق.

٣- تاقیکردنەوەکەی کۆمای کوردستان لەمهاباد کە ئەویش تەنیا ئۆتۆنۆمییەك بوو، کرایە قوربانی بەڵێنی چاڵە نەوتێك بۆ سۆڤیەت، ئەگەرچی ئەو چاڵە نەوتەشی دەستنەکەوت و ئێران دەستی سۆڤێتی بڕی!

٤- هەر دوای چواردەی تەممز، هەل بۆ ژمارەیەك لەرۆشنبیرانی کوردو رۆشنبیرانی عێراق رەخسا کە سەردانی یەکێتی سۆڤیەت بکەن، لەئەنجامدا ئەوانە بۆیان دەرکەوت کە پێکەوەژیانی گەلانی سۆڤیەت، لەزۆرەملێ و حوکمی ئاگرو ئاسن و کولونیالستی کۆمۆنیستی و روسی بەولاوە، چی تر نیە.

٥- هەر دوای چواردەی تەموز، شەپۆلی رەگەزپەرستانی عەرەب لەعێراقدا، بەجۆرێك تەوژمی ئەدا، کە مەترسی بەزۆر تواندنەوەی کوردی لێ ئەکرا لەعێراقدا. ئەوەش وەك لەوتارەکانی رۆژنامەی (الثورة)ی بەغدادو پرۆگرامی حیزبی بەعسدا بەدیارئەکەوت.

٦-لەناو پارتی دیموکراتی کوردستانیشدا، کە ئەو کاتە تاکە حیزبێکی کوردستانی بو لەباشووردا، مەترسی لەناوچوونی ئەو نیمچە ئاراستە نەتەوەییانەیەش کە تیاهەبو، پەیدابو، بەتایبەتی دوای ئەوەی ژمارەیەك کۆمۆنیست خۆیان کوتایە ناو سەرکردایەتی پارتییەوەو دەستیانکرد بەهەوڵدان بۆ

ئەهێشتنی ڕێکخـراوە کوردســتانییەکانی وەك لاوان و قوتابیــان بەتێکـەڵکردنیان لەگـەڵ ڕێکخـراوە عێراقییەکاندا! هەموو ئەوانە، بوونە هاندەر و پاڵپێوەنەر بۆ ئەوەی کاژیك، وەك قوتابخانەیەکی بیری نەتەوەیی و وەك حیزبێکیش بۆ بەرجەستەکردنی ئەو بیرە بێتە ئاراوە.

**• تایبەتمەندێتییەکانی کاژێك چیبوون؟ مەبەستم ئەوەیە کە کاژێك لەڕووی بیروبۆچوونەوە، بەچی جیاکرایەوە لەحیزبەکانی تر؟**

– ئەتوانم بڵێم تایبەتمەندێتییەکانی کاژێك، لەهەموو ڕوویەکەوە، جیاکەرەوە بون لەحیزبەکانی تری ناو کوردستان، لەو ڕۆژانەداو ئێستاش لەوانە:

١– کاژێك ڕێکخستنێکو بیرۆکەیەکی سیاسی بو بۆ هەموو نەتەوەی کوردو بۆ سەرتاسەری کوردستان، واتا سنوری چالاکییەکانی کوردستانی گەورە بو، نەك تەنیا پارچەیەك یا هەرێمێك وەك ئەو حیزبانەی تر. ئەوەش بەپێی مادەی دووەم لەپەیڕەوی ناوخۆکەی کە ئەڵێ: (مەیدانی کارگوزاریی کاژێك هەموو کوردستانە، بەڵام لەسەرەتاوە بەشێکی کوردستان ئەکات بەبنکەی ئیشکردن و لەوێوە پەلئەهاوێ بەهەموو کوردستاندا).

٢– مەسەلەی (برایەتی) بەلای کاژێکەوە ئەوەبوو کە برایەتی پەیوەندییەکی نەژادیی نێوان کوردو کوردە، پەیوەندیی نێوان نەتەوەی کوردو نەتەوەیەکی تر، ئەشێ پەیوەندییەکی دۆستانەبێ. ئەمەش بەپێچەوانەی دیدی حیزبەکانی ترەوە کە هەمیشەو لەبەرییوەرە باڵورەی برایەتی کوردو عەرەب و کوردو هەرچی دژەکورد هەیە لێئەدەن و جەنگی کوردو کورد ئەکەن!

٣– کاژێك مەسەلەی کوردی لەسەرتاسەری کوردستانداو لەهەر پارچەیەکیدا بەیەك مەسەلە ئەزانی، بەپێچەوانەی حیزبەکانی ترەوە، بەتایبەتی حیزبەکانی ئەو سەردەمە، کە مەسەلەی کوردیان لەهەر پارچەیەکی کوردستاندا، بەمەسەبەی نیشتمانی ئەو دەوڵەتە ئەزانی کە ئەو پارچەیەی کوردستانی داگیرکردووە! ئەمە خاڵێکی گرنگەو شیکردنەوەی زۆر هەڵئەگرێ کە ڕەنگە لێرەدا ئەو ماوەیە نەبێ، تەنیا ئەوەندە ئەڵێم کە مەسەلەی کورد، بۆ نمونە، لەعێراقدا هەرگیز وەك مەسەلەی عەرەب بەگشتی و مەسەلەی عەرەبی شیعەو عەرەبی سونە نیە. هەروەها مەسەلەی کورد لەئێراندا، وەك مەسەلەی ئازەری و بلوش و عەرەب و فارس نیە. بەو جۆرە لەتورکیاو سوریاو سۆڤێتی جارانیشدا.

٤– کاژێك تاوانی پارچە پارچە کردن و داگیرکردنی کوردستانی ئەخستە ئەستۆی ئیمپریالیزم و دەوڵەتە هەرێمییەکانی دەوری کوردستانیش. هەروەها ئەو تاوانە، کەم تا زۆر، لەئەستۆی فەرمانڕەوایانی ئەو دەوڵەتەو گەلەکانیشیاندایە. کەچی حیزبەکانی تر، ئەم تاوانەیان ئەخستە تەنیا ئەستۆی ئیمپریالیزم.

٥– ئیمپریالیزم بەلای کاژێکەوە، تەنیا ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوا نەبو. ئیمپریالیزمی ڕۆژهەڵاتیش بو کە خۆی لەئیمپریالیزمی کۆمۆنیستدا ئەنوانند، لەوەش زیاتر، کاژێك ئەو دەوڵەتانەشی بەداگیرکەرو کۆلۆنیالیست ئەزانی کە کوردستانیان داگیرکردووە. کەچی بەلای پارتییە کوردستانییەکانیترو پارتییە مارکسیەکانەوە لەکوردستاندا، ئیمپریالیزم تەنیا ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوا بو!

لەم بارانەوە، کاژێکنامە، جەخت لەسەر ئەو لایەنانە ئەکاتەوەو ئەڵێ: (کاژێك داگیرکەرانی کوردستان بەیەك چاو تەماشا ئەکات و کوردستان تەنیا بەموڵکی کورد ئەزانێ و ئەبێ کورد هەر خۆی

فەرمانڕەوا بێ لەکوردستاندا. لەبەر ئەوە بڕوای بەو برایەتییە درۆزنەیە نییە کە لەڕێگەیەوە سەروەتو سامانی کوردستان بەتاڵان ئەبرێو لەکەمترین مافی مرۆڤانە بێبەش ئەکرێ. لەبەر ئەوە فەرمانڕەوایەتی هەموو ناکوردێك بەسەر کوردستاندا بەکارێکی ناشەرعی ئەزانێ).

٦- کاژێك وەك ڕێکخراوێکی سیاسی نەتەوەیی کوردی، خۆی بەنوێنەری سەرجەم نەتەوەی کورد ئەزانی، نەك نوێنەری تەنیا چینێك یا توێژێکی کۆمەڵی کوردەواری بەپێچەوانەی پارتییە مارکسیەکانەوە کە خەباتیان خەباتی چینایەتی بو، بۆ ئەو مەبەستەش، هەمیشە گڕی ئاگری شەڕی چینایەتیان خۆش ئەکرد. لەم خاڵەشەوە هەندێك ئەنجام ئەکەوێتەوە:

أ- بەرژەوەندی هەموو تاکو کۆمەڵانی کورد لەسەربەخۆیی کوردستاندایە بەر لەوەی لەخەباتی چینایەتیدا بێ.

ب- هیچ چینێکی کۆمەڵ مافی ئەوەی نیە خۆی بکاتە پێشڕەوو سەرکردەی چینەکانی تر.

ج- کێشەی نێوان چینەکان بەشەڕی چینایەتی چارەسەرناکرێ، بەڵکو بەنەهێشتن یا کەمکردنەوەی جیاوازیی چینایەتی چارەسەر ئەکرێ.

د- داگیرکەرانی کوردستان، ڕژێمی فەرمانڕەوایەتیان هەرچی بێ، هەمیشە بەیەك چاو سەیری چینەکانو تاکەکانی نەتەوەی کورد ئەکەن.

لەو بارانەوە، دروشمی کاژێك: (کوردستان بۆ کورد، یەکسانی بۆ گەل) هەموو ئەو ڕاستییانەی تێدا ڕەنگئەداتەوە.

٧- مەسەلەی ئازادیی نەتەوەی کوردو سەربەخۆیی کوردستان، مەسەلەیك نیە سازشی لەسەر بکرێ بەهیچ بیانوویەکەوە، تەنانەت بەبیانووی دیموکراتیو ڕای زۆریەشەوە. بۆ نمونە: ئەگەر زۆریەی نەتەوەی کورد لەجیاتی ئەوەی دەنگبدا بۆ سەربەخۆیی کوردستان، دەنگبدا بۆ چوونە پاڵ هەر دەوڵەتێکی تر، ئەوا ئەو دەنگدانە ناڕەوایە کاژێك دژی ئەوەستێتەوە. ئەمەش بەپێچەوانەی ئەو پارتیانەوە کە مافی چارەنووسی کورد بەڕای زۆربەوە، یا بەڕای پەرلەمانێکەوە، یا بەڕای خۆیانەوە گرێ ئەدەن. یا ئەوانەی مافی چارەنووسی کورد لەناو چوارچێوەی هەر کام لەدەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانەدا ئەهێڵنەوە ڕایەکی زۆربەی لەو جۆرە بێگومان ڕایەکی نائازاد، یا ڕایەکی چەواشەکراوو ناوهوشیارانەو نەخۆشەو هیچ بینایەکی لەسەر ناکرێ.

٨- بەلای کاژێکەوە بەپێچەوانەی پارتییە مارکسیەکانو کۆمۆنیستەکانەوە، نەتەوایەتی (بەکوردایەتیشەوە) ئەدەسکردی چینی بورژوای هیچ نەتەوەیەکەو نەقۆناغێکیشە لەمێژوودا. بەڵکو هەستێکی سروشتی مرۆڤە لەڕۆژی پەیدابوونی هەر نەتەوەیەکەوە، تا مرۆڤیش بمێنێ ئەو هەستە هەر ئەمێنێ ئەگەرچی نەتەوایەتی وەك هەر دیاردەیکی تر گەشە (تطور) ئەکاتو تەنیا لەیك قاڵبدا نامێنێتەوە.

٩- بەلای کاژێکەوە، بەپێچەوانەی ڕای مارکسیەکانەوە، مەرج نیە بەرژەوەندیی ئابووری چینی کرێکار لەهەموو جیهاندا وەك یەك بێ، بەڵکو گەلێ جار بەرژەوەندی ئابووری چینی کرێکار لەوڵاتێکدا لەگەڵ بەرژەوەندیی ئابووری چینی سەرمایەداری هەمان وڵات ڕێك ئەکەوێ دژی بەرژەوەندی ئابووری چینی سەرمایەداری هەمان وڵات ڕێکئەکەوێ دژی بەرژەوەندیی ئابووری چینی کرێکاری وڵاتێکی تر. بۆ

نموونە: بەڵگەنەویستە کە بەرژەوەندیی چینی سەرمایەدارو چینی کرێکاری وڵاتە داگیرکەرەکان لەوەدایە کە خوێنی وڵاتە داگیرکراوەکان بمژن، بەخوێنی چینی کرێکارانیشیانەوە.

١٠- هاوبیرانی کاژیک، هەرگیز باوەڕیان بەو دروشمەی پارتییەکانی تر نەبووە، کە ئەڵێن: (دیموکراتی بۆ عێراق یا بۆ وڵاتە داگیرکەرەکانی تری کوردستان‌و ئۆتۆنۆمی، یا فیدراڵی بۆ کوردستان).

١١- بەلای هاوبیرانی کاژیکەوە، پشت بەستن بەهەر کام لەداگیرکەرانی کوردستان، لەماڵوێرانی کورد زیاتر، هیچی تری لێدەسگیرنابێ. ئەمەش بەپێچەوانەی ئەو پارتییانەی ئەم دەوڵەت‌و ئەو دەوڵەتی داگیرکەرانی کوردستان بەدۆست ئەزانن‌و پشتیان پێ ئەبەستن!

**• ئاخۆ لەماوەی ئەم چەند ساڵەدا، مەبەستم لەدروستبوونی قوتابخانەی بیری نەتەوەیی کاژیکەوە، کە ئەمڕۆ (٤٤) ساڵە، راستیی هیچ کام لەبیرۆکەکانی ئەو قوتابخانەیە لەمەیدانی کاردا، دەرکەوتێک‌و هاتنەدییەکی بووبێ؟**

- بێگومان.. لەبارەی بەڵێن‌و پەیمان‌و رێککەوتننامەکانەوە: کوا ئەنجامی ئەو مەرجانەی باشووری کوردستانیان پێ خرایە سەر عێراق؟ چی لەدەستورەکەی قاسم سەوزبوو کە گوایە عەرەب‌و کورد شەریکن لەعێراقدا؟ ئایا رێککەوتننامەی یازدەی ئازاری ١٩٧٠، ئەوە ئۆتۆنۆمی بو؟ یا پیلانبوو بۆ کوشتنی بارزانی‌و شۆڕشی ئەیلول؟ ئایا ئەنجامی پێکەوەژیانی کورد‌و نەتەوە سەردەستەکانی تر، قەدەغەکردنی زمانی کوردی‌و کوشتنی بەکۆمەڵ‌و ئەنفال‌و کیمیاباران‌و کورد تواندنەوە نەبوە؟

لەبارەی بەستنەوەی مەسەلەی کورد بەمەسەلەی نیشتمانی نەتەوە سەردەستەکانی کوردەوە، لەماوەی ئەو چلوچوار ساڵەدا چەندین رژێمی ئەو نەتەوە سەردەستانە گۆڕان‌و هەر رژێمەش بەشێوازێکی خۆی مەسەلەی نیشتمانی نەتەوەکەی خۆی چارەسەرکرد بێئەوەی هیچ کامیان مەسەلەی کورد چارەسەر بکەن.

لەبارەی تاوانی پارچەپارچەکردنی کوردستانەوە، لەو ماوەیەدا، ئیمپریالیزم لەعێراق‌و سوریا‌و ئێران‌و ئەو بەشەی کوردستان کە ئەکەوێتە یەکێتی سۆڤێتی جارانەوە، ئەما، ئەی بۆچی کوردستان هەر بەپارچەپارچەکراوی ماوەتەوە؟

لەبارەی دیدی کاژیک بۆ ئیمپریالیزمی کۆمۆنیستی.. هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت ئەوەی سەلماند کە ئەوانیش هەر جۆرێك بون لەئیمپریالیزم.

لەبارەی ئەو سەرنجەی کاژیکەوە کە داگیرکەرانی کوردستان هەموو بەیەك چاو سەیری چینەکان‌و تاکەکانی نەتەوەی کورد ئەکەن.. هەموومان، لەو ماوەی چلوچوار ساڵەدا بەچاوی خۆمان بینیمان چۆن چەکی ژاراوی ئەکرێت بەسەر هەموو کوردێکدا‌و چۆن کورد کۆمەڵکوژ ئەکرێت بێگوێدانە تەڕو وشك. لەبارەی ئەمرێتیی نەتەوایەتییەوە بۆ ئەوەش کە نەتەوایەتی قۆناغێك نیە لەمێژوودا، دیسان هەڵوەشاندنەوەی سۆڤێت بەڵگەیەکی زیندووە بۆ راستیی ئەو بۆچوونەی کاژیک، چونکە بەپێی بۆچوونی مارکسیتی، ئەبولیە لەقۆناغی سوسیالیستیدا، هەست‌و دەماری نەتەوایەتی تەواو سڕبولیە. کەچی بەزۆری هەر ئەو هەست‌و دەمارە بو کە یەکێتی سۆڤێتی هەڵوەشانەوە، بۆ وەڵامی ئەوانەش کە ئەڵێن سەردەمی نەتەولیەتی بەسەرچووەو بۆ ئەو قسەیەشیان بازاڕی ئەورووپی هاوبەش‌و پارەی (یۆرۆ)‌و جیهانگیری (عولمە) بەبەڵگە ئەهێننەوە.. ئەڵێین: کام لەو دەوڵەتانەی ئەورووپا وازیان

لەزمانو کەلتورو بەستنی خاکو سەروەریو ئاسایشی نەتەوەیی خۆیان هێناوە؟ بەپێچەوانەوە، یەکگرتنی ئەو وڵاتانەی ئەورووپا لەو بازاڕە هاوبەشەو لەیۆرۆدا، ئەوە گوڕوتەوژمێکی تازەکارانەی نەتەوایەتی ئەو وڵاتانەیە بۆ خۆڕاگرتن لەبەردەم مەترسیی وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکادا بۆ سەریان.

لەبارەی دروشمی (دیموکراتی بۆ ئەوانو ئۆتۆنۆمی یا فیدراڵی بۆ ئێمە)ەوە. یا بەدەربڕینێکی تری ئەو پارتیانە کە ئەڵێن دیموکراتی لەو وڵاتانەدا چارەسەری کێشەی کورد ئەکات کە هاوبیرانی کازیک باوەڕیان بەو دروشمو قسانە نەبووە.. ئەڵێین: ئەوە هەرگیز وانیە، بەبەڵگەی ئەوەی لەسەردەمی پاشایەتی لەعێراقدا جۆرێك دیموکراتیو حوکمی یاسا هەبووە. لەتورکیاشدا، بۆ نەتەوەی تورك خۆی، دیموکراتی هەیە، کەچی کێشەی کورد، نە لێرەو نەلەوێ چارەسەر نەکراوە. لەعێراقی پاشەڕۆژیشدا کە ئەگەر دیموکراتییەکانی وەك ئۆپۆزسیۆنی عێراقی فەرمانڕەوایەتی بگرنەدەست، نەك هەر کێشەی کورد چارەسەر نابێ، بەڵکو فیدراڵیش دەستەبەر نابێ. ئەوەش لەئێستاوە دیارە، بابزانین چۆن؟

لە ١٤/ بۆ ١٧/١٢/٢٠٠٢ لەلەندەن کۆنگرەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بەسترا. ئەم کۆنگرەیە ئەگەرچی بەشی زۆری لەسەر شانی لایەنە کوردییەکان بوو، ئەگەرچی تاڕادەیەك لەسەر پارەو خەرجی کورد بوو، ئەگەرچی دوابڕیاریش ئەوە بوو کە لیژنەی بەدواداچوونو هەماهەنگی، پێگەی خۆی لەکوردستاندا جێگیر بکات کە دوور نیە لەو پێناوەدا باشووری کوردستان بەر مەترسیو زیانێکی گەورە بکەوێ، هەروەها ئەگەرچی جگە لەلایەنە کوردییەکان، زۆربەی ئەوانی تر هیچ کامیان لەدوکانی بەکرو دوو قاڵب سابوون زیاتر نینو ئەشێ بەخەویش کورسی فەرمانڕەوایی عێراق نەبینن. دیسان لەگەڵ ئەوەدا کە کوردستان دە ساڵ زیاترە سەربەخۆو ئازادە.. لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، وەك پێویست دانیان بەقەوارەیەکی فیدراڵیدا نەنا بۆ باشووری کوردستان. بەڵگەش بۆ ئەم قسەیەمان: لیوا روکن حەسەن نەقیب وتی: (مەسەلەی فیدراڵی جارێ وازلێبێنن بۆ رەئی گشت گەلی عێراق)! ئەحمەد چەلەبیش وتی: (داڕشتنی کۆتایی بۆ چوارچێوەی سیستمی فیدراڵیو سنووری ناوچەکانو درێژەی ئەوانی ترو دەسەڵاتە جیاوازەکان، ئەوانە دوایی گەلی عێراق بڕیاری لەسەر ئەدات ئەو کاتەی بڕیار لەسەر دەستوری هەمیشەیی ئەدات کە هەموو رۆڵەکانی گەلی عێراق دەنگی لەسەر ئەدەن). پێشتریش ئەوە بڕیار درابوو کە دەستوری هەمیشەیی دوای دوو ساڵ دەنگی لەسەر ئەدرێ بەرامبەر بەم قسانەش، هەموو ئامادەبووان بەلایەنە کوردییەکانیشەوە بێدەنگ بوون. ئەو بێدەنگیەش رەزامەندیی ئەگەیان! ئا بەو جۆرە، ئەو ئۆپۆزسیۆنە زۆر دیموکراتیخوازانە، لەئێستاوە لەو فیدراڵیەش دەرچوون. چونکە ئاشکرایە دواخستنی دەنگدان لەسەر فیدراڵی، ئەوە مردارکردنەوەی ئەو فیدراڵیەیە. بڕیاردانی فیدراڵیش ئەگەر بخرێتە دەس هەموو رۆڵەکانی عێراق، ئەوا بێگومان دەنگنەدان ئەبێ بۆ فیدراڵی. گریمان دەنگدانیش بێ بۆی، ئەوا ئەو فیدراڵیە، لەحوکمە زلتیەکەی بەعس چاکتر نابێ.

# لەنێوان بارزانی و کاژێکدا

١- سەرۆک بارزانی
٢- ئدریس بارزانی
٣- محەمـەد عـەزیز ـ ئەنـدامی سەرکردایەتی کاژێك.

لەوەلامی پرسیارێکی بەڕێز زانیار سەردار فرگەییدا بۆ ژمارە ١٧٢٣ی ڕۆژی ٢٠٠٥/٣/١ی ڕۆژنامەی ڕێزداری خەبات

* بارزانی نەمر لەدیدوبۆچوونی بەڕێزتانەوە؟

– پـێم خۆشـە وەلامـی پرسـیارەکە، لـەدوو دیدوبۆچوونەوە، بدەمەوە:

یەکەم: وەك هەستیارێك: دوای گەڕانەوەی بارزانی نەمر لەیەکێتی سۆڤێت، بۆ یەکەمجار ڕووبەڕوو بەڕێزیانم لەوتێل سەمیر امیس لەبەغدا بینی، پشتبەست بەو زانیاریانەی پێشتر هەمبوو لەسەر خەباتو تێکۆشانیو کە ڕووبەڕووش خۆیم بینی، لەناو ئاپورەی ئەو خەڵکە زۆرەدا کە ڕژابوونە وتێلەکە، بەهەڵبەستێك ڕووم تێکردو وتم:

ژیان ئەمڕۆ بزەی تەڕە
بزەی لێوی تێکۆشەرە

مەبەستم لەتێکۆشەرەکە، بەڕێزیان بوو، درێژەی هەڵبەستەکەش لەدیوانی هەڵبەستەکانمدا بلاوبۆتەوە.

دووەم: وەك سیاسەتکارو ئەنـدامێکی دامەزرێنـەرو سـەرکردایەتی کاژێـك: پـێم وایـە بـارزانی سـەرکردەیەکی نەتـەوەیی کـورد بـوو، لەتەنگژەترین ڕۆژانی نەتەوەکەماندا، ئـەو نـەمرە ڕابەرایـەتی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی بەپاکیو بەچاکیو بەلێهاتوویی کردوە.

ڕێکخراوەکـەشمان، کاژێـك، لەدامەزراندنیـەوە، بەبایـەخ و ڕێـزەوە ڕوانیویەتـە ئـەو سـەرکردەیەو هەرەوەزی لەگەڵدا کردوەو لەهەندێ بۆنەدا ڕای خۆی پێشکەش کردوە، لەوانە:

١- لەبارەی ڕای کاژێکەوە بۆ پشت نەبەستن بەداگیرکەرانی کوردستان، هێما بۆ بیرخەرەوەیـەکی کاژێك ئەکەم کە لەبەرواری ١٩٦٤/٥/١٣ دا پێشکەش بەسەرکردەی شۆڕشـی ئـەیلول بـارزانی کـرد کـە ئەمـە بەشـێکێتی: (ئێـران دووەمـین دەوڵەتـە کـە پارچـەیەکی گـەورەی لەنیـشتمانی بـەنرخمان داگیرکـردووەو ئـەزانێ کـە سـەرگرتنی بزوتنەوەکـەمان، هیـواو ئـاواتی براکانمـان لـەوێ بـۆ ڕزگـاریو بەرەلابوون لەبەندایەتی ئەژێنێتەوە. لەبەر ئەوە سـەختنەگیریی ئێران لەگەڵمان لەهەندێ کاروبـاردا، هیچ نیە هەوڵدانێك نەبێ لەلایەن ئێرانەوە بۆ خەریك کردنی حکومەتی عێـراقو بێهێزکردنـی بـۆ ئـەوەی بەوە ڕێخۆشکات تاکو ئـەو دلرودەستانەی سـەر بـەڕۆژئاوان بێنـە سـەر حـوکم لەعێراقـداو ئـەو دەمـە ئـەبینین کـە ئێـران دەسـتدرێژ ئـەکات بـۆ ئـەو حکومەتـە تازەیـەی عێـراقو ڕێکنەکـەوێ لەگەڵیـدا بـۆ لێدانمان) ئەوە بوو پێشبینییەکەی کاژێك لە ١٩٧٥/٣/٦دا هاتەدی.

٢-بەیانی کازێك ١٩٧٠/٦/٢٥ لەبارەی رێکەوتننامەی ١١ ی ئازارەوە.

٣- بەیانێکی تر ١٩٧٠/٩/١١ لەبارەی هەمان رێکەوتننامەوە.

درێژەی ئەو دوو بەیانە لەلاپەڕەکانی ٣٣ تا ٤٠ لەنامیلکەی (حقیقە کازێك)دا بلاوکراوەتەوە، هەر لەلاپەڕە (٢٥)ی ئەو نامیلکەیەدا، کازێك لەوەلامی (لێدوانێکی گۆڤاری الثورة العربیة ژمارە ٩ ساڵی ١٩٦٩ کە گۆڤارێکی ناوخۆی نوسینگەی رۆشنبیریی سەرکردایەتی نەتەوەیی حیزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی بوو بەعەرەبی‌و ژمارەیەك تۆمەتی ناڕەوای خستبووە پاڵ کازێك) کازێك لەبارەی بارزانیەوە بەمجۆرە وەلامی ئەداتەوە:

لێدوانەکە ئەڵێ*: (مەلا لەسەرەتاوە لەم بزوتنەوەیە ـ مەبەستی کازێکە ـ زۆر بەگومانبوو، لەبەر ئەوە بەرەنگاریان وەستا، دوایی گەڕایەوەو هەڵوێستێکی ئاشتیانەی بەرامبەریان وەرگرت بەمەبەستی مژینیان).

لەوەلامدا کازێك ئەڵێ: (پەیوەندیی کازێك بەهەر کەسێکی دیاریکراوەوە، هەڵوێستی ئەو کەسە دیاریی ئەکات بەرامبەر بزوتنەوە رزگاریخوازە کوردییەکەو بەرامبەر کازێك.

بارزانی سەرکردەیەکی کوردی شۆڕشگێڕە، گوڵی لارێتی خۆی بۆ رازەی پرسی کورد وەرلنو رێگەی خەباتی چەکدارانەی گرتەبەر، لەبەر ئەوەی کازێك پارتییەکی باوەڕداری شۆڕشگێڕە، هەر ئەبێ بۆ سوودی کورد لەگەڵ بارزانیدا هەروەزی بکا، راستە بارزانی لەسەرەتادا بەگومانەوە ئەیڕوانیە ئێمە، لەوەشدا لەسەر رەوابوو، بارزانییەك سالانێکی زۆری بەخەباتێکی دژوارەوە بردەسەرو زۆر کەسی تاقیکردەوە، مافی خۆیەتی لەخودی خۆشی بەگومانبێ، سەرکردەیەك گوماندار نەبێ، ناتوانێ رابەرایەتی بزوتنەوەیەکی سیاسی‌و سەربازی بکات، لەسالانی شۆڕشی کوردا، ئەوە بۆ بارزانی دەرکەوت کە کازێك بۆ پارەو پلە پشتگیری ئەو ناکات، کازێك ئەو سەربازە نابیارە بوو کە بەرگریی لەبارزانی‌و ئەو بزوتنەوەیە ئەکرد کە ئەو لەتەنگژەترین رۆژگاردا رابەرایەتی ئەکرد، کازێك هەرواش ئەمێنێتەوە تا بارزانی کار بۆ پرسی کورد بکات. پەیوەندی کازێك بەبارزانیەوە، پەیوەندییەکی خەباتکارانەیە. ساڵی ١٩٦٤ کاتێ پارتی دیموکراتی کوردستان دوو لەت بوو، باڵە جیابووەوەکە بارزانیی بەجۆرەها تۆمەتی هەڵبەستراو تۆمەتبار ئەکرد، لەو کاتەدا کازێك بەیانێکی مێژوویی دەرکرد بەناونیشانی (لەبارەی ناکۆکیەکانی ئەم دواییەوە لەنێوان بارزانی‌و سەرکردەکانی پارتیدلو چۆنیەتی چارەسەرکردنیان)، لەو بەیانەدا ئەوە هاتبوو کە بارزانی لەو جۆرانە نیە کە ویژدانی بکڕێت، ئەگەر وابوایە، خۆی بەنوری سەعید ئەفرۆشت کە ئامادەبوو بەملیۆن بیداتێ بۆ ئەو مەبەستە. هەموو ئەوانەی بارزانی ئەناسن، ئەزانن ئەو کەسێکی پاکژو دیوڵە (زاهد)ەو گوێ بەماڵی دنیا نادات، ئەوەی بارزانی ئەنجامی ئەدات، ئەوە بەشێکە جیانابێتەوە لەئامانجەکانی کازێك، ئیتر چۆن ئەبێ کازێك هاوپەیمانی بارزانی نەبێ؟ ئێمە بارزانی بەبرایەکی گەورەمان ئەزانین‌و رێزی لێئەگرین‌و پشتی ئەگرین تا ئەو لەپێناوی پرسی گەلەکەماندا چەکی لەشاندابێ).

---

* لێدوانەکەو وەلامەکە بەعەرەبیە ئەوە کوردییەکەیەتی.

لەگۆشەنیگای ئەو باری سەرنجەوە بەرامبەر بارزانی، کاژیک هەمیشە لایەنگریی بارزانی کردووە بێئەوەی ڕۆژێ لەڕۆژان پوولێ یا پلەیەکی لەبارزانیو پارتییەکەی وەرگرتبێ، بەپێچەوانەوە، پارتییەکەی بارزانی (پ.د.ك) بەردەوام دژایەتی کاژیکی ئەکرد. کاژیکیش هەمیشە جیاوازیی لەنێوان بارزانیو پارتیدا ئەکرد. ئێستاش بەلای هاوبیرانی نەتەوەییەوە، جیاوازی لەنێوان بنەماڵەی بارزانیو (پ.د.ك) دا هەیە، ئەمە بارێکی سەرنجەو هەر کەسیش ئازادە لەدەربڕینی باری سەرنجی خۆیدا. هەر ئەم دیدوبۆچوونەش بوو کە پاڵی پەمنەوە تا دوای کۆنگرەی یازدەی پارتی، بەبێ دەنگ، خۆم بکشێنمەوە لەپارتیو بێلایەن دانیشم، چوونە ناو پارتییەکەشم، بە حوکمی تێکەڵاوبوونی حیزبی یەککگرتنو پارتییەوە بوو.

کە ناوی خۆشم لەسەر تەختەی رەش بینیەوە وەك پاڵێوراوێك بۆ لیژنەی ناوەندی لەو کۆنگرەیەدا، ئەوە هەر بەحوکمی ئەوەبوو کە یەکێك بووم لەئەندامانی سەرکردایەتیی حیزبی یەککگرتن، ئەگینا بەخواستی خۆم، خۆم نەپاڵاوتبوو، لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزمدا بۆ (پ.د.ك).

هەڵوێستی ئەرێنی کاژیک بەرامبەر بارزانی، ئەگەڕێتەوە بۆ مێژوویەکی دێرین، بۆ هەموو ئەو شۆڕشانەی ئەو بنەماڵەیە بەرپایان کردوون، کاتێکیش دووبەرەکیەکەی ١٩٦٤ ڕوویدا، کاژیک لایەنی بارزانی گرت. چاوخشاندنەوەیەك بەژمارەکانی گۆڤاری چرای کوردستان ــ گۆڤاری یەکێتی لاوانی نەتەوەیی کورد کە دروشمەکەی: (کوردستانێکی یەککگرتوو، کوردێکی سەربەخۆ) بوو، هەروەها گۆڤاری نەوەی کورد ــ گۆڤاری یەکێتی قوتابیانی نەتەوەیی کورد کە دروشمەکەی: (خوێندەوارییەکی کوردی، پەروەردەیەکی نەتەوەیی) بوو لەساڵەکانی ١٩٦٥ و ١٩٦٦ دا کە لەسلێمانی دەرئەچوو، ئەو راستیە ئەسەلمێنێ.

# ئدریس بارزانیو کاژیك

لەناو بنەماڵەی بارزانیدا نزیکترین کەسێك بەکاژیك شەهیدی جوانەمەرگ ئدریس بارزانی بوو، خوالێخۆشبوو لەهەموو باوەڕو بنەماکانی کاژیك گەیشتبوو باوەڕی پێهێنا بوو بەرگریی لێئەکرد بەجۆرێك زۆر کەس بەکاژیك ناویان ئەبرد.

لەیەکێك لەرۆژەکانی کۆنگرەی یازدەی پاتیدا لەهەولێر، بۆ ماوەی کاژمێرێك منو کاك نێچیرڤان بارزانی کەوتینە تەنیشتی یەکەوە.

سەیرێکی ئەو باجەی کرد کە بەیەخەمەوە بوو، دوای ئەوەی ناوەکەمی لەسەر باجەکە خوێندەوە، پرسی: ئەم ناوە بەلامەوە غەریب نیە، ئەکرێ جەنابت خۆتم زیاتر پێبناسێنی؟ دوای قسەکردنێکی زیاتر، هاتینە سەر باسی کاژیك، لێرەدا کاك نێچیر وەك شتێکی بیربکەوێتەوە کە باوکی هەمیشە لەناو ماڵدا باسی کردبێو شانازیی پێوەکردبێ، بەڕوویەکی خۆشەوە رووی تێکردمەوەو وتی: بەڵێ.. بەڵێ.. ئەوەی بابم. من ئەوسا منداڵ بووم.. بابم زۆرجار باسی کاژیکی بۆ دەکردین.

هەر لەبواری هەرەوەزیی بارزانیو کاژیکدا، سەرکردایەتی کاژیك، دوو ئەندامی سەرکردایەتییەکەی: هاوبیر محەمەد عەزیزو هاوبیر شێخ محەمەد هەرسینی ناردە ناو شۆڕشو نزیك بارزانی. سەرۆك بارزانیش، لەگەڵ ئەوەدا کە زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتیی پارتی دژایەتیان ئەکردنو بەدگۆییان لەبارەیانەوە ئەوت لای بارزانی، ئەو تا ئەبوو زیاتر ئەوانی لەخۆی نزیك ئەخستەوەو کاری گرنگی پێ ئەسپاردن. ئەوە بوو دوای کۆچی دوایی بەهەشتی بارزانی نەمر، شێخ محەمەد شەهید کرا، من رۆژێك لەدوای کۆبوونەوەیەکی سەرکردایەتی حیزبی یەککرتن، بەیەکێك لەکۆنە ئەندامەکانی سەرکردیەتیی پارتیم وت: تۆ تۆمەتباری بەکوشتنی شێخ محەمەد هەرسین؟! بەلام ئەو زۆر پاکانەی کردو سوێندی بۆ خواردم کە دەستی ئەوی تیا نەبووە!

لەمارتی ١٩٧٠ دا رێکخراوی تۆکسەی سەر بەکاژیك لەدەرەوەی وڵات لەبەیانێکدا گومانی خۆی پیشاندا بەرامبەر بەعس کە ئەو رێکەوتنە جێبەجێ بکات، ئەگەرچی تۆکسە پشتگیری رێکەوتننامەی ئازاریشی کرد.

# ئەڵقەیەکی تر لەزنجیرەی بیرەوەرییەکان

رۆژنامەی ڕێزدلری (تایم)، بۆ ئەڵقەیەکی کە لەزنجیرەی بیرەوەرییەکانم، ژمارەیەك پرسیاری تری ئاڕاستە کردم، لەوەئەچێ گۆڕانێك لەستافی رۆژنامەکەدا کرابێ، رۆژی ئەبرد رۆژنامەکەش لەکار وەستا. لەبەر ئەوە ئەو ئەڵقەیە بڵاونەکرایەوە، منیش ناوەڕۆکی ئەو ئەڵقەیەم دەسنەکەوتەوە تا وەك خۆی لێرەدا بڵاوی بکەمەوە.

وەك دێتەوە یادم، پرسیارێك لەبارەی رۆڵی من لەبواری یاسادا بوو؟ ئەشێ ئێستا وەڵامێك بدەمەوە:

ساڵی ۱۹۷۰ تا ۱۹۷٤ سەرۆکایەتی کۆمەڵەی یاساناسانم کرد لەسلێمانی، ئەو کۆمەڵەیە، ئەگەرچی ناوەندەکەی لەبەغداد بوو، بەڵام ئێمە لەسلێمانی، دوای رێکەوتننامەی ئازار، دروستمانکرد، ناوەندیش دانیپیانابێ، وەك دێتەوە یادم، دەستەی دامەزرێنەر بریتی بوو لە: کامل ژیر، مەحمود بابان، ئەکرەم عیزەت نەجیب، فوئاد تۆفیق، کەمال رەشید، فەوزیە فەقێ رەشید، گەلاوێژ سەعید، گەلاوێژ رەشید، محەمەد نوری فەتاح، ئازاد تاڵەبانی‌و نوری نانەکەلی.. لەگەڵ داوای لێبوردن لەو بەڕێزانەی لەیادم نەماون.. ئامانجی سەرەکیمان، جگە لەبەرگری لەمافی یاساناسان، بڵاوکردنەوەی هوشیاریی یاسایی‌و لەکوردستاندا، بۆ ئەو مەبەستە، زنجیرەیەك دیمانەی تەلەفزیۆنیمان لەتەلەفزیۆنی کەرکوکەوە ئەنجامدا، دوای بەرپابوونەوەی شەڕی نێوان کوردو رژێم ساڵی ۱۹۷٤، من چوومە شاخ‌و کۆمەڵەکەش کەوتە دەس ژمارەیەك یاساناسی سەر بەرژێم.

لەرۆژنامەی (الاتحاد)ی یەکێتیدا، بەعەرەبی ژمارەیەك وتارم نووسی بەم ناونیشانانە: ۱- النظام القانوني والجهاز القضائي في كوردستان ۲-الدستور ۳- لغة المحاكم في كوردستان کە تا رۆژی بڵاوکردنەوەی ئەو وتارە ۱۹۹۹/۷/۹ زمانی دادگاکانی کوردستان هەر عەرەبی بوو! ! دوای ئەوەو لەگەڵ هەوڵی ژمارەیەك دادوەرو هەندێ لەکارمەندانی پۆلیس لەبنکەکانیاندا، کوردیمان کردە زمانی دادگاو دادبینی‌و لێکۆڵینەوە، هەر بۆ ئەو مەبەستە، لەگۆڤاری (ناوخۆ)شدا وتارێکم نووسی.٤- قانون ايجار العقار ٥- قانون الاحوال الشخصية ٦- قانون المرافقات ۷- قانون التنفيذ، کە لەهەموو ئەو وتارانەدا داوای گۆڕانکاریم کردووە بەجۆرێك لەگەڵ بارودۆخی کوردستاندا بگونجێ.

هەر بۆ ئەو مەبەستەش، بەشداریم لەو دەستە یاساییانەدا کرد کە یاسای بەکرێدانی خانووبەرەو یاسای باجەکان‌و یاسای باری کەسێتیمان تیا گۆڕی، لەدەستەیەکیکەشدا، گەڵاڵەی یاسای رۆژنامەنووسیمان لەکوردستان داڕشت.

**دەستەی دارێژەرانی گەڵاڵەی یاسای رۆژنامەوانی ۲۰۰۲**

**لەچەپەوە:** دانیشتوان: عبدالباسط، کامیل ژیر، فەرید ئەسەسەرد، عبدالكريم حیدر، ئاسۆ سەردار رشید.

**لەپشتیانەوە:** سامان فەوزی، عبدالواحد علاف، عبدالهادي مهدي، مصطفى صالح كريم.

لەبارەی پرۆژەکەی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە بۆ دەستوری عێراق و کوردستان، وەك بەرپرسی سەرکردایەتیی کۆنگرەی نیشتمانی کوردستان، رای کۆنگرەم نووسی، دەستەکەشمان پەسەندیان کردو رۆژنامەی رێزداری خەباتیش لەژمارە ١٠٨٥ رۆژی ٢٠٠٢/٩/١٣ بلاویکردەوە.

ئەمەش دەقەکەیەتی: هەروەك خۆی بەعەرەبی:

## الهيئة المعدة لمشروع المؤتمر الوطني لجنوب كوردستان
## تبدي رأيها في مشروع الحزب الديمقراطي الكوردستاني
## لدستوري العراق و كوردستان

صدر المشروع ضمن ملحق العدد (١٠٨٩) في ٢٠٠٢/٨/٢ لجريدة (خەبات) الغراء، وهو مشروع في غاية الأهمية في الظرف الراهن وذو صلة بالجميع، لذا لرتأينا أن نبدي آرائنا حوله ونقيمه سلباً وايجاباً مشاركة منا في جعل المشروع حقيقة متطابقة للواقع ومنسجمة مع المباديء القانونية التي بنيت عليها الدساتير الاتحادية والاقليمية في دول اتحادية أخرى.

جاء في ديباجة الدستور الأول، دستور الجمهورية الفيدرالية المقترحة، ان دولة العراق الحديث ومنذ قيامها في اعقاب الحرب العالمية الأولى، لم تنعم بالأمن والاستقرار والسلام، وان هذا يعود في جانب كبير منه الى وجود خلل في تنظيمها الدستوري وطبيعة نظامها السياسي.. لان النظام يتسم بالمركزية الشديدة، ثم تمضي الديباجة الى ان تصل الى الفيدرالية والديمقراطية كصنوان متلازمان.

يفهم من ذلك التفسير ان دولة العراق لو سلكت الديمقراطية والفيدرالية منذ تأسيسها لأنعمت بالأمن والأستقرار والسلام، بينما الحقيقة هي ان السبب في ذلك يعود الى الحاق جنوب كوردستان بالعراق العربي قسرا بقرار من عصبة الأمم في ١٩٢٥/١٢/١٦ ونتيجة للمساومات التي جرت بين بريطانيا وتركيا والعراق العربي على جنوب كوردستان او ما كان يعرف بولاية الموصل دون اعتبار لمعاهدة (سيفر) المتضمنة وضع خطة لاستقلال كوردستان الكبرى، وليس لأسباب ديمقراطية أو دستورية، فلو كانت الديمقراطية مسلكا للدولة العراقية الحديثة لما تأسست تلك الدولة بشكلها الحالي اصلا، لان الديمقراطية تعني اول ماتعنيه، احترام الرأي الأخر. وقد أبدى الكورد رايه الرافض لقيام تلك الدولة والحاق كوردستان بها، وقد جاء ذلك الرفض من خلال حكومة الملك محمود التي سبقت قيام الحكومة العراقية ومن خلال ثوراته ومواجهات شريف باشا للمؤتمرات الدولية والعصبة، كذلك من خلال انتفاضة السادس من ايلول ١٩٣٠ وثورات بارزان ونهضة الكورد بعد الرابع عشر من تموز ١٩٥٨ ثم ثورة ايلول ١٩٦١ الممتدة لغاية انتفاضة آذار وأخيراً وليس أخرا تحرير ما تم تحريره من جنوب كوردستان وغيرها من الحركات والأفكار التي تعبر جميعها عن استحالة الجمع بين تلك الاضداد التي تكونت منها الدولة العراقية الحديثة من العرب والكورد والسنة والشيعة وغيرها من المتناقضات الجغرافية والتأريخية والبيئية والنفسية بالاضافة الى العملية الغريبة وغير الطبيعية المتمثلة في استيراد ملك عربي من خارج العراق والقضاء على الملك الكوردي الاصيل في كوردستان وفيما يسمى بالدولة العراقية الحديثة. أما الفيدرالية، فانها لاتلقي أذانا صاغية من العرب حتى في عصرنا الحاضر الا ما ندر ناهيك عن عقليات عشرينات القرن الماضي. فلو كانت الفيدرالية صيغة الحكم عند تأسيس الدولة العراقية الحديثة (جدلا) لنالت تلك الفيدرالية نفس المصير الذي آل اليه التصريح المشترك من حكومتي بريطانيا والعراق في ٢٥/ كانون الثاني /١٩٣٢ وفحواه الأعتراف بحق

الكورد في اقامة حكومة لهم، كذلك مصير الشروط المعلنة في البيان الدستوري العراقي الصادر في ١٩٣٢/٥/٣٠ وفحولها التزام العراق باحترام حقوق الأقليات وحماية آبار نفط كركوك الكوردية و وجوب صرف واردتها الى الشعب الكوردي، وإذا خالف العراق تلك الشروط، فعلى العصبة ومحكمة العدل الدولية ان تتخذ ماتراه مناسبا من الاجراءات وفق احكام المادتين (١٠) و (١٦) من البيان المذكور والمادتين (٣٦)و (٣٧) من القانون الأساسي لمحكمة العدل الدولية. كذلك مصير دستور قاسم المتضمن شراكة العرب والكورد في العراق ثم لنالت تلك الفيدرالية المفترضة نفس المصير الذي آلت ليه اتفاقية الحادي عشر من آذار ١٩٧٠.

اذن لم تكمن المعضلة في الدستور، انما تكمن المعضلة في العقليات والنيات والنفسيات المتعالية التي تخرق الدساتير والقوانين وتناقض الديمقراطيات وتحطم الفيدراليات لأجل التجاوز على حقوق الغير كلما وجدوا الى ذلك سبيلا، ثم المعضلة هي معضلة الكيانات غير المتجانسة التي تنافي الطبيعة البشرية التواقة نحو الحرية والاستقلال دوما بغض النظر عن حساب الأرباح والخسائر.

مع ذلك ومهما كانت الأسباب، فان الدولة العراقية الحديثة قد تكونت على علاتها وان هذه الدولة تواجه الآن مصيراً مجهولاً وقد انفصل منها قسم من جنوب كوردستان واستقل، وان الأمر يتطلب الآن حماية وترسيخ هذه الاستقلالية وتوسيعها لتشمل بقية الأجزاء الكوردستانية غير المحررة وهو أفضل خيار كي تعود المياه الى مجاريها الطبيعية وتنعم شعوب الدولة العراقية المفتعلة بالأمن والأستقرار والسلام والوئام كل في بيته.

اما اذا هبت الرياح بعكس هذا الخيار وتحولت الدولة العراقية الى جمهورية فيدرالية وكتب على الكورد البقاء ضمنها، عندئذ ولزاء خيار كهذا، لابأس من التخطيط لدستور لو دساتير تلك الجمهورية الفيدرالية كما في مشروع دستوري الحزب الديمقراطي الكوردستاني مع ملاحظة مايلي:

**أولاً:** وردت عبارة (المتكونة من قوميات أو أديان أو لغات) في السطر السادس من الديباجة، والأصح هو (المتكونة من قوميات أو أديان أو مذاهب) لأن كلمة القوميات تعوض اللغات فلا مبرر لتكرار الكلمتين.

**ثانياً:** يلاحظ ان محافظة الموصل (نينوى) وفق المادة الثانية من الدستورين، اصبحت من نصيب الأقليم العربي بعكس حقيقتها التي لم تكن تابعة للعراق العربي طوال التاريخ، بل لنها جزء من كوردستان منذ أن أتخذ الكورد هذه الأرض موطناً له وقد سبق للميديين ان استردوا هذه البقعة من كوردستان من الأشوريين سنة (٦١٢) قبل الميلاد بعد استيلائهم عليها فترة من الزمن ثم اصبحت مدينة الموصل عاصمة لولاية الموصل الكوردية في العهد العثماني وان وجود اعداد من العرب فيها، مهما قلت أو كثرت، لايغير من حقيقتها الجغرافية الكوردستانية شأنها شأن محافظة كركوك التي يجري العمل فيها على قدم وساق لتعريبها وهي عاصمة اقليم كوردستان حسب الدستور الثاني المقترح، دستور اقليم كوردستان، ولايوجد أي تبرير للتمييز بين الموصل و كركوك في ذلك الدستور كما ليس من حق أي كان، حكومة أو حزبا أو برلماناً أو فرداً، التنازل عن شبر واحد من الوطن مهما كان التبرير. ثم تحدد حدود الأقاليم عادة على الأساس الجغرافي وليس على الأساس السكاني ونوعه، واذا وجدت قومية أخرى في أي من الأقليمين غير قوميته بصورة مشروعة، فانها تعتبر أقلية في ذلك الأقليم تتمتع بحقوقها المشروعة كأقلية قومية

فقط. والمتواجدون فيه بصورة غير مشروعة يطردون مع تحميلهم التعويض لما أحدثوه من الأضرار بالغير.

**ثالثاً:** ورد خلط في بعض الجوانب من الدستور الأول بين الدولة الفيدرالية والدولة البسيطة التي تمنح حكماً ذاتياً لبعض مناطقها، اذ تتطلب الدولة الفيدرالية، من الناحية الدستورية، وجود حكومة وبرلمان مركزي وحكومات وبرلمانات اقليمية بقدر عدد الأقاليم الت تتكون منها الدولة الفيدرالية، غير أن الدستور المقترح، ولن أشر الى الأقليمين العربي والكوردي، لكنه لم يشر الى حكومة وبرلمان الأقليم العربي. وقد أدى هذا الخلط بواضع الدستور لن ينص في مادته الرابعة على ان (يتكون الشعب العراقي من قوميتين رئيسيتين هما القومية العربية والقومية الكوردية، ويقر هذا الدستور حقوق الشعب الكوردي القومية وممارستها في اقليم كوردستان على أساس الفيدرالية .. الخ) بينما الصحيح هو (ويقر هذا الدستور حقوقهما القومية وممارستها في الأقليمين..الخ).

**رابعاً:** لامبرر لكلمة (للاتحاد) في المادة الثامنة مادامت تنص هذه المادة على (اللغة العربية هي اللغة الرسمية للاقليم العربي..الخ).

**خامساً:** يجب أن يعتبر المرشح لعضوية المجلس الوطني مستقيلاً من الوظيفة العامة من تاريخ ترشيحه وليس من تاريخ ادائه اليمين كما في المادة (٣٠ ـ ثالثا) والا فانه يستغل وظيفته لمصلحته في هذا المجال.

**سادساً:** لم تشر المادة (٣٤) الى كيفية تقديم الأقليم ممثليه الى مجلس الأقاليم وعزلهم مما يتطلب اعادة صياغة هذه المادة كالآتي: (يقدم كل أقليم ممثليه الى مجلس الأقليمين بترشيح من برلمانه ومصادقة رئيس الأقليم).

**سابعاً:** تكتنف المادة (٣٥) الغموض مما يتطلب اعادة صياغتها كالآتي: (يتخذ المجلس الوطني قراراته بالأكثرية ومجلس الأقليمين بالاجماع) وهذا يعني لن مشروع القرار يعد بدءاً من قبل المجلس الوطني ثم يرفع الى مجلس الأقليمين الذي يصادق عليه أو يرفضه أو يغير منه وفي هذه الحالة الأخيرة يعاد مشروع القرار الى المجلس الوطني الذي بدوره يقوم بإعادة النظر في ذلك التغيير فاذا اخذ به، يرفع المشروع الى رئيس الجمهورية. اما اذا أصر المجلس عليه، عندئذ يعيده الى مجلس الأقليمين ثانية الذي له قول الفصل في المشروع أما بالرفض نهائياً فيفشل المشروع أو بالمصادقة عليه بالاجماع فيرفعه الى رئيس الجمهورية لاصدار القرار النهائي عليه.

**ثامناً:** فيما يخص اختصاصات البرلمان الأتحادي موضوع المادة (٣٦) يجب مراعاة ما جاء في (سابعاً) اعلاه أي موافقة مجلس الأقليمين بالاجماع وليس الثلثين أو الأكثرية كما ورد في تلك المادة.

**تاسعاً:** جعل مدة انتخاب رئيس الجمهورية وكذلك رئيس الأقليمين اربع سنوات بدلا من خمس سنوات مع جواز وتكرار انتخابهما لمرة واحدة فقط ومع وجوب التناوب في الترشيح والأنتخاب لمنصب رئيس الجمهورية بين العرب والكورد كل (٨) سنوات. وبخلاف ذلك يكون اشغال هذا المنصب حكرا على العرب نظراً لزيادة نسبتهم على الكورد. هذا ويفضل أن يكون نائبه من الاقليم المقابل دائماً.

**عاشراً:** عند ممارسة رئيس الجمهورية صلاحيته في تحريك القوات المسلحة وقوى الأمن الداخلي، موضوع المادة (٤٣-سابعاً) يستوجب استحصال موافقة برلمان الأقليم الذي يشمله ذلك التحرك.

**حادي عشر:** فيما يخص اتهام أو إدانة رئيس الجمهورية موضوع المادة (٤٤) يفضل ان يدخل ذلك ضمن اختصاص المحكمة العليا على أن يكون خاضعاً للتمييز لدى مجلس الأقليمين الذي يكون قراره باتا.

**ثاني عشر:** حذف ضريبة التركات المنصوص عليها في المادة (٧٣-ثانيا) من الدستور الأول لالغاء هذا النوع من الضريبة في العراق لان الضريبة تؤخذ من الكسب ولاكسب في التركة بل تصيب العائلة بالنكبة في موت مورثهم.

**ثالث عشر:** تنظم قوات البيشمركه في جيش محلي لحماية حدود اقليم كوردستان وليس ضمها الى القوات المسلحة للجمهورية الفدرالية العراقية كما ورد ذلك في المادة (٧٨) من الدستور الأول.

**رابع عشر:** اضافة ما يلي الى آخر المادة (٧٩): واعادة الفيليين المهرجين الى مناطقهم واعادة ممتلكاتهم.

**خامس عشر:** استبدال المادة (٨٣) بما يلي: يحق لشعب أي من الأقليمين ممارسة حق تقرير مصيره بنفسه بالاستفتاء العام في الأقليم.

**سادس عشر:** استحداث مادة في الدستور الثاني تبيح لاقليم كوردستان ممارسة تبادل التمثيل الدبلوماسي والقنصلي وحق الأنضمام الى المنظمات الدولية في امور تقتضيها طبيعة الشعب الكوردي ومصالحه وبما لايتعارض مصالح الأقليم العربي. وقد أخذ بهذا المبدأ دستور المانيا سنة ١٨٧١ ودستور الاتحاد السوفيتي الذي اجاز لبعض دول (اوكرانيا و روسيا البيضاء) حق الانفراد بتبادل التبديل الدبلوماسي وحق الانضمام الى المنظمات الدولية وبموجب ذلك اصبحت هاتان الدولتان عضوتين في الأمم المتحدة ولهما اصواتا مستقلة في جميع فروع هذه الهيئة.

**سابع عشر:** وضع مادة اخرى في الدستور الثاني تبيح لاقليم كوردستان حق عقد بعض المعاهدات لتنظيم شؤون الجوار والحدود وغيرها بما لايتعارض مع معاهدات عقدها الاتحاد. وقد قضى بذلك الدستور السويسري في مادته/ الثامنة.

**ثامن عشر:** اضافة مادة أخرى الى الدستور الثاني مفادها علم وشعار ونشيد لاقليم كوردستان بقانون من برلمان كوردستان.

باستثناء هذه الملاحضات، فان مشروع الدستورين لهما ما يبررهما حسب توجهات الحزب الديمقراطي الكوردستاني وبعض الأحزاب الأخرى التي ترى الفيدرالية حلا مناسبا لاقليم كوردستان في الظرف الراهن. والجدير بالذكر، و من باب التقدير والتثمين، هو ما نصت عليه المادة الخامسة من الدستور الثاني بجعل مدينة كركوك عاصمة لاقليم كوردستان. وبذلك اسدل الدستور الستار بوجه كل الأغيار الذين لهم الطموح غير المشروعة في هذه المدينة بالاستيلاء عليها او النيل من كورديتها او يقلل من شأنها الكوردستاني، ونرجو ان يكون هذا التوجه من التوجهات المبدئية التي لاتقبل المساومة بأي حال من الاحوال.

**مع الشكر والتقدير**

## ئەم بیرەوەرییەش

# لیژنەی کۆششی نەتەوەیی لەهەرایەکدا

ڕۆژێـك لـەرۆژەكانی سـەرەتای مـانگی كـانونی یەكـەمی ١٩٩٥، لەئـەنجامی نامەیـەكی كـراوەی لیژنەكـەمان، لیژنـەی كۆشـشی نەتـەوەیی، بەبـەرواری ١٩٩٤/١٢/٢٦ ئاراسـتەی سـەركردایەتی دوو لایەنەكەمان كرد، بەتەلەفۆن بانگ كراین بۆ ناو خانوویەك لەسەر شەقامی سالم ــ بەرامبەر مەڵبەنـدی سلێمانیی یەكێتی، وتیان گوایە كاك نەوشیروان ئەیەوێ قسەتان لەگەڵ بكات، كە چـووین نـاوبراوی لێ نـەبوو، بـەڵكو لەلایـەن چـەند كەسێكەوە ئابڵوقـە دراین، ئنجـا كەسـێك بـەناوی (ع.ف)ەوە كەوتـە گرمەگرمو هەڕەشەو سوكایەتی كردن.

سـەرەتا ڕووی كـردە خوالێخۆشـبوو رەفیـق قـەزازو پێیـوت: تـۆ كێیـت؟ تـۆ ئـەوە نیـت مـن وەك بەڵێندەرێك ئەو بینایەم دروست كردووە، بەڵام من هەرگیز لەژیانمدا جاشێتیم نەكردووە!

ئنجا ڕووی كردە دوكتۆر نهاد فاضلو پێیوت: ئەی تۆ كێیت؟ تۆ برای ئەو كەسەنیت كە لـەبارەگای توركمانەكان كار ئەكات؟ ئێوە كەس نازانێ كوردن یا توركمان! لەوەڵامدا دوكتـۆر وتـی: براكـەی مـن كاسبە، چێشتخانەی ئەو جێگەیەی بەقونتەرات وەرگرتووە، ئێمە كوردین. من چـەند سـاڵ پێشـمەرگە بووم، نازانم تۆ ئەو كاتە لەكوێ بوویت!؟

دوای ئەوە زۆر بەقینەوە ڕووی كردە من، بێ ئەوەی هیچ قسەیەك بكات، تـەنیا سـەرێكی لێ بـادامو دەستێكی لێ ڕاوەشاندم!! لێرەدا برامان جمال شـاڵی ڕاپـەڕیو نـەڕلنی بەسـەریدلو پێیـوت: ئـەی تـۆ كێیت؟ تۆ ئەزانی ئێمە كێین؟ من كاتێ ئەندامی لیژنەی مەركـەزی بـووم، تـۆ كـەس نەیئـەزانی كێیـت، كاك جەمال بـۆی هەسـتا، بـرادەران هێوریـان كـردەوە، دوای ئـەوە خوالێخۆشـبوو وشیار بابـان ڕووی تێكردو وتی: من نازانم ئێوە كێن؟ ئێوە ئەمنن یا پۆلیسن یا چین!؟ لەولاوە كاك جلال سام ئاغا ڕووی تێكردو وتی ئێمە بۆ لای كاك نەوشیروات هـاتووین بمانزانیایـە وا نیـە هـەر نەئـەهاتین، ئنجـا لـەوەڵامی قسەیەكیدا كە وتی ئێمە دوانتان بەچاكی ئەنرخێنین: كاك جلالو كاك هوشیار، كـاك جـەلال وتـی: من بەرتیلی قسە قبوڵ ناكەم، ئێمـە هـەموو یـەكین، ئێمـە بەسیفەتی میـوان هـاتووین حـەز ئەكـەم ئەگـەر كۆبوونەوەی دووەممان هەبێ، بێیت بۆ لامان بۆ ئەوەی فێری ئوسوڵی میوانداریت بكەین وتی من ئەمە ئەگەیەنم بەكاك نەوشیروان.

گەڵێ قسـەی تـری پـێ وت، جـارێكی تـر كـاك جـەمال شـاڵی ئەڕانیـەوە بەسـەریدا. (ع) ژوورەكـەی بەجێهێشت كەسێكی تر هاتو كەوتە هێوركردنەوەمان. دوای نزیكەی دە دەقیقەیەك (ع) گەڕایەوە، من پێم وت: ئێمە نازانین تۆ لەسەر چی ئەمە ئەكەیت؟ ئەگەر لەسـەر نامەكەمانـە، ئێوە ڕۆژنامـەو ڕادیـۆو تەلەفزیۆنتان هەیە، ئەتوانن وەڵامان بدەنەوە، كـاك جـەلال كەوتـەوە سەرزەنشـت كردنـی. (ع) هاتـە بەردەمیو داوای لێبوردنی لێكردینو سەری دانەوانو وتی ئەمـە پـشتی مـنو ئـەوە (......)ی ئێـوە، بەڵام پزیشكەی لێ قبوڵ نەكراو بێ خواحافیزی چووینە دەرێ.

ئنجا پیاو قسەیەکی هەقیش بۆ ئەوان بکا، نامەکەی ئێمە ئەوەندە توندوتیژ بوو کە هەر ئەو دوولایەنە بوون قبوڵیان کرد، ئێمەش تەنیا لەدڵسۆزیمانەوە بوو، پێشەکیش چاوەڕوانی هەموو کاردانەوەیەکمان ئەکرد لەدژمان.

ئەمەش دەقی نامەکەیە:

نامەیەکی کراوە لەلیژنەی کۆششی نەتەوەیییەوە

بۆ سەرکردایەتی (ی.ن.ک) و (پ.د.ک) و جەماوەری گەل

وا جارێکی تر خوێنی کورد بەدەستی کوردکوژە کوردەکان ڕژێنرایەوە.

ڕێکەوتننامە ستراتیجیەکانتان کە دواهەمینیان ڕێکەوتننامەی ١٩٩٤/١١/٢١ بوو و ئەبوایە تا کۆتایی ئەم چەرخە بڕی بکردایە، لەدوای یەك مانگ پێشێل کرا.

ئێستاش ئەشێ بپرسین کێ خەتابارە؟ بەهەموو پێوانەیەك خەتابار ژمارەیەك لەئێوەی سەرکردەکانی ئەو دوو حیزبەن کە دەستتان گرتووە بەسەر:

١- بەرهەمی ڕاپەڕینەکەی جەماوەری کوردستاندا.

٢- پارەی بانقەکانو ئامێرو کەلوپەلو کەرەسەی فەرمانگەکانو گومرکی کوردستاندا.

٣-ماڵو موڵکی خەڵکی دا بەبیانووی ئەوەی سەر بە ئەم لا یا ئەولان، یا بەناوی پیتاکەوە.

٤- کۆنەجاشو موستەشارو بەعسیو ئەمنو موخابەراتەکانی ڕژێم، لەنێو خۆتاندا بەش ئەکەن.

٥- هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانتان تەزویر کردو ڕێژەی ٧٪ پیلانێك بوو دژی حیزبەکانی تر.

٦- بازرگانی بەخوێنی شەهیدانەوە ئەکەنو لەدوای ڕاپەڕینەوە پێشبڕکێ ئەکەن لەسەر ئەوەی زیاترین ڕۆڵەی کورد بکوژن یا بەکوشت بدەن.

٧- دیموکراتیەتو ئازادیو مافی مرۆڤو حوکمی یاسا پێشێل ئەکەنو هەوڵ ئەدەن لەڕێگەی هێزو پیلانو تەزویرو چەواشە کردنو ویژدان کڕینەوە دەست بەسەر دەسەڵاتی حوکمدا بگرن.

٨- گوللەتان بە P.K.K و بزوتنەوەی ئیسلامیو حیزبی شیوعیەوە ناو بەربەستێکن لەبەردەم پەرەسەندنی هێزە سیاسیەکانی ترداو ڕێگرێکن لەبەردەم کەسانی شارەزاو بەتوانادا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات.

٩- فەرمانگەکانتان کردووە بەتەمەڵ خانەی لایەنگرەکانتان بێ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی گشتیو میلاکو پێویستی.

١٠- گوێ لەڕاو تەگبیرو هاناو هاواری کەسانی دڵسۆزی ئەم نەتەوەیە ناگرنو لەبەردەم هێمایەکی بێگانەدا ملکەچو دەستەوستانن.

١١- یاری بەبازاڕو بەدرلوو بەدۆلارو بەئابووری وڵات ئەکەن.

١٢- ناوچە ڕزگارنەکراوەکانی کوردستانتان لەیاد کردووە.

١٣- پەنا ئەبەنە بەر تۆقاندنو کوشتنو گرتنو ئازاردان لەسەر بیروباوەڕ.

١٤- بوونەتە هۆی نائارامیو لاوازکردنی هەستی نەتەوایەتی ئەوەش وای کردووە خاوەن تواناکان کوردستان بەجێبێڵن.

١٥- گرنگی بەپرۆژەی ئابووریو گەشەسەندن نادەنو بیر لەگوزەرانی خەڵکیو دادی کۆمەڵایەتیو نەهێشتنی برسێتی هەژاران و فەرمانبەرانو خانەنشینان ناکەنەوە.

١٦- لەکاتێکدا کە نەخۆشخانەکان بێ دەرمانو بێ کەرەسەو بێ ئامێرن، بەبێ حساب پارەی ئەم میللەتە ئەدەن بەچەکو کوردی پێ ئەکوژن.

ئێوەی سەرکردایەتی ئەو دوو حیزبە کە ژمارەیەکتان بەخوێنی ئەم میللەتە بوونەتە سەرمایەداری گەورەو پەساپۆرتی هەلاتن لەگیرفانتانایەو خێزانو منداڵتان لەئارامیو رابواردنی هەندەرانن.. یا هەر لەسەرەتاوە رێکەوتننامەکانتان بەراست نیەو بۆ چاوبەستو چاوەڕوانکردنی هەلێکی لەبارترە بۆ شەرێکی تر، یا بەهۆی لەزمەو خاڵە لاوازەکانتانەوە دەسەلاتتان بەسەر کورد کوژەو هەلپەرستو جەردەو ئاودیوکەرو پیاوانی رژێمو پیاوانی بێگانەی ناو حیزبەکانتان نیە، بۆیە بەناوی جەماوەری ستەمدیدەی کوردستانەوە دلواتان لێ ئەکەین کە چیتر یاریی بەچارەنووسی ئەم میللەتە نەکەنو ئەم تاقیکردنەوەیەی کوردستانی باشووریش لەدەست نەدەن.

دلواش لەبەرێزان سەرۆکو سکرتێری گشتی ئەو دوو حیزبەو تێکۆشەرانو دلسۆزانی ناو ریزەکانیان ئەکەین کە لەم قۆناغە ناسکەی کوردستاندا بەرژەوەندیی تەسکی حیزبایەتی بەلاوەنێنو کوردایەتی پێش حیزبایەتی بخەنو بەدەستێکی پۆلایین ریزەکانی حیزبەکانیان لەشەرخوازو پیاوخراپ پاک بکەنەوەو بۆ بنەبڕکردنی شەڕی براکوژیو چارەسەرکردنی کێشەکانی هەرێم ئەم خاڵانە جێبەجێ بکەن:

١-راگرتنو قەدەغەکردنی هەموو شەڕێکی براکوژی.

٢- بەشداری کردنی کەسی یەکەمی ئەو دوو حیزبە لەدەستەلاتەکانی حکومەتی هەرێمدا.

٣- کۆتایی هێنان بەبیاردەی پەنجا بەپەنجاو سپاردنی کار بەکارامەو دلوێن پاک.

٤- هەڵوەشاندنەوە میلیشیای هەموو حیزبەکانو دروستکردنی سوپای کوردستان لەرێگەی تەجنیدی زۆرەملێوەو سپاردنی چەکی حیزبەکان بەو سوپایە.

٥-جێبەجێ کردنی یاسای حیزبەکانو یاسای چەک.

٦- تەرخان کردنی ٩٠٪ی گومرگو باجو داهاتە گشتیەکانو دەستکەوتەکان بۆ حکومەتی هەرێمو ١٠٪ی بۆ حیزبەکان.

٧- پێکهێنانی وەزارەتێکی هەمەلایەن لەگەڵ حیزبەکانی تری ناو کوردستاندا.

٨- یەکخستنی رێکخراوە جەماوەرییەکانی خوێندکارانو قوتابیانو لاوانو ئافرەتانو ژنانو..هتد هەریەکەو لەتەنیا یەك رێکخراودا.

٩-سپاردنی هەموو ئێزگەکانی رادیۆو تەلەفزیۆن بەوەزارەتی رۆشنبیری.

١٠- ئەنجامدانی ئاماری گشتی پێش هەڵبژاردنی گشتی پەرلەمانو هەڵبژاردنی داهاتوو لەسەر شێوازی دائری بێت نەك رێژەیی.

بەباوەڕی ئێمە ئەو هەنگاوانە لەمڕۆدا چارەسەری کێشەکان ئەکەن. چونکە ئەگەر گومرگ درایە حکومەت ئەوسا شەڕ لەسەر چی ئەکەن؟ ئەگەر میلیشیا نەما ئەوسا بەکێ شەڕ ئەکەن؟

ئەگەر چەك ڕامالرا ئەوسا بەچی شەڕ ئەکەن؟ ئەگەر حکومەتێکی هەمەلایەنی بەهێز دروست بوو ئەوسا حوکمی یاسا ئەچەسپێ‌و ڕێگە لەیاسا لادەران ئەگیرێ.

جا ئەگەر برادەرانی سەرکردایەتی یەکێتی‌و پارتی گوێ بەم چارەسەرییانە نەدەن ئەوا چوار ڕێگەیان ئەکەوێتە بەردەم: یا واز بێنن‌و هەلێك بڕەخسێنن بۆ دوای خۆیان، یا بەردەوام بن لەسەر شەڕو بەیەکدادان لەشارەکان دوورخەنەوە تا لایەکیان لاکەی تر تەواو ئەکات، یا ببن بەیەك لەیەك حیزبدا، یا چاوەڕوانی غەزەبی جەماوەر بن بەراپەڕینێکی ترو هاتنە سەرجادەو مانگرتن.

هیوادارین نامەکەمان ڕاستیەکانی خستبێتە ڕوو چاوەڕوانی وەلامین

لەگەل ڕێزمان

کامل ژیر

رفیق توفیق قزاز

شێخ سالار حفید

خالد محمد خال

جلال سام ئاغا

د. نهاد فاضل

هوشیار بابان

جمال شالی

**لیژنەی کۆششی نەتەوەیی**

**١٩٩٤/١٢/٢٦**

ئەم ڕاگەیاندنەمان لەرۆژنامەی (ئالای ئازادی) ژمارە ٢٦٩٤ رۆژی ١٩٩٥/١/٢٢ ل٤و لەنامیلکەی پەرلەمانی شەهید ل٢٨٢–٢٨٥ بلاوکرایەوە، خەلکیش سەدان وێنەیان لەبەرگرتەوەو لەناوەوەو دەرەوەی ولات بلاویان کردەوە. ئەبوایە من ئەم بەسەرهاتو نامەیەم لەنامیلکەی (کوردایەتی‌و سەربەخۆیی) کە سالی ٢٠٠٢ چاپکرا بلاوکردایەتەوە. بەلام لەو سالەدا پارتی‌و یەکێتی لەیەکتر نزیك بوونەوە منیش وتم: با لەم کاتەدا برینەکانیان نەکولێنمەوە، بەشکم دوو ئیدارەکە یەکخەنەوە، بەلام ئەوە هەر نەبوو، بۆیە ئێستا لەناو ئەم بیرەوەریانەدا، ئەم جێگەیەم بۆ کردەوە وەك بەلگەنامەیەکی مێژوویی. ئەوەش وێنەکانی لیژنەی کۆششی نەتەوەییە:

# لەوەڵامی داوایەکی بەڕێز هیمدادی حسەیندا بۆ نامەی ماجستێرەکەی

پێشنیوەڕۆی ١٩٩٤/٩/١٢ لەهۆڵی دادگای سلێمانی، مژدەی ئەوەت دامێ کە نامەی ماجستێر ئەگوزەرێنێت، شادمان بووم‌و هیوادارم سەرکەوتووبێت.

چۆنیەتی پەیوەندی من بە گۆڤاری هیواوە، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو گرەوەی ساڵی ١٩٥٧، بۆ جوانترین هەڵبەست لەسەر بەهاری کوردستان سازکرا، ئەو کاتە من دوورخراوەیەکی سیاسی بووم لە ئەبوغرێب، لە ڕێگەی ڕۆژنامەی ژینەوە هەواڵەکەم خوێندنەوەو بەپیر گرەوەکەوە چووم‌و ئەنجام بەپۆستەدا نامەیەکم بۆ هات کە هەڵبەستەکەی من یەکەم دەرچووە. نامەکە خەم‌و پەژارەی دوورخراوییەکەمی ڕەواندەوە. بەتایبەتی بۆ ئەوسای منێك کە تەنیا سێ ساڵ بو بەهەڵبەستوتن ئاشنا ببووم!

لیژنەی گرەوەکە، بەڕێزان: ڕەشید عارف‌و عەلائەدین سوجادی‌و ئەنوەر سائیب‌و شەماڵ سائیب بوون. دوای وەرگرتنی خەڵاتەکە، ڕووی ئەوەشیان لێنام کە سەرپەرشتی‌و سەرنەنووسەریی گۆڤاری هیوای یانەی سەرکەوتن بکەم کە تازە ڕەزامەندیی بۆ وەرگیرابوو، کاك شەماڵیش ڕووی ئەوەی لێنام کە لەرادیۆی کوردیی بەغداد گۆشەیەکی وێژەیی وەرگرم، هەردوو داواکەم پەسەندکرد، بێئەوەی ئەوە بدرکێنم کە من دوورخراوەیەکی سیاسیم‌و بەدزی پۆلیسەوە هاتوچۆی بەغداد ئەکەم.

کاتێ بۆ گۆڤارەکە دەست بەکاربووم، زوانیم مامۆستا کەریم زانستیش بۆ هەمان مەبەست ڕووی لێنراوە، پێکەوە نەخشەی کارمان کێشاو مانگی تەمموزی ١٩٥٧ ژمارە (١)مان خستەبەر دیدەی خوێنەرانی ئازیزەوە. مامۆستا کەریم بەزۆری کاری ئیداری‌و ژمێریاری‌و سەرپەرشتیی چاپی گرتە ئەستۆی خۆی، دوای ماوەیەك برای خۆشەویست‌و دڵسۆزم محمد نوری عارف (د. محمد نوری عارف) هاتە پاڵمان‌و ئەویش دەس بەکاربوو لەگەڵماندا، چەند مانگێکیش خوشکی بەڕێزم نەسرین خان (د. نەسرین فەخری) کاری لەگەڵدا کردین، بەڵام مامۆستا کەریم زانستی لەدوای ژمارە (١١)ی ساڵی (١)ەوە خۆی کشانەوە، مامۆستا حافظ مصطفى قازیش مدیری مەسئولی گۆڤارەکە بوو، مامۆستا حافظ خۆی ژمێریاربوو لەکۆمپانیاکەی مامۆستا رشید عارف. بەو هۆیەوە کە ئەوسا ئەو لەدەرچوانی کۆلیج بوو، کرابوو بە مدیری مەسئول، هەندێك پارەتیشی ئەداین، بەتایبەتی لەهەڵبژاردنی ئەو نوسینانەدا کە بەبالینی بۆمان ئەهات، خاوەنی ئیمتیازی گۆڤارەکەش یانەی سەرکەوتن بو لەبەغداد.

ڕاستییەکەی یانەی سەرکەوتن نیوەندێکی ڕۆشنبیریی نەتەوەییانەی کوردی بوو، زۆربەی ئەو کوردانەی لەخۆگرتبوو کە لەبەغدا ئەژیان. ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لەپەرەپێدانی هەستی کوردایەتیدا، جگە لەکۆڕو کۆبوونەوەکان، قوتابخانەیەکیش بو بۆ وتنەوەی وانەی زمانی کوردی، جگە لەو کوردانەی زمانەکەی خۆیان لەیاد نەمابوو، ژمارەیەکیش عەرەب ئەهاتنە ئەو دەورانەوە کە بۆ فێربوونی کوردی ئەکرایەوە، یانە جێگەی کۆبوونەوەی قوتابیە کوردەکانیش بوو لەبەغداد، ئەو قوتابیانە کۆبوونەوە سیاسیەکانی خۆیان لەیانەدا ئەنجام ئەدا. بەهۆی یانەوە کوردە فەیلیەکانیش لەبەغداد بەکوردانی سۆران‌و بادینان ئاشنا ئەبوون. یانە گەلێ چالاکیی تریشی ئەنجام ئەدا.

گۆڤاری هیواش قوتابخانەیەکی کوردایەتی گشتی بو بۆ ئەو ڕۆژە. پێنووسی نووسەرە گەورەو ناودارو بەبڕشتەکانی ئەو سەردەمەی لەخۆگرتبوو، جگە لەنووسەرو هەستیارە لاوەکان، لەزۆربەی

ژمارەکاندا ناوی ئەم نووسەرە بەرێزانە دووبارە ئەبوونەوە: عبدالقادر قەزاز، جمیل رۆژبەیانی، أ. ب. هەوری، شاکر فتاح، محمد مصطفی کوردی، احمد خواجە، شێخ حسن شیخ حەمە مارف، محمد توفیق وردی، کاکەی فەلاح (بەناوی روناك محمد)ەوە (کە سەری لێتێکدابووین‌و وامان ئەزانی کچە کوردێکە کە لەو رۆژەدا نوسەری ئافرەت کەم بوو، منیش بۆ هاندان لێکۆڵینەوەیەکم لەسەرکرد)، عثمان رضا علی، کاردۆخی، محمد سعید جاف، شیخ محمدی خاڵ. ت.ب مەریوانی، ج بابان، شارەزا، حوێزی، ناکام، احمد غفور.

لەنووسەرە لاوەکانیش: شەماڵ سائیب، مصطفی صالح کەریم، فاضل نظام الدین، عبدالله میدیا، غەمبار، غەمگین، محمد نوری توفیق، مەم، نوری تاڵەبانی، فؤاد زکی مەناری، محمدی مەلا کەریم، فاتح عبدالکریم، پرشنگ، ساجد ئاوارە، بیمار، هۆشیار، وەرزێر، فؤاد عزت، ئەمینی میرزا کەریم.

لەهەستیارانیش: کامەران، کاکە شوان، دلزار، صالح یوسفی، هەوری خالد دلێر، شاربازێری، دیلان، خالد رشید، نەسرین فەخری، د. رەسول، غەمبار، مدهوش، قدری جان.

لەپزیشکەکانیش: د. عبدالرحمن عبدالله، د. نامق نادر، د. قادر شال، د. مەریوانی، د. انور کریم، د. وریا رەواندزی.

جگە لەوانە، ژمارەیەك نووسەرو هەستیاری تریش کە بەناوی خوازراو، یا بەپیت بەرهەمەکانیان بڵاوئەکردەوە نوسینەکانیان دووبارە ئەبوونەوە. نوسەرو هەستیاری تریش هەبوون کە کەم کەم بەرهەمیان لەهیوادا بڵاوئەکردەوە.

منیش بەناوی کامل، ژیر، هێمن‌و زۆرجاریش بەبێ ناو بەرهەمم بڵاوئەکردەوە، داخم ناچێ کە من ئاگادار نەبووم لەوەی هەر جارێ بەناوی (هێمن)ەوە ئەمنووسی، لەئێران هەستیاری بەرێز هێمنی مهابادیان ئەگرت‌و تووشی لێپرسینەوەو ئەشکەنجەدان ئەبوو! کە هاتە ئەمدیو، بەدەم شەرەوە یەکترمان ناسی، بەڵام من داوای لێبوردنم لێکرد.

هیوا گەلێ بابەتی گرتبووە خۆی، وەك: ئەدەب، زانست، زمان، تەندروستی، کشتوکاڵ، کۆمەڵایەتی، مێژوو، چیرۆك، هەڵبەست، توێژینەوە، هونەر، رەخنەسازی‌و.. هتد.

هیوا ئەگەرچی گۆڤارێکی سیاسی نەبوو، بەڵام ئێمە لەو دەرگایەشمان هەر ئەدا، بگرە هەندێ جار شتی وامان ئەوت کە ئێستاش هەموو نوسەرێك زات ناکا بیڵێ، بۆ نمونە من لەپێشەکی ژمارە -٢- ساڵی -٢- نوسیبووم: پێویستە ئەدەبەکەمان ئەرخان بکەین بۆ سوودی شۆرش‌و ئازادکردنی کوردستانی تورکیاو ئێران‌و یەکخستنی ئەم پارچانە لەژێر ئالایەکی یەکگرتوودا. لەهەڵبەستی کوردستانی من دا ل ٦٣ ژمارە-٤- ساڵی -٢- ئەڵێم: ئەمرۆ ئەبینم نیشتمان وەك گوڵاڵەی بەهاری جوان، کوڵمی سوورو چاوی گەشە، تومەزێرێکی بێ خەشە، تیابڵاوەو ئەڵێ دەی زوو، بۆ کوردستانی یەکگرتوو.

لەهەڵبەستی (بۆ جوانێکی دیل)دا وتوومە: چار نیەو ئەبێ رەوان، پڕ بەدەم، بەنەڕەی پڵنگ شاروێ پڕکەم، بۆ راپەڕینی هەوڵێ کۆششێ، لەخەو هەڵسانێ دەنگێ جۆششێ، بۆ ئازادبوون‌و مافی کوردستان، زۆردار، دەرەبەگ لەگۆڕو چاڵنان. کە لەژمارە -٣- ساڵی -١- لاپەڕە ٢٦ دایە.

هەڵبەستی (بەهاری کوردستان)یش ئەگەرچی دوای سەرکەوتنەکەی، لەرۆژنامەی ژیندا بڵاوکرایەوە، بەڵام لەسەر داخوازیی لیژنەکەو لەسەر داخوازیی دەستەی بەڕێوەبەری یانەی سەرکەوتن،

لەژمارە -١- ساڵی -١-ی هیوادا جارێکیتر بڵاوکرایەوە، واتا ئەمڕۆی ١٩٥٧ کە لەو هەڵبەستەشدا هاتووە: زرمەی پێ بێ‌و چریکەی دەنگ، دەنگی بیرێك قووڵ‌و زۆر مەنگ، لێی بێتەدەر ئاوازی خۆش، ئاوازێ گشت بێنێتە جۆش، زەماوەندێ وەها ساز کەن، داڵە کەرخۆر پەڕەوازکەن، تاکو ئەوساکە کوردستان، بۆ خۆمان بێ‌و هەر بۆ خۆمان.

جگە لەوانە، لەناواخنی هەندێ گۆشەدا، وەك گۆشەی: (چیت نەزانی پرسیار بکە) کە نوسەری ئەم دێڕانە سەرپەرشتی ئەکرد، بۆ ئەوەی کوردایەتیەکەی دڵداری هەستیار بخەمەوە یادی خوێنەران، پرسیومە: ئەم هۆنراوەیە هی کێیە؟ ئەی رەقیب هەر ماوە قەومی کورد زمان نایشکێنێ دلنەیی تۆپی زەمان، کە لەلاپەڕە -١٣- ژمارە -٢- ساڵی-٢- بڵاوکرایەوە، هیوا گرنگیەکی زۆری ئەدا بەڕەخنەسازی، لەژمارە -١- ساڵی -٢- لاپەڕە (٨٠)دا گۆشەیەکی تازەی کردەوە بەناونیشانی (لەژمارەی پێشوودا)، ژمارەی پێش ئەم ژمارەیەی سپارد بەژمارەیەك نوسەر بۆ رەخنەو لێکۆڵینەوە. من کە خۆم سەرپەرشتی ئەم بەشەم ئەکرد، مامۆستا سعید ناکام رەخنەی لەو هەڵبەستەی من گرتبوو کە وتبووم: من کە دیم لەرەی شەپۆلی شنەی ئالای کوردستان، تێکەڵاو ئەبێ لەگەڵ جریوەی ئەستێرەی بەیان، ئەو کاتە هیواو ئامانجی دوورم هەردوو پێکەوە. ئەبن بە پرشنگ گوڵاڵەی سوورم ئەگەشێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بە ئەمانەتەوەو بەسنگێکی فراوانەوە، رەخنەکەیم بڵاوکردەوە، بێ ئەوەی وەڵامێکی بدەمەوە، ئەگەرچی رەخنەکەشی لەجێی خۆیدا نەبوو.

گۆڤاری هیوا بۆ هاندانی نوسەران، گرەوی ساز ئەکرد، لەژمارە -١٢- ساڵی -١- لاپەڕە (٧١)دا، مەدالیای هیوا، مەدالیای زیوین، تەرخان کرد بۆ یەکەمی ئەو نوسەرانەی لەگرەوەکانی هیوادا سەرئەکەوین، خەلاتی تریش بۆ دووەمەکان تەرخان کرد. لەو ژمارەیەدا گرەوی (چیرۆك بۆ شانۆ) بڵاوکرایەوە بۆ جوانترین شانۆنامەی خۆماڵی‌و شانۆنامەی وەرگێڕاو.

وەك راستییەك ئەشێ ئەوەش بدرکێنین کە گۆڤاری هیوا ئەتوت لەکوردستانێکی ئازاددا دەرئەچێ! هیچ رۆژێك لەرۆژان وێنەیەکی مەلیکی تێدا بلاونەکرایەوە لەکاتێکدا هەبوو لەلاپەڕەی یەکەمی کتێبێکی زمانەوانیدا یا کۆمەلایەتیدا یا مێژووییدا وێنەی مەلیکی عێراقی بلاوئەکردەوە، هیچ وشەیەکیش یا دێڕێك لەهیچ بۆنەیەکی ئەو رژێمەدا بڵاونەکرایەوە لەهیوادا.

یانەی سەرکەوتن‌و گۆڤاری هیوا، لەگەڵ دەسکورتی‌و کەمدەرامەتییەکەشیدا چەندجار بڵاویکردەوە کە ئامادەیە بۆ چاپکردنی پەڕاوی نوسەران لەسەر ئەرکی یانە خۆی، ئەوەبوو مێژووی کوردو کرودستان دانەری شێخ محمدی مەردۆخ، وەرگێڕی محمد فیدامان چاپکرو بڵاوکردەوە.

بیرەوەرییەکانی من لەگەڵ گۆڤاری هیواو یانەی سەرکەوتندا دەگەڕێتەوە بۆ تەنیا دوو ساڵی ١٩٥٧ و ١٩٥٨ دوای ئەوە لەگۆڤارو یانە کشامەوە.

لەگەڵ رێزمدا

# بەدواداچوونێك لەسەر وتارێکی کاك فریاد ڕەواندزی لەبارەی یەکگرتنەوە

بیرۆکەی یەکگرتنی حیزبە کوردستانیەکان، بیرۆکەیەکی دێرینە، بەکردەییش هەنگاوی بۆ نراوە، پارتی دیموکراتی کوردستان پێکهاتەی پاشماوەی دارکەرو شۆڕشو ڕزگاریو هیوایە، یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش پێکهاتەی شۆڕشگێڕانو ڕەنجدەرانە.

نووسەرانی کوردیش هەمیشە داوای یەکێتیان کردووە، ئێستا خواستی جەماوەر یەکێتی ڕیزەکانە، بەهەر چاویلکەیەکیش بڕوانرێتە کێشەی کورد، لەپلەی یەکەم دا چارەسەر لەیەکێتیدا ئەبینرێت، بەتاقیکردنەوەش دەرکەوتووە، بێ یەکگرتن یەکێتی تاسەر نابێ، هەڵبەت ئەوەش دیاردەیەکی تاڕادەیەك تایبەت بەکوردە بەهۆی نەبوونی قەوارەیەکی سیاسییەوەو بەهۆی ئەو زیانانەوە کە لەکورد کەوتووە لەئەنجامی دووبەرەکیدا، ئەگینا ئەم پەرۆشییە بۆ یەکگرتن نەئەبوو، بگرە هەر پێویستیشی نەئەکرد.

لەدوای ڕاپەڕینەوە، هەوڵێکی کردەیی بۆ یەکگرتن، لەنوسەری ئەم دێڕانەوە دەستی پێکرد، درێژەو ئەنجامی ئەو هەوڵانە لەنامیلکەیەکدا بڵاوکراوەتەوە[1]. لیژنەی کۆششی نەتەوەییش کۆششێکی زۆری لەم بارەیەوە هەیە، لەم دواییەشدا مامۆستا فلك الدینو د. ڕۆژ گزمەکەیان سەر لەنوێ شڵەقاندەوە، بەدوای ئەواندا ژمارەیەك نووسەری تریش. وا بۆ یەکەمجار کاك فریاد ڕەواندزیش لە (کوردستانی نوێ)وە لەدەرگای ئەم باسەیدا کە ئەمەیان سەرنجێکی تایبەتیی ئەوێ، چونکە خەڵکی چاوەڕوان بوون کە لەلایەنی یەکێتی نیشتمانیشەوە شتێك ببیستن. ئەوەی مایەی دڵخۆش بوونە، نوسینەکەی کاك فریاد، یەکگرتنی ڕەت نەکردۆتەوە، بەڵکو مەرجێك بۆ یەکگرتن دائەنێو ئەڵێ: (پێویستە لەخاڵە لەیەك جیاوازەکانەوە دەست پێ بکرێ، نەك لەخاڵە هاوبەشەکاندا[2]). ئەمەش مەرجێکە باوەڕ ناکەم کەس لاریی لێ هەبێ. بەڕێز مام جەلالیش هەر هەمان بۆچوونی هەبوو کە ڕۆژی ١٩٩٤/٣/٢٣ لەقەلاچوالان دیدەنیم کردو پێشنیاری یەکگرتنی یەکێتیو پارتیم بۆ کرد، ڕۆژی ١٩٩٤/٣/٣٠ کە ئەو بۆچوونەو پێشنیارەم بە بەڕێز کاك مەسعود گەیاند، ئەویش پێشنیارو بۆچوونەکەی پەسەند کرد.

لەڕاستیدا خاڵی جیاواز نەك لەنێوان دووپارتیدا، بەڵکو لەنێوان دوو کەسیشدا هەر ئەبێ، بەلام کاتێ ژمارەیەك لەتاکەکانی کۆمەڵ یەك ئەگرن بۆ دروستکردنی حیزبێك ئەوا بێگومان ئەبێ لەسەر خاڵە جیاوازەکان پێك بێن.

بۆ نمونە: ئێستا منو کاك فریاد ڕامان جیاوازە لەسەر هەندێك بابەت کە لەو وتارەی ئەودا هاتووە:

١) ئەو ئەڵێ: دوای هەڵبژاردن حیزبی گەلو پاسۆکو سوسیالیست یەکیانگرت بۆ ئەوەی دڵڕاندنی خۆیانی لەو هەڵبژاردنەدا پێ بشارنەوە.

---

[1] بڕوانە کامل ژیر: کوردایەتیو دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ، چاپی سوید، ئابی ١٩٩٤.

[2] ئەم وتارەم ڕۆژی ١٩٩٤/١٢/١١ نارد بۆ ڕۆژنامەی (کوردستانی نوێ)، بەلام بڵاوی نەکردەوە.

من ئەڵێم: پاسۆك‌و سوسیالیست پێش هەڵبژاردن یەکیانگرت‌و بەیەك لیست (لیستی شین) چوونە هەڵبژاردنەوەو د. مەحمود عوسمانیش پاڵپوراویان بوو بۆ رابەر. کەواتە هەر هیچ نەبێ بەلای ئەو دوو حیزبەوە مەسەلەی دۆڕاندن هاندەری یەکگرتن نەبووە.

٢) ئەو ئەڵێ: هەر بۆیەش یەکگرتنەوەکە سەری نەگرت‌و حیزبە نوێیەکە لێکهەڵوەشایەوەو خوالێخۆشبوو رسوڵ مامەند جارێکی دیکە سوسیالیستی دروست کردەوە.

من ئەڵێم: یەکگرتنەکە سەری گرت، جیابوونەوەی چەند کەسێکیش نابێتە بەڵگەی هەڵوەشاندنەوە، خوالێخۆشبوو روسول مامەند هەتا رۆژی هەڵبژاردنی سەرکردایەتی حیزبی یەکگرتن لەگەڵ یەکگرتندا بوو، بەڵام دوای جیاکردنەوەی دەنگەکان، یەکسەر خۆی جیاکردەوە بێ ئەوەی چاوەڕوانی ئەوە بکات کە ئایا کارلێکی کیمیاوی یا فیزیاوی دروست ئەبێ یا نا؟ لەگەڵ ئەوەشدا کاك رسول یەکگرتنی بەرەهایی رەت نەکردەوە، بەڵکو یەکگرتنی لەگەڵ (ی.ن.ك)دا کرد، ئەوەش ئاساییەو مرۆڤ ئازادە لەهەڵوێست‌و دیاریکردنی چارەنووسی خۆیدا، منیش بەو بۆنەیەوە کە ئەوسا ئەندامی سەرکردایەتیی حیزبی یەکگرتن بووم، خواستم ئەوەبوو کە کرداری یەکگرتن زۆربەی حیزبە کوردستانیەکان بگرێتەوە، بۆیە دوای یەکگرتن لەگەڵ پارتیدا درێژەم بەکۆششی یەکگرتن دا، لەگەڵ (ی.ن.ك) یشدا، ئەوەبوو سەرەتا بەتەنیا باڵ‌و دوایی لەگەڵ لیژنەی کۆششی نەتەوەییدا بۆ ئەو مەبەستە هەوڵماندا‌و ئەو هەوڵانەش شاردراوە نین، بەڵام وەك مەولەوی ئەڵێ:

من لەرێی رەحمەت نوختەم ئەکران
بەرێی رەحمەتا مێشێ پیا ریان!

ئێمە لەسەرەتای ئەو کۆششەدا بووین، مێردەزمەی شەڕی خۆکوژی کارەکەی ئێمەی دواخست‌و وانیازمانە لەنووکەوە دەس پێ بکەینەوە.

٣) ئەو باس لەوە ئەکا کە ئەشێ بەیەك گرتن حیزبەکان واز لەبەشێکی گرنگی سەروەری‌و مێژوویان بهێنن.

من ئەڵێم: سەروەری‌و مێژووی نەتەوە لەهی حیزبەکان گرنگترە ئەگەر ئەو راستیە رەچاوبکرێ کە حیزب هۆکار (وسیلە)یەو نەتەوە مەبەست (غایە)یە، بەگەڵەویستیشە ئەگەر حیزبێك پێچەوانەی ئەم راستییە بێ، ئەوا نە خۆی سەروەری بەدەست ئەهێنێ‌و نە نەتەوەش خۆی ئەکاتە هۆکار بۆی.

لەگەڵ ئەو خاڵە جیاوازانەشدا، من‌و کاك فریاد یەك ئەگرینەوە لەو راستییەدا کە هەر یەکگرتنێك ئەگەر ئاکامەکانی بەرەو ئاقاری سەرکەوتن بچێت، ئەوە لەئەنجامی پێشکەوتوویی‌و لەیەك گەیشتن‌و لەخۆبوردییەوە دێت‌و بەلەمی یەکگرتنیش ئەگەر لەناو شەپۆلەکانی دەریایەکی بێ ئامانیش بێ، ئەوا نقوم نابی‌و دەگاتە کەناری ئاواتەکانی.

ئەوەش کەوابوو، هیچ کام لەو حیزبانەی یەك ئەگرن سەروەری‌و مێژووی خۆیان ون ناکەن، بەڵکو ئەو سەروەری‌و مێژووانە ئەبنە سەروەری‌و مێژووی هاوبەش بۆحیزبە تازەکە.

لەکۆتاییدا سوپاس بۆ کاك بریاد رەواندزی کە ئەم هەلەی رەخساند بۆ ئەم بەدواداچوونە، ئەم باسە هەرچەندو هەرکەس لەسەری بنوسێ چاکەو سوپاس بۆ خەمخوارانی یەکێتی ریزەکانی نەتەوەی کورد.

لەوەڵامی پرسیارێکی گۆڤاری ڕێژداری (تایم - Time)دا - ژمارە ٦ ساڵی ١٩٩٨

# بەسەرهاتی قەڵەمێک

### کامل ژیرو ئەزموونی ڕۆژنامەنووسی

## لەسەر وتارێکی ڕەخنە ئامێزی من، ڕەفیق حیلمی لەئیبراهیم ئەحمەد زویر بوو

ڕەفیق حیلمی — زێـــــر

ڕاستە بەهرە زگماکییەکە پاڵپێوەنەرە، بەڵام هەندێ جار ڕێکەوتیش ئەبێتە هاندەرو ئاڕاستەکەری مرۆڤ بۆ پیادەکردنی جۆرێك یا چەند جۆرێك لەچالاکییەکانی ژیان. من بیرم لەوە نەکردبووەوە کە بکەومە بواری ڕۆژنامەنووسییەوە، زیاتر بەسیاسەتەوە خەریکبووم، جارجاریش هەڵبەستم ئەوت‌و لەدەرگای چیرۆك‌و شانۆنامەنووسین‌و بەشداربوون لەشانۆگەریم ئەدا.

ساڵی ١٩٥٧ کاتێ دوورخراوەیەکی سیاسی بووم لەئەبوغرێب، بەشداریم لەگرەوێکی وێژەییدا کرد کە بۆ جوانترین هەڵبەست لەبارەی بەهاری کوردستانەوە سازدرابوو، ئەو کاتە تەمەنم ٢٣ ساڵ بوو، بەتەمای سەرکەوتنێکی ئەوتۆ نەبوم لەو گرەوەدا کە لەڕۆژنامەی ژین دا بڵاوکرابووەوەو بەڕێکەوت ئەو ژمارەیەی ژینم بەرچاوکەوت. کەچی بەپۆستەدا نامەیەکم بۆ هات مژدەی ئەوەی تێدا بوو کە هەڵبەستەکەی من بەیەکەم دانراوە لەلایەن لیژنەی تایبەتی گرەوەکەوە.

کاتێ چووم بۆ وەرگرتنی پاداشتی گرەوەکە، زانیم دزی هەندێ دەروازە خەریکە لەڕێمدا ئەکرێتەوە! منێك کە لەوەوپێش هەر خۆپیشاندانێك یان چالاکییەکی گشتی سیاسی لەسلێمانیدا ئەنجام بدرایە، بەشداری ببومایە یا نا، چەند مانگێك لەسەری ئەگیرام‌و جارێکیش بۆ ماوەی حەوت مانگ‌و بیست ڕۆژ لەسەربازگەی شوعەیبە خرامە زیندانەوەو دواجاریش نەفی کرام بۆ ئەبوغرێب‌و لیرەش دەسبەسەرێکی سیاسی بووم، کەم کەس ئەیانوێرا قسەم لەگەڵدا بکەن، ئەوە جگە لەباری خراپی ئابووریم، بەڵام کە بەدزی پۆلیسەوە چوومە بەغدا بۆ وەرگرتنی پاداشتی هەڵبەستەکەم، زانیم لیژنەکە بایەخێکی تایبەتیم پێئەدەن.

مامۆستا ڕەشید عارف داوای لێکردم ببمە ئەندامی یانەی سەرکەوتن‌و وتیشی یانە، تازە ئیمتیازی گۆڤارێکی بەناوی (هیوا) وەرگرتووە، ڕووپێلێنام من ئەو گۆڤارەیان بۆ دەرکەم، شەماڵ سائیب وتی مامۆستا کاملی کاکەمین بەڕێوەبەری ڕادیۆی کوردی لەبەغدا وتویەتی گۆشەیەکی ئەدەبی وەرگرم لەئێستگە، هەردوو داواکەم پەسەندکرد، دوای ماوەیەکیش هەر ڕەشید عارف لەکۆمپانیای کەرەسەی خانووبەرە دایمەزراندم‌و سەفیری یۆگسلاڤیش داوای لێکردم وانەی کوردی پێبڵێمەوە کە بەم کارانە دەسکەوتی مانگانەشم گەیشتە ١٤٥ دینار کە ئەو کاتە مانگانەی فەرمانبەرێکی مامناوەندی لە ٢٥ دینار تێپەڕی نەئەکرد. بەو جۆرە تێکەڵ کاری ڕۆژنامەوانی‌و ڕادیۆکاری بووم.

لەمێژووی ڕۆژنامەنوسی کوردیدا؛ بەدوای کوردستانەکەی یەکەم ڕابەر میقداد مەدحەت بەدرخان دا، گەلێ ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی ڕوناکیان بینی، بەلام لەڕووی قەوارەو بەردەوامیتی و تەمەن درێژی و بایەخی مێژوویی و ئەدەبییەوە، ئەگەر گۆڤاری گەلاوێژ بایەخێکی تایبەتی هەبێ، ئەوا گۆڤاری هیواش چراوگی گەشی ڕۆژگاری خۆیەتی. ئەم گۆڤارە لەچاو سەردەمەکەی خۆیدا قوتابخانەیەکی کوردایەتی بوو؛ پێنوسی نوسەرە گەورەو بەبڕشتەکانی ئەوسای کوردی لەخۆگرتبوو، لەدەرگای ئەدەبو زانستو زمانو تەندروستیو کشتوکاڵو کۆمەلایەتیو مێژوو و چیرۆکو هەڵبەستو توێژینەوەو هونەرو ڕەخنەسازیی ئەدا. لەڕووی سیاسیشەوە، ئەگەرچی گۆڤارەکە سیاسی نەبو، بەلام ئێمە لەو دەرگایەشمان ئەداو هەندێ جار قسەمان لەئازادکردنی کوردستانو یەکخستنەوەی پارچەکانی کوردستانو ئالای کوردیو کوردستانی یەکگرتوو ئەکرد بەتایبەتی لەدوو توێی نوسینو هەڵبەستەکانی منەوە کە لەژێر ناوی کامل ژیر، ژیر، هێمن، هەندێ جاریش بەبێ ناو پەخشم ئەکردن.

**ئیبراهیم ئەحمەد**

بیرەوەرییەکانی من لەگۆڤاری هیوادا، وەك ڕۆژنامەنوسێك، ئەگەڕێتەوە بۆ تەنیا دوو ساڵی ١٩٥٧؛ ١٩٥٨. دوای ئەوە خۆم لە گۆڤاری هیواو بانەی سەرکەوتن کشانەوە. ئنجا ساڵی ١٩٥٩ لەپارتی دیموکراتی کوردستانەوە داوایان لێکردم کە پاشکۆی ڕۆژنامەی (خەبات) بەکوردی هەفتەی جارێك دەرکەین؛ بۆ ئەم کارە سەرەتا تەنیا مامۆستا حیلمی عەلی شەریف یاریدەی ئەدام. بەهۆی ئەو ڕۆژنامەیەوە لەگەڵ هەستیاری گەورەی عەرەب محەمەد مەهدی جەواهری یەکترمان ناسی، چونکە ڕۆژنامەکەمان لەچاپخانەیەکدا چاپ ئەکرا کە ئەویش ڕۆژنامەیەکی بەعەرەبی تێدا چاپئەکرد. گەلێ جار لەو چاپخانەیەدا شەومان ڕۆژ ئەکردەوەو بەدەم کارەکەمانەوە لەوێژەو سیاسەت ئەدواین.

لەیادەوەرییەکانی ئەم ڕۆژنامەیەدا، دوای ئەوەی مامۆستا ڕەفیق حیلمیو مامۆستا گۆران بەشداریی کۆنگرەی ئەدیبانی عەرەبیان کرد لەکوێت ساڵی ١٩٥٩، من وتارێکی ڕەخنە ئامێزم ئاراستەی ئەو دوو بەڕێزە کرد بەرامبەر بەو بەشداری کردنەیان، چونکە بەشداری کردنەکەیان وەك دوو ئەدیبی عێراقی بوو نەك وەك دوو ئەدیبی کورد. وتارەکەم بەناوی (هـ)ەوە بلاوکردەوە، لەدوای گەڕانەوەیان مامۆستا ڕەفیق حیلمی لەمامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد زویر بوو؛ ڕۆژێك لەدوکانەکەی مامۆستا بەشیر موشیر باسی ئەو وتارەی بۆ ئەکردمو ئەیوت من بەشێوازی نوسینەکەدا ئەزانم ئەوە وتاری ئەوە. پێموت مامۆستا من بەوتاری ئەوی نازانم، بەلام نەشموێرا بڵێم وتاری منە!

ساڵی ١٩٩١ وەك ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی، لێپرسراوی ڕاگەیاندنی پاسۆك بووم،دەرکردنی ڕۆژنامەی (سەربەخۆیی) لەئەستۆی مندا بوو، ئەو ساڵە ڕۆژنامەکەمان بەتایپو ئامێری لەبەرگرتنەوە

←

**لەوەڵامی چەند پرسیارێکی کۆڤاری ڕێبازی (کۆنگرە)دا ژمارە ٢٣ نەورۆزی ٢٧٠٢**

## وتووێژێك لەگەڵ هونەرو نیشتمانپەروەرو سیاسەتکاری لەمێژینەی کورد مامۆستا کامیل ژیر

ئا/ سیروان کاوسی - سەرنوسەری کۆنگرەی

ئۆرگانی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان

بڵاوکراوەی بیری نەتەوەیی کوردی - نەرویج

ئەوە ناونیشانی وتووێژەکە بوو کە چەند پرسیارو وەڵامێکی گرتبووە خۆ لەبارەی بنەماڵەو بەرهەمەکان و کارێکو بیری نەتەوەیی کورد لەچاو شەستەکانی سەدەی رابوردوو و هۆی نەبوونی هوشیاریی نەتەوەیی و باری سەرنج بەرامبەر داهاتووی کورد.

لەم بەرهەمەدا کە ئێستا لەبەردەست خوێنەرەوەی بەڕێزدایە، لەو دەرگایانە چەندجار دراون، دوبارەکردنەوەیان جارێکی تر لێرەدا، گونجاو نیە. تەنیا هێمایەك بۆ دوا وەڵام ئەکەین:

بەرامبەر داهاتووی کورد، گەشبینم، هیوادارم حیزبایەتی تێکی نەدا.

بەباوەڕی من نەخشەکانی نێوچەکە گۆڕانیان تێدا دەکرێ.

---

←—— چاپ ئەکرد، لەکاتی ڕەوەکەدا کە خەڵکی شپرزەی دەرچوونی خۆیان بوون، منو هەندێك لەهاوبیرانی دەزگای ڕاگەیاندنی پاسۆك شپرزەی ئەو ئامێرانە بووین؛ دوو تایپو دوو ئامێری لەبەرگرتنەوەو چەند رۆنیۆیەكو هەرچی کاغەزو ستێنسڵو مەرکەبمان هەبوو لەگەڵ موەلیدەیەکی بچووکی کارەبادا ئامان لەپیکابێكو گەیاندمانە بیارە، لەوێ لەو کاتی ڕەوەدا دەستمان کردەوە بەدەرکردنی ڕۆژنامەی سەربەخۆیی کە لەو کاتەدا تاکە ڕۆژنامەیەکی حیزبەکانی بەرەی کوردستانی بوو، دوای چەند مانگێك گواستمانەوە بۆ قەلاچوالان، لەدوای کشانەوەی ڕژێمیش لەکوردستان، گەڕاینەوە سلێمانی و تا یەککرتنی پاسۆكو سوشیالستیش سەرپەرشتیاری ڕۆژنامەکە بووم.

لەئەزمونی ڕۆژنامەنووسیمدا باری سەرنجم بەرامبەر ڕۆژنامەنووسی ئەوەیە کە کارێکی ماندووئامێزە، لەکاتێکدا خەڵکی بەرۆژ گەشتو سەیرانو بەشەو ئاوەڵی مێزو مەین، ڕۆژنامەنوس پشتی بەسەر مێزی نوسینو پیاچوونەوەدا چەماوەتەوەو هەرگیزو لەباشترین ڕۆژگاریشدا پاداشتەکەی بەپەرێزی ماندوبونەکەیدا ناچێ، بەڵام لەگەڵ دەرچوونی هەر ژمارەیەکدا لەبەرهەمەکەی، هەناسەیەکی سەرکەوتن ماندووبوونەکەی ئەڕەوێنێتەوە.

بۆ ئایندە ئەگەر تەمەن بەدەمیەو بمێنێ، هەوڵ ئەدەم ئیمتیازی ڕۆژنامەیەك وەرگرم بەو مەبەستەی تەرخانی کەم بۆ خزمەتی بیروباوەڕی کوردایەتی وەك ڕۆشنبیرێکی بێ لایەن. بەتایبەتی ئێستا هیچ ڕۆژنامەیك نابینم کە سەر بەحیزبێك نەبێ لەم کوردستانەی ئێمەدا. خۆ ئەوەش ئاشکرایە ژمارەی کەسانی بێلایەن لەهەموو کونجێکی جیهاندا زیاترە لەلایەنداراانی حیزبەکان. جا کەوابێ بۆچی نەبێ ڕۆژنامەیەك یا چەند ڕۆژنامەیەك گوزارە لەبیدو بۆچوونی ئەوانیش نەکات!؟

لەرازیکدا بۆ گۆڤاری پەیامی مرۆڤایەتی ژمارە ٨ ساڵی ١٩٩٩

# مافی مرۆڤی کورد لەبیرەوەرییەکانمداو تێڕوانینێک لەسەر کێشەی کورد

شێخ مەحمود

لەیادمە ئەیانوت وا شەڕ ئیمەشی گرتەوە! کات ساڵی ١٩٣٩ بوو، نازانم چ رۆژێک بوو؟ بەڵام لەئەیلولی ئەو ساڵەدا، شەڕی دووەمی جیهانیی بەرپا بوو؛ ئەو کاتە چوار ساڵو نۆ مانگێک بەسەر تەمەنی مندا تێپەڕیبوو بوو کە ئەیکردە ١٩٣٤/١٢/٢٠.

ئەڵێن ئەوەی مرۆڤ لەکاتی ئاساییدا بەساڵێک فێری ئەبێ، لەکاتی جەنگدا بەرۆژێک فێری ئەبێ، منیش گوێی منداڵیم بە دەنگوباسی ئەو شەڕە ئاشنابوو، کە شەش ساڵێکی خایاندو گەورەترین کارەساتێکە لەمێژووی مرۆڤایەتیدا.

لەبیرمە خەڵکی لەچاپخانەکاندا گوێیان لەرادیۆ ئەگرت بۆ هەواڵەکانی شەڕ، نرخی شتومەک بەدرێژایی ئەو شەش ساڵە لەبەرزبوونەوەدا بوو.

بەپێی سەرچاوەکان لەم شەڕەدا ٧٢ دەوڵەت بەشداریان تێداکردووەو ١١٠ سەدو دە ملیۆن چەکدار تیا بەشدار بوونو ١٣٨٤ هەزارو سێ سەدو هەشتاو چوار ملیار دۆلار زیانی داوەو نزیکەی ٥٠ پەنجا ملیۆن کەس تیاکوژراوەو ٢٨ بیستو هەشت ملیۆنێك سەقەتو کەم ئەندامی لەپاش بەجێماوە!

ئەو رۆژەی ساڵی ٣٩ کە فڕۆکەکە بەئاسمانی سلێمانیدا تێپەڕی، من نەم ئەزانی خەڵکەکە بۆچی وا شپرزەبوون بێ ئەوەی ئەو فڕۆکەیە هیچ بۆردومانێک بکات، دوایی زانیم کە خەڵکی ئەم شارە مارانگازی فڕۆکە بوونو مارانگازیش لەخشەی گوریس ئەسڵەمێتەوە! هەمووی ١٦ ساڵێك لەوەوبەر فڕۆکەکانی ئینگلیز بۆ یەکەم جار ئەم شارەیان بۆردومان کردبوو کە رێکەوتی ١٩٢٣/٣/٣ بوو، وەك باوکم بۆی ئەگێڕامەوە هەر لەو ساڵەدا ماڵی باپیرم لەسیتەك شێخ جەلال کە لەو کاتەدا موفتیی شاربازێر بوو؛ بەر بۆردومانی فڕۆکەکانی ئینگلیز کەوتبوو، دوای ئەوەش سەدان جاریتر ئەو فڕۆکانە بۆردومانی سلێمانیو دەوروبەرەکەیان کردووە بەمەبەستی کوژاندنەوەی شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی نەمر. تا ئەمڕۆش تەمەن درێژەکانی ئەم ناوچەیە مەرگەساتەکانی ئەو بۆردومانەیان لەیادە کە چۆن تەپو وشکی مرۆڤی کوردی پێکەوە تیا ئەسوتێنراو تیا ئەکوژرا. سەرچاوەو بەڵگەنامەکانی ئینگلیز خۆیشی باس لەپێشێلکاریەکانی مافی مرۆڤی کورد ئەکات لەو سەردەمەدا، وەك مێژوونووس بەڕێز دوکتۆر کەمال مەزهەر لەنوسینەکانیدا باسی ئەکات کە چۆن بەهۆی پەرەسەندنی خەباتی رزگاریخوازانەی کوردەوە، رۆژ بەرۆژ رۆڵی فڕۆکە جەنگیەکانی ئینگلیز لەکوردستاندا زیاتر ئەبوو؛ ئەم راستیە لە بەسەرهاتو روداوەکانی رۆژانی قۆناغی دووەمی بزوتنەوەکانی شێخ مەحموددا تەواو خۆ ئەنوێنێ. ئینگلیز ئەیویست ئەو رژێمەی شێخ مەحمود لەتشرینی یەکەمی ١٩٢٢دا دایمەزراند، زوو بەزوو زیندەچاڵ بکرێ، رۆڵی فڕۆکەکانی ئینگلیز لەجێبەجێکردنی ئەو کارەدا گەورەبوو.

ڕۆژی ٢٠/٥/١٩٢٤ ئەو فڕۆکانە بەخەستی بۆمبارانی شاری سلێمانیان کردۆتەوە. بەر لەوەش فڕۆکەکانی ئینگلیز ناوچەی بادینانیشیان بۆردومان کردووە. لەڕۆژانی شۆڕشی بیستیشدا ئینگلیزەکان چەند جارێك فڕۆکەیان ناردۆتە سەر گەلێ ناوچەی کوردستان بۆ هەڕەشەو چاوترساندن. ناوەندی ئەیلولی ١٩٢٠یش دوو فڕۆکەی ئینگلیز بۆردومانی بارام ئاواو بەڵخەو چەند گوندێکی تری ناوچەی هەورامانیان کردووە بۆ دامرکاندنەوەی دژلیەکان کە هەمیشە لایەنگری شێخ مەحمود بوون، دوای ئەوانە ڕۆژی ٢٤/١٢/١٩٣١ دیسان فڕۆکەی ئینگلیز لەدوو جێگەوە پەلاماری هێزەکانی شێخ مەحمودیان داوە، بەر لەوەش ڕۆژی ٩/٣/١٩٣١ چوار هەزار گوللە ڕەشاشو بیستو پێنج بۆمبایان لەناوچەیەك لەدووریی سلێمانیەوە گرتۆتە شۆڕشگێڕانی کورد. لەڕۆژی ٢٢/٣/١٩٣١یشەوە بۆمبهاوێژەکانی ئینگلیز بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لەسەر یەك کەوتوونەتە گیانی گوندو شارۆچکەکانی دەوروبەری خانەقین، بەتایبەتی هۆرێنو شێخانو کانی کرمانجو شاهوازیو باخ هەنارو بێلولەو قورەتوو گوندەکانی عوسمان بەگی سەرەك هۆزی شەرەف بەیانیو چیای سورخو ناوچەکانی سەر ڕووباری عەبباسان، ڕۆژی ٣٠ مارتیش ژمارەیەك لەو گوندانەی کەوتوونەتە باشووری دامێنی زنجیرە چیای قەرەداغەوە، بۆمباران کراون، بەپێی بەڵگەنامەکانی ئینگلیز خۆیشیان تەنها ئەو ڕۆژە ئەوەتو پێنجَ هەزارو دووسەد گوللەڕەشاشیان گرتۆتە تەنها سێ لەو گوندانەی باشووری قەرەداغ، لە ٥/٤/١٩٣٦ یشدا هێزی ئاسمانی شاہانەی بەریتانی، بەتوندیو بێبەزەیی بۆمبارانی ناوچەی ئاوباریکیان کردووە، ڕۆژی ٥/٤یش فڕۆکەوان گ.گاردنەر کە لەگەڵ هێزە دەستوەشێنەکەی خۆیدا لەسلێمانیەوە فڕیبوو، دەوروبەری شەست تا سەد لەشۆڕشگێڕانو ژمارەیەك وڵاخی قەڵتاخ کراوی لەناودارو درەختو جۆگەکانی باشووری ئاوباریکدا بەدی کردووەو هێرشی بردوونەتە سەر، گشت فڕۆکە بۆمبا هاوێژەکانی پۆلی (٣٠ و ٥٥) بەدرێژایی دوا سانەکانی ئەو ڕۆژە خەریکی بۆمبارانی ئەو ناوچەیە بوون، هەر ئەو گاردنەرە یەکەم کەس بووە کە ڕۆژی ٣/٣٠ شۆڕشگێڕانی لەگوندی بانی مورت دۆزیوەتەوەو بەهاوکاری لەگەڵ چەند فڕۆکەیەکی تر بۆردومانیان کردوون. سەرەتای نیسان دیسان دەستەیەك شۆڕشگێڕی تری لەگوندی دەروازملك بەدی کردووەو ڕابەریی هێرشی ئەولنی کردووە، هەر ئەمیش بوو ڕۆژی ٤/٥ شوێنی شێخ مەحمودی لەئاوباریك دەستنیشان کردووەو پەلاماری داون. ڕۆژی ٤/١٧ یش ڕابەریی هێرشی فڕۆکەکانی بۆ سەرکان کردووەو دوای چوار ڕۆژ واتە لە ٤/٢١دا لەسیاگوێز ژمارەیەکی تری لەشۆڕشگێڕان بەدی کردووەو بۆردومانی کردوون. ئنجا بەرامبەر ئەو هێرشە دڕندانانەی گاردنەر بۆ سەر نەتەوەیەکی لێقەوماوی بەش بەش کراوی لاوازو بێ چەکی هاوتا، گاردنەر مەدالیای خزمەتی باڵای دراوەتێ.

جگە لەو گاردنەرە لە لیستەی ڕاپۆرتەکانی ئەوسای شەڕدا، نمونەی تر لەم بابەتە بەرچاو ئەکەوێ، ئەفسەری فڕۆکەوان سیدنی جۆزێف کار ١٨٥ کاتژمێر فڕینی تەنها لەکاتی هێرشەکانی ئاوباریکو بانی مورتو گوندەکانی ئەو دەوروبەرەدا تۆمارکردووە، لەسەرەتای مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٣٠یشدا ئەم فڕۆکەوانە ١٤٩٦ کاتژمێر تەنها بەسەر سورداشو دەوروبەرییەوە بووە. جونسن ولیەمزیش کە دوایی بووە یەکێك لەهەرە فڕۆکەوانەکانی جیهان، لەو هێرشەدا بەشدار بووە کە مارشاڵی فڕۆکەوان جێمس

رۆژ لەجەژنی کریسمسدا ساڵی ١٩٢٣ کردبویەتیە سەر ماڵی شێخ مەحمود لەسلێمانی، بەکورتی فڕۆکە جەنگیەکانی ئینگلیز بەهەزاران کاتژمێر لەئاسمانی کوردستاندا دژی شۆڕشگێڕانی کورد جەنگاون[٢].

کەواتە ئەو ڕۆژەی ساڵی ١٩٣٩ کە ئەو فڕۆکەیە هاتە ئاسمانی سلێمانیەوە، خەڵکەکە ئاهەقیان نەبوو بەو جۆرە شپرزەبوون، منیش مەبەستم لەگەڕانەوە بۆ شۆڕشەکانی شێخ مەحمودو دەوری فڕۆکەکانی ئینگلیز لە لەناوبردنی ئەو شۆڕشەدا هەندێك وانەو پەندە، بەر لەم نووسینەشم لەلێکۆڵینەوەیەکدا بەناونیشانی (حکومەتەکەی شێخ مەحمود بۆ سەرنەکەوت؟) کە لەیادی حەفتاساڵەی دامەزراندنی ئەو حکومەتەدا (٣ تا ١٩٩٢/١١/١٠) لەهۆڵی ڕۆشنبیری جەماوەر لەسلێمانی پێشکەشم کرد[٣]، بەدرێژی لەو بارەیەوە دواوم ئەشێ ئێستاش هەندێ وانەو پەند لەبەسەرهاتەکانی رابوردومانەوە وەربگرین وەك:

١- تا کورد نەبێتە خاوەنی چەکی بەرگری تەواوی خۆی، یا پاڵپشتێکی نێودەوڵەتی وەك ئێستای باشووری، نابێ جارێکی تر سەرلنی کورد، خەڵکی شارەکانی کوردستان بخەنە ژێر مەترسی بۆمبابارانەوە، بەڵکو چاکتر وایە تەنیا پەنا بۆ شەڕی پارتیزانی ببرێت کە ئەتوانرێ بەژمارەیەك جەنگاوەری کەم زیانی گەورە لەدوژمن بدرێ. شەڕی پارتیزانیش بەبێ دەسوەشاندن لەناو پایتەختو شارەکانی دوژمندا، کاریگەرییەکی ئەوتۆی نابێ.

٢- گرنگترین زەبرێك کە لەشۆڕشەکانی شێخ مەحمود کەوت، بەهۆی فڕۆکەکانی ئینگلیزەوە بوو، حکومەتەکەی شێخ مەحمودو شۆڕشەکانی بەهێزی ئەوسای دەسەڵاتدارانی عەرەب لەناو نەئەبرا، ئێستاش هەروایە، هیچ کام لەداگیرکەرانی کوردستان، بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردی پێ لەناونابرێ ئەگەر زلهێزەکانی دنیا پاڵپشتیان نەکات، لەم دیدو بۆچوونەوە پێویستە کوردیش هەمیشە لەهەوڵدانابێ بۆ زامن کردنی دۆستایەتی لەگەڵ ئەو زلهێزانەو دابینکردنی پاڵپشتیان بۆ کورد. چیتر لەوە زیاتر بەبیرکردنەوەی چەپەکان هەڵسوکەوت نەکاتو دنیای هێزو دەسەڵات نەکاتە دوژمنی خۆی.

٣- ئینگلیز هەر لەسەرەتاوە، لەو ڕۆژەوە کە ویلایەتی موسڵ لەدەوڵەتی عوسمانی دابڕاو پێش ئەوەش نەیویستووە کورد ببێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ. ئەو بوارلنەش کە دای بەشێخ مەحمود بۆ دروستکردنی حکومەتەکەی، یا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ شێخ مەحموددا، ئەولنە تەنیا کار تی گوشار بوون بۆ سەر عەرەبی عێراق کە ملیان پێ کەچ کات بۆ خواستەکانی خۆی، ئەگەرچی نەشی ئەویست کورد بێبەشبێ لەمافێکی وەك ئۆتۆنۆمی.

٤- ئینگلیز لەپێش دروستکردنی دەوڵەتی عێراقەوە، چاوی لەنەوتەکەی کوردستانەوە بووە. مەبەستیشی لەدروستکردنی دەوڵەتی عێراق بەم شێوەیەی ئێستا لەعێراقی کۆنو باشووری کوردستان، ئەوە بووە کە عەرەبی عێراق بکاتە پاسەوان بەسەر نەوتی کوردستانەوە، هەروەها بەدەوری ئەو نەوتەدا کۆمەڵگایەکی فرە نەتەوەییو فرەئاینی هەبێ بۆ ئەوەی ئەولنە بەکێشەو ئاژاوەو دووبەرەکی خۆیانەوە، نەیانپەرژێتە سەر ئەو، لەڕاستیدا بەریتانیا بەر لەکورد، دەستی فەرەنسای هاوپەیمانی خۆیشی بڕی بەپێی ڕێککەوتننامەیەك لەمانگی ١٢ی ساڵی ١٩١٨ کە بەپێی ئەو ڕێککەوتننامەیە فەرەنسا ولایەتی موسڵی بەجێهێشت بۆ بەریتانیا، جا بەریتانیاش کە دەستی

فەڕەنسای هاوپەیمانی پێشووی خۆیو کوردی تازە ئاشنای بڕیو شۆڕشو حکومەتەکەی شێخ مەحمودی هەڵوەشاندەوە، ئەوە لەئەنجامی ئەوەوە نەبووە کە ئینگلیز لەناخیا دوژمنی فەڕەنسەو کوردو شێخ مەحمود بووە، هەروەها کە ویلایەتی موسڵی خستە سەر عێراقی عەرەبی، ئەوەش لەبەر خاتری چاوی رەشی عەرەب نەبووە، بەڵکو ئەوانە هەمووی بۆ سوودو بەرژەوەندی خۆی بووە.

بەڵێ بەرژەوەندی، جا با لێرەدا وشەی بەرژەوەندیمان لەبیر نەچێ، لەڕاستیدا دنیای سیاسەت بریتیە لەبەرژەوەندی، بەرژەوەندی پێوەری کردەوەو بڕیارەکانە لەجیهانی سیاسەتدا. هەر لایەنێکی سیاسی هەوڵ ئەدات زیاترین بەرژەوەندی بۆ خۆی دابین بکات، لەبواری پەیوەندیی نێودەوڵەتیشدا، هەر دەوڵەتەو هەوڵ ئەدات زیاترین بەرژەوەندیی بۆ خۆی راکێشێ ئەوەندەی لەتوانایدا بێ. کاتێکیش کارەکە ئەگاتە سنوری کۆتایی توانا، ئەوسا بەرژەوەندی هاوبەش دروست ئەبێ.

جێی خۆیەتی لێرەدا هێما بۆ ئەوە بکەین کە بەدەستخستنی بەرژەوەندیی گشتی، واتا بەرژەوەندیی نەتەوەیی، وابەستەیە بەهوشیاریی نەتەوەییەوە. کاتێ هوشیاریی نەتەوەیی ئەگاتە ئاستێکی بەرز، بەرژەوەندی نەتەوەیی ئەوەندەی بەرزی ئەو ئاستە، زیاتر بەدەست ئەکەوێ، ئەگەر رێگری لاوەکی نەبێ.

بنچینەی هوشیاریی نەتەوەییش هەستی نەتەوەییە. هەستی نەتەوەیی وەکو هەستەکانی بینینو بیستنو بۆنکردنو بەرکەوتنو تامکردن، لەناخی هەموو مرۆڤو نەتەوەیەکدا هەیە، کاتێ ئەو هەستە بەهۆی پیادەکردنو پەروەردەکردنەوە پەرە ئەسێنێ، ئەگۆڕێ بەهوشیاریی نەتەوەیی، بەداخەوە کورد وەک تاکو وەک کۆمەڵیش هوشیاریی نەتەوەییەکەی لەئاستێکی نزمدایە، چونکە بواری بۆ نەڕەخساوە پیادەی بکات، (ممارەسەی بکات) یا پەروەردەی بکات.

نزمی هوشیاریی نەتەوەیی کورد دیاردەیەکی بەڵگەنەویستە. بەبەراوردکردنێکی لەگەڵ نەتەوەکانی وەک ئەڵمانو جولەکەو عەرەب کە ئەوانیش وەک کورد بەش بەش کراوبوون، ئەو راستیە دەرئەکەوێ.

نەتەوەی ئەڵمان، لەگەڵ ئەوەدا کە نیشتمانەکەی کرابوو بەچەند پارچەیەکەوە، دوو جەنگی جیهانیی گەورەشی دۆڕان، تواني ئەو پارچانە یەکخاتەوەو جارێکی تر قەوارەی نەتەوەیی خۆی دروستکاتەوەو شانازییە نەتەوەییەکانو ئابوورییەکەش بژێنێتەوە.

هەروەها جولەکەش.. بەڵام چونکە عەرەب هوشیارییەکەی لەوان کەمترە، تا ئێستاش نیشتمانەکەی بیستو دوو پارچەیە ئەگەرچی بیستو دوو حکومەتیان هەیە. ئەو حکومەتۆکەیەی لەباشووری کوردستاندا رەخسا، ئەویش کرا بەدوو بەشەوە دوای ئەوەی دوو پارتە دەسەڵاتدارەکە بەربوونە گیانی یەکتریو ژمارەی ئەو پێشمەرگانەی لەشەڕەکانی نێوان ئەو دوو پارتەدا بەکوشت دراون، لەژمارەی ئەو پێشمەرگانە زیاترە کە لەشەڕەکانی دژ بەڕژێمی بەغدا شەهیدبوون!.. دابەزینی ئاستی هوشیاریی نەتەوەیی ئەم دووپارتە لەوەدا دەرئەکەوێ کە شەڕ لەسەر دەسەڵاتێک ئەکەن کە هێشتا بەتەواوی بەدەست نەهاتووە. لەوەش شەرم ئامێزتر ئەوەیە بەبێ پەردە باس لەدابەش کردنی داهاتەکانی ناوچەکە ئەکەن لەنێوان خۆیاندا، لەکاتێکدا ئەو داهاتانە نە هی ئەمیانەو نە هی ئەویشیانە هەرچی چەندێک دەنگیان هێنابێ لەهەڵبژاردندا. لەهەموو دنیادا کە حکومەت لەناوچەیەکدا دروست بوو

هەموو داهاتی ئەو ناوچەیە ئەچێتە گەنجینەی ئەو حکومەتەوەو ئەویش بەپێی یاساو میزانیەو بیاچوونەوەو لێپرسینەوە، هەڵسوکەوت بەو داهاتە ئەکات، لەم هەرێمەی ئێمەدا هیچ پارتێك بۆی نییە هیچ پارەو شتێك لەمولکی میللەت بۆ خۆی لابدات، ئەگەر لایدا، ئەوا ئەو پارتە هیچ جیاوازییەکی نابێ لەگەڵ ئەو فەرمانبەرەدا کە زێرە دزی (اختلاس) ئەکاتو هەردووکیان وەك یەك بەرپرسیار ئەبن بەپێی ماددەکانی ۳۱۵ تا ۳۲۱ لەیاسای سزادانی ژمارە ۱۱۱ی ساڵی ۱۹٦۹ و گۆڕانکارییەکانی[1].

لەرابوردووشدا نزمی ئاستی هوشیاری نەتەوەیی کورد، لەتێکچوونی دەوڵەتی ماددەوە دەرئەکەوێ کە گەورەترین دەوڵەتی ناوچەکانی دەوروبەری خۆی بوو، ئەو دەوڵەتە گەورەیە بەوە رووخا کە کابرایەکی فارسی وەك کوڕش هەلێکی بۆ هەڵکەوتو بەژمارەیەك لایەنگری کەمەوە هەلەکەی قۆزتەوەو دەوڵەتی فارسی لەجێی دەوڵەتی کورد دامەزراندو کەوتە قەلاچۆکردنی کوردو راوینان بۆ شاخەکان. کەچی کەسانێکی وەك سەلاحەدینی ئەیوبیو کەریمخانی زەندو ئەبو موسلیمو بەکر سدقی نەیانتوانی ئەو هەلە زێرینانەی دەستیان کەوت بیانقۆزنەوە بۆ بەرژەوەندی نەتەوەکەیانو دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی، نەك هەر ئەوە، بەڵکو ئێستا کەس نازانێ ئەوەکانی سەلاحەدینو لەشکرە کوردیە زۆرو بەمێژەکەی چییان بەسەرهاتو چۆن تولنەوە!؟ کەچی تورك بەخەلافەتو فارس بەشیعەگەرێتی قەوارەی خۆیان پاراست.

ئەگەر هوشیاریی نەتەوەیی کورد لەئاستی پێویستدا بووایە، میرنشینە کوردییەکان یەکیان ئەگرتو دەوڵەتی عوسمانی نەیئەتوانی بیانروخێنێ، دەوڵەتی عوسمانی، ئەو دەوڵەتە نەبوو کە محەمەد عەلی پاشای والی میسر لێی راپەڕیو سەربەخۆیی بۆ میسر دابین کرد؟ ئایا (بەنی بۆیە)ی فارس دەستی ئەگرت بەسەر دەوڵەتی عەبباسیداو بەخواستی خۆی ئەکەوتە یاری کردن بەئەمیری موئمنین لەساڵی (۹٤٥)ەوە؟ ئایا یۆنانو سربیا ساڵی (۱۸۳۰) لەدەوڵەتی عوسمانی جیانەبوونەوە؟ دوو مەلای وەك مەلا ئیدریسی بەتلیسیو مەلای خەتێ چی بوون ئەو هەموو میرنشینە کوردیانە بەگورگان خواردوو بدەن؟

وەك مێژوونووس سدیق دەمەلۆجی لەکتێبەکەیدا (امارە بهدینان الكردية لاپەڕە ٤۹) ئەڵێ: (ئەگەر محەمەد عەلی پاشای میسر یەکێتی میرنشینە کوردیەکانی ببینیایە، لاپەڕەیەکی تر لەمێژوودا ئەکرایەوە).

لەراستیشدا محەمەد عەلی پاشا ئەیویست یارمەتی میرنشینەکانی ئەو سەردەمەی کورد بدات بۆ جیابوونەوە لەدەوڵەتی عوسمانیو دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆی کورد، چونکە ئەو خۆیشی کورد بوو، بەلام کە ئەیبینی ئەو میرنشینانە نەك هەر یەکگرتوو نین، بەڵکو لەیەکیش ئەدەن ئیتر وازی لەو کارە هێنا!

بەداخەوە تا ئێستا کورد کەمتر لەمەسەلەی بەرژەوەندی نەتەوەیی خۆی گەیشتووە. زیاتر خەریکی پاراستنی بەرژەوەندی گەلانی تر بووە. هەمیشە کوڕی خۆی کردۆتە قوربانی کچی دراوسێکانی، هەر لەبەربووەو بێ دیاریکردنو دابینکردنی مافێك بۆ خۆی، خۆی کردۆتە برای هاوپشتی داگیرکەرەکانی، لەوەش خراپتر دڵی دوژمنی درژمنەکانی لەخۆی ئێشاندووەو هیچ پەندێکی

لەوە وەرنەگرتووە کە دوژمنی دوژمن دۆستە، یا ئەشێ بکرێ بەدۆست، بۆ نموونە لەسەر تورك دڵی یۆنانمان لەخۆمان ئێشاندووە، لەسەر عەرەب دڵی جولەکەو هەموو دنیای گاورستانمان لەخۆمان رەنجاندووە، ئێستاش نەتەوەی کورد باجی سەلاحەدینی ئەیوبی ئەدات! تۆ بزانە ئەم کوردە چ دەمزلێکی بۆ یەکێتی سۆڤێتی کوتا بێ ئەوەی چلەپۆشێکی لەو یا لەمارکسێتی دەسکەوتبێ، بەڵکو زیانی زۆریشی لێکەوتوە لەوەوە کە لینین پشتی ئەتاتورکی گرت دژی بزوتنەوەی رزگاریی کوردو ستالین کوردەکانی یەکێتی سۆڤێتی پەرش و بڵاوکردەوەو زۆربەیانی توانەوەو کۆماری مەهابادیشی بەگورگان خواردووە!

٥- هەر لەبواری وەرگرتنی پەند لەرابوردومانەوە بۆ ئەوەی فێری بەکارهێنانی تەرازووی قازانج و زەرەربین، پێویستە بەر لەوەی بڕیارێك بدەین یا هەڵوێستێك بنوێنین، ئەبێ بچینە بنج و بناوانی‌دیاردەکان و کێشەکانەوە.

لەم گۆشە نیگایەوەو وەك تێڕوانینێك لەکێشەی نەتەوەییمان، بابڕوانینە خراپەکارییەکانی ئینگلیز بەرامبەر بەکورد، چ لەوەدا کە ولایەتی موسڵ، یا راستتر بڵێین باشووری کوردستانی خستە سەر عێراق یا لەتێکدانی حکومەتەکەی شێخ مەحمود، یا لەو هەموو بۆردومانانەی فڕۆکەکانی، ئەبینین هەمووی لەپێناوی دابینکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆیدا بووە لەچاڵە نەوتەکانی کەرکوك، کەواتە کێشەی کێشەکانی باشووری کوردستان، چاڵە نەوتەکانی کەرکوکە، لەرابردوو ئێستاشدا، بۆیە ئەبوایە لەجیاتی ئەوەی کورد چ کاتی شێخ مەحمودو چ دوای ئەویش، ئەو هەموو شەڕانەی ناو شاخەکانی کوردستان بکات، قورسایی خەباتەکەی بخستایەتە سەر چاڵە نەوتەکانی کەرکوك‌و بەردەوام بەهەر شێوەیەك بۆی رێك کەوتایە، لەو چاڵە نەوتانەی بدایە، یا لەو بۆریانەی بدایە کە ئەو نەوتە لەکەرکوکەوە کێش ئەکەن، ئەوسا بێگومان ئینگلیزو هاوپەیمانەکانیشی ئەگەیشتنە ئەو ئەنجامەی بەبێ دابینکردنی مافی کورد، ئەو پارووە چەورەیان بۆ قووت ناچێ.

دوور نییە هەر ئینگلیز خۆیشی ئەم بیدو بۆچوونەی هەبووبێ، بەبەڵگەی ئەوەی کاتێ ویلایەتی موسڵی خستە سەر عێراقی عەرەبی ساڵی ١٩٢٥، کۆمەڵێ مەرجی بۆ عێراق دانا کە ئەبێ کورد جۆرە حوکمێکی خۆیی (ئۆتۆنۆمی) هەبێ، ئەو مەرجانە لەلایەن کۆمەڵی نەتەوەکان (عصبە الامم) یشەوە دووبارە کرایەوە. هەروەها عێراق بەپێی هەندێك مەرج لەکۆمەڵی نەتەوەکاندا وەرگیرا دوای ئەوەی راسپاردەیی (وصایە)ی لەسەر لابرا، ئەو مەرجانەش لەبەیانی دەستووری عێراقی‌دا کە رۆژی ١٩٣٢/٥/٣٠ دەرچوو، ئاشکراکراوەو تا ئێستاش کاریگەرێتی ماوە. ئەو مەرجانە بریتی‌یە لەوەی ئەبێ عێراق مافی کەمینەکان بپارێزێ‌و موڵکی تایبەتیش بپارێزێ بەبڕە نەوتەکانی کەرکوکەوە کە موڵکی کوردەو پێویستە داهاتەکانی بۆ گەلی کورد خەرج بکرێ. لەسەر عێراق پێویستە ئەوپەڕی گرنگی بەوە بداتو پێش هەموو یاسایەکی بخات. ئەگەر عێراق سەرپێچی لەوانەو لەئەرکەکانی سەرشانی کرد، ئەوا ئەبێ کۆمەڵەی نەتەوەکان‌و دادگای دادی نێودەوڵەتی، ئەوەی پێویستە بیکات بەپێی هەردوو ماددەی (١٠ و ١٦)ی جاڕنامەی عێراقی ١٩٣٢/٥/٣٠ و هەردوو ماددەی (٣٦ و ٣٧) لەیاسای بنچینەیی دادگای

دادی نێودەوڵەتی، ئنجا بەپێی بڕیاری ١٩٤٦/٤/١٨ کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان بەرپرسیارە لەهەموو ئەرکەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکان تا ئێستاش.

هەروەك بەڵگەیەکی تریش، چەرچل لەوەڵامی بروسکەیەکی سێر برسی کۆکسدا کە باری سەرنجی فەیسەڵی پاشای عێراقی تیا پیشان ئەدات کە گوایە فەیسەڵ مەبەستی لەوەی کوردستان بخرێتە سەر عێراق، ئەوەیە ژمارەی سوونی زیاد بکات لەئەنجومەنی ئەنسیسیەدا کە نیازبوو لەو کاتەدا دابمەزرێنرێت، چەرچل ئەڵێ: (بروسکەی ژمارە ٥١٣ ی رۆژی ٩/٢٠تان بەجێیە بەمەرجێك کورد نەخرێتە ژێر دەستی عەرەبەوە ئەگەر خۆیان پێیان خۆش نەبێ)، ئەو بەڵگەنامانە تا ئێستاش ماون لەئەرشیفی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکانداو ئێستا هەمووی لەناو ئەنتەرنێتدا پارێزراون.

بەڵام کاتێ بەریتانیاو هاوپەیمانەکانی‌و عێراقیش زانیان کورد هیچ مەترسییەکی نییە بۆ سەر چاڵە نەوتەکانی کەرکوك‌و بۆرییەکانی‌و ئەوپەڕی کارێك کە بیکەن تەقوتۆقی ناوشاخەکانە، ئیتر هەموو ئەو مەرج‌و مافانەی کورد پشتگوێ خرا.

ئێستاش وا جارێکی تر مێژوو خۆی ئەگێڕێتەوە، تورك چاوی بڕیوەتەوە نەوتەکەی کەرکوك بەناوی ئەوەوە کە ویلایەتی موسڵ هی خۆی بووەو ئەبێ بدرێتەوە بەو، ئەمریکا وەك کەڵەگای جیهان ئەیەوێ دەست بگرێ بەسەر هەموو نەوتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەوەی کەرکوکیشەوە، ئینگلیز بەشوێن رۆژانی زێڕینی لەدەست چوویدا وێڵە. فەرەنسا شوێن دەفتەری کۆنی قەرز کەوتووەو ئەشیەوێ بەشێکی ئەویش لەسامانی نەوتی ئەم ناوچەیەدا هەبێ. رژێمی عێراق بەتەمایە بیبێتەوە بەعێراقەکەی جاران‌و تابلۆقەکەی لەسەر لاچێت‌و وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچێت. ئەوەی لەم ناوەدا بەدەس بەتاڵی ماوەتەوەو هیچ جووڵەیەکی تیادا نییەو دەستپێشکەرییەك ناکات کە بیسەلمێنێ ئەو خاوەنی راستەقینەی نەوتەکەی کەرکوکەو بەبێ دابینکردنی مافی نەتەوەیی ئەو جارێکی تر هیچ لایەنێك ناتوانێت خێر لەو نەوتە ببینێتەوە، ئەوە کوردە! ئێوە بڕوانن، دوای ئەو هەموو راستیانە کورد لەقسەی زل ناو رۆژنامەو کۆبوونەوە بۆ کەرکوك بەولاوە هیچ کردەوەیەکی کاریگەر ناکات کە بۆ جیهانی بسەلمێنێ ئەو خاوەنی نەوتی کەرکوکەو بێ دابینکردنی مافی نەتەوەیی ئەو، کەس خێر لەو نەوتە نابینێ‌و پێویستە سازش‌و رێکەوتن لەگەڵ کوردا بکرێ لەبارەی ئەو نەوتەوە.

---

**سەرچاوەو پەراوێز:**

١- د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەرەیەك لەمێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم ل٢٧٩.

٢- د. کەمال مەزهەر، گاڵتەوگەپۆ گەمەکانی نێوان شێخ مەحمودو فرۆکەوانە ئینگلیزەکان: گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە ١٣٦ ساڵی ١٩٩٥ ل٦ تا ٢٢، لەو وتارەدا هێماکراوە بۆ ئەو سەرچاوانەی ئەو زانیاریانەیان لێ وەرگیراوە.

٣-کامیل ژیر: کوردایەتی‌و دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ، بنکەی چاپەمەنی رۆژ، سوید ساڵی ١٩٩٤ ل٧٣ تا ٨٧.

رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە: ١٩٩٠ بەرواری ١٩٩٩/١١/٢

# وەڵامێکی دۆستانە بۆ بەڕێز دکتۆر کوردۆ علی

**کاژیك وەك حیزبێك لەپێناوی ئازادیو ژیانەوەو یەکێتیی کوردداو بەدروشمی کوردستان بۆ کورد، یەکسانی بۆ گەلو سەربەخۆیی کوردستانو فەلسەفەیەکی نوێی کوردایەتییەوە، لەدایکبوو و شۆڕشێکی بیرمەندیانەی بەرپاکرد.**

**ئێستا کاژیك، وەك رێکخراوێکی سیاسی لەکاردا نەماوە، بەڵام وەك بیرێکی نەتەوەیی رەسەنی کوردی، ئێستاش ماوە، لەڕووی پێکهاتەوە، کاتێخۆی، لەڕۆڵە هەرەپاكو بەڕەوشتو نیشتمانپەروەرەکانی کورد پێکهاتبوو.**

لەدوو ژمارەی ١٩٧١ و ١٩٧٢ی کوردستانی نوێ دا بەڕێز سالار یاسین گفتوگۆیەکی لەگەڵ بەڕێز دکتۆر عەلیدا ئەنجامدابوو، لەژێر ناونیشانی کۆچی پێچەوانەی عەقڵی کوردی بۆ ناوەوە.

گفتوگۆکە، جگە لەو کۆچی پێچەوانەیە، گەلێ بابەتی تری گرتۆتەخۆ کە هەندێکیان جێگەی بایەخنو هەندێکیشیان جێگەی گلەیی.

وەڵامەکانی دکتۆر لەبارەی گەڕانەوەی خاوەن بڕوانامەکان لەدەرەوە بۆ ناوەوەی کوردستانو لەبارەی زمانو وەرگێڕانو یەکگرتنی زمانی کوردیو سەرەنجەکانی دەربارەی کارڵ مارکسو بەرهەمی هەندێك رۆژهەڵاتناسو کارل پۆپەر، بایەخێکی تایبەتیان هەیە، بەڵام ئەوانەی لەبارەی کاژیكو هەندێ شتیش لەبارەی دکتۆر جەمال نەبەزەوە وتوونی، جێگەی وتووێژو گلەیین، بابزانین چۆن؟

**دکتۆر کوردۆ دەڵێ: (پەشیمانم لەوەی کە ئەو فەترەیەی لەکاژێکدا کارم کرد عەقڵم ئەوەندە تەسك بوو هەستم بەو کەموکورِیانە نەدەکرد). لەجێگەیەکی تری گفتوگۆکەدا دەڵێ: (کارل پۆپەر لەعەقڵەوە کۆمۆنیست بوو، بۆیە لەعەقڵیشەوە لێی دوورکەوتەوە، بەڵام من لەعەتفو سۆز بوومە کۆمۆنیست.. بەڵام کە فامم کردەوە بۆم دەرکەوت ئەو رێبازە لەخزمەت مەسەلەی میللەتەکەمدا نییە، بۆیە بوومە دژی ئەو بیرە).**

جا بەرامبەر بەم دووجار هەڵخەڵەتانەی دکتۆر، ئەشێ پەنا بەرینە بەر ئەو پەندە کوردییەی ئەڵێ: ئەگەر جارێك هەڵخەڵەتام خوا بەرامبەرەکەم بگرێ، ئەگەر بوو بەدووجار، خوا خۆم بگرێ. ئنجا ئەگەر پاساوی دکتۆر بۆ بوونە کۆمۆنیستەکەی ئەوەبێ کە ئەوسا منداڵ بووە، ئەی خۆ بەگەورەیی بوو بەکاژیکو پاسۆکو کاری تیا ئەکردن! کە تا ساڵی ١٩٨٧ واتا هەتا تەمەنی ٣٧ ساڵەی لەکاژیکو پاسۆك دا بردەسەر.

دکتۆر کوردۆ لەوەڵامی ئەوانەدا کە پێیان وتووە ئەبوایە ئەو یەکێك بوایە لەوانەی بیری کاژێکیان رزگاربکردایە، ئەڵێ: (**بیرێك کە خۆی لەخۆیدا ئەبێ چۆن رزگار دەکرێ؟!**) منیش بەدکتۆری بەتەمەن کامڵو رۆشنبیرو نووسەرو لەئەورووپادا ژیاو دەڵێم: ئەگەر کاژیك بیرێك نەبوو، ئەو شوێن چی کەوتبوو! ؟ ئەی بۆ هەر خۆی وشەی (هاوبیر) بۆ برادەرەکانی کاژێکی بەکاردێنێ؟ ئەی بۆ ئەڵێ

**(کاژێك بەدوای من نەگەڕا، من خۆم بەفتری کاژێك بووم، کاژێك بەمانای ئەوەی کوردم خۆشبوێ). ئەم قسەیەی چۆن لەگەڵ ئەو قسەیەدا دەگونجێ کە دەڵێ: (کاتێك کە عەقڵم کرایەوەو چاوم کرایەوە لەتەمەنی سی‌وحەوت ساڵیدا ــ نوسەر ــ تێگەیشتم فریودراوم)؟**

ئێستا کاژێك وەك ڕێکخراوێکی سیاسی لەکاردا نەماوە، بەلام وەك بیرێکی نەتەوەیی ڕەسەنی کوردی ئێستاش ماوەو دوایی دێمە سەر شیکردنەوەی ئەم قسەیەم، هۆی نەمانی کاژێك وەك ڕێکخراوێکی سیاسی، ئەوە نەبوو کە **(کاژێك مەلۆتکەیەك بوو بەمردوویی لەدایکبوو)** وەك دکتۆر دەڵێ (دوایش گەڕانەوەم ئەبێ بۆ ئەو لەمپەرانەی هاتنە ڕێگەی گەشەنەکردنی ڕێکخراوی کاژێك‌و بوونە هۆی وەستانی ـ ژین).

دکتۆر دەڵێ: (کاژێك لەسلێمانی تێنەپەڕیوە تەنانەت لەگەڕەکێکی سلێمانی تێنەپەڕیوە) من بەپرسیارێکی زیندوو بەرپەرچی ئەم قسەیەی دکتۆر کوردۆ ئەدەمەوەو ئەڵێم ئەگەر وایە، ئەی فەرهاد عەبدولقادری کەرکوکی‌و دلاوەری کاکە زیادی کۆیی‌و شێرکۆ هەژاری موکریانی‌و جەواد مەلای سووری چی بوون؟ ئایا ئەوانیش هەر خەڵکی سلێمانی بوون؟ کە هەریەکەیان لەناوچەی خۆیاندا ژمارەیەك لایەنگری کاژێکیان بەدەوردا بوو، ئنجا ئەی دکتۆر تۆ خۆت یەکێك نەبووی لەئەندامانی لقی ئەورووپای کاژێك؟

دکتۆر دەڵێ: **(من شەرمم پێیە لەو حزبە ئیشم کردبێ)**، منیش داوا لەدکتۆر ئەکەم هۆی ئەو شەرمەمان بۆ ڕۆشن بکاتەوە.

ڕاستییەکەی مرۆڤ کاتێك شەرمی پێدێ لەحزبێکدا ئیشی کردبێ، کە ئەو حزبە بێگانە پەرستییەکی کردبێ، یا بەدڕەوشتییەکی تێدابووبێ.

جا دکتۆری بەڕێز تۆ کە (خۆت بەفتری کاژێك بویت)و بەمەزەندەی خۆت نزیکەی بیست ساڵێك لەکاژێکدا کارتکردووە، هیچ شتێکی لەو جۆرەت هەست پێکردووە؟

ڕاستییەکەی لەڕووی پێکهاتەوە، کاژێك لەهەرە ڕۆڵە پاك‌و بەڕەوشت‌و نیشتمانپەروەرەکانی کورد پێکهاتبوو، ئەوەش لەدامەزرێنەرەکانیەوە دەرئەکەوێ کە بریتیبوون لەئەحمەد هەردی‌و جەمال نەبەز‌و عەبدوڵلا جەوهەر‌و فەرەیدون عەلی ئەمین‌و ئیحسان فوئاد‌و فایەق عارف‌و نووسەری ئەم چەند دێڕە کە لە ١٤/٤/١٩٥٩دا پێکهاتن لەسەر دروستکردنی ئەو ڕێکخراوە سیاسییە بەناوی کۆمەڵەی ئازادی‌و ژیانەوەو یەکێتی کورد ـ کاژێکەوە، هەتا ئێستاش من دەست ئەکەم بەچاوی هەر کەسێکدا بڵێ بەری چاوی ئەو دامەزرێنەر‌و سەرکردانەی کاژێك کلی پێوەیە، بەدوای ئەوانیشدا هەموو ئەندامانی لق‌و ناوچەکان‌و کادیرە پێشکەوتووەکانی کاژێك هەر بەو جۆرە. لە هەلێکدا ناوی هەموویان، دوای ڕەزامەندییان، بلاوئەکەمەوە، بۆ ئەوەی بەبەڵگەی زیندوو قسەکەم بسەلمێنم نەك وەك دکتۆر لەبەربووره.

لەڕووی تیوریشەوە، کاژێك بۆیەکەمجار کوردایەتی لەسۆزەوە گواستەوە بۆ بیرو فەلسەفە، وەك لەنوسینەکانییەوە دەرئەکەوێ، ئێستاش بەباوەڕی من، ئەگەر خەڵکانێك هەبن نوسینەکانی ئەو کەسانەو ئەولەی پێشووی دکتۆر کوردۆشیان لەلا پەسەند بێ، ئەوە لەبەر ئەوەیە ئەو نوسینانە لەو بیرو فەلسەفەیەوە سەرچاوەیان وەرگرتووە.

ئێستا کاژێك نەماوە تا بڵێین من بەم قسانەم پڕوپاگەندەی بۆ ئەکەم، من ئەم قسانەم وەك ڕاستییەکی مێژوویی ئەڵێم کە وردە وردە خاڵ ئەخەمە سەر پیتەکانو جارێ لێرەدا ئەڵێم: ئەوە هیچ جوامێرییەك نییە مرۆڤ بەرد بخاتە سەرچاوەیەکەوە کە ئاوی لێخواردبێتەوە.

کاك کوردۆ زۆر ساکارانە ئەڵێ: **(حزبێك، ڕێکخراوێك، گروپێك لەهەموو ژیانی خۆیدا کۆنفرانسێك کۆنگرەیەك نەگرێ، چۆن بەحزب ناوی دەبەی)**. ڕاستە گرتنی کۆنگرەو کۆنفرانس کارێکی باشە بۆ حزبێك، بەلام بەنەگرتنیان ئەو حزبە لەحزبایەتی ناکەوێ، زۆر حزب بووەو هەیە کە کۆنگرەو کۆنفرانسیان نەگرتووە، یا دوای بیست سێ ساڵ گرتوویانە، ئەوە مەسەلەیەکە پەیوەندی بەبارودۆخەوە هەیە، کاژێك هەڵی گرتنی کۆنگرەیەکی بۆ نەڕەخساوە لەبەر ئەوەی زۆر بەنهێنی کاری ئەکرد، زۆربەی ئەندامەکانی لەناو حزبەکانی تردا کاریان ئەکردو تەنیا پەیوەندیی فەردییان هەبوو بەکاژێکەوە، بەتایبەتی لەناو پارتیەدلو بەزۆری لەناو هێزی خەباتدا کە بەئامر هێز فەتاح ئاغاو جێگرەکەی نوری حەمە عەلیو زۆربەی زۆری پێشمەرگەکانی ئەو هێزەوە کاژێك بوونو نەئەکرا لەکۆنگرەیەکدا خۆیان ئاشکرا بکەن، دوو ئەندامی سەرکردایەتیش شێخ محەمەدی هەرسینو محەمەدی عەزیز لەبارەگای بەرزانیدا کاریان ئەکرد، ئەم دوو هاوبیرە دوایی بوون بەئەندامی سەرکردایەتی کاژێك لەئەنجامی یەکگرتنی کاژێکو پارتی گەلی کوردەوە. هەر لەئەندامانی سەرکردایەتی: ئەحمەد هەردیو فەرەیدون عەلی ئەمین تێکەڵ بەشۆڕشی ئەیلول بوون، جەمال نەبەزیش لەساڵی ١٩٦١ەوە چووە ئەورووپاو کامیل ژیریش ساڵی ١٩٦٢ ڕووی کردە سویسراو دوایی لەشام گیرسایەوە بۆ خوێندنو پاشتر گەڕایەوە بەغدا، دکتۆر ئیحسان فوئادیش چوو بۆ یەکێتی سۆڤێت بۆ گوزەراندنی دکتۆراکەیو پەیوەندی ئەما بەڕێکخستنەکانی کاژێکەوە، جگە لەوانە، کاژێك زۆر بەتوندی بەربەرەکانی ئەکرا نەك هەر لەلایەن ڕژێمی بەغداوە، بەڵکو لەلایەن هەردوو حزبی شیوعیو پارتیشەوە، لەبەر ئەوە کاژێك نەك هەر دەرفەتی بەستنی کۆنگرەی نەبوو، بەڵکو سیاسەتی بانگدان لەکوولەکەیدا پەیڕەو ئەکرد.

من تێناگەم دکتۆر کوردۆ بەڕاستێتی کە ئەڵێ **(لە هەموو ژیانی سیاسی کاژێك دا چوار پێنج بەیاننامەی دەرکردووە کە هیچ ئەهمیەتێکی نییە)**. ڕاستییەکەی کاژێك لەڕووی تیۆرییەوە دەوڵەمەندترین حزبی کوردی بووە لەسەردەمی خۆیدا، کاژێك جگە لەپەڕاوی (کاژێك نامە)و پەیڕەوو پرۆگرامو گۆڤاری چرای کوردستانو نەوەی کوردو بانگی کاژێکو حەقیقەتی کاژێکو دەیان نامیلکەیتر، ژمارەیەکی زۆریش بەیاننامەی دەرکردووە، چەند جاریش نامەی ئاڕاستەی بارزانی کردووەو لەو نامانەدا باری سەرنجی خۆی بەرامبەر شۆڕشی ئەیلولو پەیوەندیی شۆڕش لەگەڵ ئێرانو شۆڕشو دانوستانەکانی لەگەڵ بەغداد پیشانداوە، نامیلکەی (کوردایەتی بزووتنەوەو بڕواو ڕژێمە ــ ئەشتەرە کولەکەی حەمەی مەلا کەریم لەژێر زەبری فەلسەفەی کوردایەتیدا) هی سەرکردایەتی کاژێکە، سەرەتا جەمال نەبەز دایڕشتو دوایی سەرکردایەتی پیاچووەو لێی زیادو کەم کردو بڕیاری لەسەردلو پاشان بەکامیل ژیر سپێردرا سەرلەنوێ بینوسێتەوەو بەچاپی بگەیەنێت، ئەمیش بەشێوازی خۆی وەك ئەدەبێکی گاڵتەئامێزانە (سخرية) دایڕشتەوەو لەڕیقابەی بەغداد کە ئەوسا بەڕێز عەزیز خانەقا لێپرسراوی بەشی کوردی بوو تیایدا، ڕەزامەندی بۆ وەرگرت بەناوی ئاشکرای خۆیەوە لەڕیقابەو بەناوی زەردەشتەوە لەسەر کتێبەکەو ٣ هەزار دانەی لێچاپکراوە کە لەماوەی دوو مانگێکدا هەمووی فرۆشراو دوایی خەڵکی کەوتنە لەبەرنوسینەوەی، جگە لەوە بەشێك لەهەڵبەستەکانی کامیل ژیر لەگەڵ

پێشەکییەکی نەبەزدا کە هەمووی ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕی کاژیك بوو بەناوی (کوردایەتی — کوردایەتی بیروباوەڕمانە، ئامانجی نزیكو دوورمانە) بە ٣ هەزار دانە چاپکراو دوایی کتێبخانەی سەیدیان لەسنە (٥)جار چاپکردەوە، ئێستا هەموو بەرهەمە بیرمەندییەکانی کاژیك لەلای بەڕێز دکتۆر جەمال نەبەز پارێزراون‌و دکتۆر کوردۆ عەلیش هەمووی دیون‌و زۆریشیان لەمەکتەبەی شوقەکەی دکتۆر کوردۆدا لەئەڵمانیا هەن، من بەچاوی خۆم ساڵی ١٩٨٢ ژمارەیکی زۆر لەنووسراوەکانی کاژیك‌و پاسۆکم لەشوقەکەی دکتۆر کوردۆ عەلی لەڤیەننا دی کە بەمیوانی دوو شەو لەو شوقەیەدا لای ئەو مامەوەو ماڵی ئاوابێ ئەرکی خانەخوێیەتی کوردانەی بەجێهێنا.

کاك کوردۆ ئەڵێ: (**کۆمەڵێك شاعیرو نووسەر بەخەیاڵێکی ڕۆمانسیانەوە شتێکیان دروستکردووە کە ڕووشیان نەهات بینێژن**) جارێ هیچ خەوشێك لەوەدا نییە کە کۆمەڵێك شاعیرو نووسەر حزبێك دروستبکەن، بەڵکو ئەنجامدانی کارێکی سیاسی‌و ئایدیۆلۆجی لەو جۆرە، هەر لەکەسانی بیرمەندی وەك نووسەرو شاعیر بوەشێتەوە باشترە وەك لەژمارەیەك نەخوێندەوارو عەشایەر. من لەو باوەڕەدام ئەگەر چەند سەرەك هۆزێك دەستێکیان هەبوایە لەدروستکردنی کاژێکدا، ئێستا دکتۆر کوردۆ ڕەخنەی ئەوەی لێنەگرتێ کە کۆمەڵێك دەرەبەگو کۆنەپەرست کاژێکیان بەخەیاڵێکی دەرەبەگانە دروستکردووە! دوای ئەوە کاژیك تا ئێستاش نەمردووە تا لەڕووسان هاتبێ یا نەهاتبێ بینێژین، کاژیك بەبڕیاری کۆنفرانسێك لەشاری بەغدە لەهاوینی ساڵی ١٩٧٤دا چالاکییەکانی خۆی لەناو کوردستاندا ڕاگرتو وەك ڕێکخستنێك هەڵپەسێردراو تا ئێستاش هەروایە، ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە لەو ساڵەدا زۆربەی حزبە کوردییەکان، بەوانەشەوە کە ئەوسا بەناوی لایەنگرانی ئیبراهیم ئەحمەدو مام جەلالەوە ناو ئەبران، چوونە ژێر باڵی شۆڕشی ئەیلولەوەو هەوڵی سەرخستنی ئەو شۆڕشەیان ئەدا، جگە لەوەش کاژیك هەر لەسەرەتای دروستبوونییەوە، کوردایەتی زیاتر لەلا مەبەست بووە وەك لەحزبایەتی، ئنجا دەستدانە کارێکی وەك دروستکردنی حزبێك کە بۆ ڕزگاری‌و سەربەخۆیی‌و یەکگرتنەوەی کوردستان خەبات بکات، ئەوە خەیاڵێکی ڕۆمانسیانەیە یا کارێکی ترسناکی جوامێرانەیە؟.. تا ئستاش کەس بەمارکسییەکانی نەوتووە ڕۆمانسی کە بۆ یەکگرتنی هەموو کرێکارانی جیهان‌و هەموو حکومەت‌و میللەتانی دنیا هەوڵئەدەن، کەسیش بەعەرەبە نەتەوەییەکانی نەوتووە ڕۆمانسی کە بۆ یەکگرتنەوەی (٢٢) پارچەی عەرەبنشینان هەوڵ ئەدەن.

پێشتریش کەس بەجوولەکەی نەوتووە ڕۆمانسی کە بەهەموو کونجێکی دنیادا بڵاوکرابوونەوەو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی جولەکە هەوڵیانئەدا.

هەردوو لایەنی گفتوگۆکە، سالارو کوردۆ، لەسەر ئەوە پێکهاتبوون کە (**بوونی کاژیك ڕێگەی ئەوەی بەستەوە کە بیرێکی نەتەوەیی ڕاستەقینە بێتە کایەوە، بیرێکی ڕێك‌وپێك‌و خەملیوی شیاوو گونجاو**)!!

هەویری ئەم قسەیە حەوت بەرمیل ئاو دەکێشێت:

١- کاژیك دەستی کەسی نەگرتبوو کە حزبێکی تری نەتەوەیی دروست بکەن. کاژیك نەدەوڵەت بوو، نە دەزگایەکی پۆلیسی هەبوو کە ڕێگە لەخەڵکی بگرێ بۆ دروستکردنی هەر جۆرە حزبێك یا بۆ داڕشتنی هەر جۆرە بیرێك.

ئەوەتا ئێوە خۆتان ئەڵێن: (کاژیك بەردەوام لەپەراوێزدا ژیاوەو هیچ کاریگەری‌و قورساییەکی نەبووە.. هیچی پێنەکرا.. هیچیان نەکردووە) پێشتریش دکتۆر کوردۆ وتی (کاژیك لەگەڕەکێکی

سلێمانی تێنەپەڕیوە)، ئیتر بەرامبەر بەو هەموو هیچو تەنیا گەڕەکە بۆ ئەبێ ئەو کوردستانە گەورەیە دەستەوستان دانیشتێنو بیرێکی نەتەوەیی ڕاستەقینەیان نەهێنابێتە کایەوە؟ کەواتە ئەم دوو برادەرە خۆیان وەڵامی خۆیان ئەدەنەوەو ئەنجامی قسەکانیان ئەوە ئەگەیەنن کە کاژێک شت بووەو قورسایی خۆی هەبووە لەسەر جەماوەرو لەسەر دەوروبەرو لەسەر سیاسەت!

٢- دوای کۆنفرانسەکەی ئەغەدە، هەر لەساڵی ١٩٧٤دا، ژمارەیەک ئەفەری پەڕاگەندەو ژمارەیەکیش کە هەرگیز پەیوەندییان بەکاژێکەوە نەبووە، بەیاننامەیەکیان بەهاوکاری‌و پارمەتی قیادەی مەرکەزیی حزبی شیوعی دەرکرد، تیایدا قیادەی کاژێکیان دەرکردو خۆیان کردە سەرکردایەتی تازەی کاژێکو ئەوانیش هەر لەم جۆرە قسانەی ئەو دووبرادەرەیان ئەوتەوە، کەچی زۆری نەخایاند وەک بڵقی سەر ئاو هەر لەخۆیانەوە نە ناویان ما و نە ناوەڕۆک.

٣- دوای ئەوان پاسۆک دروستبوو، پاسۆک نە لەپەراوێزدا بوو، نە لەکۆڵەکەشدا بانگی ئەدا، بەڵکو دەستیدایە چەکو چووە شاخیش کەچی لەساڵی ١٩٧٥ەوە تا ڕاپەڕینی ١٩٩١یش هەر بریتی بوون لەکۆمەڵی مەنجەڵە یاپراخەکەو کەسێکی ئەوتۆیان لێکۆنەبووەوە، دوای ڕاپەڕینیش‌و لەجادەی ئەختیشدا جەماوەرەکە هەر ڕووی نەکردە ئەوان بێئەوەی خەوشێکیان هەبێ، تەنانەت لەهەڵبژاردنی پەرلەمانیشدا، بەپاسۆکو بەسۆشیالیستیش تەنیا ٢,٥٧٢٪ دەنگیان هێنا.

٤- بەرمیلی چوارەمی ئاوی هەویرەکەی ئەم دووبرادەرە، بەڕاشکاوی ئەوە ئەگەیەنن کە ئێستاش هیچ کام لەو حزبانەی لەکوردستاندا هەن (هەڵگری بیرێکی نەتەوەیی ڕاستەقینە نین، بیرێکی ڕێکوپێکو خەمڵیوی[٩] شیاوو گونجاو)، ئەوەش قسەیەکی ڕاستەو منیش لەگەڵ ئەواندام.

٥- ئەی کەواتە ئێستا بۆچی حزبێکی (هەڵگری بیرێکی نەتەوەیی ڕاستەقینەی ڕێکوپێکو خەمڵیوی شیاوو گونجاو) دروست نابێ، خۆ ئێستا نەکاژێک هەیەو نەپاسۆک کە ببنە داهۆڵو ڕێگە لەبیرێکی لەو جۆرە بگرن؟

٦- خوالێخۆشبوو دکتۆر کامیل بەصیر، هەموو جارێک ئەیوت (کاژێک چاکترین حزبو بیروباوەڕە، بەڵام میللەتی کوردی هێنی ئەو بارە نییە).

٧- ئێستا لەم خاڵی حەوتەمەوە ئۆرە ئەدەم بەخۆم، ڕایەک دەربڕم لەبارەی هۆکانی سەرنەکەوتنی کاژێکو پاسۆکەوە:

أ- هۆی یەکەم کە هۆی سەرکییە: کاژێک لەڕووی ڕێکخستنەوە پێش ڕۆژگاری کورد کەوت، لەڕۆژێکدا لەدایکبوو کە بیروباوەڕی چەپی نانەتەوەیی بەسەر مێشکی مرۆڤی کوردا زۆر زاڵ بوو، ئەو بیروباوەڕە هەر هی حزبی شیوعی نەبوو، بەڵکو پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقو ئەوەی ئێرانو کوردەکانی باکووردو ڕۆژئاوەو زۆربەی بێلایەنەکانیش پێشبڕکێیان لەگەڵ حزبی شیوعیی عێراقو ئێرانو سووریاو تورکیادا ئەکرد لەسەر مارکسیێتی.

زۆربەی خەڵکە ناسیاسییەکەش وەک وشکە موسوڵمانێک بیریان ئەکردەوە، بێگومان ڕێکخستنێکی نوێی وەک کاژێک بەبیروباوەڕێکی نوێی نەتەوەییانەی دژ بەمارکسیێتی، ئەوەندەی پێویست خەڵکی شوێن ناکەوێ، ئەوسا ئەبوایەو ئێستاش بۆ سەرکەوتنی ڕێکخستنێکی نەتەوەیی وەک کاژێک یان وەک ئەو دوو برادەرە ئەڵێن (بیرێکی نەتەوەیی ڕاستەقینەی ڕێکوپێکو خەمڵیوی شیاوو گونجاو) پێویستە پێش ئەوە ئەو بیروباوەڕە بچێتە قاڵبی ڕێکخستنێکی حزبییەوە، مێشکی ئەو خەڵکە بشۆردرێتەوە

لەهەموو خلتەو خەوشێکی نانەتەوەییانەو لەجێی ئەو خلتەو خەوشە خۆراکی بیروباوەڕی نەتەوەییان بدرێتێ، ئەوەش بەچالاکیەکی ڕۆشنبیرانەی ئاشکرای بەرفراوان دێتە ئەنجام، نەك بەڕێکخستنێکی حزبیانەی نهێنیی فرە دوژمندار کە ناچارین بانگ لەکولەکەی تەڕدا بدات، هەر کات ڕۆشنبیرە نەتەوەییەکانی کورد توانیان ئەو ئەرکە ئەنجام بدەن، ئەوسا ڕێکخستنێکی حزبی نەتەوەییانە سەرکەوتوو ئەبێ، ئەوەش کاری نەکردە نیەو پاشەڕۆژ هەر بۆ کوردایەتییە.

ب- هۆی دووەم: سەرەتای دروستبوونی کاژیك، لە ١٩٥٩/٤/١٤ ەوە تا ١٩٦١/٩/١١ ژمارەیکی باش لەکاژیك کۆبوونەوە.

بەڵام لەگەڵ بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلولدا ئەوە تارادەیەکی زۆر وەستا، چونکە کاتێ خەڵکەکە بینی ئەوا پارتی بەگولله شەڕ بۆ کورد ئەکات، ئیتر ئایدیۆلۆژیای کاژیك ئەو کاریگەرێتییەی نەماو هەرچی دڵی بۆ کورد لێی ئەدا، چووە پاڵ پارتیو شۆڕشەکە، بەتایبەتی کەسێتی بارزانی ئەوەندە بەهێز بوو کە سەرکردایەتی هەر حزبێکی بکردایە، خەڵکی ڕوویان لەو حزبە ئەکرد. ئەوە سەرباری ئەوەی ئەو کاتە بارزانی تازە لەسۆڤێتی قیبلەی مارکسییەکان گەڕابووەوە.

ج- هۆی سێیەم: ئەوەبوو کاژیك زیاتر کوردایەتی ئەکرد وەك لەحزبایەتی، لەبەر ئەوە هەموو تواناکانی خۆی خستەپاڵ شۆڕشی ئەیلول کە بمانویستایەو نەمانویستایە ئەوە بەسوود بۆ پارتیو بەزیان بۆ کاژیك ئەشکایەوە، بەڵام دەربەستی ئەوە نەبووینو ئاواتمان سەرکەوتنی شۆڕشەکەبوو.

د- هۆی چوارەم: مەسەلەی کانی ماسی بوو کە ناڕەوا لەو سەردەمەدا بەسەر کاژیك دا شکایەوە، کە لەڕاستیدا کاژیك بەهیچ جۆرێك دەستی لەخراپەکارییەکانی، کانی ماسیو کوشتنی شیوعیەکاندا نەبوو، ڕاستی مەسەلەکەش بەم جۆرە بوو:

لەسەرەتای شۆڕشی ئەیلولەوە لاوێك لەسلێمانی بەناوی عوسەی ئامەوە ناویانگی دەرکرد بەئازایەتی، ئەم لاوە چەند سیخوڕێکی ڕژێمی بەغدای کوشتووە، خۆی ئەندامی پارتی بوو، لەهەمان کاتدا ئەندامی لاوانی نەتەوەیی سەر بەکاژیکیش بوو، لەناو خەڵکدا نەتەوەییانە ئەدوا.

لەبەر ئەوە زیاتر لەسەر کاژیك ماڵ بوو، ڕۆژێك لەگەڵ یەکێك لەبرادەرە چەکدارەکانی خۆیدا شەڕێکی ئەبێو ئەیکوژێو دوایی بۆ داپۆشینی ئەو تاوانەی، ئەیکا بەدیعایە کە شیوعیەکان کوشتویانە.

ئنجا خۆیو برادەرەکانی تری ئەچن لەناو بازاڕدا چەند شیوعییەکی بێئاگاو بێتاوان ئەکوژن، گوایە ئەوە لەتۆڵەی برادەرەکەی عوسماندلیە، بێگومان تاوانەکە زۆر چەپەڵ بووەو پارتی بۆ ئەوەی لەخۆی دوورخاتەوە، ئەیخاتە پاڵ کاژیك، شیوعیەکانیش ئەوەیان بەهەلزانی بۆ سووککردنی کاژیكو ئەوانیش تاوانەکەیان خستە پاڵ کاژیك، عوسەی ئامەش چونکە زیاتر بەکاژیك ناسرابوو، ڕەمەکی خەڵکەکەش باوەڕیانکرد. هاوبیرانی کاژیکیش لە سلێمانی بەیانێکیان دەرنەکرد کە تاوانەکە لەخۆیان دوورخەنەوە، کە ئەوە هەڵەیەکی گەورە بووە، من ئەو کاتە لەبەغداد لەکۆلیجی ماف ئەمخوێندو فەرمانبەریش بووم لەبەغداد، دوای چەند مانگێك سەری سلێمانیم دایەوە، تا ئەو کاتەش ئەو ڕاستیانە بەتەواوی ڕوون نەبووبۆوە بۆ سەرکردایەتی کاژیكو بەتەواوی نەیانئەزانی ڕاستیو مەبەستی ئەو تاوانە چیبووە، دوایی ساغکرایەوە، کاتێ کە وەخت تێپەڕی کردبوو بۆ دەرکردنی بەیانێکی لەو جۆرە بەڕای هەندێك

لەهاوبیران، بەلام هەر ئەبوایە لە دوای تاوانەکە کازیك لەبەیانێکدا ناڕەزایی خۆی بەرامبەر ئەو تاوانە دەربڕیایە.

منیش بەبێ هیچ پرسیارو وەلامێك، ئەمزانی ئەوە کاری کازیك نەبووە، چونکە هەموو کازیك لەو کاتەدا خاوەنی دەمانچەیەك نەبوو، خاوەنی سەد دینار نەبوو، ئنجا ئەگەر کازیك تواناشی هەبوایەو بشیویستایە دەستێك لەدوژمنەکانی بوەشێنێت، نەئەچوو ئەو خەڵکە بێدەسەڵاتە بێتاوانانە بکوژێ، بەڵکو کێشەی خۆی لەگەڵ سەرکردەکانیاندا یەکالا ئەکردەوە، کە لەڕاستیدا ئەو کاتە جگە لەجیاوازیی بیروباوەڕ، هیچ کێشەیەکی تر لەئارادا نەبوو، هیچ دەستدرێژییەکیش نەکرابووە سەر کازیك کە شایانی تۆڵەیەکی لەو جۆرەبێ، بەلام خەڵکی ئەم راستیانەیان نەئەزانیو ئەو کارەساتە ناوبانگێکی خراپی بۆ کازیك بەجێهێشتو بووە لەمپەرێك لەڕێگەی گەشەکردنیدا.

هـ- جگە لەوانە، ژمارەیەکیش لەهاوبیرانی خۆمان، کەموکورتیو ئەمەڵیو ناوابەستەییی هەبووە، کە ئەوانە لەهەموو حزبێکی تریشدا هەیە، ئەوانە بەکورتی هۆی سەرنەکەوتنەکە بوون.

لەبارەی وازهێنانی دکتۆر کوردۆوە لەکازیكو سۆکسەو پاسۆك، ئەوەبو بینیمان هەرچی خراپە بەکازیكو پاسۆکی وت، کەچی دوایی ئەڵێ: (**بە جەمال نەبەزم وت لەداخی تۆ واز ئەهێنم**)، کەواتە مەسەلەکە بوو بەمەسەلەیەکی کەسینە، نەك مەسەلەیەکی مەبدەئی!

کاك کوردۆ لەمەش زیاتر خۆی ئاشکرا ئەکاتو ئەڵێ: (**پێموت ئەگەر تۆ نەبایە من وازمنەدەهێنا**) باشە ئەم قسەیە چۆن ئەگونجێ لەگەڵ ئەو قسانەی تریدا بەتایبەتی ئەوەی ئەڵێ (**من شەرمم پێیە لەو حزبە نیشم کردبێ**)، ئنجا مامۆستا جەمال نەبەزێك کە هەموو ژیانی خۆی تەرخان کردبێ بۆ کوردایەتیو دەریایەك بێ لەزانستو خاوەنی زیاتر لەشەست بەرهەمی چاپکراوو زیاتر لە (٣٠) بەرهەمی چاپنەکراوی ئاست بەرزو کەم وێنە بێ لەبوارەکانی کوردایەتیو سیاسەتو مێژوو زمانو وێژەو زانستو فەرهەنگدا بێنەوەی داوای پاداشتێکی لەهیچ کەسو لایەنێك کردبێ.. چۆن ئەبێ رۆشنبیرێکی وەك کاك کوردۆ لەدلی ئەو واز لەرێکخستنێکو بیروباوەڕێك بێنێ؟!

کە ئەو وازهێنانەش (**لەو کاتەدا بووە کە دکتۆر نەبەز دەعوەتی بەیانیی بۆ دکتۆر کوردۆ کردووە لەبەرلین**)!

من نالێم دکتۆر نەبەز هیچ کەموکورییەکی نییە، هیچ مرۆڤێ لەم دنیایەدا نیە بێ کەموکوڕی، گریمان لەهەندێك دیدو بۆچووندا نەپێکابێ، یا (٣٨) ساڵی غەریبیو تەنیایی تۆزێك دڵی ناسك کردبێ، ئەوانە چین لەچاو کارە مەزنەکانی ئەو بەڕێزەدا؟ بێینەوە سەر کازیك کە دکتۆر کوردۆ ئەڵێ: (**دەوری چی بووە لەسەر گۆڕەپانی سیاسی کوردیدا**)، منیش لەسەرەتای ئەم نوسینەمدا وتم ئێستاش بیرۆکەی کازیك ماوە، برادەر سالار یاسینیش ئەڵێ: (**کازیك هیچ کاریگەریو قورسایەکی نەبووە**).

ئێمە تۆزێ لەمەوبەر ئەو لەمپەرانەمان پیشاندا کە لەڕێگەی پێشکەوتنی کازیکدا بوون، ئەوانە سەرباری نزمیی هوشیاریی نەتەوەیی لەناو کوردا، لەگەڵ ئەوەشدا کازیك لەدوو رووەوە، کەم تا زۆر دەوری هەبووە لەسەر گۆڕەپانی سیاسی کوردیو کاریگەرییو قورسایشی هەبووە لەم بوارانەدا:

یەکەم/ پەردەهەلماڵین لەڕووی بیروباوەڕی نانەتەوەییانەی وەك مارکسیزمی، ئەوەش لەڕێگەی ئەدەبیاتەکانی کازیكو نوسینەکانی نەبەزو هەردیو جەوهەرو فەرەیدونو ژیرەوە.

دووەم/ پەردەهەلماڵین لەڕووی شۆڤێنیزمی فارسیو عەرەبیو تورکیەوە بەهەمان رێگە.

سێهەم/ گەشەدان بەبیروباوەڕی نەتەوەیی کوردیو گواستنەوەی کوردایەتی لەسۆزەوە بۆ بیربەهەمان ڕێگە، من خۆم لەچەندین ئەندامانی پارتیو یەکێتیو ڕۆشنبیری تریش ئەبیسمو ئەڵێن ئەوەی جاران ئێوەی کاژێك ئەتانوتو ئێمە بەتاوانمان ئەزانی، ئێستا ئێمەش ئەوانە ئەڵێینەوەو ئەشی نووسین، کاژێك یەکەم کۆمەڵو کەسانێك بوون کە سەلماندیان کوردایەتی قۆناغ نیە، بەڵکو ڕاستیەکی مێژوویی هەمیشەییە، کاژێك توانی بیرۆکەی برایەتیی داگیرکەرو داگیرکراو ڕەتکاتەوەو ئەوە بسەلمێنێ کە ئۆتۆنۆمی چارەسەری کێشەی کورد ناکاتو سەربەخۆیی کوردستان وەك ستراتیجێك ڕابگەیەنێت.

بەر لەکاژێك بۆشاییەکی فکری لەکوردستاندا هەبوو، ئەو بۆشاییە هەمیشە بەبیروباوەڕی نامۆی وەك تورکچێتیو بەناوی ئیسلامەوە عەرەبچێتیو لەو دواییەشدا مارکسێتی پڕ ئەکرایەوە، بەلام بەپەیدابوونی کاژێك بیروباوەڕی ڕەسەنی کوردایەتی دروستبوو، هەر بەهۆی کاریگەرێتی کاژێکەوە، پارتی وازی لەبنەمای (سود لەمارکسێتی لینینی وەرئەگرین) هێنا، یەکێتیش خەریکە وردە وردە لەمارکسێتی دوور ئەکەوێتەوە.

کاژێك لەئاستی ئەوروپادا خاوەنی ڕێکخراوێکی وەك سوکسە بوو کە ئەوسا گەورەترین ڕێکخراوێکی سیاسی کوردانی خوێندکاری ئەوروپابوو.

کاژێك بۆ یەکەمجار مەسەلەیەکی گرنگی ورووژان، ئەویش مەسەلەی ئابووریی کوردستان بوو لەژێر فەرمانڕەوایەتیی داگیرکەراندا کە پێی وابوو سامانی کوردستان لەژێر فەرمانڕەوایەتیی ئەو داگیرکەرانەدا هەر بەشێوەی خام بمێنێتەوە چاکترە نەك ئەوان بیخەنە کارو خۆیانی پێ دەوڵەمەند بکەنو بیکەن بە بۆمباو بیشکێننەوە بەسەر کوردا، لەبەرئەوە هانی پرۆژە ئابوورییەکانی داگیرکەرانی ئەدا لەکوردستاندا، کاژێك بۆ یەکەمجار مێژووی کوردی باسخوازیانەو شۆڕشگێڕانەو زانستیانە لێکداوەتەوەو هۆی سەرنەکەوتنی بزوتنەوەکانی پێشووی کوردی شیکردۆتەوە لەکاژێکنامەو نوسینەکانی تریدا.

کاژێك بۆ یەکەمجار لەناو کوردا بیرۆکەی نێونەتەوەیی (أممی) ڕەتکردۆتەوە، ئەو بیرۆکەیەی سەرجەمی نەتەوەکان ئەکاتە یەکەیەك بۆ خاڵی دەسپێکردنو دەربەڕینی خۆی، بێگوێدانە بارودۆخو جیاوازیی چەندێتیو چۆنێتی هەر نەتەوەیەك.

هەر لەم گۆشە نیگایەشەوە کاژێك خاڵی دەسپێکردنو دەربەڕین لەچینێکی تایبەتی کۆمەڵەوە ڕەتئەکاتەوەو هەموو نەتەوەی مەبەستەو هەوڵیش ئەدات بۆ کەمکردنەوەی جیاوازیی چینایەتی، بەدوو دروشمی نوێشەوە هاتەپێشەوە.

دروشمی کوردستان بۆ کورد، یەکسانی بۆ گەل، بەپێی دروشمی یەکەم، ژێر دەستەیەتی ڕەتئەکاتەوەو باوەڕی بەچارەسەری نیوەناچڵ نییە بۆ کێشەی کورد، مەگەر بەشێوەیەکی کاتی، ئەویش بەمەرجێك هەنگاوێك لەسەربەخۆییەوە نزیکمان بخاتەوە.

یەکسانییەکیش لاسایی کردنەوەی هیچ کام لەسۆشیالیستەکانی وڵاتانی تر نییە، بەڵکو یەکسانییەکی گونجاوە بۆ کوردستان.

هەر لەبواری کاریگەرێتی کاژێك بۆ سەر لایەنەکانی ترو گۆڕینی باری سەرنجیان بەرامبەر دیاردە بیرمەندیو لۆجیکیو کۆمەلایەتییەکانو لەوەلامی ئەو دوو برادەرەدا، ئەم نموونەیە باس ئەکەین:

مارکسییەکان بەگشتی لەو باوەڕەدابوون کە بەرژەوەندیی ئابوریی چینی کرێکار هەرگیز لەگەڵ بەرژەوەندی چینی سەرمایەدار ڕێکناکەوێ، هەروەها بەرژەوەندی ئابوری چینی کرێکار لەهەموو جیهاندا هەریەک بەرژەوەندییە.

بەڵام کاژیك پێی وابوو بەرژەوەندیی ئابوریی چینی کرێکار لەوڵاتێکدا، گەلێجار لەگەڵ بەرژەوەندیی ئابوریی چینی سەرمایەداری ئەو وڵاتە ڕێکدەکەوێ دژی بەرژەوەندی ئابوری چینی کرێکاری وڵاتێکی دی، ئنجا بیست ساڵ دوای ئەوە، کۆمەڵەی ڕەنجەران کە کۆمەڵەیەکی مارکسی کوردی بوو، دانی بەوەدا نا کە بەرژەوەندیی ئابوریی و سیاسی و کولتوری چینی کرێکاری کوردستان بەهیچ جۆرێ لەگەڵ بەرژەوەندیی ئابوریی و سیاسی و کولتوری چینی وڵاتانی عێراق تورکیاو سوریاو ئێران، واتە چینی کرێکاری ئەو وڵاتانە یەك نین و زۆر ناکۆکن، چینی کرێکاری کورد لەلایەن چینی کرێکاری عەرەب و تورك و فارسەوە دەچەوسێنرێتەوەو تەنگ بەزیانی هەڵدەچنرێ، هەروەها ئەم کۆمەڵە مارکسییە لینینییە دوای بیست ساڵ وەك کاژیك دان بەوەدا ئەنێن کە ئەو وڵاتانەی کوردستانیان بەشکردووە، داگیرکەرو کۆلۆنیالیستن و کرێکارەکانیشیان بەبیری شۆڤێنیانەو داگیرکەرانەو رەگەزپەرستانەو خۆبەزلگرانەوە پەروەردە دەکرێن دژی کرێکاری کورد.

جگە لەوە، هەموان ئەزانن کە لەدروستبوونی حزبی رزگاری کوردەوە (١٩٤٥-١٩٤٦) لەباشور خواستی سەربەخۆیی کوردستان بەلاوە نراو دروشمی ئۆتۆنۆمی سەریهەڵدا، بووە جێگری سەربەخۆیی لەکوردستاندا، لەرۆژهەڵاتی کوردستانیش، حزبی دیموکراتی کوردستان لەتشرینی دووەمی ١٩٤٥ ەوەو جارێکیتر لەباشوری کوردستانەوە، پارتی دیموکراتی کورد لە ١٩٤٦/٨/١٦ەوە ئۆتۆنۆمیان کردە ستراتیجی خۆیان، ئەوەش جێگەی رەزامەندیی حزبی شیوعی عێراقی و کۆلۆنیالیستەکانی جیهان بوو، هەروەها ئەم دروشمە لەبەرژەوەندی داگیرکەرانی کوردستانیش بوو، لەچاو سەربەخۆیدا، دوای هەڵگێرانەوەکەی قاسم لە ١٤ ئەموزی ١٩٥٨دا، خواستی سەربەخۆیی و باسکردنی، بەیەکێك لەناپاکیی نیشتمانی ئەژمێردرا، نەك هەر لەلایەن داگیرکەران و کۆمۆنستانەوە، بەڵکو لەلایەن حزب و ڕێکخراوە سیاسیە کوردەکانیشەوە.

بەجۆرێك وایلێهات ژمارەیەك کۆمۆنیست کەوتنە ناو سەرکردایەتی پارتییەوەو ویستیان ڕێکخراوی لاوانی کوردستان لەناو ڕێکخراوی گەنجانی عێراقی سەر بەکۆمۆنیستەکاندا بتوێننەوە، ئەو کۆمۆنیستانە دەستیانگرت بەسەر رۆژنامەی خەباتی پارتیداو چاویان بریبووە ئەوەی پارتی بکەنە فۆتۆکۆپی حزبی شیوعی، کار گەیشتە ئەوەی گاڵتە بەهەموو کەلەپوور سەروەرییەکانی کورد بکرێت، بەمعاریفی کوردستانیان ئەوت معاریفی قلیاسان*، لەوەڵامی رۆژباشدا، تاکە کڵاش ئەوترا، ماڵی ژمارەیەك لەوانەی دەسبەرداری کوردایەتی ئەبوون، نیشانەکرا بۆ ئەوەی ئەوانیش وەك ئەوانەی کەرکوك راکێشرێن (سحل) کرێن.

ئا لەو باروبۆخەدا، کاژیك وەك حزبێك لەپێناوی ئازادی و ژیانەوەو یەکێتی کوردو بەدروشمی سەربەخۆیی کوردستان و فەلسەفەیەکی نوێی کوردایەتیەوە لەدایکبوو و شۆڕشێکی بیرمەندیانەی

---

* لەبارەی معاریفی کوردستانەوە، لەنزیك کۆتایی ئەم بەرهەمەدا، بەدواداچوون و بەڵگەنامەیەك بخوێنەرەوە.

لەڕێگـەی نوسـینەکانییەوە وەك حزبێـكو لەڕێگـەی پێنووسـی ژمارەیـەك لەدامەزرێنەرەکانییـەوە بەشێوەی هۆنراوەو پەخشان بەرپاکرد.

ئنجا ئەگەر کاژێك وەك ڕێکخستنێك سەرکەوتوو نەبووبێ‌و دوای ١٦ ساڵ ڕاگیرابێ، ئەمڕۆ، واتا دوای تێپەڕبوونی چل ساڵ وەك بیرێکی نەتەوەیی ڕەسەنی کوردی، لەبەردەوام بووندایەو پاشەڕۆژیش لەکوردستاندا بۆ بیروباوەڕی کوردایەتییە. بەتاقیکردنەوەی ئەم چل ساڵەش دەرکەوتووە بڕاف‌و بیروباوەڕی کوردایەتی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەبرەوێکی زیاتردایە، ئەوەش خواست‌و مەبەستی هاوبیرانی کاژێکەو جێگەی شانازییانە بێنەوەی ئەو هاوبیرانە چاویان لەپارتایەتی‌و پاداشتی مادییەوە بێت، ڕۆژانی خەباتی کاژێکانەشیان وەك ڕێکخستنێك بەڕۆژانی جەوامێری ئەزانن، نەك بەشەرم‌و پەشیمانی، کاروانی بیروباوەڕەکەش بەردەوامە، کاژێك واتا: ئازادی‌و ژیانەوەو یەکێتی کورد، ئیتر ئەوە چ پێویست بە (براءة) ئەکا لەکوردستانێکی ئازادا؟!

جەمال نەبەز — ئەحمەد هەردی — کامیل ژیر

فایەق عارف — فەرەیدون عەلی ئەمین — ئیحسان فوئاد — عەبدوڵا جەوهەر

دامەزرێنەرانی کاژێك ١٤/٤/١٩٥٩

لەوەڵامی چەند پرسیارێکی ڕۆژنامەی ڕێزداری (هاوبیر)دا
ژمارە "١" سێ شەممە ١٤ ڕەشەمێی ٢٧٠١ ٢٠٠٢/٣/٥ ل٥

# کامیـــــل ژیـــــر: کاژیـــــك وەك بیرمـــــاوەو ڕۆژێـــــك نـــــەبێت بچێتەوە قالبی ڕێکخستنەوە

**• سەبارەت بەچۆنێتی کۆتایی هاتنی کاری سیاسی کاژێك چی دەڵێن!**

– زۆر بەکورتی ئەڵێم: کاژێك خۆی کرد بەقوربانی شۆڕشی ئەیلول، ئەوەش لەو باوەڕەوە بوو کە نەتەوە لەحیزب گرنگترە. ئێمەی دامەزرێنەرانی کاژێك نەك هەر نەمانویست ببینە کۆسپێك لەبەردەم ئەو شۆڕشەدا، بەڵکو بوینە مۆمێك بۆ ئەو شۆڕشە سوتاین، کارەکەشمان وەك کاری سەربازێکی نادیاربو.

ڕاستییەکەی کاژێك قورساییەکی باشی هەبو لەناو ئەو شۆڕشەدا، هەندێکیان لەدەوری بارەگای بەرزانی کۆبوبونەوە. هێزی خەبات لەشۆڕشی ئەیلول، بەفەرماندەکەی و زۆربەی زۆری ئەندامەکانیەوە کاژێك بون بەبێئەوەی ئەو نهێنییە بدرکێنن، گرنگ بەلای کاژێکەوە ئەوەبو شۆڕشی ئەیلول سەرکەوێ و سەربەخۆییەك بەدەستبێنێ بۆ کورد.

ئەم بارە درێژەی کێشا تا ساڵی ١٩٧٤ کە شەڕ دەستی پێکردەوە، لەو ساڵەدا کاژێك لەشاری بەغدە کۆنفرانسێکی بەست، ئەنجام ئەوەبو کە تێکەڵبوونی کاژێك لەگەڵ شۆڕشدا بەجۆرێك چڕوپڕ بوە، جیاکردنەوەی ئاسان نیە کە ئامانجیش هەر کوردایەتی و سەرکەوتنی شۆڕش بێ، ئیتر پێویست بەو جیاکردنەوەیە ناکات لەو کاتەدا، لەبەر ئەوە بڕیاری کۆنفرانس ئەوەبو کە کاری سیاسی کاژێك هەڵپەسێردرێت تا ئەنجامێکی شۆڕش بەدیارئەکەوێ. دوای هەرەسی شۆڕشیش هەندێك هەوڵدرا بۆ کەوتنەوەکار، بەڵام لەولاوە پاسۆك دروستبو، ئیتر بەلای هەندێك لەهاوبیرانەوە پێویستی بەوە نەما کاژێك بخرێتەوە کار، ئێستاش کاژێك وەك بیروباوەڕ هەر ماوەو، ئەو بیروباوەڕەش ڕۆژێك ئەبێ بچێتەوە قالبی ڕێکخستن بەهەر ناوێکەوە.

**• بۆچی پاسۆك بەیەکگرتن لەگەڵ حیزبی سوسیالیست کۆتایی بەژیانی خۆی هێناو، پاشان هۆی شکستی حیزبی یەکگرتن چی بوو!**

– پاسۆك بەیەککرتن لەگەڵ حیزبی سوسیالیست، کۆتایی بەژیانی خۆی نەهێنا، بەڵکو ویستی هێزو گوڕێکی زیاتر بدات بەخۆی، هۆی ئەوەش ئەوەبوو کە لەدوای ڕاپەڕینەوەو دوای وەرچەرخانی خەباتی چەکدارانە بۆ کۆبوونەوە لەدەوری سنوقی هەڵبژاردن، ئیتر مەسەلەی (ژمارە) مەسەلەیەك بوو کە ئەبوایە حسابی بۆ بکرایە، بۆیە ئەو یەککرتنە دروستبو، پارتی و یەکێتیش هەمان حسابیان بۆ (ژمارە) کرد، بەڵام ئەوان بەوە چارەسەری کێشەی ژمارەیان کرد کە هەموو جۆرە کەسێکیان لەخۆیان

کۆکردەوە بەجاش و باشەوە. ئەوە بەپاسۆک هەزم نەنەکرا، ئەوەبو دوایی (گەل)یش هاتنە ناو یەککرتنەوە، واتە حیزبە تازەکە لەپاسۆک و سوسیالیست و گەل دروستبوو بەو نیازەی ببنە هێزی سێیەم.

هۆی شکستی حیزبی یەککرتن ئەمانە بوو:

١-دەنگنەهێنانی پاسۆک ـ سوسیالیست و گەل لەهەڵبژاردندا هۆی ئەوەش بەزۆری ئەوە بوو کە بەرەبەرەکانی نێوان پارتی و یەکێتی بەڕادەیەک ڕەنگی دابووەوە لەناو خەڵکیدا کە زۆربەی ئەندامان و لایەنگرەکانی ئێمەش دەنگیان بۆ پارتی یا بۆ یەکێتی دا!!

٢- پارتی و یەکێتی هەریەکەیان بەجۆرێك کەوتنە زەبرلێدانمان، سەرچاوەی دارلییان لێبڕین، ئێمە لەهەموو شارو شارۆچکەو ناوچەیەك بارەگاو پێشمەرگەو ئەندامان و لایەنگرانمان هەبو، ئەوانیش هەموو پارەو مەسرەف و ژیانیان ئەویست، جگە لەوەی کەوتنە ئەوەی شەڕیان پێنەفرۆشتین، هەوڵیان ئەدا دەست بەسەربارەگاکانماندا بگرن و ئوتومبیل و تەقەمەنیەکانمان ببەن و.. هتد.

٣- ماوەی یەککرتنی ئەو سێ حیزبەش ماوەیەکی کورتبوو، هێشتا لەناو یەکدا نەتوابونەوە، یەك رەئی نەبو بەرگەی ئەو ئەو گوشارەیان نەگرت، بۆیە سێ رەئی پەیدابو: ١- بمێنینەوە، ٢- خۆ حەل کەین، ٣- تێکەڵ بەو دوو حیزبە ببین، لەئەنجامدا رای سێیەم زیاتر لایەنگری هەبوو.

**• هۆکارەکانی نەرسکانی پارتێکی نەتەوەیی رادیکاڵی لەدوای پاسۆک بۆچی دەگەڕێتەوە؟**

– لەپلەی یەکەمدا، بۆ نزمی ئاستی وشیاری نەتەوەیی لەناو کورددا. پارتێکی نەتەوەیی ئەبێ پارتێکی عەقائیدی بێ، کەواتە ئەبێ لەپێش رێکخستندا، زەمینە بۆ بیروباوەڕێکی نەتەوەییانە خۆش بکرێت، ئەو دنیایەش هەروابووە، ئاینەکان پێش ئەوەی ببنە رێکخستن و فەرمانڕەوایەتی، بیروباوەڕبوون، مارکسیتی زۆر لەپێش حیزبە شیوعیەکانەوە بووە، بیریارە ئەڵمانی و جولەکەو عەرەبەکان، زۆر لەپێش حیزبە نەتەوەییەکانەوە بوون ئەوانە ساڵانێکی زۆر خەریکی گۆشکردنی نەتەوەکانیان بوون بەبیروباوەڕەکانیان ئینجا ئەو بیروباوەڕانە چوونە قاڵبی رێکخستنی حیزبیانەوە، بۆیە ئێستا نەتەوەی کورد پێویستی بەقوتابخانەیەکی بیری نەتەوەیی هەیە بەر لەحیزبێکی نەتەوەیی. بۆ ئەم مەبەستەش، پێویستە بیریارە نەتەوەییە کوردەکان لەیەکنزیك ببنەوەو لەیانەیەکی رۆشنبیری، یا لە کۆمەڵەیەکی رۆشنبیریدا یەکبگرن، یا لەدەوری گۆڤارو رۆژنامەیەکی نەتەوەییانە کۆببنەوەو گەشە بەبیروباوەڕی کوردایەتی بدەن، دوای ئەوە ئیتر رێکخستنی سیاسی خۆی دروستئەبێ و ئەو کاتە سەرکەوتووش ئەبێ.

لەرۆژنامەی ڕێزداری هاوبیردا، ژمارە (٢) رۆژی ٢٠٠٢/٤/٧ بڵاوکرایەوە

# کوردایەتی نەک پارتایەتی

لەژمارە (١)ی ئەم رۆژنامەیەدا (هاوبیر) وتم: ئێستاش کاژیک، وەك بیروباوەڕ، هەر ماوە، ئەو بیروباوەڕەش، رۆژێك ئەبی بچێتەوە قالبی رێکخستن بەهەر ناوێکەوە.

قسەکە لای هەندێك والێکراوەتەوە کە ئێمە خوازیاری ئەوەین جارێکی تر کاژیك، لەئێستادا هەستێنینەوە وەك پارتییەك بیخەینە کار. رووبەڕووش هەندێك سیاسەتکاری بەڕێز پیرۆزباییان لێکردم.

ڕاستییەکەی بەرجەستەکردنی بیروباوەڕی کوردایەتی، جارێکی تر لەپارتییەکی وەك کاژێکدا، ئەوە خولسێکی پیرۆزی منە، بەڵام کارێکی لەو جۆرە، بۆ هەڵکەوتەو بۆ باروبزخی ئەمڕۆی نەتەوەی کوردمان دەست نادات. ئەوە نەك هەر پارتییەکی وەك کاژێك، بەڵکو هەموو ئەو پارتیانەی تریش کە ئەمڕۆ لەسەر پانتایی کوردستان کار ئەکەن، بونیان هەر زیادەیە، بەڵکو زیانبەخشیشە، چونکە نەتەوەیەك کە هێشتا لەقۆناغی رزگاریدا بێ، پێویستی بەیەکخستنی وزەو توانای تاکەکانیەتی، نەك بەش بەشکردنی ئەو وزەو توانایانە.

ڕاستە فرە پارتی دیاردەیەکی شارستانیەو رێگەدانە بەدیدو بۆچوونی جیاواز جیاوازو نەهێشتن یا کەمکردنەوەی دەسەڵاتی تاکرەوی‌و دیکتاتۆریانەیە،بەڵام ئەوە بۆ کۆمەڵگایەکی پێشکەوتووی هوشیارە کە واتای دیموکراتێتی بزانێ‌و رێز لەڕای بەرامبەر بگرێ‌و کێشەکانی تەنیا لەڕێگەی سندوقی هەڵبژاردنەوە چارەسەر بکات.

. کۆمەڵگەی کوردی هێشتا بەدەست ژمارەیەك کۆسپ‌و تەگەرە لەڕێگەی فرە پارتایەتیدا ئەناڵێنێ، وەك: پارچە پارچەکردنی خاکەکەی، داگیرکردن، نەزانین، نەخوێندەواری، گیانی تیرەگەری‌و ناوچەگەری، گیانی تۆڵە سەندنەوەو.. هتد، کە ئەوانە هەمووی پێویستیان بەیەکخستنی وزەو تواناکانە، نەك لەیەك ترازانیان بەهۆی فرە پارتایەتییەوە.

لەم رووەوە فەیلەسوفی ئەڵمانی (ترێتشکە) ئەڵێ: فرەپارتاییەتی بۆ گەلانی ئازاد پێویستە، بەڵام ئەو نەتەوانەی هێشتا لەقۆناغی تێکۆشاندان بۆ سەربەخۆیی، ئەوانە بۆ فرە پارتایەتی ناشێن، بەڵکو پێویستیان بەتەنیا یەك رێکخستنی نەتەوەییانە هەیە، وەك بەڵگەیەکیش ناوچەی (پیدمۆنت) بەنمونە ئەهێنێتەوە کە چۆن لەژێر کاریگەرێتی (کافور) دا هەموو پارتەکان یەکیان گرت لەساڵی ١٨٥٩دا.

ئێمەی کوردیش زیانەکانی فرەپارتایەتیمان بەچاوی خۆمان بینی، بەهۆی فرەپارتایەتیەوە کوردستان لەپێنج پارچەوە بوو بەشەش پارچە. خوێنی هەزاران لاوی کورد بەناهەق رژاو بەفیڕۆچوو، هەزاران خێزانی کورد ئاوارەبوون، چەندین رۆڵەی قارەمانی گەلەکەمان ناکاو کوژکران. لەبری ئەوان جاش‌و پاش جاش بەسەر پارتەکاندا دابەش بوون، رێ لەکەسانی خاوێن‌و بەتوانا گیراوە، ماڵ‌و موڵکی ئەو میللەتە تەرخانە بۆ دەسکەوتی پارتایەتی، لەپەنای ئاژاوەی فرە پارتیدا چەندین نۆکەرو

بەکرێگیراوی نەیارانی نەتەوەکەمان کاری گێرەشێوێنیی و سیخوڕیی و تیرۆر ئەنجام ئەدەن. هەر بەناوی فرە پارتیەوە گەلێ گروپ و تاقمی سیخوڕی دروست بوون. هەر پەنای فرە پارتیەو وایکردووە هەر پارتەو پەنا بۆ داگیرکەرێکی کوردستان ببات، یا ناچاربن کە ئەو داگیرکەرانە ناوبژیوانیان بن. بەگشتی پارتییە کوردییەکان زیاتر لەرێکخراوی سوپایی ئەچن بۆ گیانی یەکتر، کەس نازانێ داهاتی کوردستان چەندەو چۆن بەخت ئەکرێو ..هتد.

کەواتە هەلکەوتەو بارو دۆخی ئەمڕۆی نەتەوەکەمان بۆ فرە پارتایەتی دەست نادات، بەلکو پێویستی بەخەباتێکی سیاسیی یەکگرتوو هەیە. ئەویش یا بەتێکەلبوونی هەموو پارتییە نیشتمانییەکان، بەتایبەتی هاوڕێبازەکان، یا بەکۆبوونەوەیان لەژێر چەتری بەرەیەکی کوردستانی، یا کۆنگرەیەکی نیشتمانی کوردستانیدا، ئەشێ بوتری ڕزگاری بەرەی کوردستانی بەسەرچوو، بەلام کۆنگرەیەکی نیشتمانی، ئەوە کاتیەتی و ئەشێ لەڕزگارێکی وەك ئەمڕۆدا هەموو هێزە سیاسیەکانی کوردستان و کەسایەتییە سیاسییە بێ لایەنەکانیش لەژێر چەتری کۆنگرەیەکدا کۆببنەوەو تواناکانیان یەکخەن و ستراتیژی نەتەوەی کورد دارێژن و دیاری بکەن و بەرنامەیەکی هاوبەش بۆ خەباتی ئەمڕۆمان دانێن.

ئێستاش سێ کۆنگرەی سەرەکی لەو جۆرە هەیە، بەلام هەرسێکیان لەدەرەوەی کوردستاندان. ئاشکراشە یەکێك لەو سیانە سەربە پارتییەکی زانراوە. بەلام دوانەکەی تر، کۆنگرەی نیشتمانی کورد لەئەمریکاو کۆنگرەی نیشتمانی کوردستان لەئەوروپا، لەکەسانی بێلایەن و نەتەوەیی پێکهاتوون. بۆیە ئەگونجێ گەشەیان پێ بدرێ و بکرێنە چەترێك بۆ کۆبوونەوەی پارتییەکانی ناو کوردستانیش.. لەم بیدو بۆچوونەوە، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە هەر کام لەو دوو کۆنگرەیە، بوونی لەکوردستاندا هەبێ بۆ ئەوەی نەك هەر کەسایەتیە بێلایەنەکان، بەلکو پارتییە نیشتمانییەکانیش لەیەك نزیك بخاتەوە، یا کۆبکاتەوە. یا هیچ نەبێ هەندێك ئەرکی نەتەوەییانە ئەنجام بدات وەك کۆششێکی نەتەوەیی بۆ یەکخستنەوەی دوو ئیدارەکەی هەولێرو سلێمانی، سەرپەرشتی هەلبژاردنی گشتی دووەم، دانانی دەستورێك، ڕێگرتن لەوەی ناکۆکیەکان تەشەنە بکات، هەموو یا زۆربەی نەتەوە پێك بهێنێت لەسەر ستراتیژێك بۆ ئایندەی کوردو بەرنامەڕێژی بۆ ئەو مەبەستەو هەر ئەرکێکی تر.

بەکورتی، ئەمڕۆی نەتەوەکەمان، ڕۆژی کوردایەتییە نەك پارتایەتی، ئەرکی ڕۆشنبیران و هاوبیرانی نەتەوەیش، کۆششێکی لەو جۆرەیە لەم بارودۆخەدا.

# فرە پارتی ڕەوایەتییەکی نابێ تا نیشتمان ڕزگاری نەبێ

هاوبیری هێژامان دوکتور جەمال نەبەز لەژمارە (٢٣)ی نەورۆزی (٢٠٠٢)ی گۆڤاری (کۆنگرە)ی ئۆرگانی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان ــ بڵاوکراوەی بیری نەتەوەیی کوردی - لەژێر سەرناوی (ئازادیی حیزبایەتی)دا پرسیارێکی بەجێی کردووە:

بزانین حیزب نوێنەری بەرژەوەندیی کێیە؟

بۆ وەڵامی پرسیارەکەی ئەڵێ: پێویستە بزانین ڕەوایەتی حیزب لەکوێوە دێ؟ ئەڵێ لەوەوەدێ کە ئەندامانی کۆمەڵگەیەک هەموو لەباری بەرژەوەندییەوە وەک یەک نەبێ ئەوانەی بەرژەوەندییان وەک یەکە، پێویستییان بەوە هەیە پێکەوە کار بکەن، ئەوەش پێویستی بەڕێکخستن‌و بەرنامەو پێوەندی هەیە، کە ئەمانە بەهۆی حیزبێکەوە نەبێ ناکرێ؛ ئنجا دوای ئەوەی بەرپەرچی بیردۆزەی چەپەکان ئەداتەوە لەبارەی (بەرژەوەندی)یەوە، ئەڵێ: (بەرژەوەندیی وەک یەک لەباروئۆخی وەک یەکەوە دروست ئەبێ.. جا لەبەر ئەوەی سنووری چینایەتی هەموو کاتێ بەڕوونی دیار نیە، بەشکردنی ئەوانەی یەک پیشەیان هەیە بەسەر یەک چیندا شتێکی ڕاست نیە.. دوای ئەوەی دێتە سەر لایەنە خراپەکانی حیزبایەتی ڕێنمایی هاوبیرانی نەتەوەیی ئەکات کە بۆ ڕۆشنبیرکردنی کۆمەڵ هەوڵ بدەن‌و بیرۆکەی حیزبی تاقانەو حیزبی پیرۆزو حیزبی سەرکردەو پێشڕەو لەمێشکی خەڵک بکەنە دەرەوەو لەئەندامانی حیزبەکان بگەیەنن دوژمنایەتی یەکدی نەکەن‌و لەڕێی گۆڕینەوەی بیروڕاوە بگەنە باشترین چارە بۆ کێشەکانی کۆمەڵگە.

نەبەز ئەو وتارەی وەک بەشێک لەپەرتوکی (هێندێک لەکێشە بنەڕەتییەکانی قوتابخانەی کوردیی سوسیالیزم ــ لەناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی پێشوودا نوسیوە، خۆشبەختانە لەکۆتایی هەشتاکاندا، بەرەی کوردستانی هاتە بەرهەم، ئەم بەرەیە، ئەگەرچی خولستی دەوڵەتی ئێرانیشی تیابوو بەمەبەستی دژایەتیکردنێکی زیاتری دەوڵەتی عێراق لەکاتی جەنگەکەیاندا، بەڵام سێ ئەنجامی سەرەکیی باشی لێکەوتەوە، یەکەمیان: ڕاگرتنی شەڕی ناوخۆی کوردکوژانەی نێوان حیزبە کوردییەکان‌و ئاشتبوونەوەی گشتی، دووەمیان: یەک هەڵوێستی‌و هاوکاریان لەکاتی ڕاپەڕینە پیرۆزەکەی جەماوەری کوردستاندا ساڵی ١٩٩١. سێیەمیان: هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان‌و دروستکردنی حکومەتی باشووری کوردستان. دیارە ئەنجامی سێیەم تێکەڵ بەکاریگەرێتی کۆڕەوەکەو بڕیاری ٦٨٨و ناوچەی ئارامو چەکوشی ئامادەش بوو.

ئێستا، دوای زیندەبەچاڵکردنی بەرەی کوردستانی‌و بەرپابوونەوەی شەڕی ناوخۆی کوردکوژی‌و دوولەتکردنی ئەو حکومەتە.. ئەشێ بپرسین ئاخۆ ئەو هەموو حیزبانەی ئەمڕۆ لەسەرتاسەری کوردستاندا بەگشتی‌و لەباشووری کوردستاندا بەتایبەتی قوتکراونەتەوە، ڕەوایەتییان هەیە؟!

بێگومان نەء. چونکە ڕەوایەتی، وەك دوكتور نەبەز ئەڵێ، لەوەوە دێ کە هەر حیزبەو بەرژەوەندییەکی جیاوازی هەبێ لەبەرژەوەندیی حیزبەکانی تر. دەی ئاخۆ ئەبێ بەرژەوەندیی جیاوازی چواردە حیزبی کوردی لەبەشێکی بچووکی وەك ڕۆژئاوای کوردستانی پاڵ سووریە چیبێ! ؟ هەروەها حیزبە زۆرو زەبەندە کوردییەکانی تری باکورو باشوورو ڕۆژهەڵات؟

ڕۆژنامەنووسی شارەزاو بەناوبانگی عەرەب حوسنی مەحلی لەژمارەی ڕۆژی ۱۸/۲/۲۰۰۲ی ڕۆژنامەی (تایم)ی سلێمانی دا ئەڵێ: (دووبەرەکیی نێوان کوردو کورد لایەکی گرنگی مەسەلەکەیە، لەهەولێرو سلێمانی یەکەمین پرسیار لەسەرکردەکانم پرسی، ئەوە بوو چەند حیزبتان هەیە؟ بەداخەوە ڕاستە ئەزموونێکی دیموکراتییە، بەڵام ئێمە ئەزانین کە خیلافێکی قووڵ لەنێوان هەموو حیزبەکاندا هەیە لەکوردستان، ئەمەش کێشەیەکی گەورەیە، تەنها کێشەی کوردی عێراق نیە، لەسووریە چواردە حیزبی کوردی هەیە، لەتورکیا چەندین ڕێکخراوی جیاواز هەیە، هەروەها لەئێران، داوا لەبرا کوردەکانم ئەکەم چاوێك بخشێنن بەمەسەلەکانداو سوودێك لەئەزموونەکانی ڕابوردوو ببینن، هەموویان هەڵەیان کرد، نامەوێ بڵێم فلانە حیزب هەڵەی کرد. خۆیان دەزانن، من بۆ مێژوو ئەڵێم: سەرکرایەتییە سیاسییەکان هەڵەی زۆریان کرد، کاتی ئەوە هاتووە جارێکی دیکە تاووتوێی هەموو سیاسەتەکانیان بکەن).

بێینەوە سەر کرۆکی مەبەستەکەمان کە مەسەلەی (بەرژەوەندیی)یە، بێگومان بەرژەوەندی گەلێ جۆری هەیە، بەرژەوەندیی گشتیو بەرژەوەندیی تایبەت، بەرژەوەندیی گەورەو بچووك. بەرژەوەندیی نەتەوەو بەرژەوەندیی چینەکان، هی کۆمەڵو هی تاکە کەسو.. هتد، بەڵگە نەویستشە هیچ کام لەو بەرژەوەندییانە بەنەولوەتی دابین نابێ، نە بۆ گشتو نە بۆ تایبەتو نە هی گەورەو نە هی بچووكو نە هی کۆمەڵو نە هی تاکە کەسو نە هی چینەکانو نە هی ئاینو ئاینزاکانیش لەنیشتمانێکی داگیرکراوداو بۆ نەتەوەیەکی ژێر دەست، لەبەر ئەوە بوونی فرە حیزبی هیچ ڕەوایەتییەکی نیە تا نیشتمان ڕزگاری نەبێ لەداگیرکردنو تا نەتەوە سەربەخۆیی بەدەست نەهێنێت، وتەی (چەپکە گوڵ)یش هیچ کاریگەرێتییەکی نابێ ئەگەر پشتوێنێکی گونجاو بۆ ئەو چەپکە گوڵە نەبەستێتەوە بەیەکەوە.

ئەمڕۆ ئەو فرە ڕێکخراوە سیاسیانەی لەکوردستاندا هەن، بەهیچ جۆرێك نوێنەرایەتی فرە بەرژەوەندی ناکەن، یان بەواتایەکی تر، ئەتوانین بڵێین: ئەوە ئاسنی سارد کوتانەو هیچی لێ نایەتە بەرهەم، ئەو ڕێکخراوە سیاسیانەی خۆیان بەنوێنەرو خۆیان بەپارێزگاری چینێك، یا ئاینێك، یا ئاینزایەك، یا ڕەگەزێك، یا بەشێك لەکۆمەڵگەی کوردستان ئەزانن یا ئەدەنە قەڵەم، چیان پێ ئەکرێ لەئاستی فەرمانی لێپرسراوێکی ئیداری یا سەربازیی یەکێك لەرژێمەکانی ئەنکەرەو تارانو بەغدادو دیمەشق دا؟

چۆن ئەتوانن ئەو بەرژەوەندییانە بپارێزن؟ بۆ نمونە: حیزبێك کە پاشگری (دیموکراتی) نابێ بەخۆیەوە لەقامیشلیەدا، چۆن ئەتوانێ سیستمی دیموکراتی لەڕۆژئاوای کوردستاندا بچەسپێنێ لەکاتێکدا ڕژێمی دیمەشق ڕژێمێکی نادیموکراتی بێ؟ حیزبێکی ئاینی لەدیار بەکردا چۆن ئەتوانێ ئەو ئاینە بکاتە فەرمانڕەوا لەباکوور لەکاتێکدا ڕژێمی ئەنکەرە عیلمانی بێ؟

ئایا حیزبێکی کۆمۆنیستی یا سوشیالیستی لەسنەدا، ئەتوانێ سیستەمی کۆمۆنیستی یا سوشیالیستی لەرۆژهەلاتدا ئەنجام بدات ئەگەرچی هەموو خەلکی رۆژهەلاتی کوردستانیشی لەگەلدا بێ لەکاتێکدا رژێمی تاران رژێمی ئاخوندەکان بێ؟ لەباشووری کوردستاندا حیزبە کوردییەکان چینگیان نابووە خوێنی یەکترییەوە، گوایە هەر یەکەو بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی خۆی، لەکاتێکدا رژێمی بەغداد هەموویانی پێکەوە ئەنفالو کیمیا باران ئەکرد، ئینجا کوێرەوەرییە زلەکەش لەوەدایە، بۆ هەر کام لەو بەناو بەرژەوەندییانە، چەندین حیزبو رێکخراوی سیاسی هەبێ، چەندین حیزبی دیموکراتی، نەتەوەیی، ئاینی، رەگەزی، ئاینزانی (مزهبی)، هەروەها چەندین جۆر رێکخراوی قوتابیان، ئافرەتان، ژنان، لاوان، کرێکاران، جوتیاران!!

ئەوانە هەر هەموویان وەك دەوەن بەئاش بکەن، یا شوێن کلاوی بابردوو کەوتبن، یا ئاسنی سارد بکوتن وایە، هەتا کوردستان رزگارو سەربەخۆ نەبێ.

بۆیە ئەتوانین بلێین هیچ کام لەو رێکخستنانە رەوایەتییەکیان نیە یا نابێ تا قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆو ئارام گرتوومان نەبێ.

ئەوە وا.. لەلایەکی تریشەوە، بمانەوێ یا نەمانەوێ، چاك بێ یاخراپ، ئەمڕۆ لەکوردستاندا حیزبێکی زۆر هەیە، لەوەش ناچێ هیچ کامیان بەدڵی خۆی بلێ ترشە! یا لەگەڵ حیزبایەتی بێتە خوارێ، بۆیە چارەسەرێکی مام ناوەندی ئەوەیە، ئەو حیزبانە، لەژێر چەترێکدا کۆببنەوە، بەرەی کوردستانی کە لەپێش راپەڕیندا چەترێکی لەو جۆرە بوو، ئەمڕۆ ئەو چەترە گونجاوە نابێ، بەتایبەتی لەباشووری کوردستاندا، چونکە بەرەی کوردستانی چەترێك بوو تەنیا بۆ حیزبەکان، ئەمڕۆ لەباشووری ئازادا، مەوداکە فراوان بووە، جگە لەحیزبەکان، چەندین رێکخراوو کۆڕو کۆمەڵو لیژنەو کۆمیتەی سیاسی تر هەن، خەلکی سیاسیی بێلایەنیش هەیە، نەتەوەییەکانیش، دوای هەلبژاردنی کاژێكو تێکەلبوونی پاسۆك لەگەڵ (پ.د.ك) دا، بەتاكو بەکۆمەڵ، لێرەو لەوێ هەن، ئەوانە هەمووی پێویستییان بەچەترێکی فراوانتر هەیە وەك لەچەتری بەرەی کوردستانی بەتایبەتی ئەرکەکەش زیاترو فراوانتر بووە، بەرەی کوردستانی تەنیا لەنێوانی حیزبە شۆڕشگێڕەکانی شاخدا بوو بۆ بەرەو رووبوونەوەی رژێمی بەغدادو هێرشەکانی بەیەکگرتوویی، ئەمڕۆ ئەرکەکە لەوە زیاترە، دیاریکردنی ستراتیجی نەتەوەی کوردو پەیوەندیی نێوان پارچەکانی کوردستانو پاراستنی ئاسایش نەتەوەو زمانێکی کوردیی ئەدەبیو زانستیی یەکگرتوو و پێکهێنانی لووبیەکی کوردی لەدەرەوەی ولاتو گەلێ کاری تری چۆتە سەر، ئەوانەش پێکەوە لەژێر چەتری کۆنگرەیەکی هەمیشەییدا ئەنجام ئەدرێن. ئیتر با بەسبێ خۆبادان بەدەرە پارتایەتییەوە، ئەوە تێگەیشتنێکی هەڵەیە.

گۆڤاری ئاینده، ژماره: ۳۱ ل۵۸-۷۳ سالی ۲۰۰۲

# نەتەوایەتی

## لەسیاسەتەوە بۆ ئەدەب

گفتوگۆیەك لەگەڵ (كامل ژیر) دا

ئا/ عەتا قەرەداغی

كامیل ژیر:

- هەر هەستیارێك ئەگەر بەهرەمەندبێ و هەڵبەستەكانی زادەی بیری خۆبێ، ئەوە خاوەنی دەنگی تایبەتی خۆی ئەبێ.

- پێویستە هەستیار خۆی بدۆزێتەوە لەبوارێكدا كە زیاترین دەسەڵاتی هەبێ تیایدا.

- مـن وەك هەستیارێكی نەتەوەیی، چارەسەری كێشەكان، لەرزگاری و دامەزراندنی دەوڵەتێكی كوردیی سەربەخۆ بۆ سەرتاسەری كوردستان ئەبینم.

- كوردایەتی و هەموو نەتەوایەتی لەگەڵ، قۆناغێك نیە لەمێژوودا، بەڵكو راستیەكی هەمیشە زیندوو و هەمیشە ئاوەڵی مرۆڤایەتیە.

- خۆشەویستی كوردستان و كوردایەتی، تەنیا سۆز (عاتیفە)ی رووت نیە، بەڵكو بەرهەنجامی فەلسەفەی كۆران و پێویستیی ژیانی كوردیشە.

- سەرەكیترین هۆ بۆ گەشەنەكردنی ئەو ئاراستە نەتەوەییانە، خۆشنەكردنی زەمینەی لەباربوو بۆ پارتێكی لەو جۆرە (كاژێك) بەر لەدروستبوونی.

- هەستی نەتەوەیی، بەهێزترین كۆڵەكەی راگری بوون و مان و ئایندەمانە.

- بەهێزترین بنەمای كلتوری نەتەوەییمان، هەستی هاوبەشمانە بەوەی ئێمە كوردین و نەتەوەیەكی جیاوازین لەنەوەكانی تری جیهان.

- ئەم گرنگیدانەی مەحوی بەزمانی كوردی، بەڵكو ئەم شەڕكردنەی مەحوی لەسەر زمانی كوردی، كوردایەتیە.

- رێبازی نەقشبەندی، رێبازێك بوو كە ژمارەیەك لەبیریارانی كورد ویستیان وەك هەڵێك بیقۆزنەوە بۆ هەمان ئەو مەبەستەی فارس و تورك، بەشیعەیەتی و خەلافەت خۆیان پاراست، بەلام بەداخەوە هەڵێكی درەنگكاتبوو.

- نوسەرێك لەنێوان نوسینەكانیەوە، ئەوە دەركەوێ كە خۆی بەكورد ئەزانێ و بۆ خزمەتی لایەنێك لەلایەنەكانی نەتەوەی كورد ئەنوسێت، ئەوە بەهەر زمانێك بنوسێت، هەر مڵكی كوردە.

- بەشارو لوتفی و بەرەکات موڵکی کوردن، چونکە خۆیان بەکورد ئەزانن، ئەو نوسینانەشیان کە تەرخانن بۆ کورد، موڵکی کوردن.

**عەتا قەرەداغی:**

**مامۆستا کامیل ژیر یەکێکە لەو قەڵەمە دیارانەی کە ماوەی چل ساڵە لەخزمەتی ئەدەب و کولتووری نەتەوەیی کورددا بەردەوامە، چ وەکو شاعیرێکی نەتەوەیی نەوەی دوای گۆران، چ وەک نوسەرێک لەبواری نوسینی نەتەوەیی و گفتوگۆکردنی بیروباوەڕی نەتەوەییدا جێگای دیاری هەیە، بۆ ڕێزنان لەئەزموونی ئەم نوسەرە بەهەڵوێست و دڵسۆزەی میللەتەکەمان، پێمان خۆشبوو ئەم گفتوگۆیەی لەگەڵدا سازبکەین و خوێنەرانی خۆشەویستی گۆڤاری ئایندەش زیاتر بەبۆچوونەکانی ئاشنابن.**

**• لەکوێوە دەستتان پێکرد؟ لەشیعرەوە یان لەسیاسەتەوە؟ یا هەردووکیان پێکەوە؟**

– لەسیاسەتەوە، هێشتا تەمەنم چواردە ساڵ بوو، واتا ساڵی ١٩٤٨ بوومە لایەنگری حیزبی تەرر (حیزبی شیوعی عێراقی ئەوسا)، ئەم لایەنگرییەم بەهۆی مامەکانمەوەبوو، بەتایبەتی سەی ئەها کە ئەوسا وتاربێژی ئەو حیزبەبوو، براکانی تریشی، بێجگە لە أ. ب. هەوری، ئەوانیش لەئەندامە چالاکەکانی ئەو حیزبە بوون، لایەنگرییەکەشم زیاتر چاولێکەری بوو، واتا بێ ئەوەی شتێکی ئەوتۆ لەبارەی بیروباوەڕی شیوعیتییەوە بزانم.

لەبارەی هەڵبەست و نوسینەوە.. یەکەم هەڵبەستم لەرۆژنامەی ژیندا بڵاوکردەوە کە ئەوسا مامۆستا گۆران سەرپەرشتیاری بوو. ساڵی ١٩٥٤ بوو، خۆم هەڵبەستەکەم بۆ برد، کە خوێندییەوە، زۆر ڕێزی لێگرتم و هانی دام کە بەردەوام بم. دوای ئەو هەڵبەستە ژمارەیەک چیرۆک و نوسینم هەر لەژیندا بڵاوکردەوە.

**• ئێوە نەوەیەك بوون لەدوای گۆران.. ئایا چی ئێوە لەنەوەی گۆران جیادەکاتەوە؟ بەڕای جەنابتان کام لەنەوەی دوای گۆران توانیویەتی ببێتە خاوەنی دەنگی تایبەتی خۆی؟**

– وەك وتم هێشتا گۆران مابوو کە من بەوێژە ئاشنابووم، بوویشین بەبرادەر، ئەگەرچی ئەو بەتەمەن لەمن زۆر گەورەتر بو، لەبەر ئەوە من ئەوەی سەردەمێکی گۆران و نەوەی دوای ئەو سەردەمەش بووم و هەم. بۆیە جیاکەرەوەیەکی ئەوتۆ نابینم مەگەر لەڕووی بیروباوەڕی سیاسیمانەوە. کە من لەساڵی (١٩٥٨)ەوە وازم لەحیزبی شیوعی هێناو ڕێبازی کوردایەتیم گرتە بەر، ئنجا بوون بەخاوەنی دەنگی تایبەتی.. ئەوە لەڕووی هەڵبەستەوە، بەندە بەهەستیار خۆیەوە، هەر هەستیارێك ئەگەر بەهرەمەندبێ و هەڵبەستەکانی زادەی بیری خۆی بن، ئەوە خاوەنی دەنگی تایبەتی خۆی ئەبێ. بەڵام ئەگەر هەستیارێك هەر خەریکی چاولێکەری و وەرگرتن بێ لەمولەوەوە، ئەوە نابێتە دەنگی تایبەتی خۆی، مەگەر مۆرکی تایبەتیی خۆیانی لێدەن.

**• ڕاتان چیە لەسەر ئەوەی کە هەندێ کەس پێیان وایە لەدوای گۆران دەنگێکی شیعری ئەوتۆ دروست نەبووە کە لەگەڵ ئەودا بەراورد بکرێت؟**

– ئەو بەراوردە، هەر خۆی لەخۆیدا هەڵەیە، چونکە وەك وتم هەر هەستیارێ خاوەنی دەنگی تایبەتی خۆیەتی، واتا جیاوازە لەهەستیارێکی تر، تۆ ناتوانی سێوێك و پرتەقاڵێك و هەنارێك و هەرمێیەك بەراورد بکەی لەگەڵ یەکتریاندا، چونکە هەریەکەو تایبەتمەندێتی خۆی هەیەو هەریەکەشیان جۆرە کاریگەرێتییەکی لەسەر بخۆرەکەی هەیە. هەستیاریش هەروایە. لەبەر ئەوە گۆران، نە لەگەڵ هەستیارەکانی پێش خۆی، نە ئەوانەی سەردەمی خۆی، نە لەگەڵ هەستیارانی دوای خۆشیدا بەراورد ئەکرێ. ئنجا هەر هەستیارەو جەماوەری تایبەتیی خۆی هەیە وەك چۆن هەر دەنگخۆش و گۆرانیبێژێك جەماوەری تایبەتی خۆی هەیە، بەلام ئەم قسانە هیچیان ئەوە ناگەیەنن کە هەستیاری چاك و چاکترو چاکترین نیە، بەلای منەوە گۆران لەهەستیارە چاکترینەکانە. پێش گۆران و لەسەردەمی گۆرانیشدا نالی و خانی و مەولەوی و مەحوی و پیرەمێردو هەردی لەهەستیارە چاکترینەکانن، بەلام دیسان هەر ناتوانین بەراوردیان بکەین لەگەڵ یەکدا. ئنجا ئەمانە بۆچی ئەبێ لەهەستیارە چاکترینەکان بن بەرای من؟ چونکە بەهرەی هەستیارێتییەکەیان زۆرە، ئاستی رۆشنبیرییان لەزانستی هەڵبەستدا بەرزە، وردبوونەوەیان لەهەڵبەستیتر زۆرە، لەوەئەچێ کە بەچاکی بەهەڵبەستەکانیاندا چووبنەوەو پۆشتەو پەرداخیان کردبێ ئنجا دەریانخستبێ کە ئەوانە مەرجەکانی هەستیاری چاکترینن بەتایبەتی مەرجی یەکەم کە بەهرە زۆرەکەیە، بەرای من مەرجێکی تریش گرنگە، ئەویش ئەوەیە پێویستە هەستیار خۆی بدۆزێتەوە لەبوارێکدا کە زیاترین دەسەلاتی هەبێ تیایدا، بۆ نمونە: گۆران تەنیا لەهەڵبەستی وەسفدا لەهەستیارە چاکترینەکانە.

**• کامەران گرنگییەکی زۆری پێدرا.. ئایا ئەو گرنگییپێدانە هەوڵی پارتی نەبوو بۆ ئەوەی کامەران لەبەرامبەر گۆراندا بەرز بکەنەوە لەکاتێکدا گۆران لەسەر شیوعیەکان حساب دەکرا؟**

– دوورنیە، هەمان قسە بەرامبەر گۆرانیش هەروایە، گۆرانیش شیوعیەکان گرنگییەکی زۆریان پێداو هۆکارێك بوون بۆ ئەوەی بەزوویی بەکوردو بەجیهانیشی بناسێنن، بەلام گۆران بەوە سەرکەوتنی بەدەست هێنا کە خۆشی هەستیارێکی بەرزو بەهرەکەشی لەهی کامەران زۆر زیاتر بو.

**• جەنابت وەکو شاعیرو رۆشنبیرێك کە لەباڵی نەتەوەیی بوویت.. ئایا تا چەندێ شیعری کوردی قۆناغەکەی ئێوە دەربڕی ئازارو لەهەمانکاتدا خواست و ویستە نەتەوەییەکانی کورد بووە؟**

– من ئێستاش هەر نەتەوەییم، قۆناغەکەشم بەسەرنەچووە، پێنووسەکەشم هەمیشە لەکاردایە لەبواری نەتەوایەتیدا، خاڵێك کە شایەنی روونکردنەوە بێ لەوەلامی پرسیارێکی ئاوادا، ئەوەیە کە هەڵبەستی کوردی، لەبواری نەتەوایەتیدا، دوو قۆناغی بەخۆیەوە دیوە، تائێستا، قۆناغی یەکەم قۆناغی پێش قوتابخانەی بیری نەتەوەییە لەکوردستاندا، بەر لەم قوتابخانەیە، کوردایەتی نەخرابووە چوارچێوەیەکی فکریی رێکخراوەوە. سەرەتای ئەم قوتابخانەیە لەدروستبوونی کۆمەڵەی ئازادی و ژیانەوەو یەکێتی کورد (کاژێك)ەوە دەستپێئەکا، واتا ١٩٥٩/٤/١٤ بەر لەم قوتابخانەیە، هەستیارانی کورد، وەك سۆزێك کوردایەتیان پیادەئەکرد، واتا نەچوبوونە ناو قولایی کێشە نەتەوەییەکەمانەوەو لەرەگو ریشەوە پیا بچنەوەو لەبیروباوەڕە نامۆکان بەکوردایەتی جیای بکەنەوەو بەوردی بەشوێن رێگە چارەکاندا بگەڕێن و ئاماتجە دوورەکانی وەك ستراتیجێك دیار بکەن و خاڵ بخەنە سەر پیتەکانی

دۆست و دوژمنو هەوڵێکی بەکۆمەڵ بدەن بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئامانجەکانی کوردایەتی، تۆ بڕوانە ئەم هەڵبەستە:

| | |
|---|---|
| هورمزگان رمان ئاتران کژان | ویشان شاردەوە گەورەی گەورەکان |
| زۆرکار ئارەب کردنە خاپوور | گنای پاڵەیی هەتا شارەزوور |
| شن و کنیکان وەدیل بشینا | میرد ئازا تلی وەرووی هوینا |
| رەوشت زەردشترە مانوە بێ کەس | بزیکا نەکا هورمز وە هیچ کەس[1] |

واتا:

| | |
|---|---|
| مزگەوتان رمان، ئاگران کوژان | خۆیان شاردەوە گەورەی گەورەکان |
| زۆردارێ عەرەب کردنی خاپوور | دێی کرێکاران هەتا شارەزوور |
| ژنان و کچان بەدیل ئەگیران | پیاوانی ئازا لەخوێنا ئەتلان |
| رەوشتی زەردەشت مایەوە بێ کەس | یەزدان بەزەیی نەهات بەهیچ کەس |

ئەمە هەڵبەستی هەستیارێکی کوردە، ناوەکەی نازانرێ*، لەسەر پارچە چەرمێك دۆزراوەتەوە لەیەکێك لەئەشکەوتەکانی جێشانەو هەزارمێردی سلێمانی، هی رۆژانی داگیرکردنی کوردستانە، لەلایەن عەرەبەوە بەناوی فتوحاتی ئیسلامیەوە، ئەبینین هەڵبەستەکە بریتیە لەتەنیا دەربڕینی سۆزێکی رووت و هیچیتر بەرامبەر کارەساتێکی زۆر گەورەی پڕ لەزۆرو ستەمی داگیرکردنی نەتەوەو نیشتمانێك لەلایەن نەتەوەیەکی ترەوە. هەڵبەستەکە دەربڕی ئازارەکەی ئەو کارەساتەیە. بەڵام دەربڕی هیچ خواست و ویستێکی نەتەوەیی کورد نەبووە لەو رۆژەدا وەك مەبەستی پرسیارەکەی بەڕێزتان، یان بەدەربڕینێکیتر هەستیارەکە نەیزانیوە چارەسەری ئەو کێشەیە بەچی ئەکرێ کە لەو رۆژەدا رووی کردۆتە نەتەوەکەی.

ئەوە نمونەی هەڵبەستێکی کۆن، با نمونەی هەڵبەستێکی تازەش هەر لەو بوارەدا، هەڵبەستێکی گۆران بێ، کە وەك وتمان یەکێکە لەباشترین هەستیارانی کورد، ئەویش هەڵبەستی (شەهید)ە، کە بەبۆنەیەکی وەك بۆنەی ئەو هەڵبەستەی سەرەوە وتراوە کە شەڕی بەردەرکی سەرای شەشی ئەیلول (١٩٣٠)ە لەسلێمانی کە ئەمیش هەر لەلایەن زۆردارانی عەرەبەوە ئەنجام دراوە بەرامبەر نەتەوەی کوردو کوردستانی داگیرکراومان، ئەبینین ئەم هەڵبەستەش هەر تەنیا وەك سۆزێك دەربڕی ئازارەکەی

---

[1] عەلائەدین سوجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی دی.ل (١٣٠).

* هاوڕێ باخەوان (لەئاڵای کوردا ـ ل ٢٦ـ چاپی دەزگای سەردەم ــ ٢٠٠١) پێی وایە هەڵبەستی پیرشالیاری زەردەشتییە، بەلای هەندێکی ترەوە، هەڵبەستێکی دروستکراوەو بوونی نەبووە! من پشتگیری ئەم رایەی دولیی ناکەم، چونکە سەرچاوە مێژووییە رەسەنەکانیش، هەمان مەرگەسات ئەگێڕنەوە ــ ژێر.

ئەو کارەساتەیە بێنەوەی خواستو ویستێکی نەتەوەیی پیشان بدات کە چارەسەری تەواوی کێشەی کوردمانی پێبکرێ:

شەقەی شەستیرو قرچەی دەستڕێژو هەڵمەتی سونگی
بەخوێنی وردی بێ تاوان شەپۆل خستە سەر جادە
ئەما جوانێ کە سونگی ئەیسمێ سەد کەرەت سنگی
ئەما پێرێ لەریزی گوللە بووبێ قەلبی ئازادە

تەنیا چارەسەرییەك کە گۆران بۆی چووە، سەندنەوەی تۆڵەیەکی ئەو کارەساتەیە:

ئەگەر خوای گەورە بەخشی پێت هەتیوێ پێی بڵێ رۆڵە
لەمن فرمێسکی ویست باوکت، لەتۆش داوا ئەکا تۆڵە[٢]

کە لەراستیدا چارەسەری ئەو رووداوانە تەنیا بەسەندنەوەی تۆڵەیەك ناکرێ، واتا ئەوان چەندیان لێکوشتووین ئێمەش ئەوەندەیان لێبکوژینەوە. بۆیە من لەهەڵبەستێکمدا کە بۆ هەمان بۆنەی شەری بەردەرکی سەرا وتوومە، بەم جۆرە بۆ چارەسەری کێشەکە چووم:

ئەی شارەکەی عەولە سیسە
بەڵێن بێ ئەو دەستە پیسە
کە هەروا بەدەستی ئانقەست
جۆگەلەی خویناوی هەڵبەست
ئەبێ ئێمەی دلسۆزی تۆ
ئێمەی کوردی ئەوەی ئەمرۆ
بۆ تۆڵەی خوێنی رژاوات
کوردستانی زەوت کراوت
پشتێنی تۆڵە ببەستین
ئەیکەینەوەو رانەوەستین
تا تێکڕا ئەم خاکە پاکە
خاکی ئەم کوردە چالاکە
ئەخەین بەدیار، یەك تەنوێ
بەدەوڵەتێکی سەربەخۆ[٣]

واتا من وەك هەستیارێکی نەتەوەیی چارەسەری ئەو جۆرە کێشانە لەرزگاری‌و دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ بۆ سەرتاسەری کوردستان ئەبینم. نمونەی تریش زۆرە، بەلام وابزانم ئەوە بەسە بۆ وەلامی پرسیارەکەی بەرێزتان کە تا چەندێ هەڵبەستی ئێمە دەربڕی ئازارو

[٢] دیوانی گۆران، ل ٢٦٦.

[٣] دیوانی هەڵبەستەکانی ژیر، چاپی یەکەم ـ سوید ـ ستۆکهۆڵم، ل٤٧.

پێشبینیەکی ترمان لەو نامیلکەیەدا: کاریگەرێتی رەخساندنی هەلی چونیەکە لەبەردەم هەموو ئەندامێکی کۆمەڵگەی کوردستانیدا، ئەوەش بەئازادیو بەئابووری ئازاد ئەبێ، دوور لەچەوساندنەوەی چینایەتیو چەوساندنەوەی پارتایەتیو هی حکومەتی، ئەمە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە کە رۆژ لەدوای رۆژ پەیرەوکەرانی زیاتر ئەبێو سەرکەوتنی دیارو بەرچاو بەدەست ئەخات. شیکردنەوەو لەسەر رۆیشتنی ئەم دیدوبۆچوونە زۆری ئەوێ کە لێرەدا ئەو ماوەیەمان نیەو بۆ هەلێکیتر.

**• جەنابتان وەکو سیاسەت لەکاژیکو پاشانیش لەپاسۆکدا شوێنی دیارتان هەبوو.. ئایا گەشەنەکردنی ئەو ئاراستە نەتەوەییە بۆچی دەگێرنەوە؟ لەکاتێکدا ئەو پارتانەی کە وەکو ئەو ئاراستەیە نەتەوەیی نەبوون بەشێوەیەکی بەربلاو لەرووی چەندایەتییەوە گەشەیان کردووە؟**

— دیارە بەڕێزتان ئەزانن کاژیکو پاسۆک، دوو رێکخراوی سیاسی بوون، وەک دوو پارتی، لەسەر بنچینەی بیروئایدیای نەتەوەییانەی کوردی دامەزران. سەرەکیترین هۆ بۆ گەشەنەکردنی ئەو ئاراستە نەتەوەییانەیە، خۆشنەکردنی زەمینەی لەبار بوو بۆ پارتێکی لەو جۆرە بەر لەدروستبوونی.

ئەوەی لەرووی کردەییەوە پیادەکرابێ، ئەوەیە رێکخراوێکی لەو جۆرە، سیاسی، یا ئاینی، لەپێشدا زەمینە هزرییەکەی بۆ ئامادەکراوە، واتا بیروباوەڕەکە بەخەڵکی ناسراوەو لایەنگرانی بۆ پەیداکراوە، یا بڵێین باوەڕیان پێهێناوە، ئەوسا، رێکخستنی بۆ کراوە لەشێوەی پارتییەکدا، یا لەشێوەی شۆڕشێکدا، یا فەرمانڕەوایەتییەکدا، بۆ نمونە: ئاینەکان لەپێشدا بەکتێبە پیرۆزەکانیان وەک ئاوێستا، تەورات، ئنجیل، قورئان بەخەڵکی ئاشنابوون. دوای ئەوەی ژمارەیەک لایەنگری گونجاویان لێکۆبوونەوە، ئەوسا چوونە قاڵبی رێکخستنەوەو دەسەڵاتیان بۆ دروستبو، هەروەها بەر لەپێکهێنانی حیزبە شیوعیەکان، بیریارەکانی وەک مارکسو ئینگلس بیرۆکەکانیان خستە سەر کاغەزو خەڵکیان پێناشناکرد، ئەوسا حیزبە شیوعیەکان دروست بوون، لەئەڵمانیاش بەر لەرێکخستنێکی نەتەوەییانە، بیریارەکانی وەک فیختەو هیگڵو هێردەرو نوفالیسو مویلەرو تریتشکەو نیتشە، بەنووسینە نەتەوەییانەکانیان زەمینەیان بۆ رێکخستنێکی نەتەوەییو دوایی بۆ دەوڵەتێکی نەتەوەیی رەخساند، بەڵێنی بلفۆریش دەیان ساڵ پێش دروستبوونی دەوڵەتی ئیسرائیل بو، بەڵام کاژیکو پاسۆک پێش زەمینەخۆشکردنێکی لەو جۆرانە بۆ بیروباوەڕی نەتەوەییانەی کوردی، هاتنە ئاراوە. لەبەر ئەوە وەک پێویست خەڵکیان لێکۆنەبووەوە، کە شۆڕشی چەکدارانەش بەرپابوو، بەتایبەتی بەڕابەرایەتی بارزانی، ئیتر نوسراوە بیرمەندییەکانی کاژیکو پاسۆک، لەلایەن جەماوەری گەلەوە، لایان لێنەئەکرایەوە، بیروباوەڕەکەش زۆر ترسناک بوو، خەڵکی لەسەر داواکردنی مافێکی وەک رۆشنبیری ئەگیرانو ئەکوژران، چاوەی لەوەی دلوای جیابوونەوەو سەربەخۆییو یەکگرتنەوەی پارچەکانی کوردستانی ئەکرد. لەبەر ئەوە خەڵکی نەیانئەوێرا تێکەڵ بەو دوو پارتییە ببن ئەگەرچی باوەڕیان بەبیروباوەڕەکانیشیان ببولیە، گوشاری شیوعیو یەکێتیو پارتیشیان لەسەربوو، هیچ پاڵپشتێکی دەرەکیو ناوەکیشیان نەبوو، جگە لەوانە هەندێ هۆی خۆیی (زاتی)ش هەبوو کە لێرەدا ناوترێ.

هەموو ئەوانە بوونە هۆی گەشەنەکردنی کاژیکو پاسۆک وەک دوو رێکخراویی سیاسی. ئەوەبوو کاژیک خۆی هەڵپساردو پاسۆکیش تێکەڵ بەهەندێ حیزبیتر بوو.

بەلام بیروباوەڕەکەیان هەر ماوەو ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش لایەنگرانی زیاتر ئەبێ‌و کازیك‌و یا پاسـۆکێکی تر دروست ئەبێتەوە ئەگەرچی بەناوێکی تریشەوە بێ.

**• ئایا ڕەگەزەکانی گوتار (خطاب)ی نەتەوەیی کوردی لەکام شاعیرەوە بەئاشکرا دەستپێدەکات؟**

—ئەوە زیاتر کاری ڕەخنەسازانە، من ئەوەندە لەهەڵبەستی هەستیاران ئەکۆڵمەوە.

**• ئایا دەکرێت ئێمە هەر لەسنوری شیعردا بۆ بنەماکانی نەتەوەییمان بگەڕێین؟ ئایا هەست ناکەیت ئێمە جگە لەشیعر بنەمای بەهێزتری کەلتوریشمان هەیە کە دەشـێ بکرێنـە سەرچاوەی ڕابوونـەوە (نهضة)ی نەتەوایەتیمان؟**

—بێگومـان.. بـەهێزترین بنـەمای کـەلتوری نەتـەوەییمان (هەسـتی هاویـەش) مانـە بـەوەی ئێمـە نەتەوەیکی جیاوازین لەنەتەوەکانی تری جیهان، ئەو هەستە (هەستی نەتەوەیی) بـەهێزترین کۆڵەکـەی ڕاگری بوون‌و مان‌و ئایندەمانە. کۆڵەکەی دووەم زمانی کوردیمانە، بۆیە پێویستە گرنگیی زۆر بـەو دوو کۆڵەکەیە بدرێت، واتا گەشە بەهەستەکە بدرێت بـەرەو هوشیاری. کورد هەسـتی نەتـەوەیی بـەهێزە. بـەلام هوشـیاریی نەتـەوەیی لاوازە، کـورد ئـەزانێ خـۆی بپـارێزێ، بـەلام نازانـێ چـۆن پێشـکەوتن‌و سـەرکەوتن‌و گەشـەکردن بەدەسـتبێنێ، هـۆی ئـەوەش ئەگەڕێتـەوە بـۆ نزمیـی ئاسـتی هوشـیاریی نەتەوەییمان.

جگـە لەهەسـت‌و زمانەکـە.. نیـشتمانەکەمان، قـەوارە فەرمانڕەواییـەکانی وەك دەوڵـەتی مـادو میرنـشینەکانمان، شۆڕشـەکانمان، ڕاپەڕینـەکانمان، نەرێتـەکانمان.. ئەوانـە هـەمووی بنـەمای بـەهێزی کەلتوری نەتەوەییمانن کە ئەکری بکرێنە سەرچاوەی ڕابوونەوە بۆ ئاینـدەی شـکۆداری نەتەوەکـەمان. بێگومان بنەمای تریش هەن بۆ ئەو مەبەستە. بـەلام ئەوانـە سـەرکیەکانن لـەپاڵ هەڵبەسـت‌و چیرۆك‌و لاوك‌و داستان‌و پەندی پێشینان‌و تێکڕای مێژوومان.

**• ئێوە پێتانوایە مەحوی شـاعیرێکی نەتەوەییـە ئایـا دەتوانین لـەناو شـیعرەکانی مـەحوی بەڵگـە بـۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە بدۆزینەوە؟**

— ئەی من تا ئێستا چیم کردووە؟! بۆ وەلامـی ئـەم پرسـیارە، داواکـارم بـەڕێزتان‌و خوێنـەرەوەی بەڕێزیش بگەڕێنەوە بۆ وتاری (مەحوی هەسـتیارێکی نەتـەوەیی بـووە) لاپـەڕە ١٢٤ تـا ١٦٥ لـەکتێبی (لەبارەی مەحودی لوتکەوە) چاپی یەکەم ١٩٨٦ چاپخانەی سۆمەر. هەروەها وتاری (مەحوی لەدیدی نەتەوەییانەوە) لاپەڕە ٢٤ تا ٣١ لەگۆڤاری ئایندە ١٨ شوباتی ٢٠٠١ کە مـن لـەو دوو وتـارەدا نزیکـەی چل لاپەڕەم لەسەر نەتەوەیی بوونی مەحوی نوسیوە. دیـارە لێرەدا مـەودای دووبارەکردنـەوەی نیـە، بەلام ئەوە ڕێ لەوە ناگرێ لێرەدا شارایەکی تر بخەمە سەر ئەو خەرمانە.

هەر لەم وەلامانەمدا، تۆزێ لەمـەوپێش وتم: (بـەهێزترین بنـەمای کـەلتوری نەتـەوەییمان، هەسـتی هاویەشمانە بەوەی ئێمە کوردین‌و نەتەوەیەکی جیاوازین لەنەتەوەکانی تـری جیهـان)، دیـارە مـەحوی هەستی بەم ڕاستییە کردووە بۆیە وتویەتی:

بنووسە، پیری دڵم ئەمری کرد، ئیطاعەم کرد
لەئیبتداوە کە بەیتی موناسیبی دیوان

گەدایەکی وەکو (مەحوی) قەلەندەرێکی کورد

میثالی پادشەهی فورسە، صاحیبی دیوان

لەوتارەکەی یەکەمدا (مەحوی هەستیارێکی نەتەوەیی بووە) وتوومە مەحوی خۆی بەگەدایەکی نەتەوەکەی زانیوە کە ئەمە یەکێکە لەسیفەتەکانی مەلگرانی بیروباوەڕی نەتەوەیی، چونکە مرۆڤی نەتەوەیی هەرچەند پایەی بەرزبێ، نابێ لووت بەرزبێ، بەڵکو پێویستە هەمیشە خاکی (متواضع) بێ لەگەڵ ئەندامانی خۆیدا، بۆیە مەحوی لەو هەڵبەستەیدا خۆی وەکو گەدایەکو قەلەندەرێکی کورد پیشانداوە، لەکاتێکدا کە ئەو کەسێتییەکی زۆر ناودارو پایەبەرزو زانا بووە، ئەوە لەکاتێکدا مەحوی خۆی لەپاشایەکی فورس بەکەمتر نەزانیوە، ئەمەش هەر هەستە نەتەوەییەکە ئەگەیەنێ کە مرۆڤی نەتەوەیی نابێ خۆی لەخەڵکی بێگانە بەکەمتر بزانێ ئەگەرچی ئەو بێگانەیە پاشایەکیش بێ، جا ئەوەی لێرەدا ئەمەوێ، زیاد لەوتەکانی ئەو وتارەم بیڵێم لەسەر ئەم هەڵبەستە، هەستە نەتەوەییەکەی مەحوییە بەوەی ئێمە نەتەوەیەکی جیاوازین لەگەڵ فارس دا. وشەی (دیوان)یش ئەشێ مەحوی بەدوو واتا بەکار هێنابێ: بەواتای دیوانی هەڵبەستو بەواتای دیوانی پاشایەتیش کە لەئەنجامدا ئەوە ئەگرێتەوە کوردیش ئەبێ خاوەنی دیوانی پاشایەتیی خۆی بێ.

جگە لەو هەستەو هەر لەم وەڵامانەمدا وتم: کۆڵەکەی دووەم وەك بنەمایەکی بەهێزی کەلتووری نەتەوەییمان، زمانی کوردیمانە، بۆیە پێویستە گرنگی پێبدرێ، دیارە مەحوی هەستی بەم راستییەش کردووە، بۆیە لەجێگەی (همزیەو بوردە)ی عەرەبی، هەڵبەستێکی کوردیی داناوە:

لەهمزیەو بوردەم چونکە کەم دی ئیستفادەی کورد

منیش ئەم کوردییەم دانا لەرێزی ئەو قەصیدانە

ئەم کارەی مەحوی جیاوازە لەکاری ئەو هەستیارانەی تر کە تەنیا بەکوردی هەڵبەستیان وتووە، یان وەك د. محەمەد عەزیز ئەڵێ: (بەپێویستی نازانم گەر یەکێکی وەك مەحوی کوردایەتی نەکردبێ هەر لەبەر ئەوەی هۆنراوەی بەکوردی داناوە، ئەورۆ دوای پتر لەسەدەیك لەتەمەنی ونژەیی خۆی، بەزۆر بەکوردایەتی بۆی بژمێرێ).[7] مەحوی زۆربەی هەڵبەستەکانی بەکوردی وتووە، من ئەوانەم بەکوردایەتی بۆ مەحوی ژمێرە نەکردووە، بەڵام ئەمەیانی بەکوردایەتی بۆ دائەنێم، چونکە هەستی کوردایەتییەکەی پاڵی پێوە ناوە کە لەجێگەی ئەو هەڵبەستە عەرەبییە، ئەم هەڵبەستە کوردییە دابنێ، ئنجا پێداگرتنی مەحوی لەسەر زمانی کوردی لەهەندێ هەڵبەستی تریدا، ئەوە سەلماندنی بیروبۆچوونەکەی ئێمەیە:

بدە ئیزن ئەم قەصیدەی کوردییەش بێتە مەقامی عەرض

ئەگەرچی وەك شوعورم شیعرەکانیشم پەرێشانە

یان کە ئەڵێ:

موکەڕەر بوو قەصیدەی بوردە ئەشئەی عالەمی پڕ کرد

(٧) ل ٥٤ گۆڤاری ئایندە ـ ژمارە ١٥ ت ٢ ی ٢٠٠٠.

بفەرموو بەم قەصیدەی کوردە نۆبەی نەشئە پێوانە

هەروەها:

کوردی زوبانی ئەسڵمە گەر تەرکی کەم بەکوڵ

بۆ فارسی، بەکوللی ئەمن دەبمە بێ وەفا

دیسان:

چەند گەوهەرێ لەجوهرە ضەم بەو لەئالییە

نەظمی بکەم بەکوردییەکی صرفی جوملەزان

هەم یادگاری ئەهلی کەماڵو ئەحیبەبێ

هەم رەهنوما بەوانە کەبێ عیلمن‌و نەزان

بڕوانن چۆن مەحوی ئەم گرنگی دانەی بەزمانی کوردی کردۆتـە ڕێنمـایی بـۆ ئەوانـەی بـێ زانسـت‌و نەزانن؟

بەڵێ ئەم گرنگی دانەی مەحوی بـەزمانی کـوردی، بـەڵکو ئـەم شـەڕکردنەی مـەحوی لەسـەر زمـانی کوردی، کوردایەتییە، کام لەهەستیارەکانی تری سەردەمی مەحوی ئەم گۆمی زمانی کوردییـەیان وەك مەحوی شڵەقاندووە؟ ئایا دوای مەحوی، بەڵکو لـەم سـەردەمەی ئێمەشـدا بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازی کوردی، چەندین شەهیدی نەبەخشیوە لەپێناوی ئەوەدا رادیۆیـەك، ڕۆژنامەیـەك، وانـەی قوتابخانەیـەك بەکوردی بێ؟

ئنجا مەحوی کە ئەڵێ:

ڕووی مەبینە تۆ لەکەریمی بەهانە جوو

هەرچی کە کوردە پاکی ببەخشی بەئەبولوەفا

ئەمە، وەك لەوتارەکەی ژمارە (١٥) ئایندەمدا وتوومە: مەحوی گەر پاڵپێوەنەری کوردایەتییەکـەی نەبوایەو هەر موسوڵمانێتی بکردایە، ئەیوت (هەرچی ئیـسلامە پـاکی ببەخـشێ) نـەك هـەرچـی کـوردە، بێگومان وشەی (هەرچی کوردە) هەموو کوردێك ئەگرێتەوە بەکوردی گاورو کوردی جوولەکەو کوردی ئێزی‌و زەردەشتی‌و کوردی دینداری بێ دینەوە.

جگە لەوانە، مەحوی کە بەراوردی خۆی‌و وڵاتـی بابـان ئـەکات، دوای تێکـچوونی میرنـشینی بابـان، ئەوە تەواو لەهەستی جۆشخواردوو و پیشخواردووی کوردایەتییەکەیەوەیەتی:

لەدەوری دڵمی کە دیی ئەم هەموو غەم‌و تەعەبە

دەروونی کەیلە لەزووخاوو دەردو تا بەلەبە

وتی: ببێ دڵە! وەك تۆ خەراب‌و شیفتە حاڵ

بەڵێ هەیە لەمن ئاشفتەتر: وڵاتی بەبە

ئەم هەڵبەستەی مەحوی، چەپی نەگەڕاوەتەوە لەو قسانەی خوالێخۆشبوو شـاکر فـەتاح کـە دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول کوتنی‌و بوونە هۆی شەهیدکردنی، مەحویش دوای هەرەسی میرنشینی بابـان ئەم هەڵبەستەی وتووە. ئەوە بۆ ئەو ڕۆژو بارودۆخە کەم نەبووە.

**• ئایا مەسەلەی تەسەوف و پەیوەستبوونی مەحوی بەڕێبازی نەقشبەندییەوەو خودی ئەو ڕێبازەش کە بەجۆرێك نزیکایەتی لەگەڵ ڕۆحی کوردایەتیدا هەیە.. دەشێ یارمەتی سەلماندنی نەتەوایەتی بوونی مەحوی بدات!**

– زۆر وایە، من لەچەند نوسینی پێشتری خۆمدا وتوومە: دوای شەپۆلی فتوحاتی عەرەبی – ئیسلامی کە کوردو فارس و تورك نەیانتوانی خۆیان لەبەریدا بگرن، فارس شیعەگەرێتی کردە قەڵغانی پاراستنی قەوارەی نەتەوایەتیی خۆی، تورکیش بەوەی خەلافەتی بردە ئەستەموڵ، نەك لەڕووی نەتەوایەتییەوە هەر بێ زیان بو لەو شەپۆلە، بەڵکو سوودمەندیش بو، بەوەی قەوارەی نەتەوەیی خۆی پێپاراست و گەلێ وڵاتی تریشی کردە ژێردەستەی خۆی، لەو بەینەدا تەنیا کوردەکە بەدەستی بەتاڵ مایەوەو لەڕووی نەتەوەییەوە سەرگەردان بوو وەك ئەیزانین، هۆی ئەوەش نەبوونی هوشیاریی نەتەوەیی بوو لەناو کوردا.

ڕێبازی نەقشبەندی، ڕێبازێك بوو کە ژمارەیەك لەبیریارانی کورد ویستیان وەك هەلێك بیقۆزنەوە بۆ هەمان ئەو مەبەستەی فارس و تورك. بەڵام بەداخەوە هەلێکی درەنگکات بوو، بێگومان ئەگەر کوردەکە هەمووی، یا زۆربەی زۆری بکەوتایەتە سەر ئەو ڕێبازە، ئەوا نەتەوەی کورد ئەبوو بەخاوەنی ڕێبازێکی ئاینی تایبەت بەخۆی، ئەوسا بەهۆی ئەو ڕێبازەوەو تێکەڵ بەهەستی کوردایەتییەکەی، ئەبوو بەخاوەنی قەوارەی تایبەتیی خۆی و لەژێر دەستەیەتی نەتەوەکانی تر ڕزگاری ئەبوو، ئەشی مەحویش وەك بیریارێکی هوشیار، وەك نەتەوەییەکی کورد، هەمان دیدوبۆچوونی هەبووبێ، ئێستاش، وەك ئەڵێن: (دنیا ئەوەی ماوێتی، زیاترە لەوەی ڕۆییوە) بیریاران و زانایانی ئاینی کورد کارێکی لەو جۆرە بەئەنجام بگەیەنن، کەڵکێکی زۆری ئەبێ بۆ ئایندەمان.

**• ئایا چۆن سەیری پەیوەندی نێوان ئەدەب و سیاسەت دەکەن! ئایا سیاسەت لای ئێمەی کورد زۆرجار زیانی لەلایەنی هونەری و داهێنان نەداوە! ڕای جەنابتان لەم بارەیەوە!**

– خۆی لەڕاستیدا، پێویست نیە پەیوەندی لەنێوان ئەدەب و سیاسەتدا هەبێ، بەڵام لەناو نەتەوەیەکی وەك کوردا، داگیرکراوو بەشبەشکراوو چنگ لەمەناوو بوونی نەتەوەییمان نراو، بمانەوێ و نەمانەوێ ئەدەب تێکەڵ بەسیاسەت ئەبێ، چونکە ئەدەب لەزەمینەیەکی ئازادا گەشە ئەکات، هەر هیچ نەبێ بۆ بەدەستخستنی ئەو ئازادییە، ئەدەب خۆی تێکەڵ بەسیاسەت ئەکات، ئنجا بەڕای من سیاسەت لای ئێمەی کورد زۆرجار سوودی بەئەدەب گەیاندووە نەك زیانی لێدابێ، هەروەها سیاسەت سوودی بەلایەنی هونەری و داهێنان گەیاندووە.

تۆ سەرنج بدە، ئەگەر بەهۆی سیاسەتەوە نەبوایە کە نیمچە ئازادییەکی دەستەبەر کردووە لەباشووری کوردستاندا، لایەنی هونەری و داهێنان لەم ناوچەیدا وا گەشەی ئەکرد؟ نەتەوەیەك چۆن ئەتوانێ خاوەنی ئەدەب و هونەرو داهێنانی خۆی بێ ئەگەر نەك هەر قەوارەیەك یا نیمچە قەوارەیەکی تایبەتیی خۆی نەبێ، بەڵکو زمانەکەشی لێ قەدەغە بکری؟ لەبەر ئەوە تا نەتەوەی کورد، نەگاتە ئازادی و سەربەخۆیی تەواو، نەك هەر ئەدەب و هونەرەکەی، بەڵکو وەرزش و خوێندن و سەیران و خەو

خواردنیشی تێکەڵ بەسیاسەت ئەبێ، یا بەواتایەکیتر، سیاسەت سوود بەهەموو ئەو لایەنانە ئەگەیەنێت.

**• هەندێ لەنووسەرانی کورد زۆر پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە هەر نووسەرێك بەرەگەز کورد بێ، ئەوە بەهەر زمانێك بنوسێت هەر موڵکی کوردە.. بۆ نمونە یەشار کەمال، عەبدولمەجید لوتفی، سەلیم بەرەکات بەتورکیی و عەرەبی دەنووسن.. ئایا رای جەنابتان چییە لەم بارەیەوە! ئایا کوردایەتیوون لەرێگای زمان و رەفتاری کوردانەوە دەسەلمێنرێت یان تەنیا بەرەگەز!**

– بەلای منەوە، هەستی نەتەوەیی دەوری سەرەکی ئەبینێ بۆ ئەو مەبەستانەی بەڕێزتان هێماتان بۆ کرد نەك رەگەز یا زمان، ئەی من لەوەڵامی پرسیارێکتانا ئەموت: هەستی نەتەوەیی بەهێزترین کۆڵەکەی راگری بوون و مان و ئایندەمانە؟ لەبەر ئەوە هاوکێشەکە بەم جۆرەیە:

• نوسەرێك لەنێوان نوسینەکانیەوە، ئەوە دەرکەوێ کە خۆی بەکورد ئەزانێ و بۆ خزمەتی لایەنێك لەلایەنەکانی نەتەوەی کورد ئەنووسێت، ئەوە بەهەر زمانێك بنوسێت هەر موڵکی کوردە ئەگەرچی ئەو نووسەرە بەرەگەز کوردیش نەبێ.

راستە زمان کۆڵەکەی دووەمە، بەلام کۆڵەکەیەکی باریدەدەرە بۆ گەشەکردنی هەستە نەتەوەییەکە. واتا زمان هۆکارە (الوسیلة) نەك مەبەست (الغایة) مەبەست نەتەوەکە خۆیەتی، من بۆیە ئەڵێم پێویستە گرنگی بەزمان بدرێ، چونکە ئەزانم ئەبێتە هۆی گەشەکردنی هەستەکە، بەلام ئەگەر کەسێك بەبێ فێربوونی زمانی کوردیش ئەو هەستەی هەبێ و گەشەی پێبدات، ئەوە خۆیشی و ئەو نوسینانەشی کە تەرخانە بۆ خزمەتی کورد، موڵکی کوردن.

بۆ رونکردنەوەیەکی زیاتر، با هەندێك نمونە لەسەر هەستی نەتەوەیی و جیاوازیی رەگەز و جیاوازیی زمان بێنینەوە:

• کەسێك تەنیا باوکی یا دایکی کوردە، بێگومان هەستەکەی خۆی بریار ئەدا کە خۆی بەکام لەو دوو نەتەوەیە ئەزانێ، نەتەوەی باوکی یا هی دایکی؟.

• من خۆم هەندێ جار لەگەڵ خەڵکی سویسرادا تووشی مشتومڕ ئەبووم، ئەوان لەسێ زمانی سەرەکی پێکهاتوون: ئەڵمانی، فەرەنسی، ئیتالی، کە هیچیان خۆیان بەنەتەوەی ئەڵمانی یا فەرەنسی یا ئیتالی نەئەزانی، ئەیانوت ئێمە لەنەتەوەی سویسرین.

• ئێستا ئەمەریکاییەکانیش وایانلێهاتووە خۆیان بەنەتەوەی ئەمەریکی ئەزانن ئەگەرچی هەر کۆمەڵەیەکیان لەوڵاتێکی جیاوازەوە هاتوون و بەزمانێکی جیاواز ئەدوێن.

• دکتور فوئاد لەوەڵامی سەرۆکی دادگایەکی تورکیدا کە پێی وت تۆ کوردی نازانی، بۆچی بۆ کورد خۆت ئەدەی بەکوشت؟ وتی: راستە من زمانم بەتورکی ئەدوێ، دەستیشم بەتورکی ئەنووسێ، بەلام دڵم بۆ کورد لێئەدات.

لەبەر ئەوە یەشار و لوتفی و بەرەکات موڵکی کوردن، چونکە خۆیان بەکورد ئەزانن، ئەو نوسینانەشیان کە تەرخانن بۆ کورد موڵکی کوردن، بەلام ئەگەر نوسینێکیان هەبێ تەرخان نەبێ بۆ خزمەتی کورد، ئەوە موڵکی کورد نیە، نوسینەکانی کەسێکی وەك (ئیسماعیل بێشکچی)ش، ئەگەرچی

تەرخانن بۆ ئازادەی سەربەخۆیی کوردستانیش، بەڵام چونکە ئەو خۆی بەکورد نازانێ، بەڵکو وەك تورکێکی مەقبیزو بەویژدان قسە ئەکات، موڵکی کوردنین.

**• چۆن دەڕوانیتە باری شیعری کوردی لەئێستادا!!**

– وێرانە، بەتایبەتی ئەوانەی جارجار بەرچاوم ئەکەون لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان، ڕەنگە تاکە تاکەیەك هەڵبەستی باش هەبێ، بەڵام بەداخەوە بەرچاوم ناکەون، چونکە من ئەوەندەم کات نیە ئەو هەموو شتانە بخوێنمەوە کە ناوی هەڵبەستیان لێنراون، هیوادارم ئەمە بەجۆرێك لەخۆهەڵکێشان نەدەنە قەڵەم، باوەڕبکەن تامەزرۆی خوێندنەوەی هەڵبەستێکی چاکم، جاران ئێمە هەر زێن یا گەلاوێژ یا هیوا مان هەبوو، هەموویانمان ئەخوێندەوەو ئەمانتوانی چاكو خراپ لەیەك جیابکەینەوە،، بەڵام ئێستا ڕۆژنامەو گۆڤارو دیوانی هەڵبەستو ناهەڵبەست ئەوەندە زۆرن، چاکیش لەناو خراپدا ونبووە! من وای بۆ ئەچم مەسەلەی پاداشت (موکافەئە)و چاپکردنی بەرهەمەکان لەلایەن دەزگاکانەوە، پاڵەپەستۆیەکی ئەوتۆی دروستکردووە کە خراپ نایەڵێ چاك دەرکەوێ! ئەوە مەسەلەی حیزبایەتیش لەولاوە بوەستێ کە چۆن کەروێشکێك ئەکرێ بەئاسکێكو ئاسکێك بەکەروێشك.

**• ئایا ئەو شاعیرانەی کە جێگای سەرنجی تێوەن کامانەن!**

– من بەر لەئێستاو ئێستاش (هەڵبەست) سەرنجم ڕائەکێشێ نەك (هەستیار)، لەو باوەڕەدا نیم هەموو هەڵبەستی هەستیارێك چاك یا خراپ بێ، هیوادارم هەلم بۆ بڕەخسێ بۆ خوێندنەوەی زیاترین هەڵبەست، بەتایبەتی هی نەوەی نوێ، لەو باوەڕەدام نەوەی نوێ هەڵبەستی چاکیان هەیە یا ئەیانبێت بەتایبەتی ئەوانەی بەهرەی هەڵبەستیان هەیەو گەشە بەو بەهرەیە ئەدەن بەزانیاریو مەشقکردن.

**تێبینی/**

کامیل نیزامەدین کە نازناوی کامیل ژیرە، ساڵی ١٩٢٤ لەدایکبووە، لەخێزانێکی خوێندەوارو نیشتمانپەروەردا پەروەردە بووە، کۆلیژی یاسای تەواوکردووە، ئێستاش بەکاری پارێزەرییەوە خەریکە، کامیل ژیر یەکێکە لەو چەند کەسەی کە کۆمەڵەی ئازادیو ژیانەوەو یەکێتی کورد واتە (کاژیك) یان دامەزراند.

**عەتا قەرەداغی**

## لەوەڵامی دوو پرسیاری بەڕێز مامۆستا (عوسمان بەرزنجی)دا

## بۆ نامەی دوکتۆراکەی

# هێشتا ساغ نەبۆتەوە کە شێرکۆ بێکەس هەستیارێکی بەهرەمەندە

پێخۆشحاڵم کە نامەی دوکتۆرا ئەگوزەرێنن، سەرکەوتووبن

یەکەم/ من لەو باوەڕەدا نیم کە گوایە منو د. نەسرین فەخریو نوری وەشتی، بەسێ کوچکەیەک لەنوێکردنەوە، لەهەڵبەستی کوردیدا، ساڵی ۱۹۵۳ دابنرێین! وەک ئێوە ئەڵێنو ئەپرسن: ئایا بنەمای ئەو نوێخوازییە چی بوو؟

جارێ منو ئەو دوو بەڕێزە، رۆژێك لەرۆژان پێکەوە کۆنەبووینەتەوە بۆ ئەوەی بەرنامەیەکی لەو جۆرە پێکەوە دابنێین، ئەگەرچی هەردووکیان برادەرو خۆشەویستن. لەبەر ئەوە من تەنیا بەش بەحاڵی خۆم قسە ئەکەم. راستە من هەندێك هەوڵمدا، بۆ ئەوەی لەرووی فۆرمەوە، هەندێك گۆڕانکاری لەهەڵبەستدا بکەم لەدوای ئەو ساڵەوە، بنەمای ئەو هەوڵەشم لەو باوەڕەوە بوو کە ژیان هەمیشە لەگۆڕانو پێشکەوتنو نوێخوازیدایە، ئەی بۆچی هەڵبەستیش وانەبێ؟ بەرئەنجامی ئەو هەوڵانەشم، بەزۆری لەرۆژنامەی ژیندا بڵاوکردەوە. دواییش لەبەشی یەکەمی دا‌یوانی هەڵبەستەکانمدا بەناوی (نازەنین)ەوە کە ساڵی ۱۹۵۷ لەسەر ئەرکی نامەخانەی زێوەر لەسلێمانیو لەچاپخانەی النور لەبەغداد چاپکرا.

لەپێشەکیی ئەو دیوانەدا نوسیومە: ( ئەم کۆمەڵە هەڵبەستە تێکڕا ئەتوانین پێیان بڵێین هەڵبەستی تازە، یان کنەوە بۆ هەڵبەستی تازە). دولیی نوسیومە: (لەهەڵبەستی تازەدا ئەتوانرێ لەوەزنو قافیە، واز لەیەکێکیان بهێنرێ).

ئەوە دیدوبۆچوونی ئەوسام بوو، بەڵام لەدوای ساڵی پەنجاوحەوتەوە لەو رایە پەشیمان بومەوە. ئەو هەوڵانەشی بۆ هەڵبەستی بێ کێشو سەروا، یا بێ کێش، یا بێ سەروادابووم.. لەچاپکردنی سەرجەمی هەڵبەستەکانم تا ساڵی ۱۹۹۳ بەناوی (هەڵبەستەکانی ژین) لە ٤٦٤ لاپەڕەدا لەسەر ئەرکی دەزگای چاپەمەنیی رۆژ لەسوید.. ناوی هەڵبەستم لەسەر لابردنو لەژێر ناوی پەخشاندا چاپم کردنەوە. لەوانە (یەکەم– گەشتێك ل ۲۹۹ لەدیوانی نازەنیندا ل۹، دوەم– دولنامە ل٤١٩ لەنازەنیندا ل۲۷، سێیەم– بۆ گوڵی ئاواتم ل۲۱٦ لەنازەنیندا ل۳۸، چوارەم– سپلە ل۲۲۱ لەنازەنیندا ل٥١). ئیتر دوای ئەوە گەڕامەوە سەر هەڵبەستی بەکێشو سەروادارو بەشی دوەمی هەڵبەستەکانم (کوردایەتی) لەچاپخانەی النجاح لەبەغداد ساڵی ۱۹٦۰و بەشی سێیەم (جوانی) لەچاپخانەی سەرکەوتن لەسلێمانی ساڵی ۱۹۸۳و هەموو هەڵبەستەکانی تریشم، کێشیان هەیەو سەروادارن.

جا ئەگەر مەبەست لەپرسیارەکەی بەڕێزتان، ئەو هەڵبەستە بێ کێشو بێ سەروایانەبێ کە ئەوانەی د. نەسرینو نوری دەشتیش هەروابوون، ئەوا من ئێستا ئەوانەو هەموو ئەو هەوڵانەی خەڵکی تریش لەبواری بێ کێشیو بێ سەروایدا ئەیدەن، بەهەڵبەستیان نازانم، من ئەوانەی خۆمم ناونا پەخشان، چاك وایە ئەو خەڵکەش بگەڕێن ناوێکی تر بۆ ئەو هەوڵانەیان دابنێن، پەخشانە هەڵبەست، پەخشانی

هونەری، فریشتە، ئاسمان، یا هەر ناوێکی تر، نەك هەڵبەست. چونکە کێش‌و سەروا، دوو کۆڵەکەی سەرەکیی هەڵبەستی کوردین‌و لەگەڵ زەوقی مرۆڤی کورد ئەگونجێن‌و بێ بوونی ئەو دوو کۆڵەکەیە، کارەکان ئەبنە جەستەی بێ گیان لای زەوقی هەڵبەستخوازی کورد تا ئەم ڕۆژگارەمان. ئاینده‌ش، نازانرێ چۆن ئەبێ‌و چی نوێ دائەهێنرێ کە لەگەڵ خواست‌و زەوقی نەوەکانی ئەو ئاییندەیەدا بگونجێ.

من لەپاشبەندی (هەڵبەستەکانی ژێر)دا لەلاپەڕە چوارسەدو بیست‌و نۆدا، لەو بارەیەوە بەدرێژی دواوم، لەگەڵ ئەم وەڵامەدا، وێنەیەکی ئەو پاشبەندەتان پێشکەش ئەکەم.

کەواتە من ئەو هەوڵانەی (سێ کوچکەکە!) بەنوێخوازی نازانم لەهەڵبەستی کوردیدا، ئەگەرچی ئەشێ بەو هەوڵانە بوترێ جۆرە داهێنانێك، یا نوێکارییەك لەوێژەی کوردیدا کە وەك وتم نازانم چی ناو بنرێت.

شێخ نوری شێخ ساڵح‌و گۆران، نوێکارییەکیان لەهەڵبەستی کوردیدا ئەنجام دا، بێ ئەوەی واز لەکێش‌و سەروا بێنن، من‌و چەند هەستیارێکی تری وەك دیلان‌و کامەران‌و ع.ح.ب و هەندێکی تر، زوو تێکەڵاو ئەو ڕەوتە بووین‌و ئێمەش چەند خشتێکمان لەتەلاری هەڵبەستی نوێی کوردیدا دانا. من ئەمەیان بەنوێخوازی ئەزانم لەهەڵبەستی کوردیدا، بۆ بنەمای ئەم نوێخوازییەش، وەڵامەکەی لەپاشبەندەکەدا ئەبینی.

دوەم/ لەوەڵامی پرسیاری دوەمتانا، گوایە کاك شێرکۆ بێکەس ڕلوبۆچوونی لەسەر ئێمە ئەوەیە کە لەو کاتەدا تەنها هەڵچوونێك بوەو هیچی ترو خزمەتی شیعری نوێی کوردیمان نەکردووە..

ئەڵێم: بۆچی کاك شێرکۆ، حەکەمی هەڵبەستی کوردییە؟ کێ ئەو مافەی بەو داوە خۆی بکاتە مامۆستاو پرۆفیسۆری زانکۆی هەڵبەستی کوردی، تا پلەو پایە بۆ هەستیارانی کورد دابنێ؟ بۆچی هێشتا ئەوە ساغ بۆتەوە کە شێرکۆ خۆی هەستیارێکی بەهرەمەندە؟

من ئەو قسەیەی شێرکۆم، دەمێکە، لەنامیلکەی (ڕووبەڕوو لەسێبەری چیادا) خوێندۆتەوە، لەوێدا لەوەش زیاتری وتووە، ئەڵێ: (ئەو سێ کوچکەیە تا دواییش کەسیان نەبوون بەشاعیر)، جا لەسەر ئەو بنەمایەی کە ڤۆلتێر ئەڵێ: (من رام جیاوازە لەگەڵ هەموو وشەیەکدا کە تۆ ئەیڵێی، بەڵام هەتا مردن بەرگریت لێ ئەکەم کە مافی خۆتە هەرچی بڵێیت). من تا ئێستا هیچ گرنگییەکم بەو قسەیەی شێرکۆ نەداوە، چونکە وەك بنەما یاساییەکە ئەڵێ: (فاقد الشيء لايعطيه)، ئەو وەك وتم، هێشتا ئەوە ساغ نەبۆتەوە کە هەستیارێکی بەهرەمەندە؟ یا بەزۆر سواری هەڵبەست بووە؟

شێرکۆ بەتەمەن شەش ساڵێك لەمن منداڵترە، ئێمە ژمارەیەك لاو، لەناوەڕاستی پەنجاکاندا سەرەتەقییەکمان لەوێژەو هەڵبەستدا ئەکرد، ئێواران لەباخی فەرەج لەتەکیی سەرکارێز لەسلێمانی، کۆڕی شەڕە شیعرمان ئەبەست، بەبەیانیانیش سەردانی چاپخانەی ئەوقافمان ئەکرد. کاك شێرکۆش وەك مێردمنداڵێك هاتە ناومان. زۆرمان ڕێز لێگرت بەهۆی ئەوەوە کوڕی هەستیاری بەناوبانگ فائق بێ کەس بوو. ئەوە جگە لەوەی کە بێ باوکو تاقانەش بوو، بەڵام زیرەکی نەخایاند، ئەوەمان بۆ ساغ بووەوە کە ئەم لاوە بەهرەکەی باوکی تێدا نیە، بەڵام ئەیەوێ بەزۆر سواری هەڵبەست بێ. هەرچەند گەڵێ جار ڕێنماییان ئەکرد لەڕووی زانیارییەوە، ئەوەندەی ئەمانزانی، یارمەتیمان ئەدا، بەڵام بێ سوود

بوو، ئەو بەھرەیەمان تیا بەدی نەکرد، کەچی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان هەموو شتێکی شێرکۆیان بڵاوئەکردەوە، لەبەر هەمان هۆ، ئەو بڵاوکردنەوانەش بەزیان گەڕایەوە بۆ شێرکۆ خۆی، چونکە بووە هۆی ئەوەی لەخۆی بگۆڕێت و هەوڵێك نەدا بەخۆیدا بچێتەوەو ئەوانەی ئەینوسی پێیاندا بچێتەوەو پاکژیان بکاتەوە. ئیتر لەو ڕۆژەوە، شێرکۆ هەر زۆر ئەڵێ، بەلام بۆر.

لەبەر ئەوە من ئەگەر بوویم بەهەستیار، یا نا، ئەوە کاری شێرکۆ نییە، من ئەوەندەم شانازی بەسە کە ساڵی ١٩٥٧ هەڵبەستەکەی من (بەھاری کوردستان) بەیەکەم هەڵبژێردرا.. کە هەڵبەستی (خاڵوی خاڵ)م وت، خوالێخۆشبوو نجم الدین مەلا ڕۆژنامە ژینەکەی وەك ئاڵا بەرزکردبووەوەو لەو سەری سابونکەرانەوە بەڕاکردن ئەکشا بۆ بەر سەراو هاواری ئەکرد: (مەولەوی زیندوو بۆتەوە) کەسێکی وەك دوکتۆر جەمال نەبەز ئەڵێ: (ئەم کۆمەڵە هۆنراوەیەی ژێر، بەلای منەوە نمونەی هۆنراوەی دوا ڕۆژمانە)، کە خوالێخۆشبوو ب. هەندرێن ئەڵێ: (ژێری شاعیر کەلێنێکی گەورەی گرت لەئەدەبی کوردیدا بەوەی بیری کوردایەتیی لەهەستە دەروونیەکەو گیانە ستایشەکە تێپەڕاندو گەیاندییە بارە تیورییەکەو هەتا ئەمڕۆ شاعیرانی ترمان خۆیان لەو بوارە نەداوە)، هەروەها ئەوەندە شانازی بۆ من بەسە کە ئێستاش، دوای ٤١ ساڵ، هەندێ کەس ماون کە هەموو دیوانی کوردایەتییەکەی منیان لەبەرە.

قسە زۆرە، بەلام با نەبێ بەخۆهەڵکێشان، تەنیا ئەوەندە ئەڵێم، شێرکۆ خۆی گۆشکراوی هەڵبەستەکانی ناو دیوانی کوردایەتییەکەی منە لەڕووی بیرەوە لەبواری کوردایەتیدا، ئنجا دوایی کە ئەو ڕایەی داوە، ئەوە لەئەنجامی ڕووداوێکی سیاسییەوەیە کە ئەمە کورتەکەیەتی: شێرکۆ لێپرسراوی لقی سلێمانی کاژیك بوو، منیش ئەندامی سەرکردایەتی، لەبەر هەندێك هۆ شێرکۆمان لەو پلەیە لابردو دلبەزان، ئەویش لەوە تۆراو وازی لەکاژیك هێنا. لەو ڕۆژەوە لەمن لاڵووتە، چونکە ئەوە بەکاری من ئەزانێ، ئیتر وەك کوردەکە ئەڵێ: شەڕ بەکونە قین ئەکرێ، دیارە ویستویەتی بەو قسەیە تۆڵەی خۆی بکاتەوە. ئەگینا کەی ئەوە کاری ئەوە؟ هەرچەندە ئەشێ قسەکەشی ڕاستبێ و من شاعیر نەبم، چونکە ئەگەر شاعیرێتی، وەك ئەوبێ، ئەوە من شاعیر نیم. لەڕاستیشدا ئێستا من دەربەستی ئەوە نیم بەهەستیار (شاعیر) بژمێرێم، چونکە دەمێکە بەلای هەڵبەست وتندا ناچم، ئەوەشم لەو باوەڕەوەیە کە لەڕۆژگاری ئەمڕۆی میللەتاندا، شیعرو شاعیر، بوونەتە دیاردەیەك لەدیاردەکانی کۆمەڵگا دواکەوتووەکان، ئەوە ڕۆژگارێکی تر بوو کە هەڵبەست بایەخێکی زۆری هەبوو بۆ ڕابوونی ئەم دەڤەرەی ئێمە، من لەڕۆژە ڕەش و دژوارەکانی ئەو ڕۆژگارەی نەتەوەکەماندا، ئەو کارەم بەهەڵبەستەکانم بەچاکی و بەپاکی ئەنجامدا، دوای ئەوە ئەرکی گرنگترم کەوتە ئەستۆ.

لەهەڵامی پرسیارێکی ڕۆژنامەی بەرێزی (جەماوەر)دا ـ ژمارە (٤٨) دووشەممە ٢٩/٩/٢٠٠٣ ل٢

## کەس‌وکاری کیمیابارانو ئەنفالەکانو لادێ وێران بووەکان بەبینینی ئاڵای بەعس لەشاری سلێمانیدا برینەکانیان دەکولێتەوە..

• لەوەتەی ئاڵای بەعس لەشاری سلێمانیو هەڵەبجەی شەهید هەڵکراوە.. هەڵەبجە خوێن لەهەناوی دەتکێنو هەموو ڕۆژێ شەهید دەکرێتەوە..

• هەڵکردنی (عەلەم)ی عێراق لەتەک ئاڵای کوردستان پاڵنەرێکی بەهێزە بۆ لکاندنەوەی کوردستانی ئازاد بەعێراقەوە..

• نووسەرانو ڕۆژنامەنووسانو ڕۆشنبیرانو ڕووناکبیران لێکڕا بەیەک دەنگ تکا دەکەن.. ئاڵای بەعس لەشاری سلێمانی داگیرێ..

ماوەیەکە ئاڵای کوردستانو چۆنیەتی هەڵکردنی لەتەک ئاڵای بەعسییەکان لەشاری سلێمانیدا بۆتە باسێکی گرنگو ڕۆژانە لەنێو خەڵکی شارداو ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا دووپات دەکرێتەوە، چونکە ئاڵا پیرۆزە، هەر بۆیە پیرۆزیی ئاڵا لەهەموو کاتێکدا ڕەچاو کراوە بەو پێودانگەی گوزارشت لەبوونو بەردەوامیو سەروەری نەتەوەکەمان دەکات.. جا پێویست بوو لەشاری سلێمانی کوردپەروەرو کانگای بزاڤی نوێخوازیو نەتەوەیدا ڕەچاوی ئەوە بکرایەو پیرۆزیی ئاڵای کوردستان لەدەستنەدرایەو ئەو ئاڵایە هەرگیز نەکرایەتە خوێناوی بەعسییەکان.. چونکە جوداییەکی زۆر لەنێوانیاندا بەرجەستە دەبێت، ئاڵای بەعس مێژوویەکی ڕەشی لەلای خەڵکی کوردستان هەیە بەتایبەتیو زیاد لەهەمووان شاری سلێمانیو هەڵەبجەی شەهید کە تا ئێستاش هەڵەبجە بریندارەو برینەکانی سارێژنەکراوە.

جا ئەو کردەوەیەش لەلای زۆرێک لەڕۆشنبیرانو نووسەرانو ڕۆژنامەنووسانو خەڵکانی ئازارچەشتووی بریندارو خوێناوی دەستی ئەو ڕژێمە، بۆتە مایەی تووڕەییو ناڕەزاییو گازندەیەکی زۆرو پاش چەندین ساڵ نەبوونی هیچ وجودێکی ئەو ڕژێمەی بەعس ئاڵای عێراقیان بەبێ پرسو ڕاوبۆچوونی خەڵکی لەسەر سەرجەم فەرمانگەو بەڕێوەبەرایەتییە گشتییەکان هەڵکردووە کە بەپێی بڕیارێکی ڕەسمی ئیدارەی سلێمانی دەرچووە.. لەلایەن ڕۆژنامەو گۆڤارەکانەوە چەندین ڕیپۆرتاژو وتارو نووسراو بڵاوکرایەوە تا ئەو (عەلەمەی) بەعس لەم شارە داگیرێ، بەڵام بەداخەوە کەس هەر گوێی لێنەگرتنو هەر حسابیشیان بۆ نەکردن.

هەر لەم ڕووەوە خەڵکی دەڵێن بابەسبێت برینمان بکولێتەوەو هەموو ڕۆژێک بەعسمان وەبیربێتەوە.. ئەو ئاڵایە دابگرن.

**ڕیپۆرتاژ ـ زانیار سەردار قەرگەیی ـ سلێمانی**

کامیل ژیر (نووسەری سیاسی): ئاڵای عێراق، ئەم ئاڵایەی ئێستا لەشارێکی وەک سلێمانیدا، لەپاڵ ئاڵای کوردستاندا هەڵئەکرێت!! بەپێی یاسای ژمارە (٣٣)ساڵی ١٩٨٦ (یاسای ئاڵای عێراق)و بەبڕیاری ڕۆژی ١٩٨٦/٢/٨ ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش (مجلس قیادة الثورة)ی ڕژێمی بەعس ڕەوایەتی دراوەتیو نەخشەکێشکراوە.

بەپێی بڕگەی دوو لەمادەی دووەمی ئەو یاسایە، ڕەنگەکانی ئەو ئاڵایە ڕەنگەکانی ئاڵای عەرەبەکان ئەنوێنن کە لەمێژووی عەرەبیدا بەکارهێنراون. سێ ئەستێرەکەی ناوەندێ ئاڵاکەش بنەماکانی (الوحدة

والحرية والاشتراكية) ئەنوێنن هەر لەم برگەیەدا نوسراوە کە (پاڵەوانەکانی ئەم ئاڵایە گەلی عێراق، لەقادسیەی سەددامدا جەنگاوەو لەپێناویدا قوربانیان داوە بۆ بەرگری لەنیشتمانو ئازادیی گەلو سەربەخۆیی روخساری بەخشینو شەهادەتو قوربانیش ئەنوێنێ کە لەو جەنگە شکۆدارەدا بەدیار کەوتووە).

بەسەرنجدانێك لەناوەڕۆکی ئەو یاسایە، ئەم راستیانە لای هیچ کەسێك شاردراوە نابێ.

١- دارشتنو روخسارو رەنگەکانی ئەو ئاڵایە، هیچ لێکدانەوەو بیانوویەکی نیە بۆ کورد.

٢- سێ ئەستێرەکە، نیشانەی سێ دروشمەکەی بەعسن. دەی خۆ بەعس لەسەر حوکم نەماوە، کەواتە ئاڵاکە، نەك هەر لەکوردستاندا، بەڵکو لەعێراقیشدا رەوایەتی نەماوە.

٣- یاساکە، هێما بۆ قادسیەی سەدام ئەکات، ئەی لەو جەنگی قادسیەی سەدامەدا نەبوو، کورد ئەنفالو کیمیابارانو کۆکوژکرا!؟

ئێستا پرسیارەکە ئەوەیە: ئەی بۆچی، لەگەڵ ئەو هەموو نالەبارییەی ئەو ئاڵایەدا، لەهەندێ شوێنی کوردستاندا، ئەو ئاڵا ناموبارەکە، هەر هەڵئەکرێ!؟ من هیچ وەڵامو بیانوویەك شك نابەم، تۆ بڵێی (هاوفایلەگیراوەکان) لە پشتی هەڵکردنی ئەم ئاڵایەوە نەبن؟!

خۆ ناکرێ بڵێین ئەوە هاومامەڵە کردنە (المعاملة بالمثل)، چونکە تا ئێستا نەماندیوە، نەك هەر لەتکریتو فەلوجەو رومادی، بەڵکو لەنەجەفو عەمارەو بەسرەشدا، ئاڵای کوردستان لەپاڵ ئاڵای عێراقدا هەڵکرێت. کەسێکی وەك هەڤاڵ مام جەلالیش، نەئەبوو بەو جۆرە بەئاڵا کوریە هەژارەکەی کوردستاندا، لەئوسترالیا، هەڵشاخێ لەبەر ئەوەی ئەو ئاڵایە لەتەنیشت خۆیەوە ئاڵایەکی عێراقی دانەچەقاندبوو!! ئاخر خۆ تا ئێستا نەماندیوە، نەك هەر یەکێکی وەك محەمەد دووری، بەڵکو یەکێکی وەك ئەحمەد چەلەبیش کە هاوئەنجومەنو هاو ئۆپۆزسیۆنی مام جەلالە، بەئاڵای عێراقدا هەڵشاخێ لەبەر ئەوەی ئاڵای کوردستانی بەتەنیشتەوە نەبووە!!

من تێناگەم، هەڤاڵان لەکاتی شەرە پەڕۆکەیاندا، نەك هەر پەڕۆ بەڵکو کراسی سەوزو زەردیشیان، لەیکتری قەدەغەکردبوو! ئەی بۆچی ئێستا ئاڵای ئەو عێراقە قەدەغە ناکەن کە شەرە چەکی کیمیایی لەگەڵ ئەکردین!؟

خۆناشکرێ بڵێین (نهێنییەکە، ترسە) ئەی ناڵێن سلێمانی شاری هەڵمەتو قوربانییە!؟ راستییەکەی ئەبوو، ئەو رۆژەی ئاڵای کوردستان، دوای کەوتنی رژێم لەسلێمانیدا هەڵکرا، ئەو جەماوەرەی هەڵمەتو قوربانییە، دەستەونەزەر، لەبەردەم ئاڵاکەدا بوەستاناو هەموو بەیەکدەنگ سروودی ئەی رەقیبیان بوتایە، یا کەسێکی وەك من کە لەچەند هەڵبەستێکمدا ناوی ئاڵای کوردستانم هێناوە، لەوانە ئەم هەڵبەستەم کە ساڵی ١٩٥٨ وتوومە لەدیوانی (کوردایەتی) یەکەمدا کە ساڵی ١٩٦٠ چاپکراوەتەوە ئەبوایە لەهەموو کەس پەرۆشتر لەبەردەم ئاڵاکەدا بچەمایەتەوە کەچی ئەوەم نەکرد!! ئەزانن بۆچی؟! چونکە لەتەنیشت ئاڵا پیرۆزەکەی کوردستانەوە، ئاڵا خوێناوەییەکەی عێراقیش قوت کرابووەوە!! وتم ئەبا ئاڵا شەرمەزارەکەی عێراق بڵێ: نیوەی چەماندنەوەکە بۆ ئەو بووە!! ئاخۆ ئەو زوڵمە بۆ لەکەسێکی وەك من ئەکەن کە پەنجاو پێنج ساڵ لەمەوبەر لەو هەڵبەستەمدا وتوومە:

| | |
|---|---|
| گوڵی گەش بەبای شەماڵی بەهار ئەشنێتەوە | قاسپەی کەوی کەژ، بەرامبەر نزار بەرزدەبێتەوە |
| من کە دیم لەرەی شەپۆلی شنەی ئاڵای کوردستان | تێکەڵاو ئەبێ لەگەڵ جریوەی ئەستێرەی بەیان |
| ئەو کاتە هیواو ئامانجی دوورم هەردوو پێکەوە | ئەبن بەپرشنگ، گوڵاڵەی سوورم ئەگەشێتەوە |

رۆژنامەی ڕێژداری (هاوڵاتی) ژمارە (١٤٥) ڕۆژی ١٥/٢/٢٠٠٣

وەڵامێک بۆ:

# ڕێبین هەردیو بەهەڵە تێگەیشتن لەکێشەی کەرکوك‌و کوردو دیموکراسی

پێشەکی ئەمەوێ خوێنەرەوەی بەڕێز، ئەو ڕاستییە بزانێ کە من وەك برازایەکی خۆشەویست، ئەڕوانمە ڕێبین هەردی، چونکە ئەو کوڕی برای ئازیزو هاوبیری مێژام مامۆستا ئەحمەد هەردییە کە پێکەوەو لەگەڵ ژمارەیەك هاوبیری ترماندا لەکۆتایی پەنجاکانی چەرخی پێشوودا، ڕەنگی قوتابخانەیەکی بیری نەتەوەیی کوردیمان ڕشت‌و کارمان بۆ کرد، ئێستاش جێگەی شانازیمانە، کە هێشتا لەژیاندا ماوین، ئەبینین تۆوی ئەو بیرە، کە ئەوسا، سەرەتا لەکێڵگەیەکی بچووکی وەك سلێمانیدا ئەمانچاند، ئێستا لەسەرتاپای کوردستاندا سەوز بووە، ئەوەش، بە بەڵگەیەی ئەوەی ئێمە لەکولەکەدا، بەهۆی گوشارێکی زۆرەوە لەسەرمان، بانگمان بۆ ئەدا، ئێستا نەك هەر زۆربەی جەماوەری کوردی بێلایەن، بەڵکو زۆربەی ئەندامانی ئەو حیزبە کوردیانەی ئەوسا دژایەتییان ئەکردین، بەحیزبی شیوعیشەوە، ئێستا وەك ئێمە داوای جیاکردنەوەی کوردستان ئەکەن لەداگیرکەران‌و خوازیاری کوردستانێکی سەربەخۆو ئازادو دیموکراتن‌و بەشوێن میکانیزمێکدا ئەگەڕێن کە ئەو مەبەستە بپێکن‌و ئەو ئامانجە بەدەستبخات. کە دواتر لەبارەیەوە ئەدوێم، بەڵام ئەوەی جێگەی نیگەرانی‌و سەرسوڕمانە تازە ڕێبین هەردی، ئەیەوێ بمانگێڕێتەوە بۆ چەمکی هەڵەی چوونە ناو باوەشی عێراقی دەسکردو پێکەوەژیانی زۆرداری زۆرلێکراوو دیموکراتیزەکردنی داگیرکەرو داگیرکراوو برایەتیی با وەکوشتەو باوەکوژراو!! ئەوە لەکاتێکدا کە ئێستا زێڕینترین هەل لەئارادایە بۆ سەربەخۆیی کوردستان!

لەژمارە (١٤٤)ی ڕۆژنامەی ڕێزداری (هاولاتی) ڕۆژی ٨/١٠/٢٠٠٢دا، کاك ڕێبین لەوتاری کێشەی کەرکوك‌و چەند سەرنجێکدا، ئەڵێ: (گەورەترین تەحەدای دیموکراسی لەبەردەم هێزە سیاسیەکانی عێراقدا کێشەی شاری کەرکوکە)، لەوەڵامدا ئەڵێم: بۆچی دیموکراسی، پێشترو ئێستاش، لەکەرکوك‌و لەعێراقدا، بوونی هەبووە تا تەحەدا بکرێ!؟ یا چاوەڕوان ئەکرێ، بەکەوتنی ڕژێمی بەعس، کەرکوك‌و عێراق ببنە سویسراو وڵاتانی ئەسکەندەنافیە؟ یا ئەشێ بەم وتارەی کاك ڕێبین، هاوبیرانی موقتەدا سەدرو بەچکە بەعسیەکان‌و عەرەبە دە هەزاریەکان‌و تورانیە کەمالیەکان ببن بەدیموکراتی!؟

من پێشتر لەچەندین وتارمدا وتوومە: (فرەلایەنی‌و دیموکراسی وەك ئاوو خواردن وایە بۆ ژیان، بەڵام لەکەشێکی نەگونجاودا، بۆگەن ئەکەن‌و ئەبنە ژەهرو ژیان لەناوئەبەن) کەشی عێراق، بەکەرکوك‌و موسڵ‌و هەموو ناوچە کوردیە بەعەرەبکراوەکانی ترەوە، کەشێکی گونجاو نیە بۆ دیموکراسی، ئەو شوێنانە، ئەشێ کاتێك دیموکراسیان تیا پیادە بکرێ‌و کورد زەرەرمەند نەبێ تیایاندا، کە شوێنەوارەکانی بەعەرەبکردن‌و بەتورانیکردنیان تیا نەهێڵرێ، لەبەر ئەوە، بەکاك ڕێبین ئەڵێم: وەك تۆ پێتولیە: (حەساسیەتە گەورەکە، بانگەشەی کوردبوون‌و ئالا سێ ڕەنگیەکەی کوردستان، لەکەرکوکدا، خولقاندویەتی!) ئەوە ولنیە، ئەو حەساسیەتە گەورەیە، هۆی ئەمڕۆو هی ئەو بانگەشەو ئالایە نیە، بەڵکو ئەو حەساسیەتە لەڕۆژێکەوە دروست بووە، کە باشووری کوردستان، بێپرس‌و خواست‌و ویستی نەتەوەی کورد، خرایە سەر عێراقی عەرەبی‌و کەرکوك‌و موسڵ‌و چەندین شارۆچکەو دێهاتی کورد، لەکورد شێوێنراو ماڵ لەخانەخوێ حەرامکرا.

تۆ ئەڵێی: (لەبری ئەوەی هێزە ناکوردییەکان بوروژێنین، بیانخەینە پاڵ خۆمانو لەپێناویدا کاریکەین)! من ئەم قسەیەی تۆ ئەچوێنم بەو قسەیەی کاک مستەفا چاوڕەش کە لەهەمان ژمارەی هاوڵاتیدا بڵاویکردۆتەوەو ئەڵێ: (من لەدوژمن بەفێڵو دوژمنیش لەمن بەفێڵ بوو، سەرەنجام من خەڵەتامو فێڵی دوژمن سەریگرت) ئێستاش تۆ ئەگەر لەو قسەیەت مەبەستت فێڵ بێ، ئەوا دیارە تۆ هیچ پەندێکت لەچیرۆکەکەی (کاک مستەفاو دەیان چیرۆکی لەو جۆرە) وەرنەگرتووە، ئەگەر لەناخو دڵێکی راستگۆیانەشەوە ئەو قسەیە ئەکەی؟ ئەوا بێگومان هیچ پەندێکت لەچیرۆکی (مارەکەی شێخ هۆمەر) وەرنەگرتووە. لەو باوەڕەشدا نیم تۆ ئەوەندە ساویلکەبیت! تەنیا لێکدانەوەیەك بۆ ئەو قسەیەش، ئەشێ ئەوەبێ کە دووی کڵاوی بابردووی (دیموکراسی) کەوتبی لەدۆزەخی ئەو عێراقەی لەسەر زەوتکردنی باشووری کوردستانو بەخوێنی سەدان هەزار کورد دروستکراوە لەماوەی هەشتا ساڵێکی رابردوودا.

لەجێگەیەکی تری وتارەکەیدا، کاك رێبین ئەڵێ: (بۆ من گرنگ نیە چ ئاڵایەك لەکەرکوکدا هەڵدەکرێ، هی عێراق یان کوردستان یان بەرەی تورکمانی، بەڵام یەکجار بەلامەوە گرنگە کۆی ئەو ئاوارانەی لەشاری کەرکوك دەرکراون بگەڕێنەوە سەر شوێنی خۆیان، بۆ من گرنگ نیە دەگوترێت ئەم شارە تورکە یان عەرەبی، بەڵام بەلامەوە گرنگە چەند گەڕەکی وێرانکراوو چۆڵکراو ئاوەدان دەکرێتەوەو قەرەبووی زیانەکان دەکرێت). لەوەڵامدا ئەڵێم: ئەگەر کوردبوونی کەرکوكو ئاڵای کوردستانو هەستی کوردایەتی لای کوردی کەرکوك گرنگنەبوایە، ئەوا ئەو کوردانە هەر لەسەرەتاوە دەرنەئەکرانو ئاوارە نەئەکرانو گەڕەکەکانیان وێران نەئەکرانو ئێستا پێویستیان بەقەرەبوو نەئەبوو، ئەگەر بەلای نەتەوەی کوردیشەوە، ئەوە گرنگنەبوایە، ئەو شارە، تورکە یان عەرەبی، ئەوا کێشەی کورد لەباشووری کوردستاندا، هەر لەبەیانی یازدەی ئازارەوە چارەسەر ئەکراو ئەو هەموو کوشتارەی دوای ئەو بەیانەی نەئەویست! دیارە رێبینو هەموو ئەو کەسانەی وەکو رێبین، نانەتەوییانە بیرئەکەنەوە، ئەوەش بەلایانەوە گرنگنیە کە دهۆکو هەولێرو سلێمانیش تورك بێ یا عەرەب، گرنگ بەلای ئەوانەوە، وەك رێبین لەجێگەیەکی تری وتارەکەیدا ئەڵێ: (کردنەوەی قوتابخانەو کتێبخانەو چاندنی درەختو دروستکردنەوەی پارکی گشتی)یە!! وەك لەوەوپێش کەرکوك قوتابخانەو کتێبخانەو درەختو پارکی گشتی تیانەبووبێ!! ئێوە سەرنج بدەن، رێبین لەوتارەکەیدا ئەڵێ: (دەگوترێ تورکمانەکان خۆپیشاندان دژی کوردو ئاڵای کوردستان دەکەن، دەگوترێت ئەوان دەڵێن ئەم شارە تورکە، بەڵام ئایا ئەوان مافی خۆیان نیە چی بەڕاست دەزانن چ بڕوایەکیان هەیە بیڵێنو کاری بۆ بکەن) کەچی بەلای رێبینەوە: (بانگەشەی کوردبوونو ئاڵا سێ رەنگییەکەی کوردستان لەو شارەدا، هەساسیەت ئەخولقێنێ!!) و کاك رێبین ئەوانەشیان پێ رەوانابینێ. دوای ئەوانە، ئەڵێ: (کەرکوك شاری تورکو کوردو عەرەبە، بەڵام هیچ کام لەم دەستنیشانکردنانە، پەیوەندی بەکەمو زیادی ئەو مافانەوە نیە کە هەموو دانیشتوانێکی ئەم شارە بەیەکسان هەیانە). جارێ با خوێنەرەوەی ئازیز لەوە گەڕێت کە ئەم نووسەرە، تورکی پێش کورد خستووە بۆ خاوەندارێتی کەرکوك! دێینە سەر ئەو مافانەی هەموو دانیشتوانی کەرکوك بەیەکسان هەیانە بەقسەی رێبین! لەوەڵامدا ئەڵێین: کام ماف؟ مافی درەختو پارکی گشتی، یا مافی نەتەوەیی؟ ئەگەر مەبەست لە دووەمیانە، ئەوا مافی نەتەوەیی چۆن بۆ کورد بەدەستدێ لەکاتێکدا کە گەڕەکەکانی قادسیەی یەكو دوو، نەصری یەكو دوو، حی العسکری، ١ آذار، ١ حزيران، الحرية، حی الواسطی، حی الخضراء، البنيدار في العرقة، البو علك،

الحديدین‌و چەندین شوێنی تر لەناو کەرکوکدا عەرەبڕێژ کراون! کە بەوانە ڕێژەی عەرەب بۆتە چەندین ئەوەندەی ڕێژەی کوردو تورکمانیش! ئەوە جگە لەناوچەکانی وەك حەویجەو دبس‌و ریاض‌و تازەو داقوق‌و لەیلان‌و ڕەشادو کوێ‌و کوێ کە بۆ نمونە گوندەکانی سەر بەداقوق لە ٩٠ نەوت گوند ٦٠ شەستیان عەرەبنشین کراون! کە ئەمانە زۆربەی زۆریان بۆ تواندنەوەی کوردهێنراون لەکەرکوکدا، بەو جۆرە ئێستا ڕێژەی کورد، بەئاوارەکانیشەوە ٢٥٪ لەسەدا بیست‌و پێنج دروست ناکات. گومان لەوەشدا نیە، ئەگەر عەرەبە هاوردەکان نەگەڕێنرێنەوە بۆ زێدی خۆیان، ئەوا وردە وردە کەمینە لەزۆرینەدا ئەتوێتەوە، ئەمە دەرئنجامی ژیانە، ئیتر کام مافی نەتەوەیی؟ کام یەکسانی!؟ لەبەر ئەوە ڕێبین کە ئەڵێ: (من مەستدەکەم هیچ کەسێك هێندەی ئێمەی کورد لەورووژاندنی مەسەلەی نەتەوەیی لەو شارەدا زەرەر ناکاتو هیچ کەسێکیش هێندەی ئێمەی کورد لەبەرگریکردن لەدیموکراتیدا لەو شارەدا قازانج ناکات) ئەوە بەتەواوی پێچەوانەکەی ڕاستە، چونکە دیموکراسی، واتا حوکمی زۆربە زۆربەکەش ئەوەیە، ئیتر ئەبێ قازانجەکەی ئێمە چیبێ!؟ حەزیش ئەکەم کاك ڕێبین‌و هاوبیرەکانی ئەو ڕاستیە بزانن کە وورووژاندنی مەسەلەی نەتەوەیی بۆ ئێمەی کورد لەکەرکوك‌و عێراق‌و تورکیاو ئێران‌و سوریەو ئازەر ـــ ئەرمەنیشدا، شاڕێگەی ڕزگاری‌و بەدەستخستنی مافە نەتەوەییەکانمانە، بیرکردنەوەکانی ڕێبین‌و وێنەکانی، بیرکردنەوەیەکی کۆسمۆپۆلیتیانەیەو تەنیا داگیرکەرانی کوردستان سودمەند ئەبن لێیان. ئاخر کێشەی کوردو کێشەی کەرکوك‌و دەیان شاری وەك کەرکوك، لەچیەوە سەرچاوەی گرتووە؟ لەوەوە نیە کە کوردستان بەگشتی‌و ئەو شارانە بەتایبەتی، داگیرکراون‌و لەکوردو کوردایەتی‌و کوردبوون شێوێنراون!؟ ئاخر تۆ جارێ نابێ ئەوەی ترازاوە، بیخەیتەوە سەر سکەی خۆی؟ ئنجا نەك بۆ شاری کەرکوك، بگرە بۆ عێراقیش، ئایا ئێستا هەل لەبارە بۆ پیادەکردنی دیموکراسی!؟ بۆچی دیموکراسی، کراسێکە، بەکەوتنی ڕژێمێك، کۆمەڵگایەکی دواکەوتوو لەبەریکات!؟

ڕۆژئاوا بەسەدان ساڵ گەیشتە ئەوەی دیموکراسی پیادە بکات، ئەویش تا ئێستا بەتەواوی نا، هیچ کام لەو وڵاتانەی ڕۆژئاواش، لەپێناوی دیموکراسیدا، وازی لەسەروەری‌و مافی نەتەوەیی‌و سەربەخۆیی‌و ئاسایشی نەتەوەیی‌و بەرژەوەندیی نەتەوەیی خۆی نەهێناوە، ئیتر نازانم کاك ڕێبین بۆچی لەکۆتایی وتارەکەیدا، چارەنوسمان بەتەولوی ئەبەستێتەوە بەو عێراقەوە: (کە بڕیارە لەداهاتوودا تیایدا بژین!!) نازانم ئەوە بڕیاری کێیە؟ بڕیاری ئەمەریکایە؟ هی عەرەبە؟ بڕیاری حیزبی کوردییە؟ یا هی ڕێبین خۆیەتی!؟ من بەدڵنیاییەوە ئەڵێم: ئەوە بڕیاری هەر کەس‌و لایەکبێ، بڕیاری جەماوەری کوردی تێکۆشەر نیە لەپێناوی سەربەخۆیی کوردستاندا، کە لەوتارێکی تردا، لەمیکانیزمی ئەو تێکۆشانەو ئەو سەربەخۆییە ئەدوێم، لێرەدا تەنیا ئەوەندە ئەڵێم: کێشەی کورد، بەکێشەی کەرکوك‌و بەکێشەی ئازادی‌و دیموکراتی‌و بەکێشەی نان‌و درەخت‌و پارکی گشتیشەوە، بێ سەربەخۆیی کوردستان‌و ئازادیی نەتەوەی کورد، چارەسەری تەواو ناکرێ، چارەسەرییە نیوەناچڵەکانیش لەدەرزیی سڕکەر بەولاوە، چیتر نابن‌و دەیان ئەنفالی تریان بەدوادا دێت، لەباشترین باریشدا، ئەو چارە نیوەناچڵانە، لەچارەنووسی ئەو فیدراڵیە چاکتر نابێ کە ئێستا هەندێ لایەنی کوردی، پێش عەرەب‌و تورك، دەسبەرداری ئەبن لەپێناوی عێراقی یەکگرتوودا!!

# با لەقۆناغی قسەوە بگوێزینەوە بۆ قۆناغی کار

دوای بڵاوکردنەوەی سەرنجەکانم لەژمارە ١٤٥ی (هاوڵاتی)دا لەسەر وتارەکەی کاک رێبین هەردی لەبارەی کێشەی کەرکوکەوە، ئەمویست لەبارەی میکانیزمی سەربەخۆییەوە شتێکی تر بنووسم وەك بەڵێنم دابوو. بەلام وەڵامەکانی رێبین لەژمارە ١٤٧دا، ناچاری کردم کە جارێ ئەم وەڵامەش بدەمەوە. مەبەستیشم دەوەن بەناش نیە، بەڵکو بەهیوام منو سەلاحو رێبینو خوێنەرەوەی ئازیز بگەینە راستیەکان. ناشڵێم ئەو راستیانە هەمووی لەوەڵامەکانی من یا کاك سەلاح ئەحمەد دایە، بەڵکو نوسینو دیدوبۆچوونەکانی رێبینیش، گەلێ راستیمان پیشان ئەدەن، ئێستاش سەرەتا بەوە دەست پێئەکەم کە بڵێم: با نوسینەکانی هەموومان هەمووی هەر بابەتیانەبێ نەك دەمارگیریو پێداگرتن لەسەر هەڵەو بەکارهێنانی وشەی ناشایستەو نەگونجاوی وەك: (نەتەوەچی، فسفس پاڵەوانو شتی تری لەو جۆرانە).

زۆرم لاپەسەندە کە رێبین ئەڵێ: (من نەمنوسیوە کەرکوك کوردستان نیە، بەڵکو باسی ئەوەم کردووە لەچ رێگەیەکەوە هەوڵبدەین ئەم کوردستانی بوونە بسەلمێنین) کەواتە لێرەدا جیاوازیمان لەسەر رێگەکەیە، رێبین لای وایە: (ئەوەی کەرکوكو عێراق رزگار دەکات کارکردنە بۆ سیستەمێك کە دەتوانێ زیاد لەنەتەوەیەکی تیابژێ، بێ ئەوەی کەس مافی ئەوی دی زەوت بکات..) مەبەستی لەسیستەمەکەش: دیموکراسیە. ئەمە هەر دیدی رێبین نیە، هی تریش هەن کە بۆ نمونە هێما بۆ سویسراو ئەمریکا ئەکەن کە لەسایەی دیموکراسیدا، زیاد لەنەتەوەیەکیان تیا ئەژێ، بێئەوەی کەس مافی ئەویدی زەوتبکات، منیش ئەڵێم: هەڵەکە لێرەوە دەستپێئەکا، بابزانین چۆن؟:

سویسرا، وڵاتی هیچ کام لەو گەلانە نەبوو کە ئێستا لەناویدانو بەزمانەکانی ئەڵمانیو فەرەنسیو ئیتاڵی قسە ئەکەن، بەڵکو ئەوانە لەسنورەکانی ئەڵمانیاو فەرەنسەو ئیتاڵیاوە، دزەیان کردووە بۆ ناو سویسرا. واتا ئەوانە، هیچ کامیان، شارو وڵاتی ئەولنیتریان زەوت نەکردووە، بەڵکو هەریەکەو بەشێك لەنیشتمانی سویسرای بندەست کردووە، وەك چۆن ئێستا هەریەك لەعەرەبو تورکو فارسو ئەرمەنو ئازەر، بەشێك لەکوردستانیان بندەستی خۆیان کردووە، واتا ئەولنە، هیچ کامیان، شارو وڵاتی ئەوانیتریان زەوت نەکردووە، بەڵکو خاکی سویسراییەکانیان زەوتکردووە، بۆیە هەموویان لەسەر ئەو زەوتکردنە، (دیموکراتی!) و کۆکن لەناو خۆیاندا!! بەو جۆرە، ئەمریکاش وڵاتی هیچ کام لەو گەلانە نەبووە کە ئێستا هەریەکەو ناوچەیەکی بۆ خۆی پاوانکردوەو فەرمانڕەوایی ئەکاو پەنجا ولایەتیان لێدروستکردووە. بۆیە هەموویان لەسەر ئەو پاوانکردنەی خاکی ئەمریکا (کۆكو دیموکراتیو یەککگرتوون!!) بەو جۆرە ئەوانە، داگیرکەرو زەوتکەری وڵاتو مافی ئەو کۆمەڵە خەڵکەبوون کە بەر لەوانیتر، لەناو سویسراو ئەمریکادا ئەژیانو ئێستا ئەوانە، یا توێنرلونەتەوە، یا بەئاستەم نووزەیەکیان تیاماوەو بەرەو تواندنەوە ئەڕۆن.

بەرامبەر بەوانەش، هەموومان دیمان، کە چەندین تێکەڵەی تری وەك یەکێتی سۆڤێتو یوگوسلافیاو چیکوسلوڤاکیاو شوێنی تر، چۆن لەیەك ترازان، ئەو لێکترازانەش، لەبەر ئەوە نەبوو کە دیموکراسی لەو شوێنانە نەبوو، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو کە گەلەکانیان توانای خۆڕزگارکردنیان مابوو لەزەوتکردنو

داگیرکرىن. واتا لەلایەك داگیرکردن‌و زەوتکردن هەبو، لەلایەکی تریشەوە، توانای خۆرزگارکردن مابوو، لەعێراقیشدا هاوکێشەکە هەر بەو جۆرەیە، باشووری کوردستان لەلایەن عێراقی عەرەبییەوە داگیرو زەوتکرابوو، ئێستا جگە لەدهۆك‌و هەولێرو سلێمانی کە بەهۆی پاراستنی هاوپەیمانانەوە رزگاربوون، شارەکانی تری وەك موسڵ‌و کەرکوك‌و خانەقین‌و هەندێك ناوچەی تر، هێشتا هەر داگیرو زەوتکراون. لەبەر ئەوە تەنیا دوو رێگە هەیە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی تیایاندا، ئەویش یا ئەبێ ئەو شوێنانە بخرێنە سەر عێراقی عەرەبی‌و کوردیان (بەدەرکردن‌و بەتواندنەوە) تیا نەمێنێ. یا ئەبێ ئەو شارانە بخرێنەوە سەر بەشە رزگارکراوەکەی کوردستان. ئەوسا ئەگەر چەند کەمینەیەکی نەتەوەیی‌و ئاینی لەکوردستاندا بمێننەوە، ئەوا مافی کەمینەیان ئەبێ، نەك مافی دروستکردنی قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ. باوەڕیش ناکەم هیچ کوردێك چاوی لەوەوە بێ مافی کەمینەکان بخوا.

لێرەدا ئەشێ کاك رێبین بڵێ: ئەوە چارەسەرکردنێکی بەعسیانەیە بۆ کێشەکە. لەوەڵامدا ئەڵێم: نەخێر، ئەوە چارەسەرکردنێکی سویسریانەو ئەمریکیانەشە کە لەگەڵ خەڵکە نەژادەکەی سویسراو هیندیە سوورەکانی ئەمریکادا کران. لەهەمان کاتدا ئەو چارەسەریەشبوو کە کێشەی زۆربەی نەتەوەکانی سۆڤیەت‌و یوگوسلافیاو هەندێ وڵاتی تری فرەنەتەوەی پێچارکرا بەجیاکردنەوەیان لەیەکدی. بەکورتی کێشەی وڵاتی فرە نەتەوە کە لەسەر بنچینەی زەوتکردنی یەکدی دروست بووبێ. یا بەتواندنەوە، یا بەجیابوونەوە چارەسەر ئەکرێ‌و چارەسەرکراوە، رێگەی سێیەم، تەنیا لەخەیاڵی ئەو کەسانەدایە کە شوێن کڵاوی بابردووی دیموکراسی کەوتوون. لەبەر ئەوە کاك سەلاح ئەحمەد لەسەر رەوایە کە لە(هاولاتی)٢٢/١٠/٢٠٠٣ دا ئەڵێ: (کەرکوك بووە بەمەڕی مەلود کە دەبێ بەبەشرێتەوە).

هەموومان ئەزانین کە مێژووی پەلکێشکردنی عەرەب بۆ پارێزگای کەرکوك، زۆر کۆن نیە. دە ئێستا من تازەترین ئاماری ئەنجومەنی شارەوانی ـ نوسینگەی راگەیاندنی قەزای داقوقی سەر بەکەرکوکم لەبەردەستدایە، بۆ نمونە بەپێی ئەو ئامارە: ناوچەی (تازە) بەمجۆرەیە:

ژمارەی گوندەکانی تازە: ٢٨ گوند

ژمارەی گوندە عەرەبنشینەکان: ٢١ گوند

ژمارەی گوندە تورکماننشینەکان: ٥ گوند

ژمارەی گوندە کوردییەکان: ٢ گوند

ناوەندی ناوچە (ناحیە)کەش تێکەڵەیە لەهەر سێ رەگەزەکە.

باشە ئەوە، بەخشینەوەی کەرکوك نیە، بەسەر عەرەبدا؟ ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە چارەنووسی کەرکوك، بەهەر هۆکارێکی دیموکراتیانەی وەك هەڵبژاردن، یا راپرسی، کەوتۆتە دەس عەرەبە هاوردەکان؟ ئیتر چۆن ئەبێ رێبین بەسەلاح بڵێ: (ئەمجۆرە نوسینانە کە لەخۆیانەوە شانی پیادەکەن‌و بەمەیلی خۆیان شت دروستدەکەن‌و هێرشی دەکەنە سەر، جگە لەنەخۆشیەکی رۆشنبیری ترسناك هیچی دی نیە) بەتایبەتی رێبین لەهیچ جێگەیەکی وتارەکەی‌و وەڵامەکانیدا هێمایەك بۆ ئەوە ناکا کە ئەبێ ئەو عەرەبە هاوردانە بگەڕێنرێنەوە سەر زێدی خۆیان. نەك هەر ئەوە، بەڵکو رێبین خۆی ئەڵێ دژی ئەو کوردستانیبوونەی کەرکوکە ئەگەر ئەو عەرەبانە، نەك هەر نەگەڕێنەوە بۆ شارەکانی

پێشوویان، بەڵکو ئەگەر وەك میوانیش قبوڵ کرێن! وەك لەم دەقەیدا دەرنەکەوێ: (کەرکوك بەشێکە لەکوردستان، بەڵام ئەگەر بەدەستهێنانەوەی ئەم مافە بەمانای میوانکردنی تورکەکانو عەرەبەکانی ئەو شارەبێ، بەمانای ئەوە بێت تورکو عەرەبەکان هیچ مافێکیان تیا نەبێ، ئەوا من یەکەم کەسم دژی ئەمجۆرە کوردستانیبوونەم)!! لەلایەکی تری وەڵامەکەیدا، رێبین زیاتر پێ لەسەر ئەم دیدەی دادەگرێو ئەڵێ: (کورد هەنووکە لەکەرکوکدایەو زۆرینەی ناوەندە گرنگەکانی بەڕێوەبردنی ئەو شارەی بەدەستەوەیە.. کاریان هاتوهاولرو ئیستیفزازکردنی نەزعەی نەتەوەیی، نەتەوەکانی تری ئەو شارە نیە، بەڵکو هەنوکە کاری ئەوان بریتیە لەباوەشکردنەوە بۆ هەموو هاوشارییەکی ئەو شارە بەدەر لەئینتیمای نەتەوەییان، بریتیە لەکارکردنی کردەگی بۆ گەڕانەوەی ئاوارەکانو مافدانەوە بەو کەسانەی مافەکانیان زەوتکراوە) بێئەوەی رێبین رەچاوی ئەم راستیانە بکات:

١- زۆرینەی ناوەندە گرنگەکانی بەڕێوەبردنی کەرکوکو قەزاو ناوچەکانی، هەنوکە بەدەست کوردەوە نیە، ئەگەر مەبەستی خودی پارێزگارو چەند فەرمانبەرێکی تری کوردە، ئەوا ئەوانە لەئاستی ئەو واقیعە تالکراوەی کەرکوکدا دەستەوستانن.

٢-ئاوارەکان چۆن بگەڕێنەوە یا بگەڕێنرێنەوە بۆ ئەو پارێزگایە کە ئاوا بەو جۆرە عەرەبڕێژ کرابێ؟!

٣- ئاخۆ چۆنو بەچ شێوەیەك ماف ئەدرێتەوە بەو کەسانەی مافەکانیان زەوتکراوە، لەکاتێکدا ئەو مافانە لەبندەستی زەوتکارەکاندابێو بەپێی رێبینیش نابێ لەگوڵ کاڵتریان پێبوترێ!؟ لەکۆی ٢٨ گوند لەناوچەیەکی وەك (تازە)دا ٢٢ گوندی لەژێر دەسەڵاتی عەرەبو پێنج گوندی لەژێر دەسەڵاتی تورکمانو بۆ کوردەکەش تەنیا ٢ گوند مابێتەوە!!

تا لێرەوە ئەکرێ بازێك بدەین بەرەولای ئەو رۆشنبیرانەی خەریکی بانگەشەی ریفراندۆمن کە من لەچەند رووبەڕووبوونەوەیەکدا پێم وتوون: ئەو راپرسییەی ئەوان ئەشێ ببێتە هۆی ئەوەی گەڵ شوێنی وەك موسڵو کەرکوکو خانەقینو چەندین قەزاو ناوچەی تری کوردستانمان لەدەستبچێ، بۆ؟ چونکە ریفراندۆم، دیاردەیەکی دیموکراتیانەیە، هەر بەپێی ئەو بنەما دیموکراسیە، خەڵکی ئەو شوێنە کوردستانیانەی ئێستا کورد تیایاندا بۆتە کەمینە لەچاو رەگەزە سەپێنراوو هاوردەکانی تردا، بۆیان هەیە بڵێن: (وەرن راپرسی لەو شارو شارۆچکەو ناوچەو گوندانەشدا بکەن کە ئێمەی تێداین، بزانن زۆرینەی ئەو ناوچانە ئەیانەوێ بچنە سەر کوردستان یا سەر عێراق؟) بێگومان ئەوسا زۆربەیان کە کورد نین، دەنگ بۆ ئەوە ئەدەن کە بچنە سەر عێراق! بەوەش کوردستانەکەی ئێمە ئەمێنێتەوە سەر دوکانی بەکرو سێ قاڵب سابوونەکەی دهۆکو هەولێرو سلێمانی، جا ئەگەر کورد بەئەنجامێکی لەو جۆرە رازیبوایە، ئەوا هەر لەبەیانی یازدەی ئازارەوە، کێشەکەی بەنیوەناچڵی چارەسەر ئەکرا!!

ئەوەیە ئەنجامی چارەسەری دیموکراتیانە بۆ کێشەی کورد کە رێبین هەردیش بانگەشەی بۆ ئەکات بێگێڕانەوەی هاوسەنگی بۆ ترازووی لاسەنگ! ئەوەتا بەڕاشکاوی ئەڵێ: (مەسەلەی کەرکوك هەر ئەوە نیە تورکو عەرەبیشی تێدا دەژی، بەڵکو مەسەلەکە ئەوەیە هەر سێ نەتەوەکە بانگەشەی خاوەندارێتی دەکەن) لەهیچ شوێنێکی وتارەکەیشیدا، هێمایەك بۆ ئەوە نابینین کە رێبین بانگەشەی عەرەبی هاوردە بۆ خاوەندارێتی کەرکوکی کوردستان، بەناڕەوا بزانێ، ئایا ئەوە لەوە ناچێ ژمارەیەك

دز، یان راگوزار، یا میوان بچنە سەر ماڵێکو دوایی بڵێن: لەبەر ئەوەی ژمارەی ئێمە لەخاوەنماڵەکە زیاترە، ئیتر ماڵ ماڵی خۆمانە؟ یا وەك ڕێبین مەبەستێتی، بڵێن: ئێمە سیانو خاوەن ماڵ یەك، لەبەر ئەوە ماڵەکە، سێ بەشی بۆ ئێمەیەو یەك بەشی بۆ خاوەن ماڵ! ڕاستییەکەی، دیموکراسیەکەی ڕێبین، بەپێی خوێندنەوەی نوسینەکانی، ئەنجامێکی لەو جۆرە ئەگەیەنێت! کەسیش نازانێ چی لەدڵی مەستیاردا هەیە! بۆیە ئەشێ لێرەدا لەکاك ڕێبین بپرسین، ئایا تۆ لەچ ڕێگەیەکەوە ئەتەوێ کوردستانیبوونی کەرکوك بسەلمێنی؟ ئەگەر ڕێگەکەت، هەر ڕێگەی ئەو جۆرە دیموکراسیەیە کە دزو خاوەن ماڵ بکاتە هاوبەش، ئەوا ئەو ڕێگەیە تا ئێستا لەهیچ کام لەو جێگایانەدا پەیڕەو نەکراوە کە خۆت لەوەڵامەکەتدا ناویانتهێناوە، وەك: قودس، کشمیر، ئەلزاسو لۆرین، ئەسکەندەرونەو قبرس، ئیتر بۆچی ئەتەوێ ئەم تاقیکردنەوە دیموکراتیە سەیرو سەمەرەیە لەسەر حسابی کورد بەسەر کەرکوكو عێراقدا بسەپێنی!؟

گریمان وابێ وەك ڕێبین ئەڵێ: (دیموکراتی بەحوکمکردنی زۆرینەدا ئەناسرێتەوە. بەڵکو بەفرەییو پاراستنی مافی کەمایەتیو کۆمەڵگای مەدەنیدا بناسرێتەوە) لێرەدا پرسیار ئەوەیە: ئایا ئێستا عێراقو کەرکوكو کوردستانیش، ئەو زەمینە بەپیتەیە کە ئەو جۆرە دیموکراسیەی تیا سەوز ببێ!؟ ئایا ئەو سیستەمەی ڕێبین باسی ئەکا کە شتێکی تیانەبێ ناوچەی پەراوێزبێ، ئەوە نەك لەعێراقدا، بەڵکو لەئەورووپاو ئەمەریکاشدا، سیستەمێکی لەو جۆرە هەیە!؟ ئایا ئەم قسەیەی ڕێبینو هاودیموکراتیەکانی ڕێبین، لەقسەی ئەو کەسانە ناچێ کە خەیاڵ لەکانیەك ئەکەنەوە گورگو مەڕ پێکەوە ئاوی لێبخۆنەوە!؟ دواجار، گریمان ئەو خەوو خەیاڵانە، ڕۆژێك ئەبێ بێنەدێ، ئاخۆ ئەو ڕۆژە، دوای چەند چەرخی تر، لەعێراقاو کەرکوکدا بێتەدی!؟ لەبەر ئەوە ڕێبین وتبێتی یا نەیوتبێ، ئێمە ئەگەر بەتەمای دیموکراسیەکەی کاك ڕێبین بین، ئەبێ تا ئەو ڕۆژەی کە دەنگی هەیەو ڕەنگی نابێ، هەر لەپەراوێزدا بین، ئەو لەپەراوێزبوونەش، دەیان ئەنفالی تری بەدوادادێ. ئنجا ئەشێ ژیانی من ئەوەندەی بەبەرەوە نەمابێ، خوا بکا برا عەرەبو تورکمانە دیموکراتیەکانی ڕێبین، ئەو بپارێزن لەو ئەنفالە چاوەڕوانکراوانە ئەگەر باشووری کوردستان هەر لەبندەستی عێراقدا مایەوە.

هەموو ئەو ئەنجامانە، ئەوەمان بۆ دەرئەخا کە کێشەی وڵاتی فرە نەتەوە کە لەسەر بنچینەی زەوتکردنی یەکدی دروست بووبێ، یا بەکەڵەگایەتی لایەنێك یا بەدابەشکردنی ئەو وڵاتە چارەسەر ئەکرێ کە هەر لایەو بگەڕێتەوە سەر زێدی خۆیو خۆی فەرمانڕەوای خۆیبێ. ئەو فەرمانڕەوایەتیەش، مەرج نیە لەیەکەم ڕۆژیەوە دیموکراتی بێ. خۆ ئەگەر بووش، ئەوا باشتر، چونکە عەرەب واتەنی: (مالا یدرك کلە، لایترك کلە)، لەراستیشدا لەهیچ وڵاتێکی ئەم دنیایەدا، ڕێنەکەوتووە لەیەکەم ڕۆژی دروستبوونی دەوڵەتێکەوە، دیموکراسی پیادەکرابێ، کەسیش دەوڵەتی خۆی ڕەفز نەکردووە لەبەر ئەوەی دیموکراسی تیا پیادە نەکراوە، بەڵام ئەشێ کەسانێك ڕژێمێکی نادیموکراتی ڕەفز کەن، نەك دەوڵەتەکە. لەسەردەمی بەعسدا، هەزاران عەرەب عێراقیان بەجێهێشت، بەڵام کەسیان داوای هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عێراقیان نەکرد. بەڵکو تەنیا داوای گۆڕینی ڕژێمەکەیان ئەکرد. تەنانەت ئەو یەك کەسەی (لەکۆی ٢٥ ملیۆن) حاشای لەجنسیەتی عێراقیبوونی خۆی کرد (وەك ڕێبین ئەڵێ) ئەویش داوای نەمانی دەوڵەتی عێراقی نەکردو وەك ڕێبین سەد جار لەعنەتی لەو دەوڵەتە نەکرد!

ئەگەرچی ئەشێ لەعنەتی لەرژێمەکەی صدام کردبێ. منیش و هەموو کەسێکی تری وەك من ئەو دەوڵەتە بەچاك ئەزانین کە دیموکراتی و پاراستنی مافی هاوڵاتیان رەچاو بکا. بەڵام کەسێکی فامیدە شکنابەم وەك رێبین بڵێ: (ئەو دەوڵەتەی بوون و مەرجی دروستبوونی نابەستریتەوە بەدیموکراتی و پاراستنی مافی هاوڵاتیانەوە، نەبوونی لەبوونی گەلێك باشترە). چونکە ئەشێ دەوڵەتێك دیموکراتی نەبێ و مافی هاوڵاتیانی تیا نەپارێزرێت لەسەردەمی رژێمێکی ئەو دەوڵەتەدا، بەڵام لەسەردەمی رژێمێکی تردا، وا نەمێنێ، بەڵام لەنەبوونی دەوڵەت، لەپاشاگەردانی زیاتر، چیتر سەوز نابێ.

ئەو دنیایەش هەروابووە، دەوڵەتەکان، هیچیان لەپڕێ نەبوونەتە کوپێ، دەوڵەت کە پێناسەکەی بریتیە لە: (جیاکردنەوە لەنێوان حاکم و مەحکوم دا) واتا لەنێوان ئەوەی دەسەڵاتی بەدەستەوەیەو ئەوەی دەسەڵاتی بەدەستەوە نیە لەکۆمەڵدا، بەچەندین جۆرە قۆناغدا تێپەڕیوە، وەك دەوڵەتی ناوەندی و دەوڵەتی ناناوەندی (لامرکزی)، دەوڵەتی خاوەن سەروەریی و تەواو و دەوڵەتی خاوەن سەروەریی ناتەواو وەك ئەوانەی ژێر ئینتیداب و ژێر پاراستن و ژێر سپاردە(وصاية)، دەوڵەتی سادەو دەوڵەتی ئاوێتە وەك فیدراڵی و کۆنفدراڵی، دەوڵەتی دەستوریی و هی نادەستوری، دەوڵەتی پاشایی و هی کوماری، دەوڵەتی دیکتاتوری و هی دیموکراتی و.. هتد، دەسەڵاتەکانی فەرمانڕەوایانیش بەرەبەرە کەمبوونەتەوە تا گەیشتۆتە دەوڵەتی دیموکراتی کە ئەویش هێشتا دەوڵەتێکی تەواو دیموکراتی و نمونەیی لەم دنیایەدا لەدایك نەبووە، ئنجا خۆ دنیاش هەر لەیەك ترێکلدا نامێنێتەوە.

لەوانەیە لەئایندەدا دەوڵەتی وا بێتە ئاراوە کە چەندین جار لەدەوڵەتی دیموکراسی چاکتربێ، بەتایبەتی ئێستا دەوڵەتە دیموکراتیەکان، ئەگەرچی لایەنی باشیان زۆر تێدایە، بەڵام لایەنی خراپیشیان تێدایە کە ئەمەیان باسێکی تایبەتی ئەوێ.

لەبەر ئەوە، من ئێستا، خراپترین دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیم لاپەسەندترە لەچاکترین دەوڵەتێك کە بەشێك لەکوردستانی بندەست کردبێ، چونکە دەوڵەتە سەربەخۆ کوردیەکە، چاوەڕوانی چاکبوونی لێئەکرێ، بەڵام دەوڵەتە ئاوێتەکەی سەردەستی بەشێك لەکوردستان، زیاتر چاوەڕوانی خوێنڕژانی چەندین جارەی تری لێئەکرێ، ئنجا کێش ئەڵێ ئەو دەوڵەتە کوردیە سەربەخۆیە، دیموکراتی نابێ و مافی هەموو هاوڵاتیان و هەموو کەمینەکانی تیا پارێزراو نابێ؟ بۆیە داوای من لەکەسێکی وەك کاك رێبین و هەموو رۆشنبیرێکی تر و هەموو کوردێکی دڵسۆز ئەوەیە: فەرموون با هەموومان پێکەوە کارئامێر (میکانیزم)ێك دروستکەین بۆ کوردستانێکی سەربەخۆ و دیموکرات کە هەموو مافێکی رەوای تیا پارێزراوبێ، یا لەقۆناغی قسەوە بگوێزینەوە بۆ قۆناغی کارکردن.

با ئێمە چێنەری ئەو تۆوە بین بۆ ئەوەی ئەگەر خۆشمان بەرەکەی نەخۆین، نەوەکانمان پێی شادبن، جۆری ئەو کارئامێرەش، وەك پێشتر بەڵێنم دابو، جێگەباسی وتارێکی ترمان ئەبێ.

# جەماوەری کوردستان بەگشت کەرت و توێژەکانییەوە خوازیارن هەرچی زووترە بەرگی شۆڕشگێڕی لەبەر خاوەن فایلەکان دا بماڵدرێت و دادگایی بکرێن

دوابەدوای سەرکەوتنی ئۆپەراسیۆنی رزگاری عێراق، چەند کێشەو گرفتێك سەری هەڵدا، یەکێك لەو گرفتانەی کە بووە مایەی سەرسوڕمان و تێڕامان لەنێوان گومان و راست و ناڕاستیدا.. مەسەلەی ئاشکرابوونی فایلی بەرپرسە شۆڕشگێڕەکانی دوێنێ بوو، کەلاف و گەزافیان لێدەدا گوایە کوردپەروەرو شۆڕشگێڕ بوون، بەڵام دەرکەوت کە پەیوەندی ژێراوژێریان بەسەختترین دوژمنی گەلی کوردەوە هەبووە، کە ئەم پەیوەندی کردنەش دەچێتە خانەی خیانەتی نیشتمانیی و ناپاکییەوە.

پاش ئەم ئاشکرابوونە، فایلەکان هەر بەهەڵواسراوی مایەوەو هیچ کام لەحزبەکان هەڵوێستیان نەبوو، بەڵام وا بەشێنەیی لەلایەن چەند رۆژنامەیەکی ئەهلی بوێرو جەربەزەوە ناوە فایلی سیخوڕەکان ئاشکرا دەکەن.. هەر بۆ ئەم مەبەستە جەماوەری کوردستان بەگشت کەرت و چین و توێژێکەوە خوازیارن هەرچی زووترە ئەو کەسانە لەپلەی بەرپرسیتی لابرێن و دادگایەکی تایبەتیان بۆ دابنرێت بۆ دادگاییکردنیان.

**زانیار قرگەیی/ سلێمانی**

**کامیل ژیر**

**پارێزەر لەدادگای سلێمانی**

**نووسەری سیاسی:**

لەراستیدا ئەو فایلانە هی ئەو شۆڕشگێڕانە بێت یا هی هەر کەسێکی دیکە بێت بەتایبەتی هی کەسێکی کورد، خۆی بۆ خۆی شتێکی نادروستەو ئەچێتە خانەی ناپاکیی نیشتمانییەوە، بەتایبەتی ئەوانەی کەوا خەڵکی تریشیان ئەزیەت داوە یا خەڵکیان بەگرت داوە یا خەڵکیان راکێشاوە بۆ ئەندامێتی حزبی بەعسی لەگۆڕنراو.

لەڕاستیدا بەرامبەر بەوانە من وەکو یاساناسێك رایەکی یاسایی دەردەبڕم ئەویش ئەوەیە ئەوانە چەند جۆرێکن، جۆرێکیان ئەوانەن کە خەڵکی تریان ئازار داوە.. جا ئازاردانەکە خەڵکیان بەگرت دابێ، یا بەکوشت دابێ ئەوانە بێ قەیدو شەرت دەبێ دادگایی بکرێن و سزای خۆیان وەربگرن، بۆ ئەم مەبەستەش من لەدیمانەیەکی تردا، رای خۆم دەربڕیوە کە دەبێت دادگایەکی تایبەتی دابنرێ بۆ ئەوانە، چونکە دادگا ئەمەی کە ئێستا هەیەو لەدەسەڵاتی دادوەریدا هەیە بەپێی یاسای سوڵتەی قەزایی، ئەم جۆرە دادگایە کە دادگای ئاساییێن و لەهەموو وڵاتێکدا هەن، بەپێی بەڵگەنامەو مستەمسەکاتی تەواو نەبێت دەستیان گیراوەو ناتوانن هیچ بڕیارێکی حوکم دەرکەن، بۆ کەسانێکی لەو

جۆرەش بەڕاستی ڕەنگە ئەوەندە بەلگە کۆنەکرێتەوە لەسەریان، بەلام لەبەردەمی دادگایەکی تایبەتیدا کە کەمتر خۆی دەبەستێتەوە بەدەقە یاساییەکانەوەو زیاتر وەکو دادگایەکی عورفی مامەڵە دەکات، زیاتر بەقەناعەتی دادگا حوکم ئەدرێ بەسەر ئەو کەسانەدا، بەباوەڕی من ئەبێت دادگایەکی تایبەتیان بۆ دابنرێتو بدرێن بەو دادگا تایبەتییە بۆ ئەوەی هەر کاتێك ئەو دادوەرانە قەناعەتیان پەیداکرد، ئیتر بەپێی ئەوە کاربکەنو فەرمانی حوکمی خۆیان دەربکەن، ئەوە ئەوانەی فایلیان گیراوەو لەئەنجامی ئەوەدا لەپاڵ ڕژێمدا بوون، جۆرێکی تر هەن لەمەرکەزی مەسئولیەتدان، جا لەمەسئولیەتی حکومەتی هەرێمدا یاخود مەسئولیەتی حزبدا بێ لەیەکێك لە حیزبەکاندا ئەو جۆرە کەسانە کەمترین کارێك کە بەرامبەریان ئەنجام بدرێت ئەوەیە کە دەبێت یەکسەر لەمەرکەزی مەسئولیەت لابرێن، ئەگەر تاوانیشیان ئەنجامدابێ بێگومان دەبێت دادگایی بکرێن، ڕەنگە خەڵکانێکی تریش هەبن بڵێن لەناچاریدا یان لەترسدا یان قوتابی بووبێ لەبەر ئەوەی لەشوێنێکی باش وەربگیرێ یان دابمەزرێ وەرەقەیەکیان لێ وەرگرتووە، هەر ئەو کاغەزە بووەو هیچی تر کە هەرچەندە ئەوەش ئەبوایە نەبوایە، چونکە مرۆڤێك خۆڕاگربێت نیشتمان پەروەربێت نابێت بۆ وەزیفە نە سەردانەوێنێت نە مل کەچ بکات، ئەگەر حەمالی یان کرێکاری بکات زۆر لەوە باشترە وەزیفەیەکی دەست بکەوێت لەڕێی ئەوەی ئینتیما بکات بۆ حزبێکی تری وا کە دوژمنی نەتەوەکەی بێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو کەسێك ئەو پاڵەوانەو ئەو توانایەی نییە، جا ئەو جۆرە کەسانە ئەکرێ فەرمانێکی بەخشین (عەفویەك) یان بۆ دەربکرێت بەو مەرجەی کە جارێکی دیکە کردەوەیەکی وا بۆ هیچ داگیرکەرێکی کە ئەنجام نەدات ئەوانە کارەکەیان تۆزێك ئەهوەنترە، بەلام بۆ کەسێك هۆشیار بێتو ڕۆژێك لەڕۆژان ناوی نیشتمانپەروەری یان حزبایەتیو بەرپرسێتیان هەبووبێ بچێت ئەوە بکات بەڕاستی ئەوە دەچێتە خانەی ناپاکی نیشتمانییەوەو پێویستە ئیجرائاتیان بەرامبەر بکرێت، ئەوانەی هەڵدێن بۆ دەرەوە کە فایلیان گیراوە ئەگەر حزبەکە ڕەوانەی دەرەوەیان بکات ئەوە بێگومان کارێکی زۆر ناپەسەندە، بەلام ئەگەر خۆیان هەڵبێنو دەرچن لەمەسئولیەت ئەوە شتێکی ترەو لەدەسەلاتی کەسدا نییە هەر کاتێك بەردەست کەوت ئەوجا ئیجرائاتی بەرامبەر دەکرێت.

بەدواداچوونێک لەسەر وتارێکی بەڕێز ئاسۆس هەردی ـ (هاوڵاتی) ژمارە(١٥٧) ڕۆژی ٢٠٠٤/١/١٥

# با منیش قسەی خۆم بکەم

نوسینەکەی کاک ئاسۆس هەردی لەژمارە (١٥٦)ی ڕۆژی ٢٠٠٤/١/٧ی ڕۆژنامەی ڕێزداری (هاوڵاتی)، هانیدام منیش قسەیەك بکەمو بڵێم: بۆ لەپارتیو یەکێتی ناڕازین!؟ ئاخر ئێستا سەردەمی ئازادیو دیموکراتی نیە!؟ ئەی ئەوانیش مافی خۆیان نیە چۆنیان پێباشبێ، وا سیاسەت بکەن؟ کراسی ستراتیج چ پێویستە!؟ ئەی مرۆڤ بەڕووتی لەدایك نابێ؟ بۆ ڕەخنە لەشەڕەکانیان ئەگرن؟ ئایا شەڕ یەکێك نیە لەغەریزەکانی مرۆڤ؟ ئەوە نیە هەزاران کەس بلیتی گرانبەها ئەکڕن بۆ سەیری شەڕەبۆکسو زۆرانبازیو فلیمی جەنگ. خۆ ئاژەڵو پەلەوەریش گیاندارن وەك ئێمە، ئەگەر شەڕەقۆچی مەڕو شەڕە دەنوکی کەو ڕەوابێ، بۆ ئەبێ شەڕە چەکی پێشمەرگەش ڕەوا نەبێ!؟ دەی خۆ ئەوانیش لەوە زیاتریان نەکردووە.. یاریکردن بەداشی دامە، وەك یاریکردن بەداشی پەرلەمانە، پەرلەمانیش پەرلەمانی خۆیانە، ڕۆژێك پەنجا بەپەنجا، ڕۆژێك دوو لەت، ڕۆژێك پەنجاو یەك بەچلونۆ، ئێستا ئێکسپایەر، سبەینێ جۆرێکی تر! پەرلەمانتارەکانیش ڕۆژێك خۆیان ئەبەستن بۆ جەنگ، ڕۆژێك هێورو بێدەنگ، تا ئیمێلێکی حیزبیان ئەگاتە دەس، دەنگ نادەن بۆ هیچ بڕیارێکو بەهیچ کەس.. کەی ئەو دوو حیزبە باسی سەربەخۆیی کوردستانیان کردووە؟ بۆ بوختانیان بۆ ئەکەن!؟ ئایا مافی خۆیان نیە بووکی ڕازاوەی خەیاڵیان، عێراقێکی یەکگرتووبێ؟ ئەوپەڕی ئاواتیان فیدراڵی پارێزگاکان، یا فیدراڵی نیوەی باشووری کوردستان بێ؟ ئەوە جاران کەرکرك دڵو قودسی کوردستان بوو، ئێستا ئەوەی دەسبەرداری موسڵ بێ، دەسبەرداری کەرکوکیش ئەبێ، یا دوای ئەخات بۆ دوای دەستوورو دوای هەڵبژاردن، یا ناوێکی تازەی بۆ دائەهێنێ وەك (شاری ئاوکۆیی) ئاوکۆیی نێوان دە هەزاریو جلخواریو حەوتەغاری. کێ ئەڵێ بۆ ئەم داهێنانە تازەیە، بەراتەی ئیختراعێك وەرناگرن؟ گرنگ پاداشتە پاداشت!! یا هەستکردنە بەگەورەیەتی. ئەو هەستکردنەیە وا لەکەسانێك ئەکات بەهیچ کورسیەکی حوکمی ناوچەیەکی سروشتی خۆیان ڕازی نەبن، نە لەهەولێرو نە لەسلێمانی، بەڵام بۆ کورسیی حوکمیی پایتەختی دەوڵەتێکی دەسکرد کە بەبەشێك لەنیشتمانێکی تر ناونەبرێ، بەخێرایی ئیشك، تا بەغداد بۆی رابکەن..

بۆ ئەوەندە خۆتان بەکردنەوەی گرێی دوو ئیدارەکەی کوردستانەوە خەریك ئەکەن؟ چ جیاوازییەك هەیە لەنێوان خواردنی خوانێکدا لەدوولاوە بەجیا، یا لەناوەڕاستەوە پێکەوە!؟ بۆ ئەتانەوێ بیردۆزە بەناوبانگەکەی ئەنشتاین، بیردۆزەی ڕێژەیی، بەدرۆ بخەنەوە. ڕاستە خاوەن فایلەکان لەچاوی ئێوەوە ئەبێ شەرمەزار بن، بەڵام لەچاوی ئەوانەوە ئەبێ ڕێزدار بن! ئەوەندە ناویان مەهێنن و مەیانخەنەوە بیر، با هەموویان ئەکرێن بەوەزیرو گزیر.. خزمایەتی ڕەگی گوڵ نیە، چیی تیایە، جاران خزمانی جافو هەمەوەندو هەرکیو مزووری، ئێستا خزمانی ڕومادیو ڕاویو بەیاتیو جبووری..

ئەو خەڵکە ئەوەندەی دەمیان ئەخەنە کار بۆ ئامۆژگاریی پارتیو یەکێتی کە دەمێکە قۆناغی ناکامییان تەواوکردووەو لەوسەری مەسەلەکان دێنەوە، ئەوەندە دەستیان بخەنە کار بۆ کارێکی بەکۆمەڵ تا ئەوەی بەوان ناکرێ، یا نایانەوێ بیکەن، ئەمان خۆیان بیکەن، باشتر نیە؟؟

رۆژنامەی ڕێنزداری (هاوڵاتی) ژمارە (١٦٠) ڕۆژی ١١/٢/٢٠٠٤

# ترازوو

## لەوەڵامی هەرایەکدا لەسەر بڕیاری ١٢٧

ئەو هەرایەی ئەئەویست، گریمان بڕیارەکە لەلایەن هەر سیازدە ئەندامە شیعیەکە، یا لەلایەن هەموو ئەندامانی ئەنجومەنی دەسەلاتەوە لەبەغدا، دەرئەچوو، گریمان بڕیارەکە ئەبوو بەیاساو لەرۆژنامەی فەرمیشدا بلاوئەکرایەوەو کاری پێ ئەکرا، یا گریمان دەسەلاتی هاوپەیمانانیش ئەو بڕیاری (١٢٧)ەی لەبەر خاتری ریشەکەی سیستانی، یا لەترسی هەڕەشەکان ئال صەدرو ئال حەکیم پەسەند ئەکرد. بۆ نا؟ ئەی دیموکراتی مانای چی؟ ئەی حیزبکارانی کورد هەمیشە نەیانوتووەو نالێن ئۆتۆنۆمی یا فیدراڵی بۆ کوردستانو دیموکراسی بۆ عێراق؟ ئەی عەرەب بەگشتیو شیعە بەتایبەتی، زۆرینەی عێراق نین؟ ئەی ئەوانە هەموو موسوڵمان نین؟ ئایا مافی خۆیان نیە بەپێی شەریعەتی ئیسلامی کاربکەنو واز لەو یاسای باری کەسێتی ژمارە (١٨٨)ە بهێنن؟

ئێمە تاکەی، بێ ئەوەی ترازووی سوودو زیان بۆ خۆمان بخەینە کار، بۆ خەلکی تر بگرین!؟ بەتایبەتی ئەگەر ئەو خەلکی ترە ئەیاریش بێ!! ئەیارەکەش ئەوەندە رق ئەستور بێ مردنی خۆیو زیانی ئێمەی بوێ!! فەرموو ئەوەتا حیزبکارانی کورد، لەراهی خواداو بێ ئەوەی راپرسییەکی گشتییان کردبێ لەکوردستاندا، بەسەری رووتو دەستی بەتاڵەوە رایانکردووە بۆ بەغدادو هاوار ئەکەن: (ئێمە ئامادەین واز لەقەوارە سیاسییە سەربەخۆکەی باشووری کوردستان بێنین لەپێناوی عێراقێکی یەکگرتوو و نیمچە قەوارەیەکی فیدراڵیدا) کەچی ئەوان ئەوەشمان پێ رەوا نابینن، لەکاتێکدا فیدراڵی دژو پێچەوانەی سەربەخۆیی ئەو کوردستانەیە کە بۆتە سەرچاوەی ژیان بۆ ئەوان، ئەوە هەشتا ساڵە بەنەوتو ناوی ئێمەوە کوڕێنی دەکەن. بابڕۆ زیاتر، ئەو چەند دێرەی سەرەوە، لەم وتانەی خوارەوەدا، شیبکەینەوە:

بڕیاری (١٢٧)ی ئەنجومەنی دەسەلات، ئەگەر بشخرێتەکار، پەیوەندیی بەناوچەی حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە نیە، ئەویش بەپێی برگەی دووەمی بڕیاری ژمارە (١١)ی ڕۆژی ٣١/٨/١٩٩٢ ی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان کە ئەڵێ: (کار بەو یاساو رێساو بڕیارو ئامۆژگاریانە ناکرێ کە لەدەسەلاتی حکومەتی ناوەندییەوە دەرچوون، یا دەرئەچن، دوای کێشانەوەی ئیدارە حکومەتییەکان لەکوردستان لە ٢٢/١٠/١٩٩١دا، مەگەر دوای دانانی بەرەوایەتیی کارپێکردنیان لەهەرێمدا لەلایەن ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانەوە) ئنجا ئەم دەقە بۆ ئێستاو بۆ ئایندەی فیدراڵیش (خوانەخواستە) هەر وائەبێ، چونکە ئەم جۆرە یاسایانە لەهەموو دەوڵەتێکی فیدراڵدا، لەناوچەیەکی فیدراڵیەوە بۆ ناوچەیەکی فیدراڵی تر، ئەشێ جیاواز بێ.

بەو جۆرە، ئەو بڕیاری (١٢٧)ە، ئەگەر خراپیش بێ، ئەوا بۆ پەزەکەی ئێمە زیانی نیە، مەگەر حیزبکارانی کوردستان، لەبەر خاتری چاوی رەشی برا سەردەستەکانیان، گوێ بەو بڕیارەی پەرلەمانیش ئەدەن! لەسیاسەتیشدا هەموو ئەگەرێك شیاوی بوونە!! کەواتە ئەو هەرایەی ژنانو

ئافرەتانی دەڤەری خۆمـان، ناویانەتـەوەو خۆپێشـاندانی بـۆ ئەکـەن، هەرایـەکی رەواو بیـانوودار نیـە، چونکە:

–ئەگەر بنەمای دیموکراسی رەچـاو بکـەین، ئـەوا خـەڵکی خۆیـان سەرپـشکن لەهـەر بڕیارێکدا بـۆ خۆیان.

– ئەگەر یاسای پارێزەری رەچاوکەین، ئەوا کەس بۆی نیـە ببێتـە پـارێزەری کەسـێکی تـر تـا ئـەو کەسـە بریکارنامەیـەکی بـۆ ئەکاتـەوە، یـا دەسـەڵاتێك ئەیکاتـە بریکـار بـۆی، هـیچ بریکارنامـەو بەبریکارکردنێکی لەو جۆرەش بۆ ئێمە لەئارادا نیە.

– ئەگەر دەستیاوین، ئەوا بەدرێژایی ساڵانی کۆکوژیو ئەنفالی ئێمە، خەڵکی ئەو دەڤـەری عێراقـە، هەرایەکو خۆپێشاندانێکیان بۆ ئێمە نەکرد.

– ئەگەر بەپێی بەکارهێنانی ترازووی سوودو زیانیش بێ، ئەوا وەك خۆیان ئەڵێن (مصائب قوم عند قوم فوائد) یا وەك کوردەکە ئەڵێ: (شینی گورگ شایی مەڕە). خەڵکانێك کە هـیچ مافێـك بەئێمـە رەوا نەبینن، بەڵکو هەرلو خۆپێشاندانیش دژمان بکەن. دیارە بڕیارێکی لەو جـۆرە کـە ئـەو نەیارانـەمان بـۆ دولوە ئەگێڕێتەوەو دووریان ئەخانەوە لەشارستانێتی سـەردەم، بێ سوود نابێ.. وەرن گـەلی خوشـكو برایان، با فێری بەکارهێنانی ترازووی سوودو زیانبین..

ئاخر ئەگەر دیاردەیەکی وەك یەکسانیی هەردوو رەگەزی نێرومـێ، روخسـاری گەشو شارسـتانێتی دەڤەرەکـەی ئێمـە پیـشان نـەدات ئـەوانیش پاشەکـشێ لەشارسـتانێتی نەکـەن، چـۆن لەپێـشبڕکێدا گرەوەکە ئەبەینەوە؟

بسم الله الرحمن الرحيم

قرار (١٣٧)

قرر مجلس الحكم بجلسته المنعقدة بتاريخ ٢٩/١٢/٢٠٠٣ مايلي:

١. تطبيق أحكام الشريعة الإسلامية فيما يخص الزواج والخطبة وعقد الـزواج والأهليـة واثبـات الـزواج والمحرمات وزواج الكتابيات والحقوق الزوجية من مهر و نفقة وطلاق وتفريق شرعي أو خلع والعدة والنسب والرضاعة والحضانة ونفقة الفروع والأصول والأقارب والوصية والايصاء والوقف والميراث وكافـة المحـاكم الشرعية (الأحوال الشخصية) وطبقاً لفرائض مذهبية.

٢. إلغاء كل القوانين والقرارات والتعليمات والبيانات واحكام المـواد الـتي تخـالف الفقـرة (١) مـن هـذا القرار.

٣. يعمل به من تاريخ صدوره.

السيد عبدالعزيز الحكيم

رئيس مجلس الحكم

٢٩/١٢/٢٠٠٣

# دروستو نادروست لەیاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراقدا بۆ قۆناغی گواستنەوە

یاسای ناوبراو، ئەوەی پەیوەندە بەکوردستانەوە، هەندێ لایەنی دروستو هەندێ لایەنی نادروستی، لەیەك کاتدا، لەخۆگرتووە، بەپێچەوانەی بنەمای یاساییەوە کە ئەبێ گونجاویو هاوئاهەنگی لەنێوان بەندەکانیدا هەبێ. ئەوەش وا ئەکا کە بایەخی ئەم یاسایە کەمبێتەوەو خەڵکی هوشیار بەچاوی گومانەوە سەیری ڕاستگۆیەتیو بەردەوامیی بکەن، ئەویش بەم جۆرە:

یەکەم: دروست لەدیباجەکەیدا ـ هێماکردنە بۆ ئازادیو ڕێزگرتن لەیاسای نێودەوڵەتی، نادروستیش پێداگرتنە لەسەر یەکێتی عێراق.

ئاشکرایە باشووری کوردستان (ولایەتی موسڵ) بەزۆرو بەبڕیارێکی کۆمەڵی نەتەوەکان لە ١٦/١٢/١٩٢٥دا، لەئەنجامی سەنگوسوکیی نێوان بەریتانیاو تورکیاو حکومەتی فەیسەڵدا خرایە سەر عێراق، بێ خواستی کورد کە ئەوەی نەئەویست، ئەو نەویستنەش لەشۆڕشەکانی مەلیك مەحمودو ڕووبەڕووبوونەوەکانی شەریف پاشادا بوو لەگەڵ کۆنگرە نێودەوڵەتیەکانو کۆمەڵی نەتەوەکاندا، دوای ئەوە هەمان ئەو نەویستنە، لەڕاپەڕینەکەی شەشی ئەیلولی ١٩٣٠ و شۆڕشەکانی بەرزانو شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ و ڕاپەڕینەکەی ئازاری ١٩٩١و قەوارە سیاسیە سەربەخۆکەی باشووری کوردستاندا ڕەنگی دایەوە کە تا ئێستاش ئەو قەوارەیە بەردەوامە، ئەو نەویستنەش لەگەڵ بنەماکانی ئازادیو یاسای نێودەوڵەتیو مافی مرۆڤو مافی چارەنوسی گەلاندا گونجاوە. لەبەر ئەوە گوزارەی (پارلستنی یەکێتی عێراق) نەگونجانو ڕەتکردنەوەیە بۆ ئەو بنەمایانەو ئەو مافانە، بەتایبەتی لەیاسایەکدا کە هێما بۆ فیدراڵی بکات وەك ڕژێمێك بۆ عێراقی ئەمڕۆ.

فیدراڵی گرێبەستەیەکە لەنێوان لایەنەکانیدا، هەر کات یەکێك لەو لایەنانە سەرپێچیان لەبەندەکانی ئەو گرێبەستەیە کرد، مافی لایەنەکانی ترە لێی دەرچنو هەڵیبوەشێننەوەو بەبەندەکانیەوە پابەند نەبن، لەبەر ئەوە واچاکتر بوو، داڕێژەرانی ئەو یاسایە، خاڵێکی وایان تیا بنوسیایە کە مافی چارەنووسی لایەنەکانی پیشانبدایە، بێ هیچ مەرجو سنورێك هەر کات بیانویستایە، نەك دەقێکی لەو جۆرە، کە ئەبێ پابەند بن بەیەکێتی عێراقەوە.

دووەم: دروست لەمادەی چوارەمدا ـ فیدراڵیو دابەشکردنی دەسەڵاتە لەسەر بنچینەی ڕاستیە جوگرافیو مێژووییە کان؛ نادروستیش ئەوەیە کە لەمادەی پەنجاو سێدا هاتووە کە سنوری هەرێمی کوردستان بەو زەویانە دیاری ئەکات کە لە ١٩ ی ئازاری ٢٠٠٣ دا لەژێر ئیدارەی حکومەتی کوردستاندا بوون.

گومانی تێدا نیە کە ڕاستیە جوگرافیو مێژووییەکان، بەڕوونی ئەوە ئەسەلمێنن کە هەموو ئەو ناوچانەی بە (باکوری عێراق) ناو ئەبرێ، بەپارێزگاکانی موسڵو کەرکوكو دیالەشەوە، کوردستانین، ئنجا ئێستا لەو ناوچانەدا کێ ئەژی (کورد، عەرەب، تورکمان، کلدو ئاشور، یا خەڵکی کە) ئەوە هیچ

لەکوردستانیبوونی ئەو ناوچانە ناگۆڕێ. ئەوە وەك ئەوە وایە کە سەدان هەزار خێزانی کورد لەبەغداو شارەکانی کەی ناوەڕاست و خوارووی عێراق ئەژین، بێ ئەوەی لەعەرەبستانی ئەو شارانەیان گۆڕیبێ. هەروەها پەنابردن بۆ ئەژماری دانیشتوان (الأحصاء السكاني) کە لەبڕگەی (ج)ی مادەی پەنجاو هەشتا هاتبوو بۆ یەکلاییکردنەوەی ئەو زەوییانەی کێشەیان لەسەرە، بەکەرکوکیشەوە، ئەوەش نادروستی و پێچەوانەیە لەگەڵ بەشی کۆتایی مادەی چواردەدا کە ئەڵێ (نەك لەسەر بنچینەی نەتەوەیی و ئاینزایی) پارێزگای کەرکوك و پارێزگا کوردستانیەکانی تر، وەك جوگرافیا، لەسەر هەرێمی کوردستانن زوربەیان کوردبن یا ناکورد. ئەژمارکردن ئەمانباتەوە بۆ دابەشکردنی دەسەلات لەسەر بنچینەی نەتەوایەتی نەك لەسەر بنچینەی راستیە جوگرافیەکان. لەمبارەیەوە، بارزانی نەمر کەرکوکی بەدەورییەك چواند کە هی خۆی بێ لەبارەی ئەژمارەوە بەوەفدێکی راوێژکاری وت: ئەم دەورییە هی منە ئەگەرچی ئێوە پڕیشی بکەن بەشتی خۆتان.. هەروەها لەبارەی خانووبەرەیەکەوە کە هی کەسێك بێ، کرێگرتە یا زەوتکەرێك، بەخاوەنی ئەو خانووبەرەیە ناژمێردرێن با لەڕۆژانێکی زۆریشەوە ئەو خانووبەرەیەیان لەبندەستابووبێ. بەسەرچوون (تقادم) و هەقی بەدەستکەوتوو (الحق المكتسب) بەرامبەر خاوەندارێتی (الملكيه) نیە، هەروەها بەرامبەر راستییە جوگرافیەکان.

سێیەم: دروست لەمادەی شەشەمدا ـ ئەوەیە: عێراق وڵاتێکی فرە نەتەوەیە گەلی عەرەب لەناویدا بەشێکە لەنەتەوەی عەرەب، نادروستیش بێ دەنگبوونی یاساکەیە لەبارەی گەلی کوردەوە کە دارێژەری یاساکە ئامادە نەبووە دان بەوەدا بنێ کە بەشێکە لەنەتەوەی کورد، ئەوەش وەك پەندە کوردییەکەیە (بانێکەو دوو هەوا).

چوارەم: دروست لەمادەی پەنجاو هەشتا ـ ئەوەیە کە ئەڵێ حکومەتی عیراقی کاتێ کێشە خانووبەرەییەکان چارەسەر ئەکات و ئەو ستەمانە لائەبات کە رژێمی پێشوو کردبوونی لەبارەی گۆڕینی دانیشتوانی هەندێ شوێنی دیاریکراوەوە، کەرکوکیش لەناویاندا. نادروستیش ئەوەیە کە لەبڕگەی (ج)ی مادەی شازدەدا هاتووەو ئەڵێ: (هاوڵاتیانی عێراقی مافی تەواوو بێ مەرجیان هەیە کە ببنە خاوەن موڵك لەهەموو ناوچەیەکی عێراقدا بەبێ هیچ رادەیەك).

چاکتر وابوو ئەم یاسایە ئەو بڕگەیەی دانەنایە، هیچ نەبێ، لەماوەی قۆناغی گواستنەوەدا بەتایبەتی بۆ کەرکوك کە ئەم شارە لەزۆر بەندەکانی کەی ئەم یاسایەدا هەڵاوێردراوە، چونکە بەپێی ئەو بڕگەیە، نیشتەجێکراوە عەرەبەکان ئەتوانن لەم پارێزگایە ملکێکی زیاتر بکڕن و تیا نیشتەجێ ببن ئەگەر موڵکەکانی ئێستایان لێ بسەندرێتەوە بەوە قورەکە زیاتر لیتاوی ئەکەن و سودێك لەمادەی پەنجاو هەشتدا نامێنێ.

پێنجەم: دروست لەسەرجەمی یاساکەدا ـ دانپیانانە (بەرووکەش) بەرژێمی فیدراڵیدا لەعێراق، نادروستیش ئەوەیە کە (بەناوەڕۆك) لەو رژێمە لایداوە لەزۆر بەندەکانیدا.

ئەوەی ئەگۆڕە لەوڵاتە یەکگرتووە (فیدراڵی)یەکاندا، ئەوەیە کە یەکگرتنێکە دوو، یا زیاتر لەدوو لایەن، ئەگرێتەوە لەیەك دەوڵەتدا، لەگەڵ پاراستنی سەربەخۆیی ناوخۆو ئەو لایەنانەدا لەڕووی دەستوریی و یاسادانان و دادوەریی و کارگێڕی خۆیانەوە. بەو جۆرە، پێوانەی فیدراڵی لەسەر دوو بنکەیە،

یەکەم: بەشداربوونی ئەو ئەندامانەی یەکێتییەکەی پێکهێناوە لەدانانی ئەو یاساو بڕیارانەدا کە لەدەسەڵاتی ناوەندییەوە دەرئەچن، ئەو بەشداربوونەش، هی ئەو ئەندامانە، لەئەنجومەنی دەوڵەتۆکە، یا ولایەت یا هەرێمەکان (ئەنجومەنی باڵا)وە بەدیار ئەکەوێ، کە لەو ئەنجومەنەدا، ئەندامەکان یەکسانن، بنکەی دووەم: سەربەخۆیی ناوخۆیە بۆ هەر یەك لەلایەنەکانی یەکگرتنەکە، هەر یەك لەوان دەستورو یاساکانی خۆیان دائەنێن‌و دەسەڵاتەکانی جێبەجێکردن‌و دادوەریشیان هەیە، بەڵام ئەم (یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراقە لەقۆناغی گوستنەوەدا) لەو دوو بنکە یاساییە گشتییە دەرچووە، ئەویش بەوەی ئەنجومەنی هەرێمەکان (ئەنجومەنی باڵا)ی تێدا نیە کە ئەندامەکان تیایدا بەیەکسانی خۆیانی تێدا بنوێنن، سەرباری کۆمەڵەی نیشتمانی (الجمعية العامة ـ أو البرلمان) کە ئەندامەکان بەپێی ڕێژەی دانیشتوانی ناوچەکان لەخۆی ئەگرێ بۆ هەر هەرێمێك. ئەوەشی کە لەمادەی بیست‌و چواردا هاتووە کە حکومەتی عێراقی گوێزەرەوە لەئەنجومەنی نیشتمانی‌و ئەنجومەنی سەرکردایەتی‌و ئەنجومەنی وەزیران پێك دێت.. هتد، ئەوە ئەو ئەنجومەنەی بە (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی، یا سەرکردایەتی) ناوبراوە، جێگرەوەی (ئەنجومەنی باڵا، یا ئەنجومەنی هەرێمەکان) نیە، چونکە ئەندامەکان یەکسان نین تیایدا، بەڵکو ئەوە ئەنجومەنێکی هەڵبژێردراو ئەبێ لەلایەن کۆمەڵەی نیشتمانی (الجمعية الوطنية) بەپێی مادەی سی‌و شەش، کارەکەشی ئەوەیە وەك سەرۆوەریی عێراق خۆی ئەنوێنێ‌و سەرپەرشتیی کاروباری باڵای وڵات ئەکات، کۆمەڵەی نیشتمانیش دەسەڵاتی لابردنی هەریەك لەئەندامەکانی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی هەیە بەهۆی نەبوونی توانا یا ناپاکیانەوە، بەو جۆرە دەرئەکەوێ کە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی هیچ پەیوەندییەکی بەئەنجومەنی هەرێمەکانەوە نیەو جێگرەوەی ئەو نیە، چونکە ئەنجومەنی هەرێمەکان لەنوێنەری هەرێمەکان پێکدێن‌و ئەوان دیارییان ئەکەن‌و ژمارەشیان یەکسان ئەبێ‌و کاریان یاساکاری ئەبێ نەك سەرپەرشتی کاروباری باڵای وڵات. ئەو دیارنامە (لوائح)ە یاساییانەی ئەنجومەنی نیشتمانی ئامادەی ئەکەن، ئەبێ ئەنجومەنی هەرێمەکان پەسەندی بکەن، ئەگینا ڕەتئەکرێنەوەو نابنە یاسا. لەبەر ئەوە ناکرێ دەوڵەتێکی فیدراڵی بەبێ ئەنجومەنێکی هەرێمەکان ببێ، بۆیە دەوڵەتی عێراق لەقۆناغی گواستنەوەدا، بەپێی ئەو یاسایە، جگە لەدەوڵەتێکی سادە کەلامەرکەزی یا ئوتونومی یا فیدراڵی ئیداری ڕەچاو ئەکات بۆ هەندێ ناوچە، چیتر نیە، ئەو شتانەش، هەرکات دەسەڵاتی ناوەندی بیەوێ، ئەتوانێ بەیاسایەکی ئاسایی نەیانهێڵێ، ئنجا ئاخۆ فیدراڵی چاکترین چارەسەرە بۆ وڵاتێکی فرەنەتەوەو فرە ئایەفەو فرە ئاین؟!

# چارەسەرکردنی کێشەکانی کورد لەڕێگەی یاسای نێودەوڵەتییەوە

ئەوە ناونیشانی ئەو کۆڕە بوو کە زانکۆی سلێمانی ـ کۆلیجی زمان ـ لیژنەی رۆشنبیری بۆ هەردوو بەرێز: د. فەرەیدون رەفیق حیلمی و پارێزەر کامل ژیر سازیکرد لەهۆڵی کۆلیجی پزیشکی، کاتی ١٠ی بەیانی رۆژی ٥ شەممە ٢٩/٤/٢٠٠٤.

سەرەتا د. مۆگر محمود فرەج، هەردوو ناوبراوی پێشکەشکرد، ئنجا پارێزەر کامل ژیر بابەتەکەی خۆی بەمجۆرە پێشکەشکرد:

نامەوێ خۆم بکەم بەمامۆستاو وانەیەك بڵێمەوە، ئەمەوێ دەرگایەك بکەمەوە، هەمووومان پێکەوە لێوەی بچینە ناو جیهانی یاسای نێودەوڵەتی و بزانین ئاخۆ ئەکرێ کێشەکانی نەتەوەکەمان لەڕێی ئەو یاسایەوە چارەسەر بکەین؟

با کێشەکان بکەین بەسێ کۆمەڵەوە:

**١-کێشەی بژاردنی ئەو زیانانەی بەهۆی کردەوەکانی ئەنفال و کیمیاباران و گوندە تێکدراوەکان و خەڵکە ئاوارەکراوەکانەوە لێمانکەوتووە.**

**٢-کێشەی ئەو هەموو سامانی سەرزەوی و ژێرزەوییەی کوردستان کە براوەو ئەبرێ بەتاڵان، یا ئەو هەموو دزییەی لەرێژەی ١٣٪ەکەی بڕیاری نەوت بەرامبەر بەخۆراك ٩٨٦ کراوە.**

**٣-کێشەی نەبوونی سەربەخۆیی کوردستان و ئەو هەڕەشانەی لەبوونی نەتەوەییمان ئەکرێ.**

مادەی ١١ بڕگەی ٢ لەپەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان کە ساڵی ١٩٤٥ لە سان فرانسیسکۆ واژۆ کراوەو تا ئێستاش کاری پێئەکرێ، لەبارەی مەبەستەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، ئەڵێ: (بۆ کۆمەڵەی گشتی هەیە لەهەر مەسەلەیەك بکۆڵێتەوە کە پەیوەندییەکی هەبێ بەپاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتییەوە، هەر کام لەئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان، یا دەوڵەتێك ئەندام نەبێ تیایدا، بەرزی کاتەوە)، هەروەها مادەی ٣٥ بڕگەی ٢ ئەڵێ: (بۆ دەوڵەتی نائەندام لەنەتەوە یەکگرتووەکان هەیە، ئەنجومەنی ئاسایش یا کۆمەڵەی گشتی، وریاکاتەوە بۆ هەر کێشەیەك خۆی لایەنێك بێ تیایدا).. تێگەیشتنی ئەم دوو مادەیە، ئەم ئەنجامانە ئەدات بەدەستەوە:

أ-ئەبێ کێشەکە، دەوڵەتێکی ئەندام، یا نائەندام، بەرزی کاتەوە، واتا جگە لەدەوڵەت، بۆ کەسێك، لایەنێك یا گەلێك نیە ئەو کارە ئەنجام بدات.

ب-ئەندامێتی لەو کۆمەڵەیەدا، مەرجێك نیە بۆ بوونە دەوڵەت، واتا ئەشێ دەوڵەتێك دەوڵەت بێ ئەگەرچی ئەندام نەبێ لەکۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکاندا.

جگە لەو دوو مادەیە، بەپێی مادەی ٣ش لەدەستووری بنچینەیی دادگای دادی نێودەوڵەتی، جگە لەدەوڵەت بۆ کەسی تر نیە ببێتە لایەنێك لەو دلوایانەدا کە لەو دادگایەدا ئەکرێن.

بەپێی ئەو سێ مادەیە، نەتەوەی کورد، تا پێش ساڵی ١٩٩٢ بۆی نەبوو، سکاڵاکانی خۆی بخاتە بەردەم کۆمەڵی نەتەوەکانو دادگای دادی نێودەوڵەتی، چونکە نە خۆی دەوڵەت بوو، نەدەوڵەتێکیش ئەو کارەی بۆ ئەکرد, جگە لەیەك جار نەبێ کە مەنگولیا ویستی کێشەی کورد بخاتە بەردەم ئەو کۆمەڵەیە، ئەویش هەر زوو پەشیمان بووەوە بەهۆی گوشاری دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە..

بەڵام دوای ساڵی ١٩٩٢ مەسەلەکە گۆڕرا، کورد لەبەشێك لەباشووری کوردستاندا، بوو دەوڵەت.

### ئێستا بابزانین دەوڵەت چییە؟ یا چی دەوڵەتە؟

هەموو زانایاران (فقهاء)ی یاسا، لەسەر ئەوە کۆکن کە دەوڵەت بریتییە لەسێ توخم: (گەل، هەرێم، حکومەت) واتا لەهەر کاتێکدا حکومەتێك فەرمانڕەوایی گەلێك لەهەرێمێکدا بکات، دەوڵەت هەیە، یا ئەوە دەوڵەتە، کەواتە ئەو قەوارە سیاسیەی باشووری کوردستان، دەوڵەتە، کە دەوڵەتیش بوو ئەتوانێ دەنگو کێشەکانی نەتەوەی کورد، بخاتە بەردەم کۆمەڵی نەتەوەکان، یا دادگای دادی نێودەوڵەتی، ئیتر ئەوەش هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێ کە ئەم قەوارە سیاسیە، دەوڵەتی دێ ژوور ( De Jure) یا دەوڵەتی دێ فاکتۆ (De Facto)یە، هەروەها ئەوەش گرنگ نیە کە لەئاستی نێودەوڵەتیدا دانی پیانراوە یا نا، ئەگەرچی لەهەندێ رووەوە دانیشی پیادانراوە، چونکە دانپیانان، یا ڕاستەوخۆ ئەبێ، یا ناڕاستەوخۆ. ئەم قەوارەیە بەوەی کە هەندێ دەوڵەت مامەڵەی لەگەڵدا ئەکات، وەك ئاڵوگۆڕی بازرگانی، ترانسێت، کردنەوەی نوێنەرایەتی حکومەتی هەرێم لەزۆر وڵاتداو.. هتد ئەوانە هەمووی دانپیانانی ناڕاستەوخۆن.

پێشکەشکردنی کێشەکانیش، بەدوو ڕێگە ئەبێ: ڕێگەی ڕاستەوخۆ لەلایەن حکومەتی هەرێمەوە خۆی. ڕێگەی دووەم لەلایەن بریکارێکی حکومەتەوە. لەم ڕووەوە مادەی ٤٢ لەدەستوری بچینەیی دادگای دادی نێودەوڵەتی ئەڵێ: (لایەنەکانی کێشەکان، بریکارەکانیان، نوێنەرایەتییان ئەکاتو بۆیان هەیە پەنا بەرنە بەر ڕاوێژکارانو پارێزەران لەبەردەم دادگاکەدا).

ئەوانە بەگشتی لەبارەی کۆمەڵە کێشەی یەکەمو دووەمەوە، واتا بۆ داواکردنی قەرەبووی ئەو زیانانەی لەکورد کەوتووە بەهۆی ئەنفالو کیمیابارانو وێرانکاریو ئاوارەکردنەوە، یا بۆ ئەو زیانانەی لەئەنجامی تالانکردنی سامانی ژێرزەویو سەرزەویو لەئەنجامی ئەو دزیانەی لەبەشی کوردستان لەبڕیاری ٩٨٦ لەکورد کەوتووە یا کراوە، بەڵام بۆ سێیەم، واتا سەربەخۆیی، بابزانین یاسای نێودەوڵەتی ئەڵێ چی؟ بڕگەی (٢) لەمادەی (١)ی پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان کە ئەو پەیمانە یەکێکە لەسەرچاوەی یاسا نێودەوڵەتییەکان، ئەڵێ: (گەشەدان بەپەیوەندیی دۆستانە لەنێوان نەتەوەکاندا لەسەر بنچینەی ڕێزگرتن لەو بنەمایەی یەکلاییکردنەوەی ماف لەنێوان گەلاندا ئەنجام ئەداتو بۆ هەریەکێکیان هەیە چارەنووسی خۆی دیاری بکات)، هەروەها مادەی (٥٥) لەهەمان سەرچاوە ئەڵێ: (بۆ خواستی هۆکانی ئارامیو خۆشگوزەرانیی پێویست بۆ پەیوەندی دۆستانەی پتەو لەنێوان نەتەوەکاندا کە لەسەر ڕێزگرتنی بنەمای یەکلاییکردنەوەی ماف لەنێوان گەلاندا دامەزرابێو بۆ ئەوەی هەریەکێکیان دیاریکردنی چارەنووسی خۆی هەبێ). کەواتە مافی دیاریکردنی چارەنووس،

بەمافی جیابوونەوەو راگەیاندنی سەربەخۆیشەوە، مافێکی دانپیانراوە لەڕووی یاسای نێودەوڵەتییەوە، بەڵام ئەمەیان مافێك نیە یا کێشەیەك نیە کە لەکۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان، یا لەدادگای دادی نێودەوڵەتی، یا لەهیچ سەرچاوەو دامودەزگایەك، داوا بکرێ؛ بەڵکو ئەمە مافێکە، هەر گەلێك بۆی هەیە بەخۆی رەوا ببینێ، یا بۆ خۆی رابگەیەنێ، بەڵام ئەگەر هاتوو هەر لایەنێك، یا دەوڵەتێك هەڕەشەی لەو گەلە کرد، یا پەلاماری دا بۆ ئەوەی ئەو مافەی لێ زەوت کات، ئەوا ئەوسا، ئەو گەلە بۆی هەیە پەنا بەرێتە بەر یاسای نێودەوڵەتی و دەزگا نێودەوڵەتییەکان بۆ ئەوەی بیپارێزن، بەپێی مادەکانی ٣٩ و ٤٠ و ٤١ و ٤٢ و ٧٧ لەپەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەوەبوو بینیمان هاوپەیمانان، بەبێ داواکردنی گەلی کوردیش ناوچەی ئارامیان بۆ باشووری کوردستان دابینکرد بەپێی بڕیاری ٦٨٨.

## بەڕێزان، ئامادەبووانی کۆڕ:

من نامەوێ وەك کۆڕە ئاساییەکانی کە، بەدەستی بەتاڵ بڵاوەی لێبکەین، ئەمەوێ ئێوەش لەگەڵ ئێمەدا خاوەن بڕیارین، ئەگەر ئێمە بەردی بناغە دابنێین، ئێوە دیوارەکە تەواوکەن، فەرموون ئێوەش لەگەڵماندا، با هەموومان وەڵامی پرسیارە چارەنووسسازییەکان بدەینەوە:

یەکەم: ئاخۆ بۆ چارەسەرکردنی کۆمەڵە کێشەی یەکەمو دووەمی سەرەوە، واتا بژاردنەوەی ئەو زیانانەی لەنەتەوەکەمان کەوتووە. کام ڕێگا کردەییانەترو ئەنجامدارترە؟ ڕێگای یاساو دەزگا نێودەوڵەتییەکان؟ یا ڕێگای وتووێژ لەگەڵ داگیرکەرلندا؟ یا بێدەنگیو چاوەڕوانی قەدەر؟ یا ڕێگای توندوتیژی؟ یاخود ئێوە ڕێگایەکی کە شك ئەبەن کە من نەیزانم؟ جگە لەوە، ئایا بەرپاکردنی کێشەکانمان لەدەزگا نێودەوڵەتییەکاندا، هەر هیچ نەبێ، هۆکارێك نیە بۆ ئەوەی کێشەی کورد لەئاستی ناوچەییەوە بگوێزرێتەوە بۆ ئاستی نێودەوڵەتی؟

دووەم: بۆ کێشەی نەبوونی سەربەخۆیی، بابزانین ئەگەر هەر ئێستا پەرلەمانو حکومەتی هەرێم جیابوونەوەی ئەم قەوارە سیاسییەی خۆی، لەعێراق، راگەیاندو بانگی سەربەخۆیی بۆ دا، ئاخۆ بەوە دنیا ژێرەوژەبەر ئەبێ؟ بۆ وەڵام: باخراپترین کاردانەوە ڕەچاو بکەین، با وای دابنێین ئێرانو تورکیاو سووریاو عێراق پەلامارمان ئەدەن، یا ئابڵوقەی ئابووریمان ئەخەنە سەر. لەئاستی ئەگەرێکی وادا، ئاخۆ ئەوانە سەرکەوتوو ئەبن؟ ئەوانە ئەگەر ئەوەیان لەتواناندا بوایە، ئایا بەرامبەر بەقەوارە سیاسییە تەمەن دوازدە ساڵەکەمان، خراپتریان ئەنەکرد؟ ئایا ئێستا ئێرانو سووریای ناو بازنەی (محوری شەڕ) لەترسی کڵاوەکەی خۆیان، زاتی هەنگاوێکی لەو جۆرە ئەکەن؟ ئایا تورکیای ئێستا، تورکیاکەی زەمانی ئەتاتورکە کە یەکێتی سۆڤێت پشتی بگرێ؟ یا تورکیاکەی زەمانی تانسوچیلەرو بلند ئەجەویدە کە ئەمریکا پشتی بگرێ؟ ئایا دوای رمانی بلوکی ئیشتراکی، ڕۆژئاوا کارێکی ئەوتۆی بەتورکیا ماوە؟ ئایا تورکیا ئەوەی بەسەرەوە ئەچێ کە ڕێگەی بەسوپای ئەمەریکا نەدا، بێتە عێراقەوە کاتی داگیرکردنی عێراق. لەبارەی عێراقیشەوە، عێراقەکەی سەدام حسەین نەیتوانی پەلاماری ئەم قەوارە سیاسییەمان بدات، ئێستا عێراقی لەیەك هەڵوەشاوەی لاواز ئەتوانێ ئەوە بکات؟ لەبارەی ڕۆژئاواشەوە، ئێستا ئەورووپا بەگشتیو ئەمریکا بەتایبەتی بەدەست تیرۆرەوە ئەناڵێنن، لەم

ناوچەیەشدا جگە لەکورد کەسی تریان دۆست نیە، لەبەر ئەوە، بەلگەنەویستە کە پشتی کورد بەرنادەن، ئەوەش نەك لەبەر چاوی کاڵی ئێمە، بەڵکو بۆ بەرژەوەندی خۆیان، یا بۆ بەرژەوەندی هاوبەشمان، لەبەر ئەوانە هەمووی، سەربەخۆیی کوردستان، یا هیچ نەبێ جاریێ هی باشوور، ئەو وەهمی کاری نەکردەیە نیە کە لەلای هەندێ کەس و لایەن دروست بووە! ئەوانە ئەشێ لەسەر ڕەوا نەبن کە ئەڵێن جارێ کاتی سەربەخۆیی نەهاتووە. ئەی کەی ئەو کاتە دێت؟ ئەوانەی ئەڵێن: ئێمە فیدرالیەکمان بۆ دەستەبەر ناکرێ، سەربەخۆیی چۆن؟ ئەشێ ئەوە دیدوبۆچوونێکی ڕاست نەبێ. چونکە فیدراڵی پێویستی بەرەزامەندیی لایەنەکانی ترە. فیدراڵی، گرێبەستەیە، لەنێوان چەند لایەنێکدا، بێ ڕەزامەندیی هەموویان، فیدراڵی دروست نابێ. جگە لەوە، تاکە گەرەنتییەك بۆ فیدراڵی، دیموکراسیە، دیموکراسیش کراسێك نیە لەچرکەیەکدا بێتە گۆڕین، ڕۆژئاوا بەسەدان ساڵ گەیشتنە ئەم دیموکراسیەی ئێستایان، ئاخۆ سوننەی فەلوجەو شیعەی نەجەف و دەوروبەرەکانیان، کەی لەکلتووری بەعس ئەشۆرێنەوەو ئەبنە دیموکراتی!؟ ئنجا ئەوانە کەوابن، ئایا ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی، کردەییترو ئاسانترو ئەنجامدارتر نیە؟ ئەشێ ئەوانەش کە چاوەڕوانی ڕەزامەندیی هاوپەیمانان، یا ئەمریکان بۆ سەربەخۆییمان، لەسەر ڕەوا نەبن، ئەوانە لەخۆیانەوە بەوە ڕازی نابن، ئەبێ ئەوانە ناچار کرێن و بخرێنە ئەمری واقیعەوە، ئایا لەهەندێ وڵاتی تردا، ناچار نەکران؟

سێیەم: ئایا ئەم پەرلەمان و دوو حکومەتی هەرێمە، کارو ئەنجامێکی وایان لێ چاوەڕوان ئەکرێ؟ ئەگەرنا، ئەی دەوری میللەت چی ئەبێ؟ ئایا وشەی میللەت، بەڕەهایی، هیچ واتایەك ئەبەخشێ؟ ئایا دروست بوونی ڕایەکی گشتی نابێتە ڕێکخەرو ئاڕاستەکەری میللەت؟ ئەی ئەو ڕا گشتییە لەخۆیەوە دروست ئەبێ؟ ئاخۆ ئەکرێ ئەم کۆڕە بکرێتە یەکەم بەردی بناغەی ڕایەکی گشتی و دوایی پەرەی پێ بدرێ و پەرلەمانی داهاتووی کوردستانی پێ موتوربە بکرێ لەپێناوی چارەسەرکردنی کێشەکانی کورد لەڕێگەی یاسای نێودەوڵەتی و دیموکراسییەوە؟

دوای ئەوە د. فەرەیدون ڕەفیق حیلمی وتەکانی خۆی پێشکەشکرد کە هاوئاهەنگ بوو لەگەڵ وتەکانی پارێزەر کامیل ژیردا. باسی لەشارەزایی و زانیارییەکانی خۆی کرد لەبارەی چۆنیەتی پەرلەمان و دەوری ڕای گشتی کە لەماوەی چل و سێ ساڵی ژیانی خۆی لەئەورووپادا بەدەستی کەوتووەو وتی: پەرلەمان ئەبێ نوێنەری میللەتبێ، کاتێکیش ئەبێتە نوێنەری میللەت کە نائیبەکان بەئازادی و لەکەشێکی دیموکراتییانەدا هەڵبژێردابن و هەر کەس بزانێ نوێنەری ناوچەکەی خۆی کێیە، بۆ ئەوەی هەمیشە بچێتە لای و کێشەکانی ناوچەکەی لا باس بکات و ئەویش هەوڵی چارەسەرکردنیان بدات، ئەوەش بەهەڵبژاردنی تاکەکەسی ئەبێ نەك بەلیستە. هەڵبژاردن بەلیستە، فێڵە، لەمیللەت ئەکرێ. کەس نازانێ نوێنەری ناوچەکەی خۆی کێیە!؟ کێشەکانی میللەتێك بەگلەیی و بۆڵەبۆڵ چارناکرێ. لێرە خەڵکی هەمیشە خەریکی بۆڵەبۆڵن! بەسە ئیتر، با خەریکی چارەسەرکردن بین، یا هەنگاوی کردەیی بنێین، چارەسەرکردنی کێشە گشتییەکان لەڕێگەی پەرلەمانەوە ئەکرێ، واتا لەڕێگەی دیموکراتییەوە، پەرلەمان خاوەنی بڕیارە، پەرلەمان ئەتوانێ وەزیرەکان و دەسەڵاتی

جێبەجێکردن بهێنێتە گیروگاز، لێیان بپرسێتەوە، باوەڕیان لێبکێشێتەوە، بیانداتە دادگا لەسەر خراپەکارییەکانیان. نابێ پەرلەمان هی حیزب بێو هەر چاوی لەقسەی سەرۆکی حیزبەکەیەوە بێ. با کاریکرێ بۆ یاسای هەڵبژاردن بەجۆرێکی گونجاو لەگەڵ ئەو مەبەستانەدا، با کاریکەین بۆ سەربەخۆیی.

دوای ئەوە، نۆرەی وتەی ئامادەبووانی کۆڕەکە هات، بەگشتی وتەکانی ئەولنیش هاوئاهەنگ بوون لەگەڵ دوو وتارەکە، بەلام ڕلو دیدوبۆچوونی تازەو جیاوازیش هەبوو بەمجۆرە:

مامۆستا جەمال بابان لەگرنگی کەناڵەکانی راگەیاندن دواو وتی ئەبێ ئاڕاستەکەربن، وتی کەی ئەمە دەوڵەتە؟ دەوڵەت ئەوەیە دلنیپیانرابێو باڵێوزی هەبێ.

مامۆستا جەمال عەبدول لەگرنگی هوشیاری میللەت دوا، لەبارەی کەرکوکو ناوچە کوردییەکانی ژێر دەستی رژێمەوە، وتی ئەو شوێنانە لەدەست دران، وەك تاریق عەزیز وتی ئەبێ بەراگوزار بەلایاندا تێپەربن.. دروستبوونی هێزی سێهەمی بەپێویست زانی لەکوردستاندا، باسی لەبزافی ریفراندۆمو کۆکدرنەوەی ملیۆنێکو حەوت سەد هەزار واژوو کرد، باسی لەکۆڕی سەربەخۆیی کردو وتی: ئەوانە چییان بەسەر هات، گلەیی زۆری لەپەرلەمان هەبوو.

د. سامان شاڵی وتی: کۆمەڵی نەتەوە یەككگرتووەکان لەدەوڵەتان دروست بوونو هەر گوێ لەوان ئەگرن، گلەیی لەو کاریەدەستە کوردلنە هەبوو کە هەمیشە ئەڵێن کێشەکەمان، کێشەیەکی ناوخۆییە، وتی رێگای ئێمە تەنیا رێگای سەربەخۆییە، ئەمیش لەگەڵ دروستبوونی هێزی سێهەمدا بوو، داوای گۆڕینی یاسای هەڵبژاردنی کردو دلوایکرد میللەت بێتە سەرجادە بۆ دلواکارییەکانی.

سەیران خان هەلگری بڕوانامەی ماستەر لەیاسای نێودەوڵەتیدا، باسی لەکێشەی سایکۆلۆجی مرۆڤی کورد کرد، وتی: تووشی کەم باوەڕی بووم، هەروەها وتی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق مافی چارەنووسی کوردی تیانیە، ئەوەشی دركان کە پێکەوە ژیان لەعێراقدا ئەستەمە.

مامۆستا محەمەد سەعید داقوقی وتی: بەدلنوسستان هیچ ناکرێو چارە گرتنی رێگەی یاسایی نێودەوڵەتییە گرنگی بەدەوری راگەیاندندا، لەگەڵ دروستبوونی هێزی سێهەمدا بوو، وتی باکۆمەك بۆ راگەیاندنو ئەو هێزی سێهەمە بکرێ.

مامۆستا نزار محەمەدی رۆژنامەنووس وتی: ئەم کۆڕە شتێکی تازەیەو بیرۆکەکانی لا پەسەند بوو، وتی دوای بڕیاری ٦٨٨ نەئەبوو کورد روو لەبەغداد بکات، وتی موعارەزە بێ هێزە، پێویستە موعارەزە هەمیشە بوونی هەبێو شەڕ لەگەڵ دەسەلاتدا بکات.

مامۆستا حەمە عەلی فەرەج وتی میللەت گوناهی نیە، میللەت زۆری کردووە، با هەمیشە باسی دەوڵەتی کوردی بکەین.

د. فەرەیدون عەبدول ستار وتی: با نەخۆشییەکان چارەسەر بکرێن ئەوسا دلوای دەوڵەت بکەین، وتاری یەككگرتوومان نیە، گرنگ ئەوەیە هەوڵ بدەین بۆ سەربەخۆیی کوردستان، نەخۆشی ناوچەگەرێتی نەمێنێ، با ئەم کۆڕلنە بەردەوام بن.

مامۆستا محەمەد سالح سەعید پێی وابوو ئەمە بەشێکە لەکوردایەتی، بادەسبەکاربین، قسەی لەپەرلەمانو دەسەلاتی سەپاو کرد، گلەیی لەفرە ئایدیا هەبوو.

پارێزەر شێخ محەمەد وتی ئیدارەیەك هەیە نەك دەوڵەت، دادگای عەدل تەنیا کێشەی دەوڵەتان ئەبینێ نەك گەلان.

پاشان د. فەرەیدون حیلمی وەڵامی ژمارەیەك پرسیاری گشتیی لاوەکانی دایەوە، دواجار د. هۆگر مەحمود رووی لەپارێزەر کامیل ژیر نا ئەگەر شتێکی هەبێ لەسەر قسەکان، ئەویش بەمجۆرە وەڵامی دایەوە:

سوپاس بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی بەدواداچوونیان هەبوو، هەموو وتەکانیان تۆمارکراون‌و سوودیان لێ وەرئەگرین، منیش هەندێك سەرنج‌و بەدواداچوونم هەیە: ئەوە تەنیا قسەی من نیە، بەڵکو هەموو یاسازانان کۆکن لەسەر ئەوەی لەهەر کوێ حاکم‌و مەحکوم هەبێ، لەوێ دەوڵەتێك هەیە. کاربەدەستانی ئەم هەرێمە ئەگەر بەخۆیان ڕەوا نابینن ئەمە دەوڵەتە، ئەوە گوناهی من نیە، لەبارەی ریفراندۆمەوە، ئەو برادەرانە زۆر ماندوو بوون، کۆکردنەوەی ئەو هەموو واژۆوە، کارێکی مەزن بوو، بەڵام ڕێبازەکەیان هەڵەبوو، ئەبوو ئەو واژۆانە بدرانایە پەرلەمان؛ پەرلەمانیش بیکردایە بەبڕیارو حکومەتی هەرێم لەسەر بڕیاری پەرلەمانی کوردستان، داواکاریی گشتپرسییەکەی بناردایە بۆ دەزگا نێودەوڵەتییەکان‌و سەرچاوە بڕیاردەرە جیهانییەکان راستەوخۆ یا لەرێگەی وەکالاتەوە. راستە کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان لەدەوڵەتان پێك هاتوون، بەڵام سەیری کێشەی میللەتانیش ئەکەن بەمەرجێك لەدەوڵەتێکەوە بەرزکرابێتەوە بۆیان، ئەوە یاسایەو دەقی یاسایی لەسەرە (ولا اجتهاد في مورد النص) ئەی بڕیارەکانی ٦٨٨ و ٩٨٦و چەندین بڕیاری تر کە گەلی کورد سوودمەندبوو لێیان، لەکوێوە دەرچوون؟.. کێشەی کورد ئەوە نیە کە یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق مافی چارەنووسی کوردی تیا نیە. گریمان ئەوەشی تیابوو، گەرەنتی چیە بۆ ئەوەی سبەینێ ئەو یاسایە ناگۆڕێت، خۆ لەدەستوورەکەی قاسمدا کوردو عەرەب هاوبەش بوون، ڕێکەوتننامەی یازدەی ئازاریش ئۆتۆنۆمی تیا بوو بۆ کورد. کوا ئەوانە چییان بەسەر هات؟

بەو جۆرە کۆڕەکە لەکاژێری ١ ی دوای نیوەڕۆدا کۆتایی هات بەچەپڵەرێزانێکی گەرم وەك نیشانەیەك بۆ ڕەزامەندیی ئامادەبووان لەبابەت‌و مەبەستی کۆڕەکە.

# کامیل ژیر: هەندێ لەئەدەبیاتی کاژێك رەنگدانەوەی هەڵبەستەکانی منن

دیمانەی: کاندیش

(کامیل ژیر) یەکێکە لەو شاعیرانەی کە لەگەرمەی زەمانێکی پڕ لەتەمۆژمی سیاسی و ململانێ و دەستپێکردنی شۆڕشدا بەجۆش و خرۆشێکی کوردانەوە تێکەڵ بەدنیای شیعری کوردی بووە.

ئەم زاتە بەشیعر هاتە ناو دنیای نوسینەوەو یەکەمین دیوانی لەساڵی ١٩٥٧ بەچاپ گەیاندووە، دوای ئەوە دیوانێکی بەناوی کوردایەتی ـــ بڵاوکردەوە، ئیدی لەساڵی ١٩٦٢ چووەتە کۆلیژی ماف و لەساڵی ١٩٦٦ خوێندنی زانکۆی تەواوکردو دوایی بو بە (پارێزەر)، بەڵام دوای ئەوەش دەستبەرداری هەڵبەست و شیعر نووسین نەبووەو هەر بەردەوام بووە، بزانین چۆن ئەم شاعیرە سێ کوچکەی شیعرو پارێزەری و سیاسەتی لەیەك کات و زەماندا بەهاوسەنگی پێکەوە گونجاندووە.

**• چۆنە لەدوای ئەوەی بوویتە پارێزەریش کەچی هەر تامەزرۆیت بۆ دنیای هەڵبەست وەك خۆی مایەوە.**

– ئەگەر کەسێ هەستیارێکی رەسەن و نەژادبێ، هەڵبەست لەدەروونیدا چەکەرە دەکات و تا تەمەنیش بەرەو زۆرر بچێ بەرهەمی جوانتر دەخاتەوە، کەسی هەستیار ئەگەر پیشەکەشی پێوەندی بەئەدەب و هەڵبەستەوە نەبێ ئەو هەر لەنووسین دانابڕێ، ئیدی من هەر بەردەوام بووم و دوای ئەوانەش لەساڵی (١٩٨٣) دیوانێکم لەژێر ناوی (جوانی) بەچاپ گەیاند، لەساڵانی (١٩٩٣-١٩٩٤) سەرجەم هەڵبەستەکانم لەسوید چاپکران، چەندین هەڵبەستی دیکەم هەیە زیاتر لەدووساڵە داومەتە دەزگا ئاراس لەهەولێر کە سەرجەمی هەڵبەستەکانمەو دەکاتە دیوانێکی نزیکەی (٥٥٠) لاپەڕە، چونکە ئەوەی سوید هەر وەك چاپنەکرابێ وایەو نزیکەی دە نوسخەیەکی گەیشتۆتەوە ئێرە، بەڵام تا ئێستا دەزگای ئاراس هەواڵیان پێنەداومەتەوەو نازانم بۆچی تا ئێستا چاپیان نەکردووە.

**• لەناو کۆلیژی ماف ــ دا گروپ و ئەزموونی شیعری دیکە هەبوون یان هەر خۆت بەتەنیا لەوێ خەریکی شیعرو هەڵبەست نووسین بوویت!**

– لەڕاستیدا زیاتر قوتابیەکان سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی یاسایی بوون و کەسێکی وانایەتە خەیاڵم کە خەریکی ئەدەبیات بووبێ، بەڵام لەدەرەوەی کۆلیژ یەکەمین هەستیارێ کە ناسیبم (جەواهیری) بو لەساڵی ١٩٥٩ لەرۆژنامەی ـ خەبات ـ ماوەیەك بووم سەرپەرشتیاری کە بارەگاکەی لەشەقامی ـ متنبی ـ بوو لەچاپخانەی جەواهیری یەچاپیان دەگەیاند، گەڵ شەو کە دەمایەوە بەدیار هەڵەچنی و چاپەوە لەگەڵ جەواهیری دادەنیشتین و شیعرمان بۆ یەکدی دەخوێندەوەو باسی ئەدەبیاتمان بۆ یەکدی دەکرد، کەڵکم لەبیدو بۆچوون و هەڵبەستەکانی وەرگرت.

**• لەئەرشیفی خۆتدا شتێك ماوە بەڵگەیی بێ وەك یادەوەری باسی بکەیت؟**

– بەداخەوە بەهۆی چەندینجار دەربەدەریو کوردایەتییەوە زۆربەی بەڵگەو ئەرشیفەکەم فەوتان، دوای ئەوەی کە چووینە ناو شۆڕشەوە، لەترسی پشکنینو هەڵکوتانە سەرماڵان زۆربەی وێنەو بەڵگەکانی کە هەمبوون بوونەتە خۆراکی ئاگر بەبێ ئاگاداریی خۆم.

**• کە ناوی ـ کامیل ژیر ـ دێت خەڵکی یەکسەر ناوی ـ کوردایەتی ـ دێتە زەینیان.**

– کوردایەتی ناوی یەکێك لەدیوانەکانمە بەر لەبەرپابوونی شۆڕشی ئەیلول بەساڵێ چاپم کرد، لەو دیوانەدا گەلێ هێمای تێدایە کە داوای ئەوەم کردووە کورد دەستبداتە چەك‌و شۆڕش بەرپا بکات بۆ سەندنەوەی مافە زەوتکراوەکانی خۆی، چونکە هەموو ڕێگە سیاسیەکانی دیکە خرێ دادەخران، بیرۆکەی ئەو دیوانە هاوزەمان بوو بەقۆناغێکی نوێی خەباتی گەلەکەمان، زیاتر لەبیرۆکەی دروستبوونی حزبی کاژیك کە من یەکێك بووم لەدامەزرێنەرانی کاژیك، ئەو بیرۆکانەی کەلەکاژێك‌و لەئەدەبیاتیدا هەبوون لەدیوانەکەمدا دیکۆمێنت کراون‌و هەندێ لەو ئەدەبیاتە ڕەنگدانەوەی هەڵبەستەکانم بوون‌و بەپێچەوانە هەندێ لەبیروباوەڕی ئەو حزبە لەهەڵبەستەکانمدا ڕەنگیان داوەتەوە هەردوولا چ هەڵبەستەکانم‌و چ ئەو بیرۆکەیە، کاژیك، کاریگەریمان لەسەریەك هەبووە، (د. جەمال نەبەز) پێشەکی بۆ دیوانەکە نوسیوەو منیش پێشکەشم کردووە بەشاگردانی ئەو بیروباوەڕە جوانەی کاژیك، جەمال نەبەز لەپیشەکییەکەدا ئاماژەی پێداوە کە ئەو بیروباوەڕە تازەیەی لەشیعرەکانمدا هەوێنی ئەدەبێ لەدوارۆژدا دەبێتەوە بەبڕوای هەموو کوردێك، چونکە لەو سەردەمەدا زۆر بیروبڕوای نامۆ مێشك‌و زەینی خەڵکی پڕکردبۆوە، کوردایەتییان بەقۆناغێك دادەنا لەمێژوودا، بەلام من ئەو کاتەش دەمگوت:

ئەڵێ کردەم جێی داخ نییە، کوردایەتیم قۆناغ نیە.

**• یەکێك لەو ڕەخنەو گازندانەی کە بەبەردەوامی ئاراستەی ڕێکخراوی کاژیك دەکرێن ئەوەیە کە گوایە بەر لەقۆناغی هاتنی داواکردنی سەربەخۆیی کە مافێکی ڕەوای گەلی کوردە کاژیك دوا قۆناغی ئەو داواکردنەی دەخستەڕوو.**

– دەمەوێ ئەو ڕاستییە بدرکێنم کە کاژیك لەئەدەبیاتەکانیشدا زۆر واقیعی بووە، کە باسی سەربەخۆیی کوردستانی کردووە، وەك مەسەلەیەکی ستراتیژی خستویەتییە بەرباس، ئەگینا ئەگەر کورد لەقۆناغێکدا شتێك لەسەربەخۆیی نزمتری دەسکەوت بووبێ، کاژیك دژایەتی ئەو دەسکەوتەی نەکردووە، بۆ نمونە حزبە شیوعیەکان کە دەڵێن (یا عمال العالم اتحدوا) ئەمە دروشمێکی ستراتیژی بوو کە وەدینەهات، هاوکات لەگەڵ داوای سەربەخۆییدا ئێمە خۆشحاڵیمان دەربڕی بەڕێکەوتنی ئازار، ئێستا هاوبیرانی نەتەوەیی لەسەربەخۆیی کەمتر بە دەسکەوتی باش نازانن، ئێمە لەساڵی ١٩٩٢ تا ئێستا دەوڵەتێکی سەربەخۆین بەپێی یاسا نێودەوڵەتییەکان بەم قەوارە سیاسییەی ئێستای کورد دەوترێ سەربەخۆ، ئەمە دەوڵەتێکی دیفاکتۆیەو ئیعترافی نێودەوڵەتیمان هەیە، کە ئیعترافی نێودەوڵەتی دوو شێوەیە، دانپیانانی ڕاستەوخۆ هەیەو دانپیانانی ناڕاستەوخۆش هەیە، ئێمە لەم بەشەی کوردستاندا ئیعرافێکی ضمنی ـ مان هەیە، ئەمەش لەو مامەڵەکردنە دەردەکەوێ کە وڵاتانی

دەرووبەر لەگەڵمان کردویانە بەدرێژایی ئەو (١٣) ساڵەی کە ئەم قەوارە سیاسییەی ئێستامان خولقاندویەتی، لەڕووەکانی دیبلۆماسی و ئابوری و ترانزێت و مامەڵەی بازرگانی و چەند پێوەندی دیکە کە بۆ خۆی ئیعترافی ناڕاستەوخۆن، بۆیە هەوڵ بدرێ بەناوی فیدرالییەتەوە ئەم قەوارە سەربەخۆییە لەدەست نەدرێ و هەوڵبدرێ بپارێزرێ باشەو زیاتر بیکەینە دەوڵەتێکی حەقیقی باشە، نەک بەناوی یەکێتی خاکی عێراقەوە، ئەم هەلەمان لەکیس بدرێ، چونکە ئەو نەتەوانەی لەعێراقدا دەژین هێشتا ئاستی هۆشیارییان نەگەیشتووە بەئاستی هۆشیاری ئەو نەتەوانەی کە لەئەمەریکادا کۆبوونەتەوە، پێکەوەژیان لەگەڵ ئەو نەتەوانەدا کوێرەوەریمان بۆ دێنێ و لەپاشەڕۆژدا لێی پەشیمان دەبینەوە.

**• باشە ئامانجەکانی کازیک چ کاریگەرییەکی لەسەر دانانی شیعرەکانت هەبووە یان شیعرەکانت بەچ شێوەیەک ڕەنگدانەوەی بیرو بڕوات بوون؟**

– من وەک هەستیارێک و کازیکیش وەک حزبێک، هەردوولا کاریگەریمان بەسەر یەکدی هەبووە، بۆ نمونە دیوانی کوردایەتی کە لەنێوان ١٩٥٨–١٩٦٠ نوسراون و کازیک لە ١٩٥٩ دامەزراوە، هەندێ لەهەڵبەستەکان کاریگەریی بەسەر کازیکەوە هەبووەو پێچەوانەش هەر ڕاستە، چونکە خۆم یەکێک بووم لەدامەزرێنەرانی ـ کازیک ـ بەگشتی زیاتر پیاو دەبێ قسەی هەق بکات، بیروباوەڕی کازیک ئیلهام بەخشی زۆر لەهەڵبەستەکانم بووە، زۆربەیان بەر لەدامەزراندنی کازکیش بەتایبەتی لەدیوانی (نازەنین) کە لەساڵی ١٩٥٧ چاپمکردووە، هەندێ لەو هەڵبەستانەم مێژویان بۆ پەنجاکان دەگەڕێتەوە کە من باسی سەربەخۆیی کوردستانم تێداکردوون، بیرۆکەی کازیکی تێدابووە، کە کاتێ باسم لەیەکگرتنەوەی پارچەکانی کوردستان بەشیعر کردووەو ئەوانەش لەدیوانەکانمدا هەن بەتایبەت لەکۆی بەرهەمەکانم کە لەدیوانێکدا چاپکراون و لەسوید چاپیان کردبو ئەو بیرۆکانەی کازیکی تێدان تەنانەت لەزۆر گۆڤارو ڕۆژنامەی کوردی ئەو سەردەمانەشدا باسم لە جۆش و خرۆشی ئەو بیروبڕوایەم کردووە کە چۆن کاری کردۆتە سەر هەڵبەستەکانم.

**• چەند شاعیرێکی دیکەیش کە نزیکبوون لەو قۆناغەی لێ هەڵبەستت تێدا گوتوون هەمان شێوە بیروبڕوایان لەهەندێ شیعریاندا ڕەنگی داوەتەوە لەوانە (ئەحمەد هەردی و محەممەد ساڵح دیلان و کامەران موکری) ئەوانیش شیعرەکانیان زۆرجار ئاموبۆی بیروبڕواکەیانی داوە ئەگەرچی جیاوازیش بن لەیەکدی، لەو ماوەیەدا بەڕێزتان چ پێوەندییەکی ئایدیۆلۆژی یان ئینسانی بەو شاعیرانەی دەبەستێتەوە).**

– لەڕاستیدا ـ کامەران و دیلان و من ـ هەرسێکمان کوڕی گەڕەکێک و شارێک بووین و لەیەکدیەوە نزیکبووین هەڵسوکەوت و هاتوچۆو پێوەندی برادەرانەمان هەبوو بیروبڕواشمان لەگەڵ یەکدی بەگفتوگۆ ئاڵوگۆڕ دەکرد، ئەوانیش کوردایەتییان دەکرد، بەلام ئەوان بەتەقلیدی و لەڕووی عاتیفەوە شیعرەکانیان تێکەڵ بەبیروبڕوای سیاسی و کوردایەتی دەبوو نەک بەو قوڵییەی کە ئێمە بەفەلسەفە کوردایەتیمان کردە ڕێبازێک بۆ خومان، ئەوان نامۆبوون بەبیروبڕوای کازیک و هیچیان لێنەدەزانی، چونکە لەو سەردەمو بارودۆخە خوێناوییە ئاڵۆزەدا کازیک زۆربەنهێنی کاری دەکرد و دوژمنی زۆربوو، هەڵبەستەکانی (کامەران و دیلان) کوردایەتی تێدایە، بەلام زۆر عاتیفانە دەریانبڕیوە، نامەوێ خۆم مەدحی هەڵبەستی خۆم بکەم، چونکە گونجاونییە، بەلام بەڕێز لەتیف قەرەداغی (ب. هەندرێن) کە

باسی لەهەڵبەستەکانم کردووە، کتێبێکی بەناوی (کامیل ژیرو مۆنراوەی نەتەوەیی، لەهەڵوێستو رەخنەدا) بەچاپگەیاندووە، هەرکەسێ بیەوێ بیروبۆچوونی ئەدەبیو سیاسی لەهەڵبەستەکانم وەربگرێ دەتوانێ لەرێی ئەو کتێبە بیانناسێ.

**• لەدوای زیاتر لەپەنجا ساڵ کە دەکاتە تەمەنی شیعری خۆت ـ کامیل ژیر ـ چ گازندەو گلەییەکی هەیە بەگشتی..!**

– گلەییم زۆرە، رەنگە هەمووی نەوترێت، ئەم دەسەڵاتە سیاسییەی کە لەکوردستاندا هەیە وەك پێویست ئاوڕیان لەبەهرەمەندانی کورد نەداوەتەوە، هەرچەندە ئێستا بەرەو باشی دەچێو ئەوەتا لەیادی ١٠٦ ساڵەی رۆژنامەگەری کوردیدا لەهەولێر ئاوڕێکی باشیان لەهونەرمەندانو هەستیاران داوەتەوە، بەهەزلرانیان رێزلێنراونو مانگانەیان بۆ تەرخان کردون، پێشتریش لەسلێمانی بەهەمانشێوە گلەییەکانم لەمانگانەو پارەو پول کە دەدرێ بەم توێژە ئاسکەی کۆمەڵ نییە، چونکە بەش بەحاڵی خۆم موحتاجی ئەوەنیم، بەڵام گەلێ ئەدیبو نووسەری دیکە هەن کە بەو رێزلێنانە باری بژێویان باش دەبێ، نووسەرو ئەدیبی برادەرم هەبووە لەو ساڵانەی دوایدا کتێبخانەکەی خۆی بۆ کەمێ خۆراك فرۆشتووە، دوای راپەرین قاتوقڕی بوو، من مەبەستم لەڕووی مەعنەوییە، منێك کە تاقیکردنەوەم لە بواری سیاسەتو ئەدەبیشدا هەیە، دیوانێکی (٥٠٠–٦٠٠) لاپەرەییم بەئامادەکراوی خستۆتە بەردەمی (دەزگای ئاراس) بەبێئەوەی داوای هیچ پاداشتێ لەو دەزگایە بکەم پێمگوتون چاپی بکەن بۆ خۆتان، کەچی چەند ساڵێکە لەوێ ماوەتەوەو چاپنەکراوە، چاپکردنی کتێبێك ئەوپەڕی رێزلێنانە بۆ ئەدیبێك کە پەنجا ساڵە خزمەتی ئەدەبی کوردی دەکات.

**• بەداخەوە لەناو کوردا بووە بەنەریت تا شاعیرو نووسەر نەمرێ، کەس مشوور لەبڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ناخوات، لەکاتێکدا خەڵکانێکی زیندوو هەن دەکرێ تا لەژیاندان دڵیان خۆش بکەن بەچاپکردنی کتێبێك یان دوو کتێبیان کە خزمەتی قۆناغێکی ئەدەبی مێژوویی رۆشنبیری کوردیان کردووە.**

– ئەمەی یەکێك لەبرادەرە شاعیرەکانم لەسەر میللەتی کورد گوتویانە بەڵگەیە لەسەر راستێتی ئەم بۆچوونەت، ئەڵێ ئێمە میللەتێکی زیندووکوژی مردوو پەرستین، بۆ نمونە ـ حەسیب قەرەداغی ـ رەحمەتی، تا لەژیاندا بوو بەکامی دڵی خۆی تامی ژیانی نەکرد، بەڵام کە وەفاتی کرد لەفیستیڤاڵێکدا بەسەرکرایەوە نیوەی ئەو پارەیەی لەفیستیڤاڵەکەیدا سەرفکرا، ئەگەر ئەو کاتەی لەژیاندا بوو بۆی سەرفبکرایە لەوانەبوو بیست ساڵی دیکە بەخۆشی بژیایە!

**• لە دیوانی کوردایەتیدا یەکێك لەهەڵبەستەکانت کە ئەوسا ولوتن بۆ بۆنەی گەڕانەوەی (بارزانی نەمر) بووە کە لە یەکێتی سۆڤیەت گەڕاوەتەوەو لەبەغدا دابەزیوو لەناو حەشامەتی خەڵکەکەدا بەدەنگی بەرز شیعرێکت وتبوو ئەگەر ئێستا بیڵێیتەوە.**

– بەڵێ گوتم (ژیان ئەمڕۆ بزەی تەڕە بزەی لێوی تێکۆشەرە).

تێکۆشەرەکە مەبەستم لەبارزانی بوو کە هێمام بۆ ئەکرد ئەو پێی خۆش بوو، خەڵکەکەش بەچەپڵەڕێزان ڕوویان تێکردم، هەر ئەوەندە، بەڵکو لەو کاتانەدا گەلێ شیعری دیکەم بۆ جۆشانی خەڵکی ئەو سەردەمە گوتووە، جارێکیان لەبۆنەیەکدا گوتم:

ئاشتی لای ئێمە ژێر دەستی نییە
ژیانی دیلی سەربەستی نییە
کاتێ کوردستان گەیشت بەهیوا
بەسەربەرزی تیاهەڵکرا ئاڵا
ئەو کاتە ئاشتی پێمان ڕەوایە
بۆ کوردایەتی کاڵای باڵایە

من وەك کوردێك تا سەربەخۆییم دەستنەکەوێ ئیدی ئاشتی ئاشتی چییە، ئاشتی نێوان گورگو مەڕ سوودی نییە یان لەیادی (٦ی ئەیلوول ١٩٣٠) کە من لەشیعری عەولە سیسە گوتومە:

ئەی شارەکەی عەولە سیسە بەڵێن بێ ئەو دەستە پیسە کە هەروا بەدەستی ئەنقەست جۆگەلەی خوێناوی هەڵبەست، تا دەگاتە ئەوەی:

بۆ تۆڵەی خوێنی ڕژاوت کوردستانی زەوتکراوت پشتێنی تۆڵە ببەستین، ئەیکەینەوەو ڕانەوەستین تا تێکڕا ئەم خاکە پاکە خاکی ئەم کوردە چالاکە ئەخەین بەدیار یەك تەنو پۆ، بەدەوڵەتێکی سەربەخۆ.

من لەو کاتەوە باسی سەربەخۆییم کردووەو ئومێدمە بۆ سەرتاسەری کوردستان بێتەدی.

**• پێش تۆ ج کەسێك هەبووە لەناو خانەوادەکەتان کە ڕێچکەی ئەدەبیاتی گرتبێتەبەر!**

– مامم کە ناوی (أ ـ ب ـ هەوری) بوو، هەروەها شێخ سەلامی شاعیر کە خاڵی باوکمە، باپیرم کە ناوی (شێخ جەلال)ە، موفتی شاربازێر بووە، باپیرە گەورەمان شێخ نیزامی ئەویش خوێندەوارێکی باشبووەو لایەنی ئاینی گرتووەو مەرقەدەکەی لەگوندی چنارەی لای دەربەندیخانەوەیە، براکەم ناوی (فازل نیزامەدین) خاوەنی فەرهەنگی شیرینو فەرهەنگی ئەستێرە گەشەیە، خەزوورێشم (شێخ حەسەنی شێخ حەمە مارف) ئەویش نووسەرێکو سیاسەتکاری ڕۆژانی خۆیبوو، ناوی هەیەو لەدەنگی گێتی تازە شتی نووسیوە خێزانو منداڵەکانیشم بەگشتی وەك بیروڕای کوردایەتی هەر هاوبیری منن.

شێخ سەلام

أ.ب. هەوری

شێخ حەسەن مەعروف

فازل نیزامەدین

# کۆنگرەی دووەمی سەندیکای پارێزەرانی کوردستان

# لەبەدواداچوونێکی (هەواڵ)دا

**ئامادەکردنی: هەواڵ**

**لە ٢٢-٢٠٠٤/٥/٢٥ لەشاری هەولێر دووەمین کۆنگرەی سەندیکای پارێزەرانی کوردستان بەڕێوەچوو. لەگەڵ ئەوەی کۆمەڵێ پێشێلی یاسایی و نایاسایی لەکۆنگرەدا پەیڕەو کراوە، بەڵام چەند ڕێچکەیەکی تێدا شکێنراوە کۆمەڵێ شەڕی مەدەنی و جوانی تێدا کراوە، لەوانە لیستی ئیئتلافی لەکۆنگرەدا نەبوو کە ماوەیەکە پەیڕەو دەکرێ و خەریکە دەکرێتە باو، دووەم جگە لەلیستی حزبەکان لیستی بێ لایەن هەبوو، سێیەم قبوولکردنی ئەنجامەکانی کۆنگرەکە بووە لەهەموو لایەکەوە.**

**هەواڵ بەدواداچوونی خۆی بۆ کۆنگرەکە کردوە بەچەند بەشێك بڵاوی دەکەینەوە بۆ ئەوەی لەکۆنگرەکانی تردا سود لەلایەنە جوانەکانی وەربگیرێ و لایەنە نەگەتیفەکانی بخرێتە لاوە.**

**<u>پارێزەر کامل ژیر:</u>**

**بەڕاستی حزبایەتی ئەمڕۆ بەڵایەکە، کێشەیەکە، کورد دووچاری بوە.**

سەرەتا چەند پرسیارێکمان ڕووبەڕووی پارێزەر "کامیل ژیر" کردەوە بەم شێوەیە:

**هەواڵ: وەك ئەوەی سەردەمێکە ڕۆشنبیران و پەرمەندانی کورد باس لەدامەزراندنی دامەزراوەی مەدەنی و جیاکردنەوەی حزب لەدەسەڵات دەکەن، دەکرێت بڵێین کۆنگرەی پارێزەران بۆ یەکەمجار بەبەشداریکردنی لیستی سەربەخۆ هەنگاوێکی عەمەلی بێت لەم ئاڕاستەیە؟**

کامیل ژیر: لەڕاستیدا هەڵبژاردنی سەندیکای پارێزەران کە لەڕۆژانی ڕابردوودا کرا هەڵبژاردنێکی ئاساییە وەك هەر ڕێکخراوێکی تری پیشەیی کە ساڵانە یان چەند ساڵێك ئەنجام دەدرێت.

ئەمە کۆنگرەش بو، هەڵبژاردنیش بو، ئەوەی ئەم هەڵبژاردنە لەهەڵبژاردنەکانی تر جیادەکاتەوە ئەوەیە لەم کۆنگرەیە لیستێکی بێلایەنان هەبو کە بۆ پلەی نەقیب کاك "گۆڤەند" و بۆ ئەندامەکانیش "فەوزیە"خان و کاك "ستار خوارەحم" و چەند کەسێکی تر بوون، بەداخەوە ئەوانیش لەژێر گوشاری حزبەکان پەشیمانکرانەوە، ئەم دوان سیانەش کە ناومان بردن، ئەمانیش لەڕاستیدا گوشارێکی زۆریان خرایە سەر، ئەوەی کەوا من بیستم لەسەرەتاوە هەوڵیاندا ئیغرایان بکەن بەماڵی دونیاو بە "منصب" و ئەو شتانە.. هەروەها قسەی خۆش. ئیمجە هەڕەشەشیان بەکارهێنا، بەڵام دوایی هەڕەشەکە زیاتر

قورسی بەست. بەواتایەکیتر گوشارەکە زیاتر چووە سەریان، ئەمانیش بڕیاریاندا کە بکشێنەوە بۆ ئەو مەبەستە بەیانێکیان دەرکردو لەبەیانەکەدا وەك من ئاگادار بوم هۆی کشانەوەکەیان پێشاندابوو، دوای ئەوەی کە بەیانەکە بڵاوبۆوە هەر لەخۆیانم بیست کە گوایە تۆمەتی ئەوەیان بۆ کراوە چەندین دەفتەر دۆلاریان وەرگرتووە لەبەرامبەر خۆکشانەوەیاندا، بەڵام ئەم کردەوەیە لەڕەوشتی ئەم برادەرانەوە دوورە من ئەم بەڕێزانە بناسم کە وەکو هاوپیشەمن لەپیشەی پارێزەریدا لەئاستێکی زۆر لەوە بەرزتردان بەپارە مەبدەئی خۆیان بفرۆشن، بەڵام ئەمان توشی کاردانەوەیەك بون بەرامبەر بەو تۆمەتانە لەڕقی ئەو تۆمەتانە جارێکی تر خۆیان کاندید کردەوە.

**هەواڵ: مامۆستا کامیل ژیر مەبەستێك هەبووە لەپشت تۆمەتو پروپاگەندەکانەوە؟!**

کامیل ژیر: دیارە مەبەستێکیان ئەوەبو بەهەموو جۆرێك دژی خەڵکی بێلایەن بوەستنەوە بەتایبەتی ئەمان دروشمی سەربەخۆیی کوردستانیان بەرزکردبۆوە کە بەداخەوە حزبی کوردی ئەمڕۆ دوورە لەو دروشمەوە، زیاتر ئەوان عێراقچێتی دەکەن، خۆیان بەکاری عێراقچێتییەوە سەرقاڵ کردوە، بەو دەورەدا ئەڕۆن کە کوردەکانی بیستەکان بەرەوپیر یەکێتی خاکی عێراق دەچون، ئەچون بۆ پایتەختو ئەو کات پیرەمێردی ئەمر هۆنراوەی (وەفدی کوردستان میللەت فرۆشان)ی بۆ وتن، ئەمە بەڕاستی ئەمڕۆ لەمانویداوە ئەمانیش دوای کیمیابارانو دوای ئەنفال ڕانەکەنەوەو ئەچنەوە بۆ بەغداو دەعوات بۆ قاتڵەکانو پیاوکوژانی کیمیاباران دەکەن، دەست دەکەنە ملیانو ئاشتیان دەکەنەوە، واتە دەتوانم بڵێم ئەمە زۆر زۆر شیعرەکەی پیرەمێردیان بەسەردا دەچەسپێو هەمان دەور دوبارە دەکەنەوە یاخود مێژوو خۆی دوبارە دەکاتەوە کە بەداخەوە ئەمە زەرەر لەکورد دەدات.

بێینەوە سەر مەسەلەی هەڵبژاردنەکە، ئەم کارەی کە ئەم چەند برادەرە بێلایەنە کردیان کارێکی ئازایانە بو و کارێکی هەقیش بو، بەڵام بەداخەوە ئەو هەموو کۆسپانەی خرایە ڕێیان بو بەهۆی ئەوەی وەك پێویست دەنگ نەهێنن، چونکە هاوسەنگی نەبو لەنێوان ئەمانو لەنێوان حزبەکاندا، حزبەکان ئەتوانم بڵێم لەسنوری ملیۆن دیناریان خەرج دەکرد بۆ ئەوەی سەرکەوێن لەو هەڵبژاردنەدا، ئیتر ئەمە بەحجزکردنی ئوتێلو بەگرتنی ئوتومبیلو بەدەعواتکردنو ئەو شتانەوە، خۆ ئەوە مافێکی خۆشیانە، هەر کەس بۆ خۆی دیعایە دەکات، بەڵکو من مەبەستم ئەوەیە کەوا هاوتای یەك نەبون لەو هەلومەرجەدا کە بۆ پاڵاوتێکی حزبی ڕەخسا لەبەرامبەر پاڵاوتێکی بێلایەندا.

**هەواڵ: مامۆستا کامیل مانشێتی کۆنگرە دەڵێ کۆنگرەیەکی پیشەیی دیموکراتی سەربەخۆ؟**

کامیل ژیر: خۆ بەقسە ئەوە زۆر دەوترێت لەڕاستیدا مادەی "٤٥" لەیاسای سەندیکای پارێزەرانیش ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە سەندیکا ڕێکخراوێکی بێلایەنی سەربەخۆیە، بەڵام خۆ شەرت نیە کە هەر لایەك دروشمێکی بڵاوکردەوەو شتێکی وت، بەکردەوەش ئەوە بکات، ئێمە بەتاقیکردنەوە بۆمان دەرکەوتووە کە بەقسە جۆرێکنو بەکردەوە جۆرێکی ترن.

**هەواڵ: دەكرێت بڵێین ئەم كۆنگرەیە هیچ دیموكراسیەتێكی تیادا نەبووە؟**

كامیل ژیر: خۆی دیارە ئەگەر دیموكراسی بوایە، چ پێویست بو ئەو گوشارە بخەنە سەر ئەمان تا پەشمیان بنەوە، چ پێویست بو هەڕەشەیان لێبكەن، چ پێویست بو تەماعیان بدەنێ؟! ئەمانە هەمووی دورن لەدیموكراسیو لەمافی مرۆڤیشەوە.

**هەواڵ: لەم كۆنفرانسەدا ئەم دوو حزبە هیچ گۆڕانێكیان بۆ دیموكراسی لێەدی دەكرا یان بڵێین ئەم كۆنگرەیە هیچ جیاوازییەكی هەبوو لەگەڵ كۆنگرەكانی پێشوودا؟**

كامیل ژیر: نەخێر ئەمان بەپێچەوانەی بێلایەنەكانەوە هیچ بەرنامەیەكیان نەبو، من نەمبینی ئەم دوو حزبە بەیانێكیان هەبێ، بەرنامەیەكیان هەبێ، بەپێچەوانەی لیستی بێلایەنەكانەوە كە بەیانیان هەبو ئامانجەكانیان نوسیبو دەسكەوتەكانیان كە لەمەودوا چی دەكەن چی بكەن، بەلام حزبەكان هیچ بەرنامەیەكی لەو شێوەیەیان نەبو بۆ ماوەی داهاتوو.

**هەواڵ: بەڕای تۆ ئەم حزبانە بۆچی لەسەندیكای سەربەخۆ بەگشتیو سەربەخۆی سەندیكای پارێزەران دەترسن؟**

كامیل ژیر: بەڵێ ئەمە یەكێ لەلایەنە خراپەكانی ژیانی حزبایەتیە بۆ میللەتێكی وەكو كورد، گەلێ زەرەرمەند دەبێت لەحزبایەتی، بەڕاستی حزبایەتی ئەمڕۆ بەلایەكە، كێشەیەكە كورد دووچاری بوە، بەهۆی حزبایەتییەوە ئێمە بینیمان شەڕی ناوخۆ چۆن هەڵگیرساو دوبەرەكی دروست بو، نیمچە حكومەتێكمان هەبو كرا بەدوو لەتەوە، تەنانەت ئەم سەندیكایەی ئێمەش چەند ساڵ پێش ئێستا جیاكرایەوە، بەلام دواتر ئێمە كە چەند كەسێكی بێلایەن بووین هەوڵێكی زۆرمان دلو توانیمان هەردوو سەندیكا یەكبخەینەوە، لەڕاستیشدا ئەو هەولانە هەموو هەوڵی خەڵكی بێلایەن بون نەك حزبەكان.

# گەمەی عێراق

## لەوەڵامی پرسیارێکدا: تاکەی بەشداریکردنی کورد لەدەسەڵاتەکانی بەغداد دروستە؟

من ناڵێم نەئەبوو کورد بەشداریی لەکردەوەی رزگارکردنی عێراقدا نەکردایە، یا لەئەنجومەنی حوکمدا بەشدار نەبوایە، چونکە نەتەوەی کورد، لەباشووری کوردستاندا، قەرزاری هاوپەیمانان بەگشتیو ئەمریکا بەتایبەتی بوو، قەرزەکەش دابینکردنی ناوچەی ئارام بوو بۆ ئێمەی کورد دوای راپەرینو دوای کۆڕەوەکە، ئەوە سەرباری بڕیاری ۹۸٦ کە بەدوای بڕیاری ٦۸۸دا لە UN ەوە دەرچوو و بوونە هۆی دروستکردنی قەوارەیەکی سیاسیی کوردیی، بەهەر سێ دەسەڵاتی یاسادانانو بەڕێوەبردنو دادوەرییەوە، جا ئەگەر کورد ئەو هاوکاریو هاوپەیمانیەی لەگەڵ ئەمریکاو بەریتانیادا نەکردایەو بەشداریی ئەو کردەوەو ئەنجومەنەی نەکردایە، ئەوا ئەکەوتە هەڵەیەکی وەك هەڵەکەی تورکیا کە ڕێگەی نەدا بەسوپای هاوپەیمانان لەوێوە بێنە عێراق لەکاتی کردەوەی رزگارکردن، یا بڵێین داگیرکردنی عێراقدا، کە ئەو هەڵەیە زۆر کەوت لەسەر تورکیاو زیاتر ئەکەوێ لەسەری لەئایندەدا، ئنجا خۆ ئەگەر شەڕ بەکۆنەقینیش بکرێ، ئەوا قینی کورد لەرژێمی ستەمکاری بەعس، لەهەموو قینێکی تر زیاتر بوو و زیاترە.

ئەوەی من ئەمەوێ لێرەدا بیڵێم ئەوەیە (گەمەی عێراق) بۆ کورد، وەك گەمەی کورسی کورسی ولیە!! ئەو گەمەیەی کە دە کەس بەدەوری نۆ کورسیدا رائەکەنو لەکاتی فیکەی ناوبڕیواندا، هەرچی چۆنێ هەڵپە بکەن، هەر تەنیا نۆکەس کورسیی بەرئەکەوێو یەکێك لەدە کەسەکە ئەکرێتە دەرەوەی گەمەکە.

بەو جۆرەو هەرجاری کورسیەك لائەبرێو یەکێك ئەکرێتە دەرەوە تا ئەمێنێتەوە یەك کورسیو یەك کەس، گەمەی عێراقیش هەرچی چۆنێ نەتەوەی کورد بەشداریی تیا بکات، لەئەنجامدا ئەمێنێتەوە تەنیا یەك کورسیی حوکمو ئەو کورسیەش تەنیا بۆ عەرەب ئەبێ، چونکە ئەگەر بەپێی زەبرو هێز بێ، عەرەب گەمەکە ئەباتەوە لەبەر ئەوەی زەبرو هێزیان زیاترە، ئەگەر بەپێی بنەمای دیموکراسی بێ، ئەوا هەر ئەوان گەمەکە ئەبەنەوە، لەبەر ئەوەی ئەوان لەعێراقدا زوربەن. بەتاقیکردنەوەش ئەو راستییە دەرکەوتووە، کە نەك هەر لەعێراقدا، بەڵکو لەهەموو وڵاتە هاوشێوەکانی عێراقدا لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەو دیموکراسیەی کە لەژێر سێبەریدا گورگو مەڕ پێکەوە ئاو بخۆنەوە، لەخەیاڵێکی خاو بەولاوە چیتر نیە، بۆیە پێویستە ئەو بەڕێزە کوردانەی لەئەنجومەنی حوکمو لەوەزیرانی عیراقدا بەشدارییان کردووە، یا بەشداری ئەکەن، تەنیا بۆ ماوەیەکی کاتی لەو جێگایانەدا بمێننەوە، با زیاتر تواناکانی خۆیان تەرخان کەن بۆ ناوچەی کوردستان، بۆ ئەوەی هەرچی زووترە، ناوچەکانی موسڵو کەرکوكو خانەقینو هەموو شوێنە کوردییەکانی تر، بخرێنەوە سەر قەوارەکەی کوردستان، چ بۆ مەبەستی فیدراڵی، یا بۆ مەبەستی سەربەخۆیی کە پێویستە سەربەخۆییەکە هەڵبژاردەی سەرەکیو یەکەمینمان بێ، لەراستیشدا تا ئێستا هەلێکی وا چاك رێنەکەوتووە بۆ سەربەخۆیی، ئەوە هاوپەیمانان لەعێراقی عەرەبیدا گوللەباران ئەکرێن، لەکوردستاندا گوڵباران، خێرو بێتەکەی عێراقیش بۆ ئەمریکاو

بەریتانیا، لەکوردستاندایە، نەك لەبەغداو تکریتو رومادیو بیابانە بێ پیتەکانی تر، تێگەیاندنی ئەم هاوکێشەیە لەئەمریکا، کارێکی ئەوەندە گران نیە، ڕۆژگاریش ئەم ئەنجامە ئەسەپێنێ، ئەوەش بڕێ ئەبینێ.

بەرێزەکانی بەشداربوو لەئەنجومەنی حوکمو لەوەزیرانی عێراقدا، نەك پێنجیان کورد، ئەگەر هەموشیان کوردبن، ئەوا لەبەغدادی عەرەبستاندا، ئەهیچیان پێکراوەو نە هیچیشیان پێ ئەکرێ بۆ کورد، ئەی لەهەموو دەسەلاتەکانی دوای دروستبوونی دەوڵەتی عێراقدا، لەبیستەکانەوە تا ئەمڕۆ، چەندین سەرەك وەزیرانو وەزیرو سەرکردەی سوپا، کورد نەبوون!؟

کێشەی عێراق، لەپێکهاتە موزاییکە ناسروشتیو نەگونجاوەکەیەوە دەست پێئەکا، چارەسەری کێشەکە، تەنیا بەجیاکردنەوەی (جۆرە) جیاوازەکان ئەکرێت، بەکۆتایی هێنان بەگەمەی عێراق ئەبێ، پشتبەستن بەدەسەلاتەکانی بەغداد، لەدەرزیی سڕکردنو خۆهەڵخەڵەتاندنو کورد لەخشتەبردن بەولاوە، چیتر نیەو نابێ.

ئێستا ئەشێ وەلامی پرسیارەکە: ئاکەی بەشداریکردنی کورد لەدەسەلاتەکانی بەغداد، دروستە؟ بەڕای من، ئەوەبێ: تا دانانی دەستوری عێراقی کە ئەگەر لەو دەستورەدا مافی چارەنووسی کورد، بەجیابوونەوەشەوە بەبێ هیچ مەرجێك دیاری نەکرا، ئەوا ئیتر ئەو بەشداریکردنە هیچ بیانوویەکی نامێنێ. وەك پێشبینیەك ئەوەش ئەڵێم کە نەك مافی جیابوونەوە، بەڵکو ئەو دەستورە، فیدرالیەکی راستەقینەش ناگرێتەخۆ، ئەوەتیە ئۆپۆزسیۆنە عەرەبە دیموکراتیە بەشداربووەکانی کۆنگرەی لەندەنو کۆنگرەی سەلاحەدین، هەروەها ئەوانەی سالانێکی زۆر بەنانو ناوی کوردستان ئەژیانو لەکوردستاندا ئەپارێزران، ئێستا بەلالوتێکەوە فیدرالیەکە ئەکەن بەفیدرالی پارێزگاکان!! جاوەی لەرەگەزپەرستەکانیانو لەبەچکەکانی موقتەدا سەدرو هاوشێوەکانی!!

گەمەی عێراق، گەمەی کورسی کورسییەکەیەو هەمیشە بەشکستی کورد کۆتایی دێت، با تا هەل لەدەستی کوردا ماوە، هەموو ناوچە بەعەرەبکراوەکان، لەعەرەبە هاوردەکان پاك بکرێنەوە، ئەمەش کەمترین ئەرکێکی ئێستامانە وەك هەنگاوێك بەرەو سەربەخۆیی، یا بەرەو هەر جۆرە فەوارەیەکی سیاسیی رەواو دروست بۆ باشووری کوردستان.

رۆژنامەی ڕێزەاری (هاوڵاتی) ڕۆژی ٢٠٠٤/٢/١٨

# خۆپیشاندان لەگۆشەیەکی بیرەوەریدا

بیرمە، پەنجاکانی چەرخی پێشووبوو، ژمارەیەك ئاژاوەچیبوین، بەڵێ وایان پێئەوتین، هەر خۆپیشاندانێك بکرایە، ئێمەیان ئەگرت، جاری وا هەبوو، بەشداریش نەبووینایە، هەر ئەگیراین!

* بابە بۆ ئەمگرن؟ خۆ من لەو ڕۆژەدا لەسەفەر بووم!

– وسبە، بۆ ناتناسین؟ جا با لەسەفەریش بووبێ.

* ئەی بۆ!؟

– چونکە ئەگەر لێرەبوویتایە، لەوان خراپتر ئەکرد.

هاوگرتووخانەکانم لەسلێمانی، تێکەڵبوون لەشیوعیو پارتی، وەك: دوکتۆر فارس، ئەحەی مارف، قادری میرزا کەریم، فەتاح کاوە، عەبدولی سوران، حسەینی مەلا حەکیم، حەمەساڵح دیلان، جەلال عەزیزو زۆری تر.. بەو جۆرە گوزەراندمان تا دوای چواردەی تەمووزی ١٩٥٨.. خۆپیشاندان دەستی پێکردەوە، بەڵام ئەمجارەیان ترسو گرتنی تێدا نەبوو.

قادر وتی:

* کەی ئەمە خۆپیشاندانە!؟

– بۆ؟

* خۆپیشاندانێك، بابەشێخو سەعید ساقی، سەری ژمارەیەك خۆپیشاندەر بەدارودۆنکی ئەشکێنن و بەتەکان نەیانبەن، ئەوە چ خۆپیشاندانێکە!؟ ئاخر دوور لەترسو بگرە کوشتنیش، خۆپیشاندان نابێتە جۆری، لەسەیران!؟

خۆپیشاندانەکەی ٢٠٠٤/٢/١٤ لەسلێمانی ئەوانەی وەبیرهێنامەوە، نازانم بۆچی ئەو برادەرەم بەشداریی تێدا نەکرد؟ تۆ بڵێی لەو ڕۆژەدا سەفەری کردبێ؟ یا ئەشێ نەیبیستبێ چ ترسو بیمێك بۆ ئەو خۆپیشاندانە دروست کرا! ئەگینا ئەویش بەشدار ئەبوو.

* چۆن؟

– کاتژمێر دەی ئێوارەی ٢/١٣ تەلەفۆنێك خەوی ئەو شەوەی لەسازدەرانی ئەو خۆپیشاندانە زڕان.. وتی:

ئەو خۆپیشاندانە مەکەن.

* بۆ!؟

– چونکە ئێمە، وەك دەسەڵات، زانیاریمان هەیە کە تەقینەوەی تێدا ئەبێ.

ئیتر بەو جۆرەو چەندین هەواڵیتر: (نۆزدە تیرۆریست هاتوونەتە شارەوە.. ئۆپێلێکی سور مین ڕێژکراوە.. نەکەن ئەو خۆپیشاندانە بکەن، ئەگینا تاوانەکە ئەخەینە ئەستۆی کافو میم).

تا بەو جۆرە گۆمەکە قووڵ بوو، گۆمیش تا قووڵ بێ مەلەی خۆشە. ئەم خۆپیشاندانە نەك هەر دارو دۆنکیو گرتن، بەڵکو ئەشێ مینو تیو ئێن تیو کوشتنیشی تێبکەوێ. گرنگ نیە، ئەمجارەیان داخوازییەکە گەورەیە، بۆ سەربەخۆیی کوردستانە، ئەهێنێ! کوڕینە ئەڵێن چی؟

أ– من ئەگەر بەتەنیاش بیَ، ئەو خۆپیشاندانە هەر ئەکەم.

ب– منیش.

ج– با خۆمان بچینە ریزی پێشەوە. بۆ ئەوەی ببینە قەڵغان و سپێر بۆ جەماوەرەکە.

د– ئەوە راو هەڵوێستی من و هەموو ئەوانیکەشمانە.

بۆ رۆژی دوایی، واتا ٢/١٤ زەنگی چەند تەلەفونێکی تری لەو جۆرە، لەزۆر فەرمانگەو قوتابخانەو پەیمانگەو زانکۆ، لێدرا. ئەو زەنگانە، ئەگەرچی کاریان کردە سەر چەندێتی خۆپیشاندانەکە، بەلام کاریان لەچۆنیەتی خۆپیشاندانەکە نەکرد جەماوەرە قارەمانە بەشداربووەکەش، ئەیانووت:

* ئەو تەلەفونانەش نەبووبایە، ئێمە خۆمان هەر چاوەڕوانی هەموو جۆرە تەقینەوەیەک بووین و نەبین، خۆ بۆ سەیران نەهاتووین.

هەندێک لەکۆبوونەوەکانی کۆری سەربەخۆیی کوردستان و دیمەنەکانی خۆپیشاندانەکە. ئەم کۆرە لەکۆنگرەی نیشتمانی کوردستان – سەرکردایەتی باشوور و ناوەندی رۆشنبیری ئاڤێستاو ژمارەیەک کەسایەتی بێ لایەن و لایەنداری سەربەخۆییخواز پێکهاتبوو. یەکێک لەکارەکانیان خۆپیشاندانەکەی ١٤/٢/٢٠٠٤ بوو.

ردا على اسئلة وجهتها راية الحرية في عددها ٦٦ ليوم ٢٠٠٤/٨/١٦

**كامل زير: أرى قانون ادارة الدولة مجرد خدعة للشعب الكوردي،**

**لأنه لامعنى للفيدرالية من غير مجلس الأقاليم**

**• كيف تنظر الى التداخلات التركية في شؤون كوردستان العراق، والى اجتماعاتها مع دول الجوار ضد الكورد؟**

– لايخفى على احد بأن تركيا لازالت تحن الى الامبراطورية العثمانية، والحقيقة أن الشعب التركي لم يكن اصلاً يعيش في هذه البقعة الجغرافية المسماة حاليا بتركيا، انه اصلاً من بقايا المغول الذين اتوا زحفا الى هذه المنطقة واستوطنوا فيها، وهم يتقاطعون مع احفاد هولاكو وجنكيزخان، في ان مبدأهم الظلم والتعدي على الغير.

كان جنوب كوردستان قبل تأسيس الدولة العراقية جزءاً من الإمبراطورية الثمانية، وبعد الحرب العالمية الثانية ووفقا لمصلحة بريطانيا انتزع جنوب كوردستان وضم الى الدولة العراقية الحديثة بسبب وجود بترول كركوك، بالإضافة الى خيرات كوردستان الكثيرة، لارادت بريطانيا من هذا الإجراء أن تضع العرب في العراق حراساً على أبار نفط كركوك ورقباءً على الشعب الكوردي. في البداية كانت هناك خلافات كثيرة بين تركيا وبريطانيا والعراق حول هذا الإجراء، ولكن في النهاية تم راضاء واسكات تركيا، ولكن تركيا لازالت تحلم بجنوب كوردستان، ولهذا السبب تقف دائماً بالمرصاد لامام حقوق الشعب الكوردي في جنوب كوردستان، ومن هنا نجدها تقوم بعقد اجتماعات مع دول الجوار للتآمر على الكورد.

كانت تركيا خلال السنوات المنصرمة تتدخل في شؤون العراق بصورة عامة وفي شؤون كوردستان بصورة خاصة، بحجة القضاء على حزب العمال الكوردستاني، كانت حكومة صدام حسين أنذاك ضعيفة، كما ان العراق نفسه قد سمح لها بالتدخل في اراضيها الى حوالي ١٥ كم، فيما تركيا تجاوزت تلك المسافة.

**• لماذا الحكومة لعراقية صامتة؟**

يعود هذا الصمت لسببين: الأول هو ان الحكومة العراقية لم تثبت الى الآن أقدامها ولايمكنها الإمساك بزمام الأمور كلها، وأما السبب الثاني فهو أن بعض الجهات العربية والتركمانية التي لها النفوذ في الحكومة المؤقتة ترى ان التدخل التركي بشؤون العراق يخدمها.

حقيقة لا أدري لماذ الخوف من الكورد؟ وحتى قانون ادارة الدولة العراقية المؤقت الذي أقر الفيدرالية لكوردستان العراق هو أقرار غير متكامل، ذلك لأن من مستلزمات الدولة الفيدرالية وجود مجلسين هما المجلس الوطني (البرلمان) ومجلس الأقاليم، أي أن السلطة التشريعية في الدولة الفيدرالية يجب أن تتضمن هذين المجلسين، فكما هو معلوم يكون التمثيل في المجلس الوطني حسب النسبة السكانية، بينما مجلس الأقاليم يكون التمثيل فيه حسب المساواة بين الأقاليم. بالنتيجة فإن مجلس الأقاليم لاوجود له اصلاً في هذا القانون، ومع ذلك تجاهل الجانب الكوردي وخصوصاً الجهات المشاركة في السلطة ببغداد هذه الحقيقة، وبالتالي أرى أن هذا القانون مجرد خدعة للشعب الكوردي، لأنه لا وجود لمعنى الفيدرالية فيما هي تفتقر الى مجلس الأقاليم. ولكن مع الأسف نرى الأحزاب الكوردستانية وبالذات الحزبين الرئيسين صامتة تجاه هذه المسألة المهمة، وذلك لأجل المصالح الحزبية الضيقة لا أكثر ولا أقل.

**• لكل شعب حق تقرير مصيره وهذا بند واضح في ميثاق الأمم المتحدة، السؤال: متى يشهر الكورد مطالبتهم بهذا الحق؟**

– ان من حق الشعب الكوردي والأمة الكوردية المطالبة بهذا الحق والعمل من اجله، أي من أجل الاستقلال، وبإعتقادي الظرف مؤات لأن يكون لجنوب كوردستان كيان مستقل ودولة مستقلة وليس لتهديدات تركيا أو غيرها من دول الجوار أية أهمية وهذه التهديدات ليست الا تصريحات لا تتعدى الكلام الفارغ.

## لاياصديقي

## الخبز ليس من عمل القصاب

## تمهيداً لحوار أخوي مع الدكتور كمال مظهر

انه من جيلي المضطهد، وابن بار لمدينتي المناضلة، ورفيق لي في مسيرة قوامها مئات الكيلومترات في الطرق الجبلية الوعرة مشياً على الأقدام، أو ركوباً على بغل مجازف وحمار خنوع، نحو الالتحاق بثورة ايلول المجيدة.

انه اختار ذلك الحمار بمحض لرادته، لكنه لم يخف حسده (ولو على سبيل النكتة) عندما يكرر قوله طوال المسيرة، بأن للمحظوظ سوبر بغل وللمنكوب حماروفيج (نسبة الى سوبر صالون وموسكوفيج) وفي معرض جوابه على فكرة التبادل، كان يقول: بأنه يفضل الخنوع على المجازفة، وقد انعكست هذه الكيفية في كل منا بما لنا من تركيب فكري وعضوي.

انه اتجه نحو الانزواء ليتفرغ لكتابة التأريخ، وحسناً فعل ذلك، لأن هذا المسلك ينسجم مع طبعه في الحياة، الا وهو الابتعاد عن المجازفة، أما أنا فقد رافقتني السياسة منذ نعومة أظفاري. والسياسة بحد ذاتها مسلك من مسالك المجازفين، خاصة لدى الشعوب المضطهدة، وكم تعرضت للاعتقال والتعذيب والنفي والتهديد ومحاولات الأغتيال من مختلف السلطات الحاكمة بسبب انتماءاتي الحزبية ومواقفي المعارضة والتحدي لكل ما يسمى بالأمر الواقع في ميدان السياسة، من تلك المجازفات على سبيل المثال لا الحصر، عضويتي في الحزب الشيوعي الذي كان ألد أعداء السلطة في العهد الملكي ثم عضويتي لقيادتي كازيك وياسوك المناضلين من أجل الأستقلال[1] وتوجهي نحو باريس لادارة اذاعة معارضة لمحتلي كوردستان[2] لضافة الى أشعاري و مؤلفاتي وكتاباتي ومحاضراتي حول الأستقلال وبأسمي الصريح، لذا كان من الطبيعي أن نقسم البغل والحمار بيننا في تلك المسيرة على النحو المذكور، غير أن هذا الصديق، وبعد سقوط النظام البعثي، يأتي الى السليمانية ويلقي محاضرة في الجامعة فحواه (اخماد الروح الثورية لإستقلال كوردستان ولو دون القصد)، خلال أفضل فرصة لتحويل الكيان السياسي القائم في جنوب كوردستان الى دولة مستقلة لتكون نقطة انطلاقة لتحرير بقية الاجراء غير المحررة من كوردستان.. الأمر الذي أدى بي الى الرد عليه في نفس القاعة، ونالت ردودي رضا واستحسان جمهرة الحاضرين من خلال التصفيق الحاد والمصافحات الكثيرة من الجمهور دون أن يتمكن هو من الادلاء باجابات موضوعية مقنعة. الا انه يحاول الآن تبرير ما أورده في تلك المحاضرة من خلال حديثه لصحيفة راية الحرية الغراء في عددها ٦٦ ليوم ٢٠٠٤/٨/١٦ وياحبذا لو لم يأت بهذا التبرير وبقي الموضوع طي النسيان، كما سأتطرق اليه بعد قليل، ولكن قبل ذلك، أود أن أذكر، بياناً للحقيقة والتأريخ، أن ما ورد في تلك المحاضرة وذلك الحديث، لم يأت عن سوء القصد والنية. انه قدم أفضل خدمة لبني جلدته من خلال كتاباته المبدعة عن التأريخ، وهو بحق أفضل المؤرخين الكورد في عصره، وهو صادق في قوله بأنه يحلم باستقلال كوردستان ولو شتان مابين الحلم والعمل. أما الأشكال، فأنه يكمن في تجاوز الأخ للحدود الحمراء. واعني الخط الذي يتجاوزه القصاب ليجعل من نفسه خبازاً، وتلك هي العلة في الاخفاقات المتكررة للحركات الكوردية التحررية طوال تأريخها الحافل بالفشل والخسران بسبب قيام الجاهلين بالسياسة بنصب انفسهم

على قمة الهرم في تلك الحركات والثورات وبالتالي الحيلولة دون أخذ الساسة المحنكين بزمام الأمور، والنتيجة الفشل والخسران.

من هذا المنطق، انني أتوجه بالرجاء الى أصحاب الكفاءات العلمية الذين لاعلم لهم بالسياسة عدم اضاعة أوقاتهم الثمينة بمثل هذه المحاضرات. والا يقعون في اخطاء تمس شخصياتهم العلمية كما في الأخطاء التي وقع فيها الأخ العزيز الدكتور كمال مظهر وهي:

١- انه يتكلم عن العقل في حديثه لراية الحرية بصيغة توحي بأن العقل هبة من الله الى الخنوعين الخاضعين للأمر الواقع دون سواهم من البشر، وخاصة الذين يتحدون الأمر الواقع ويصنعون المعجزات بمجازفاتهم الشجاعة، الحقيقة أن العقل قد أثبت قدرته العظيمة عند مجازفاته وتحدياته للأمر الواقع وجعل اللاممكن ممكناً. أن مقولة السياسة فن الممكنات هي مقولة تروج لها أصلاً الأقوياء الظالمون، لكبح جماح الضعفاء المظلومين، ويردها أصحاب المصالح الخاصة والنفوس الضعيفة والعقول الجامدة، فلولا القدرة المجازفة الخارقة للعقل وتحديه للأمر الواقع، لما تقدمت البشرية ولبقيت على حالتها البدائية ان لم تؤل الى الزوال.

انه يحذرنا في حديثه بأن لانجازف ولانتجاوز الخط الأحمر، جاهلاً أو متجاهلاً بأن السياسة هي بحد ذاتها مجازفات وتجاوزات للخطوط الحمراء، فلولاهما، لما قامت الحركات التحررية للشعوب ولما حدثت الثورات والانتفاضات بوجه الطغات. ان الثورات الكوردية وانتفاضة آذار والهجرة المليونية بوجه أكبر طاغية في العالم، كانت أكبر مجازفة وتجاوز للخطوط الحمراء التي وضعها الطاغية بجيشه الجرار وأسلحته الفتاكة وقوانينه الصارمة، والنتيجة كانت اقامة الكيان السياسي الكوردي في المنطقة الآمنة. أما مجرد الحلم، حسب قوله فأنه لايغير من الواقع شيئاً، فكم من الشعوب الجامدة أو المسلمة (بفتح السين) بمفهوم الأمر الواقع، أو بمبدأ تحقيق الأستقلال شيئاً فشيئاً دون المجازفة، انصهروا في بودقة غيرها من الشعوب الحية المجازفة والمغامرة؟ وخير دليل على ذلك، الزحف المغولي لاسيا الوسطى والفتوحات العربية الأسلامية اللذين أديا الى توسيع رقعة أوطانهما على حساب أوطان غيرهما من الشعوب وبالتالي ابتلاعهم أثناء ما كانوا هم في انتظار جودو، أو السير بسرعة السلحفاة، حسب مبدأ تحقيق المبتغى شيئاً فشيئاً وحسب الدكتور كمال مظهر هكذا فأن من يرفع شعار استقلال كوردستان، يرفعه عن عقل سليم وليس عن العاطفة، بالأضافة الى استفادته من النتائج المأساوية عن تجربة العيش المشترك مع تلك الشعوب.

٢- انه، وفي معرض اجابته لسؤال من راية الحر ية مفاده: ماذا تعني بالخطوط الحمراء؟ يقول: (مثلاً أن تأتي تصرفاتنا بشكل تسبب في وقوف مجموعة من دول المنطقة في موقف العداء منا، أن تتحالف ضدنا)! !كأن تلك الدول ليست اعداء لنا ولم تتحالف ضدنا وكأن مجرد تسمية انفسنا بالكورد لم تشكل جريمة عقوبتها الأبادة الجماعية عبر التأريخ وهو خير العارفين بذلك! !

٣- لاياصديقي العزيز، لاتقم بألقاء مثل تلك المحاضرة أو ذلك الحديث وانك غير مختص بالسياسة رغم كونك عالماً بالتأريخ، والا تقع في اخطاء أخرى، كخطأ قيامك بقياس المعضلة الكوردية بمعضلة الألزاس واللورين، وشتان مابين الشعوب الشرق أو سطبة والشعوب الأوروبية ألم تقل في حديثك: (أن وجود العبيد والجبور في المناطق المتاخمة لكوردستان يعود الى أواخر القرن الثامن عشر والى أواسط القرن التاسع عشر؟ بينما يعود وجود الكورد في تلك المرابع الى الاف السنين، وبشهادة زينفون سنة ٤٠١

قبل الميلادج)؟ أيمكن أعادة تلك المرابع ومعها بلاد مابين النهرين الى كوردستان أو استعادة حدودنا المائية لغاية بحر الأبيض والخليج بمثل ماتم اعادة الألزاس واللورين الى فرنسا؟؟

٤-ماذا تقصد بكلامك: (أن يومنا افضل من أمسنا)؟ وانك عالم بالتأريخ وبأن أيامنا تتجه من سيء الى أسوأ وان رقعة كوردستان تتقلص باستمرار بسبب عمليات التتريك والتفريس والتعريب والابادة في ظل الأحتلال والـيش المشترك مع هؤلاء الشعوب وتقسيم وطننا وامتنا فيما بينهم.

٥- من الذي يكتب ويعمل بالعاطفة ويتصف باللاعقلانية؟ الذين يرفعون شعار استقلال كوردستان ويعملون من أجله؟ أم هؤلاء الذين يشاركونك في قولك: (أنا أؤكد بأن حق تقرير المصير للشعب الكوردي لايعني بالضرورة الأنفصال، بل يعني أن يقرر الشعب الكوردي مايريد، مثلاً أن يقرر أن يكون الاتحاد اختياريا)!!

- ألايعني ذلك الأتحاد، الأستمرار على ماهو مستمر؟
- ألا يعني ذلك الأتحاد، الأبقاء على تقسيم كوردستان؟
- هل يعقل أن ترتقي تلك الشعوب مرتبة الشعبين الفرنسي والألماني أو السويسري والأمريكي؟؟
- هل أن الديمقراطية قميص تتبدل بتبديل أنظمة الحكم في أي من الدول المحتلة لكوردستان؟

- كم من الأنظمة تغيرت لتلك الدول، وكم من الدساتير ألغيت وحلت محلها غيرها من الدساتير، وبعضها نص على الشراكة في الوطن، وقوانين شرعت واتفاقيات أبرمت بشأن حقوق الكورد؟ والنتيجة، الأبادات الجماعية لنا؟؟ لماذا نتظر الى الشعبين التركي والعربي من خلال عدد من الأشخاص لايتجاوز عددهم أصابع اليدين؟ ومعلوم أن عامة هذين الشعبين هم أنفسهم دون التغير و (أن النخبة منهم تكاد لاتعرف شيئاً يذكر عن تأريخ الشعب الكوردي ويتصورون بأن كوردستان كانت جزءاً من العراق منذ الأزل، من قالوا بلى ـ حسب اقراركم في راية الحرية)

- هل مجاملة عشرة أشخاص من مجموع أكثر من ربع مليار من العرب والترك، قد حركت عاطفتك وأدت الى وقوعك في تلك الأخطاء؟ كم من هؤلاء قطعوا وعوداً فضفاضاً قبل تسنمهم دست الحكم ثم نكثوا بوعودهم!؟

- لماذا تمهد للاتحاد ولو اختيارياً؟ أيوجد كوردي شريف عاقل أن يفضل الأتحاد (مع كل تلك المساويء) على الاستقلال الذي هو دواء لكل داء لأمتنا الكوردية؟؟

- وأخيراً وليس آخراً، ألم اكن على حق، والحالة هذه، عندما قلت لك بعد المحاضرة: مامعناه انك لاتؤيد ولاتميل الى استقلال كوردستان؟ أرجو أن أكون مخطئاً ولني أكن لك كل الأحترام[٣].

---

[١] وأنا بصفتي القانونية، أعلم قبل غيري، بأن عقوبة مجرد الانتماء الى حزب يدعوا الى انفصال جزء من العراق، هي الاعدام.

[٢] سبق أن تطرقت الى موضوع هذه الأذاعة خلال مذكراتي المنشورة في صحيفة تايم والمعاد نشرها في هذا الكتاب.

(٣) نشر هذا الرد في العدد ٦٧ ليوم ٢٠٠٤/٩/١ من نفس الصحيفة.

# کێڵگەی ڕەسەنی کوردایەتی کوردستانە

* جوێننامەیەکی نوێ دەرچووە (دیدی نەتەوەیی و نانەتەوەیی) نوسەرەکەی: حسەین محەمەد عەزیزە، لەچاپخانەی ئەزمر لەسلێمانی ۲۰۰۲ چاپکراوە.

– چیی تیایە؟

* هێرش و تۆڵەو جوێن و هەڵبەستن و تاوانباکردنی زۆری بۆ تۆ تیایە.

– بۆچی؟

* چونکە لەژمارە ۱۸ ساڵی ۲۰۰۱ی گۆڤاری ئاییندە دا، ڕەخنەت لەوتارێکی ئەو گرتووە کە لەژمارە ۱۵ ی ۲۰۰۰ی هەمان گۆڤاردا بڵاوکرابووەوە. وتارەکەی ئەو بەناوی (مەحوی لەنێوان خواپەرستی و کوردایەتیدا) و ئەوەی تۆ بەناوی (ڕەخنەو لێکۆڵینەوە ـ مەحوی لەدیدی نەتەوەییانەوە) بوو، ئەشڵێ: ئەو (ژیر)ەی، لەسەردەمی بزوتنەوەی کوردایەتیی ساڵانی پەنجاو شەستەکاندا، بەتیشکی گڕی بڵێسەی روناکی مۆنراوە جوانە نەتەوەییەکانی، ڕێی پڕ لەتاریکی و نوتەکی شەوەزەنگی کوردایەتی، بۆ لاوانی نەتەوەکەی ڕۆشن دەکردەوە، ئەو (ژیر)ەی بەبیری وردی بەپیت و پیتۆلانەی مۆنراوەکانی نێو دیوانی (کوردایەتی)، کێڵگەی خاکی پڕ لەدرکوداڵی کوردستانەکەی بۆ خاوێندەکردینەوە، ئەو (ژیر)ەی بستبەبستی نیشتمانی هەزاران ساڵەی داگیرکراوی بەدێوەزمی تەنراوی، لەدوژمنان و داگیرکەران بۆ ڕزگار دەکردین، ئەو (ژیرە)ی دڕکەزی کارەبایی چوار دیواری سنوری دەستکردی گرتوخانەکەی کوردی بۆ دەقرتاندین، ئەو (ژیر)ەی، تۆوی بیری کوردایەتی ڕاستەقینەی لەزەویی بەیاری خەباتی نەتەوەیی و ڕامیاریی کورددا بۆ دەوەشاندین، ئەو (ژیر)ەی کەرەسەی دیدو بۆچوونەکانی سەردەمێکی مێژوویی بیرکردنەوەو کارکردنی من بوو!). لاپەڕە (۸)

– جا کەی ئەوە جوێننامەیە؟

* تۆ ڕاوەستە، دوایی وردە وردە. جوێنەکانیش بەئەدەبی ساتیری نەتەوەییانە ئاسا ناو ئەبا. ل/۱۱

– بابزانین جوێنەکانی چیە؟

* ئەمە نمونەی هەندێکیتی لەگەڵ ژمارەی لاپەڕەکانی: وەك چۆن گای ئسپانی بەڕەنگی سور بەلەسە دەبێ، وەها بەکەچەڵ بەکولایەوە، مامە سەعە بە تۆزدەی هار، حاجی بەبەغدای ئەدیوە توڕە دەبوون، ژیریش بەناوی حەمەی مەلا کەریم بەرچاوی خۆی نەبینێ! ۷۰ ئەم جارەش عەرەب وتەنی: حەلیمەی کوردیی بۆ سەر خووە کۆنەکەی خۆی گەڕاوەتەوە ۷۵ وەك ناوی زڕاوەو دەنگی دڕاوە لەنێو جەماوەری شارەکەدا، بەبەعسیش ناو دەبرێ ۸۰ ژیرو ئاگرین سەرو قنگی یەکتری بوون ۱۰۵ نەك هەر هیچی بۆ کورد نەکردووە، بگرە هێندێ جاریش زیانی پێگەیاندووە ۱۰۸ هەموو شتێکی دیکەی خراپ، لەپیاوێکی یاساناس و پارێزەری وەك ژیر چاوەڕێ دەکەم ۱۱۰ ترسنۆك ۱۱۲ ئەم قسانەی لەورگی خۆیەوە دەرهێناوە، حەشری سەگ بەیەکدی دەکەن، ۱۲۲ هیچ ئەندامێکی سەرکردایەتی کازێك باوەڕی بەئایین و خوا نەبووە ۱٤٦ هەڵپەرست ۲۱٦ یەکێ گوێ بەباوەڕو ویژدان نەدا، هەڵبەتە وەك ژیر لەپێناوی

بەرژەوەندیی چەپەڵی تاکەکەسیی خۆیدا، دەست لەنێو دەستی هەموو کەس‌و دوژمنێکیش دەنێ ٢١٨ ناوو ناوبانگی خۆشی بەتەواوی پیس‌و ڕەشکرد. وەك میزی حوشتر وابووە، ٢١٩ نەبەز زۆر بەرلشکاوی گوتی بەهیچ شێوەیە باوەڕم بەخولو ئایین نیە ٢٤٤ وەك کەری نێو جۆگەکەی لێهاتووە ٢٩٥ سەرکردەکانی کاژێك ترسنۆکترین کەس بوون٣٢١.

ئەشڵێ هیوادارم توانیبێتم، دەمەتەقێیەکی هێمنانە، دیموکراسیانە، کوردانەو زانستانەم لەگەڵ ژێردا کردبێ ١٥.

– بەگشتی، جوێن، پیشەی مرۆڤی بێدەسەڵات‌و هیچ لەبارا نەبووە، هەندێ جار جوێن ئەنجامی پەروەردەی خراپی منداڵیە، جاری واش هەیە جوێن کاردانەوەی تووڕاوی‌و ژێرکەوتنە. جارجارەش جوێن بۆ وروژاندنی بەرامبەرە، بۆ ئەوەی ئەو بەرامبەرەش ناچار بکا دابەزێ بۆ ئاستی جوێنفرۆشەکەو وەڵامی بداتەوە، بەوە جوێنفرۆشەکە، ناوو ناوبانگێ پەیدا بکا! ئەدەبی ساتیریش، جوێندان‌و درۆ هەڵبەستن‌و تۆمەتی ناڕاست نیە، لەبەر ئەوە گوێ وایە هیچ وەڵامێکی نەدەینەوە.

* بەڵام لەپاڵ جوێنەکانیدا، بازدی بۆ لایەنی تریش داوەو گەلێ رای هەڵەو نا دیموکراتیانەو ناکوردانەو نازانستانەی ئاخنیوەتە ناو جوێننامەکەیەوە بۆ پەردەپۆشکردنی جوێن‌و درۆو تۆمەتەکانی، ئەوەش لەم رستەیەوەی دەردەکەوێ: (هەرگیز رۆژێ لەرۆژان، بیرم لەوە نەکردۆتەوە، لەگەڵ هۆنەرێکی وەك کامیل ژێردا، لەسەر یەکدی بنوسین، یا راستتر وایە بڵێم: رەخنە لەیەکدی بگرین‌و وەڵامی یەکدی بدەینەوە٨) ئەم قسانەش بەڵگەی ئەوەن، ئەو بەزۆر سواری ئەو بابەتانەی تر بووە بۆ ئەو پەردەپۆش کردنەو بۆ تۆڵەی ئەو رەخنەیەی تۆ لەوت گرتووە، ئەو ئەگەر بابەتیانەو زانستانە بولیەو تۆڵەسێن نەبوایە، ئەبوو زووتر لەو دەرگایانەی بدایە، بەتایبەتی مێژووی هەندێك لەو بابەتانە، ئەگەڕێتەوە بۆ پێش نزیکەی چل ساڵ، ئەی بۆچی بەدرێژایی ئەو ماوەیە بێدەنگ بوو، ئینجا تێکرا پرژی جوێن‌و بابەتەکانی، کەس‌و لایەنی کەش ئەگرێتەوە، لەبەر ئەوە ناکرێ وەڵام نەدەینەوە، وەڵامەکانیش، ئەوەی پێویستە، هەریەکەو بۆ جێگەی خۆی.

* هەر دوای ئەوەش ئەڵێ: نە کامیلەو نەژیریشە ١٠.

– دیارە رەخنەکەم ئازاریداوە!!

* بەشێکی نوسینەکەی تەرخان کردووە بۆ رەخنەی زمانەوانی لەتۆ ــ ل٤٤ تا ل٦٨، کەچی نوسینەکەی خۆی پڕە لەهەڵە.

– وەکو؟

* ئەگەر خشتەیەك بۆ هەندێکیان بکەم، وەك نمونە:

| راست | هەڵە | ل | سەرنج |
|---|---|---|---|
| گەلەکۆمەکێ | گەلەکۆمەکیی | ١٦ | وەك: چاوشارکێ، حەمامۆکێ، منمنۆکێ. |
| مەحوی | مەحویی | ١٦ | بەو جۆرە هەموو (ی)کی داکشاوی بەدوو (ی) |
| مەلەوی | مەولەویی | ١٨ | نووسیوە. کە ئەوە دەمێکە وازلێهێنراوە. |

| | | | |
|---|---|---|---|
| فەرمانڕەوایان | فرمانڕەوایان | ٢١ | فرمان (کارە) فەرمان (ئەمرە) فەرمانڕەوا لەدووەمەوە هاتووە. |
| گرنگیدان | گرینیدان | ٦٠ | لەگرنگەوە هاتووە، وشەی گرنەلەو گرین بەو واتایە لەکوردیدا نیە. |
| ئاینیەکەی | ئایینییەکەی | ٦٤ | زمان بەرەو کورتکردنەوە ئەڕوات، نەک درێژکردنەوە، لەجێگەیەکی تردا، زیاتر لەسەر ئەم لایەنە ئەڕۆم. |
| کوردایەتیان | کوردایەتییان | ٦٤ | |
| بەلکو | بەلکوو | ٨٦ | واوی کورتە، نەک درێژ، ئێستا هەوڵێک هەیە بۆ ئەوەی واوە درێژەکانیش هەر بەیەک واو بنووسرێ. |
| نەشارەزا | ناشارەزا | ١١ ٦ | چونکە پێشگری (نە) نەفی سیفەتەکە ئەکات، وەک: نەگۆڕ، نەترس، نەبەز، نەبزووت. |
| لوولەی | لوولەی | ١٢ ٧ | لامی دووەم، شەدەی نیە وەک گوللە، لەبەر ئەوە دوو لامی ناوێ. |
| لەهەموو ژیانی خۆشیدا | لەهەموو ژیانیشی خۆشیدا | ١٨ ٤ | شینی یەکەم زیادەیە. |

جگە لەوانە کە چەندین جاز لەنووسینەکەیدا دووبارە بوونەتەوە، لەلاپەڕە (١٢) دا ئەڵێ: (پەنیری رەخنەکەی رەخنەگرن ئاوی زۆر کێشا) کورد ئەڵێ: هەویرێکی ئاوکێش، نەک پەنیر، لەجێگەیەکی تردا ئەڵێ: (با بەدەولەی بیابانی نەکردووە) کورد ئەڵێ: با بەدەولەی شەیی ئاکا، نەک دەولەی بیابان.

لەلاپەڕە (٩)شدا ئەڵێ: (بەناوی بیری نەتەوەییەوە بڕیاریداوە کوتاڵی لەکەلکەوتووی (دیدە نەتەوەیی)یەکانی خۆی پێ فرۆشتووین!) کە ئەبوایە، لەڕووی زمانەوانیەوە، بیوتایە (دیدە نەتەوەییەکانی خۆیمان پێ بفرۆشێ).

لەلاپەڕە ٢٠ شدا ئەڵێ: (کێشەی کوردبوون و کوردایەتی، تەنیا بەگەز و جاوی زمان ناپێورێ)! راستە (گەز) ئامێرێکی پێوانە، بەلام (جاو) ئامێری پێوان نیە. گەز (ئەپێوێ)، جاو (ئەپێورێ)، ئەبوایە بیوتایە: جاوی کێشەی کوردبوون و کوردایەتی، بەگەزی زمان ناپێورێ.

لەلاپەڕە ٨ دا ئەڵێ: (ترکەزی کارەبایی)، جارێ لەڕووی زمانەوانیەوە، بەتایبەتی بەپێی تێگەیشتن و شێوازی نوسینەکانی خۆی، ئەبوایە بینوسیایە (ترکەزیی) واتا (ی)ی ئیزافەی بخستایەتە سەر، لەڕووی واتاییشەوە، ترکەزی، کارەبایی نابێ. چونکە ترکەزی، رووەکە، رووەک نەگەیەنەر (عازل)ە و کارەبا ناگوێزێتەوە. ئەبوایە بیوتایە (تەلبەندی کارەبایی).

– لەراستیدا، تا ئێستا ئێمەی نووسەرانی کورد لەسەر رێنوس و رێزمان و خاڵبەندییەکی یەکگرتوو، پێکنەهاتووین، بۆیە ئەبینین هەر نووسەرێك بەشێوازێك ئەنووسێ*، جگە لەوە، زمانیش وەك هەر شتێکی تر، هەمیشە لەگۆڕان و گەشەکردندایەو وشەکان بەرەو کورتکردنەوە ئەبرێن، ئەو راپۆیەی جاران ئەوەندەی دەهۆڵێك ئەبوو، ئێستا ئەوەندەی پاکەتە جگەرەیەکە، جارێك مامۆستایەکی ئەمریکی زمانی ئینگلیزی ئەوتەوە، وتی "ئێستا هەندێ کەس وشەی (Before) بە (B4) ئەنووسن"، لەسلێمانی رۆژنامەیەك بەناونی (هاولاتی)ەوە دەرئەچێ، هەموو کەس ئەزانێ وشەکە لە (هاو +ولاتی) پێکهاتووە، کارێکی باشیان کردووە کە یەکێك لە (و) کەیان فرێداوە.

* ئەڵێ: نوسەر (مەبەستی تۆیە) لەهەموو نوسینەکانیدا (نۆیە = نییە) بەنیە نوسیوە.

– جارێ ئەبوایە پیتی (ی) ی بخستایەتە دوای کەوانەکەیەوەو بینوسیایە (نۆیە = نییە)ی بەنیە نوسیوە، ئینجا (نۆیە، نییەو نیە) وەك یەك ئەخوێنرێنەوە، ئیتر کە هەموو دنیا بەرەو بچوککردنەوەو کورتکردنەوە بڕوات بۆچی ئەمیش کورتەکەیان نەبێ؟

بەپێی ئەم بنەمایە، چاك وایە ئەم وشانەی خوارەوە، بۆ نموونە، کورتکەینەوە، بەم جۆرە:

| | |
|---|---|
| راستر | راستتر |
| خەریکەم | خەریکبکەم، خەرککەم |
| دەستێوەردان | دەست تێ وەردان |
| دەسنوێژ، دەزنوێژ | دەست نوێژ |
| شتێك | شتێیەك |
| بچوکردنەوە | بچووك کردنەوە |

هەر کاتێکیش کارێکی وشەسازیمان ئەنجامدا، ئەڵێین: راستر لە (راست + تر)ەوە هاتووە، دەزنوێژ لە (دەست + نوێژ)ەوە هاتووەو بەو جۆرە.

* لەوە ئەچێ ئەم نووسەرە کە لەتەمەنێکی گەورەدا دەسیداوەتە نووسین، یا وەك خۆی ئەڵێ: (ئەز، چەندین ساڵ بوو، لەزمانی کوردیی دابڕابووم، تەنیا لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٠ ەوە، دەستم بەنوسینی کوردیی کردۆتەوە ٤٥) وەك ئەوانە بێ کە بەگەورەیی، فێری پلاوخواردن ئەبن! یا وابزانیبێ کە ئەو دوکتۆرایەی لە (پەتاتە)دا وەریگرتووە لەسۆفیێت، لەزمانی کوردیدا وەریگرتبێ!. ئەگەر وانەبێ، چۆن بەزمانێکی بازاڕی ئەنووسێ و ئەڵێ: (لەوە دەچێ، وەك چۆن گای ئیسپانی بەرەنگی سور بەلەسە دەبێ، وەهایە کەچەڵ بەکولایەوە، مامە سەعە بەنوزدەی هارو حاجی بەبەغدای ئەدیوە تووڕە دەبوون، (ژیر)یش بەناوی (حەمەی مەلا کەریم) بەرچاوی خۆی نەبینێ ٧٠). لەل ٧٥دا ئەڵێ: حەلیمەی کوردی، بۆ سەرخووە کونەکەی خۆی گەڕاوەتەوە، مەبەستی گەڕانەوەیە بۆ سەر حەمەی مەلا کەریم.

---

* راستە ئەگەر رەچاوی رێزمان و رێنوس بکرێ باشترە، بەلام وەك ب. هەندرێن ئەڵێ: تا ئەم دەمە، سەرووبۆر، نەیتوانیوە رێ لەبابەتی جیناوەر بگرێ ـ کامیل ژیرو هۆنراوەی نەتەوەیی لەهەڵوێستو رەخنەدا. ل٤.

– ئەو بەو قسانە، گوزارە لەدەروونی خۆی ئەکا، زۆر کەس هەن بەو زمانە ئەدوێن کە پێی گوشکراون! لەبارەی حەمەی مەلا کەریمیشەوە، با ئەم نوسەرە تازەیە بزانێ، منو حەمەی مەلا کەریم، ئەگەرچی بەنووسین رەخنەمان لەیەك گرتووە، بەلام لەرووبەڕووبوونەوەدا، هەمیشە رێزی یەکترمان گرتووە، دوا یەکتربینینێکمان، لەفیستیڤاڵی هەزاری موکریانیدا بوو ساڵی ۲۰۰۲ کە موو بەبەینماندا نەئەچوو، پێش ئەوەش، لەیادی حەسیب قەرەداغیدا ساڵی ۲۰۰۱ لەوتێل چوارچرای هەولێر، هەر وابووین، لەدانیشتنێکیشدا، لەهۆڵی وتێلەکە، لەبەرچاوی ژمارەیەك کەس وتی: (من کاتی خۆی کە زوێر بووم، وام ئەزانی رەفیق چالاك، (کوردایەتی بزوتنەوەو بڕولو رژێمە)ی نووسیوە.

(بەلام کاتێ زانیم جەمال نەبەز نوسیوێتی، رام گۆڕا)، ئەم قسەیەش وڵتای باوەڕهێنان ئەگەیەنێ بەناوەڕۆکی ئەو نامیلکەیە، ئەوەش هەڵوێستێکی بابەتیانەیە لەکاکە حەمەوەو شایانی سوپاسە.

* ئەڵێ تۆ، دوای هەرەسی شۆڕشی ۱۱ی سێپتەمبەر ۱۹٦۱ سەرچۆپی ئاهەنگی سەری ساڵانت، لەیانەی فەرمانبەرانی (سولەیمانیی) گەرمکرد٠٨.

– لەڕووی زمانەوانییەوە، ئەبولیە (ی) ئیزافەی بخستایەتە سەر وشەی (سەرچۆپی). ئەم نووسەرە، لەئاستی پیتی (ی)دا، سەری لێتێکچووە، لەجێگەیەکدا کە پێویستە، نایئووسێ، لەجێگەیەکیشدا کە پێویست نیە، لەجیاتی یەك (ی) سیان دائەنێ، وادیارە وەك ئەو کوردەی بەسەر هاتووە کە وتی: (من لەداخی ئەلفو لامی سەگبابە فێری عەرەبی نابم، دایئەنێم، ئەڵێن نایەوێ، دایئانێم، ئەڵێن ئەیەوێ). هەروەها ئەبولیە بینوسیایە (فەرمانبەر) نەك (فرمانبەر)، چونکە وشەکە لە ·فەرمان)موە هاتووە کە بەواتای (أمر) دێت، نەك (فرمان) کە بە وڵتای (عمل) دێت. بۆیە عەرەب بۆ (موظف)، (مأمور)یش بەکاردێنێ، وڵتا ئەمرپێکرلو.

ئینجا لەبارەی سەرچۆپییەوە، ئەوە مافی هەموو کەسێکە، هەڵپەڕێو سەرچۆپی بگێڕێ، کەسیش دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول قوڕی نەپێولوە. وەك راستییەکیش، من هەرگیز لەیانەی فەرمانبەرانی سلێمانی نەهەڵپەڕیومو نە سەرچۆپیم کێشاوە. یانەی فەرمانبەرانی سلێمانیش، لەدوا ساڵەکانی هەشتاکاندا نەبێ، ئاهەنگی سەری ساڵی هەر تیا نەکراوە، پەتی درۆش کورتە.

* ئەڵێ: هەڵبەتە، بەخۆرایش، کاری بەڕێوەبەری (کۆمپانیاکانی زیوتی نەباتیو محەلەباتو ئەلشەریکەی ئەلعراقیە ئەلتجاریەو مەوادی ئینشائی) لەسولەیمانی پێ نەسپێردرابوو ٨٠.

– ئەو زانیاریانە، کە من بەڕێوەبەری ئەو جێگایانە بووم، ئەوە من خۆم لەناو هەندێك لەبەرهەمە چاپکراوەکانمدا نووسیومن، ئەو بەڕێوەبەرێتییانەش کەس بەخێر نەیدابوون بەمن، من خۆشم هەڵپەم بۆ نەکردبوون، بەرامبەر هیچ سازێکیش نەبوون، هەموو کاتێکیش من خۆم لەپلەو پایەی وەزیفیو حیزبایەتی بەگەورەتر زانیوە. ئەو کارانە، بەهۆی توانا (کفاءة)ی خۆمەوە پەخەیان گرتبووم، من چەندین جار، لەکاتی ئەوکارانەمدا، داوای خانەنشینیم کردووە بۆ ئەوەی بچم پارێزەری بکەم، بەلام کاربەدەستانی سەرووی خۆم قایل نەئەبوون.

دۆسیەی کەسێتی خۆم، وێنەی ئەو داوایانەی منی تیایە بۆ خانەنشینی، ئینجا ئەم نووسەرە شتێکی تری نەزانیوە، ئەویش ئەوەیە، دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلول، زۆربەی ئەو فەرمانبەرانەی

لەشۆڕشەوە گەڕانەوەو پێیان ئەوتن (عائدون) گواسرانەوە بۆ باشووری عێراق. بەڵام مـن چـوومەوە سەر کارەکەی خۆم (بەڕێوەبەری لقی کۆمپانیای زیوتی نەباتی لەسلێمانی) ئەزانی بۆ!؟

* بەر لەوەی بزانم بۆ، با ئەوەش بڵێم کە هـەر بـەدوای ئـەو قـسانەیدا، ئـەڵێ: جگـە لـەوەی، وەك ناوی زڕاوەو دەنگی دڕاوە، لەنێو جەماوەری شارەکەدا، بە (بەعس)یش ناو دەبرێ ٨٠.

– من نەناوم زڕاوە، نەدەنگم دڕاوە، ئەستێرەی نـاوم هەمیشە لـەئاسمانی کوردسـتانو دەرەوەی کوردستانیشدا ئەدرەوشێتەوە، سەریشم ئەوەندە بەرزە کە هەمیشە دەنگمی دلێر کـردووە بەڕادەیـەك کە هەموو کاتێ خاوەنی هەڵوێست بووەمو وەك شێر نەڕاندوومـە بەسـەر، نـەك هـەر تـەنیا پێنووسێکی وەك ئەم پێنووسە لەرۆژکەی هەتا راپەڕین نەوێراوە لەهەندەرانیش وشەیەك بـۆ کـورد بنوسـێ، بـەڵکو نەڕاندومە بەسەر هـەموو ئـەو دەسەڵاتانەشدا کـە فـەرمانڕەوای عێراقو کوردستانیش بـوون. لـەنێو جەماوەری شارەکەشمدا، نەك هەر بە (بەعسی) ناو نەبرلوم، بەڵکو بەدژی بەعسو هەموو داگیرکـەرانی کوردستانو بەکەسێکی خـاوێنو ئـازاو نـەترسو توندڕەوو تێکۆشـەرو جەربـەزە ناسـراوم، هـاوبیرانی کاژێكو پاسۆك، کە ئەولن لەنزیکەوە شارەزاو هاوخـەباتو هاوکاری مـن بـوون، هـەروەها زیندانـەکانو خۆپیشاندانەکانو کۆڕە جەماوەرییەکانو لاپەڕەی رۆژنامەو گۆڤارەکانو هەموو ئەوانەی مـن ئەناسـن، شایەتی ئەم راستییەن، چەمیش بێ چەقەڵ نابێ. لەناو ئەم شارەی منیشدا، دوور نیە چەند چـەقەڵێك یا (هاوائازان)ەکانی ئـەو بەرەخنـەکانم، ویستبێتیان دەسە چـەوورەکەی خۆیـان بەمنـدا بسـوون، وەك ئەوانەی لەبەر دەرگای ئەمنەکەی فازیل بەڕاکدا دەستیان پانئەکردەوە بۆ کڕێی ئەو کتێبانـەی سـەدام کە وەریانئەگێڕا بۆ کوردی یا بۆ روسـی، یـا هەنـدێ لەوانـەی ئـەقڵیان لەچـاویاندایە، وتبێتیـان مـادەم بەڕێوەبەری ئەو کۆمپانیانە بووە، یا مـادەم ئـەویش لەعائـدون بـووەو نەگواسـراوەتەوە بـۆ باشـووری عێراق، کەواتە ئەبێ بەعسی بووبێ!

من دەربەسـتی قـسەی رێـویو چـەقەڵەکان نـیم، بـەڵام بـۆ ئەوانـەی ئـەقڵیان لەچـاویاندایە، جێـی خۆیەتی لێرەدا هەندێك راستییان لەو بارەیەوە بخەمە پێش چاو:

١– لەبارەی ئەو وەزیفانەوە کە ئەم نوسـەرە، بەسەرسـوڕمانەوە، هێنمایـان بـۆ ئـەکا، مـن پێـشتر لەژمارە ٣٢ی رۆژنامەی رێزداری (تایم)ی سلێمانیدا، لـەبواری بیرەوەرییەکانـدا، لـەوەڵامی پرسـیارێکی رۆژنامەکەدا کە ئەڵێ:

(* ئەو فەرمانبەرانەی دوای هەرەسی شۆڕش گەڕانەوە، زۆربەیان گواسرانەوە بۆ خوارووی عێراق، چۆن لەسلێمانی مایتەوەو بوویشیتە بەڕێوەبەری ئەو کۆمپانیایانە؟) وتوومە:

(من بەر لـەوەی پەیوەندی بەشۆڕشەوە بکـەم لـەمانگی مـارتی ١٩٧٤دا، خـۆم هـەر بەڕێوەبـەری کۆمپانیای زیوتی نەباتی بووم لەسلێمانی، ئەو کاتە حاتم عبدالرشید کـە زاوای احمـد حـسن بکـر بـوو، بەڕێوەبەری گـشتیی کۆمپانیـای زیـوتی نـەباتی بـوو لەبەغداد، حـاتم هاوکاری کۆلێجی حقـوقم بـوو، برادەرایەتیشمان خۆشبوو، ساڵەکانی ١٩٦٣ تـا ١٩٦٦ لەبەغـداد، پێکـەوە حقوقمـان تـەواوکرد، هـەر ئەویش بەبەڕێوەبەری زیوتی نـەباتی لەسـلێمانی سـاڵی ١٩٧١ دایـنـام، ئیتر سـاڵی ١٩٧٤ کـە بڕیارمـدا پەیوەندی بەشۆڕشی ئەیلولەوە بکەم، هـاتم هەرچـی مـەوادی لکـی کۆمپانیـای زیـوت هـەبوو فرۆشـتم،

سەرجەمی پارەکەی گەیشتە (١٣٠) سەدو سی هەزار دینارێك، ئەو کاتە ئەو پارەیە زۆر بوو، خەڵکی وا هەبوو لەفەرمانبەران، هەزار دینار لەقاسەکەی دائیرەکەیدا هەبوو، ئەیخستە گیرفانیو ئەوسا ئەچووە ناو شۆڕش! بەڵام من ئەو سەدو سی هەزارەم برد بۆ بانق، ئەوسا حاجی ئەکرەمو دلاوەر مەجید، ئەمین سنوقبوون. زۆر سەریان لەوە سوڕما.

ئینجا نامەیەکم بۆ حاتم نوسیو لەگەڵ قەسیمەی پارەکەدا، بەپۆستەدا ناردم بۆ حاتم. لەنامەکەدا نووسیم: (من ئەرکی نیشتمانیو نەتەوەیی پاڵی پێوەنام کە بچمە ناو شۆڕشی میللەتەکەمەوە، ئەرکی ئەخلاقیو برادەرایەتیش وای لێکردم کە خیانەت لەتۆو لەوەزیفەکەم نەکەم. بۆیە وا هەموو مەوادەکانی شەریکەم فرۆشتو پارەکەم بۆ خستنە بانقەوە)، حاتم نامەکەی بردبوو بۆ خەزووری (ئەحمەد حەسەن بەکر)و پێی وتبوو من فەرمانبەری ولپاکم هەیە، ئیتر دوای گەڕانەوەم، حاتەم هاتە سلێمانیو سەردانی کردمو وتی تۆ لەجێگەی خۆت ئەمێنیتەوەو نایەڵم نەقلت بکەن بۆ جنوب، هەرواش بوو). دوای ئەوە، من لەناو لقەکانی کۆمپانیاکاندا لەسلێمانی: وەك تایەی سپێر ولبووم، بەڕێوەبەری هەر کام لەو لقانە پەنچەریوونایە، منیان بۆ جێگەکەی ئەو نەقڵ ئەکرد. ئەوەش بەهۆی ئەوەوە بوو کە من شارەزاییەکی زۆرم هەبوو لەئیشوکاری کۆمپانیادا، چونکە لەساڵی ١٩٥٨ ەوە تا ساڵی ١٩٦٨ لەبەغداد خزمەتی وەزیفەم لەم کۆمپانیایانەدا بوو: (شركة المواد البنائية، شركة الصناعات العقارية و مصلحة الخياطة). لەسلێمانیش لەکارگەی جگەرە تا ساڵی ١٩٧١. دوای ئەوە وەك وتم، لەلقی زیوتی نەباتی لەسلێمانی. جگە لەوانە، عەرەبیەکی باشم ئەزانی، حقوقیش بووم، چەندین خولی ئیداریم لەبەغداد بینیبوو، بەو هۆیانەوە، هەمیشە من منەتم ئەکرد بەسەر کاربەدەستاندا کە ئیدارەی ئەو جێگایانە ئەکەم، زۆریش مەبەستم بوو خانەنشین کرێم بۆ ئەوەی خەریکی پارێزەری بم، بەڵام ئەوان رازی نەئەبوون هەتا ساڵی ١٩٨٢ کە جەمال حاجی شەریف بوو بەسەرۆکی ئەنجومەنی تەنفیزیو بەهۆی ئەوەوە کە برادەری منداڵیو قوتابخانەی سەرەتایم بوو، زۆرم لێکرد کە رازی ببێ بۆ خانەنشین کردنم. ئەوەندەش پەلەم بوو بۆ ئەو خانەنشینیە، چاوەڕوانم نەکرد کە شەش مانگی تر خزمەتم ببێ، بۆ ئەوەی (٢٥) ساڵ تەواو بکەم، بەڵکو بەهۆی تەمەنەوە کە بەپێی پێناسەی نفوس پەنجا ساڵ زیاتر بووم، خۆم خانەنشین کرد [*].

بۆ زانیارییەکی زیاتریش، من هەمیشە لەگەڵ شێخ جەعفەری پارێزگار ناکۆك بووم، لەبەر ئەوەی بەعسی نەبووم، نووسراوێکی نهێنی لێنووسیم بۆ ئەوەی لەمودیری لابرێم، لەو کاتەدا سیروان جاف ئەمین عام بوو لەهەولێر، نوسراوەکەی پیشاندامو وتی: ئەگەرچی من ئەزانم کەس لەمودیرەکانی لقی ئەو کۆمپانیایانە لەسلێمانی لەتۆ بەتواناتر نیە، بەڵام ئەگەر دلواکەی شێخ جەعفەر جێبەجێ نەکەم، ئەوا ئەو تۆ تووشی بەلایەکی گەورە ئەکا. وتم بەکاتبیش رازیم بەو مەرجەی دوایی خانەنشین کرێم، ئیتر نەقلی کردم بۆ دائیرەی چاودێری بازرگانی، وەك فەرمانبەرێك نەك مودیر، مودیرەکەی عەلی ساڵح

---

[*] من خۆم لەدایکبوونی ١٩٣٤م، بەڵام لەسەرژمێری ١٩٥٧دا، بەهەڵە بە ١٩٢٤ نوسراوم.

بوو، کە پێشتر لای من فەرمانبەرێك بوو لەشەریکەی ئەفریقی! ئەوەبوو دوای چەند مانگێك خانەنشین بووم پێش ئەوەی ٢٥ ساڵ خزمەتی وەزیفە تەواوکەم.

جگە لەوە، خۆ هەر من تەنیا نەبووم کە بەڕێوەبەری فەرمانگەیەك بم و بەعسیش نەبم، لەو کاتانەدا دەیانی تر، بەڕێوەبەریش بوون و بەعسیش نەبوون، وەك: شێخ جەمالی خەزنە، عەلیی ئەحمەدی تەهای باجی دلفات، محەمەد سادقی باجی خانوبەرە، کەمال کەریمی کۆمپانیای تەئمین، کەمال بەگی بەنزینخانە، عەبدول ڕەزاقی تاپۆو چەندین بەڕێوەبەری قوتابخانەکان و شوێنی تریش.

ئێستاش دوای خستنی ڕژێمی بەعس، خاوەن فایلەکان ئاشکرا بوون، ولتا ڕەش و سپی، لەبولردا دەرکەوت، من لەچەندین بۆنەو نوسینمدا لەدژی ئەو خاوەن فایلانەی بەعس دواوم و نووسیومە، بەڵام هەرگیز دەروونم ئەوەندە نزم نەبووە کەسێکی چاك و پاك بەتۆمەتێکی وا ناڕەوا تاوانبار بکەم چجای کەسێك کە هەموو ژیانی بۆ ڕاژەی نەتەوەکەی تەرخان کردبێ ئەگەرچی ئەو کەسە دوژمنیشم بێ. لەراستیشدا تاوانبارکردنێکی لەو جۆرە بۆ هەرکەسێك، بەبێ بەڵگەو هەر بە (ئەڵێن) ئەوە مەگەر هەر لەیەکێکی وەك خاوەنی ئەو جوێننامەیە بوەشێتەوە، ئەو بۆ بەرۆکی خاوەن فایلەکان ناگرێ وەك من بەرۆکیانم گرت!؟

* ئەڵێ: (زێر.. ئایا، تەنیا دێرە هۆنراوەیەکیشی بۆ کورد و شۆڕشە نوێکەی هۆنیوەتەوە؟ مەگەر تەنیا هەر لەدڵی خۆیدا هۆنراوەی بۆ کورد گوتبی ٨٠.

– عەرەب ئەڵێ: (ئەگەر شەرمت نەکرد، چیت ویست بیکە) ئەی ئەو وەك تۆ وتت، خۆی لەلاپەڕە هەشتی کتێبەکەیدا نەینوسیوە: (ئەو زێرەی لەسەردەمی بوژاندنەوەی بزوتنەوەی کوردایەتیی سالانی پەنجاو شەستەکاندا، بەتیشکی گڕی بڵێسەی روناکی هۆنراوە جوانە نەتەوەییەکانی، ڕێی پڕ لەتاریکونوتەکی شەوەزەنگی کوردایەتیی، بۆ لاوانی نەتەوەکەی ڕۆشن دەکردەوە.

(ئەو زێرەی، بەبیری وردی بەپیت و پیتۆلانەی هۆنراوەکانی نێو دیوانی کوردایەتی کێڵگەی خاکی پڕ لەدڕکوداڵی کوردستانەکەی بۆ خاوێندەکردینەوەو.. هتد!؟) دواییش دێمە سەر ئەو هەڵبەستانەی کاتی شۆڕشی نوێ وتومن.

* بەڵێ، خۆی لەراستیدا، ئەوەیان گرنگترە کە بەر لەشۆڕش، تۆ جەماوەری کوردت هاندلوە بۆ شۆڕش، بۆ ڕزگاری و ئازادی، بۆ یەکگرتنەوەی پارچەکانی کوردستان، بۆ دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ، ئینجا ئاوا بەو زەقیەو بەو بوێرییەو لەژێر دەسەلاتی ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستاندا، ئەو هەڵبەستانەت بەناوی ئاشکرای خۆتەوە بلاوکردۆتەوەو چاپکردووە، نەك هەر ئەوە، بەلکو لەگەڵ ئەوانەدا، ڕێکخستنی سیاسی شۆڕشگێڕانەشت بۆ نەتەوەکەت دروستکردووە لەگەڵ ژمارەیەك لەهاوبیرانتا بەناوی (کۆمەڵەی ئازادی و ژیانەوەو یەکێتی کورد ــ کاژیك)ەوە بەر لەهەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول بەدوو ساڵ و چوار مانگ و بیست و حەوت ڕۆژ. واتا ١٤/٤/١٩٥٩، کە نەك هەر ڕژێمە داگیرکەرەکان، بەلکو ڕێکخراوە سیاسییەکانی کوردستان و کەسایەتییەکانی سەر بەو ڕێکخراوانەش (بێجگە لەخودی سەرۆك بارزانی و هەڤاڵ ئدریس) دژایەتی کاژیکیان ئەکرد، کاژێکیش پەیتا پەیتا لاوانی گۆش و پەروەردە ئەکرد و ئەیخستنە ناو شۆڕشی ئەیلولەوە، بەتایبەتی هێزی خەبات کە

گەورەترین هێزی شۆڕشی ئەیلول بوو، بەسەرکردەکەی فەتاح ئاغاو جێگرەکەی نوری حەمە عەلی‌و زۆربەی زۆری پێشمەرگەکانیەوە، کاژێك بوون، ئەوە جگە لەوەی، وەك ب. هندرێن (لەتیف قەرەداخی) ئەڵێ: (سەرهەڵدانی هۆنراوەی کوردایەتی زێڕ، گواستنەوەی بیروباوەڕی نەتەوایەتی بوو لەسۆز (عاتیفە)وە بۆ تیور (النظرية) لەدنیای هۆنراوەی کوردیدا*.

بەرامبەر بەو قسەیەشی کە ئەڵێ: (خۆ ناشتوانێ بڵێ هۆنراوەی گوندەکان‌و هەڵەبجەو راپەڕینم هۆنیوەتەوە، چونکە، ئەو هۆنراوەیەی لە ١٩٩١/٣/١٠ دا نوسیوە) کە ئەشێ مەبەستی ئەوەبێ تۆ لەپێش راپەڕیندا هەڵبەستی نەتەوەییانەت نەنووسیوە، ئەوا من لەجیاتی تۆ، وەڵامی ئەدەمەوەو ئەڵێم: بابچێ لاپەڕە ٤ی ژمارە ٣٢ی رۆژنامەی تایم بخوێنێتەوە کە لەبارەی ئەو هەڵبەستەوە وتووتە: (ساڵی ١٩٨٨ دوای تێکدانی گوندەکان‌و ئەنفال، بە هاوڕێ حەمە ساڵح هۆشمەندا* ئەو هەڵبەستەم بۆ ناردن واتا بۆ سەرکردایەتی پاسۆك لەشاخ).

– راستییەکەی ئەو هەڵبەستە، دوو بەشە، بەشی یەکەمیان کاتی تێکدانی گوندەکان، پێش راپەڕین، وتوومە بەشەکەی تری دوای راپەڕین، بەشی یەکەم:

ئەو گوندانە ئەڕوخێنن
ئەو گوندانە ئەسووتێنن
بەبێ ورە، لەدووکەڵی ئەو گوندانە زیرە ئەکەن
لەبەریووره، تۆپی دەستی نامەردانە ئاگر ئەدەن
ئەگەر سزای ئەو گوندانە سوتاندنە، چونکە گوندی جۆرە خەڵکێکی نەبەردن
کوڕە کوڕەی ئەو گوندانە ولن لەچیا، ئەڵێن ئێوە ئەگەر نازان، ئەگەر مەردن
وەرن ئێمە جەنگاوەرین، دروستکەری ئەو گوندانەین، وەرن وەرن
ئێمەین گیان‌و چاوو دەستی ئەو گوندانە، یەخەی ئێمەی لەسەر بگرن

---

* ب. هەندرێن: لێکۆڵینەوە، کامیل ژیرو هۆنراوەی نەتەوەیی لەهەڵوێستو رەخنەدا. چاپخانەی ئۆفسێتی میناو ـ بغداد ـ ١٩٨٥ ل٢.

*حەمە ساڵح هۆشمەند، ئەوسا پەیامنێری پاسۆك بوو، لەنێوان سلێمانی‌و بارەگای پاسۆکدا ئەهاتو ئەچوو، ئێستا یاریدەری پزیشکییە لەخەستەخانەی کۆماری لەسلێمانی، لەشەقامی گۆرانیش فرۆشیاری شتومەکی پزیشکییە، شایانی وتنە هەر ئەم هاوڕێ هۆشمەندە، کتێبەکەی هاوڕێ ب. هەندرێن (لەتیف قەرەداخی) بەناونیشانی: (کامیل ژیرو هۆنراوەی نەتەوەیی لەهەڵوێستو رەخنەدا)ی بەخەتە خۆشەکەی نوسییەوەو هەر بەو دەستخەتە ساڵی ١٩٨٥ ئۆفسێت کراو زۆریشی نەبرد، فرۆشتنی کتێبەکە لەلایەن میرییەوە، قەدەغە کرا. ئامادەکردن‌و چاپکردن‌و بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبە، لەو ساڵەدا، کە هەمووی بەسەرپەرشتی من بوو، کارێکی نەتەوەییانەی ئەوتۆ بوو، لەو رۆژگارەدا، لەهەموو کەس نەئەوەشایەوە، زۆری وەك پاڵەوانەکەی دوای راپەڕین، لەهەندەرانیش نەیانئەوێرا کتێبێکی وا بخوێننەوە، نەك ئامادەیکەن!

وەرن لەمەیدانی جەنگدا دەرئەکەوێ: کێ سوارەیە، کێ پیادەیە
کێ لەسەر مافی نەتەوەی، لەگەڵ نێوەی ترسنۆکا، یەك بەدەیە
ئەگەر کێشەی ناڕەواتان، دەستەو یەخە، لەمەیدانو کۆڕی جەنگدا
لەگەڵ ئەو خاوەن گوندانە یا لەتاوان دەسهەڵگرتن ئەنجام ئەدەن
ئەوا لەجێی ئەو گوندانە، ئەو مەردانە، کە دەستێکیان پیادا هێنان
لەکەللەی سەری پەڕیوتان، گوندی جوانو رازاوەترن دروست ئەکەن.

پێشینییەکانی ئەو هەڵبەستەش هاتنەدی، ئەوەبوو لەراپەڕیندا، کەللەی سەریان پەڕیو گوندەکانیش تازەکرانەوە. بۆیە دوای راپەڕین، بەشەکەی تریم تەواوکرد.

ئێستا جێگەی خۆیەتی بپرسین: ئاخۆ خاوەنی ئەو جوێننامەیە لەهەندەرانیش، سالی ١٩٨٨ ئەو سالەی کە من ئەو هەڵبەستەم تیا وتووەو تیا بلاوکردۆتەوە، ئەو ئەیوێرا ئەو بەشی یەکەمی هەڵبەستە بخاتە گیرفانیشی، نەك شتێکی وابنووسێ!؟ ئینجا خۆ من وەنەبێ پێش راپەڕین هەر تەنیا ئەو هەڵبەستەم وتبێ.

* من لەو باوەڕەدام، ئەو هەڵبەستانەی ترت کە لەنێوان ساڵەکانی ١٩٨٢–١٩٩٠دا وتوتنو بەناوی ئاشکرای خۆتەوە بلاویشت کردوونەتەوە، لەو بەشی یەکەمەی هەڵبەستی (گوندەکانو راپەڕینو هەڵبجە)یە کەمتر نین، ئەوانەی لەژمارە ٢٤ ی رۆژی ٢٠٠٢/١٢/٤ی رۆژنامەی تایمدا لە هێمات بۆ کردوون.

* جگە لەو هەڵبەستانە، نوسینەکانیشت لەبواری نەتەوایەتی بەگشتیو کوردایەتی بەتایبەتی، هەمان گرنگیان هەبووەو بەلگەی ئەوەن ئێوە هەمیشە رۆڵەی دڵسۆزو جەولمێری نەتەوەی کوردنو هەمیشە لەسەنگەری خەباتی کوردایەتیدا بوون، نمونەیەکی ئەو نووسینانەش، وتارە شاکارەکەت (مەحوی هەستیارێکی نەتەوەیی بووە)ی ناو پەڕاوی (لەبارەی مەحوی لوتکەوە) یە کە ساڵی ١٩٨٦ لەچاپخانەی سومەر لەبەغداد چاپکراوە.

ئینجا وەك هەستیار ئەڵێ:

بازاڕی دەهرە، قیمەتی ئەشیا بەجێگەیە
مێشێ گەبیە رووی نیگاریێ، بەخاڵ ئەچێ

ئەو وتارو هەڵبەستانەی تۆ، هی ساڵانێکە کە رژێمی فاشستی بەغداد، درندانەترین هێرشی ئەبرد بۆ سەر نەتەوەی کوردو بۆ سەر رۆشنبیرانی کوردو تێکڕا جەماوەری کوردستان، لەرۆژگارێکی ئاوادا، نووسینو هەڵبەستی لەو جۆرانە لەدەست هەموو کەس نایەت، بەتایبەتی لەژێر ئاگربارانی ناو کوردستاندا، ئاخۆ ئەم نووسەرە تازەکوورەیەی دوای راپەڕین، لەئەووروپای شەقام ئەختیشدا، لەو رۆژانی ئاگربارانەی کوردستاندا، نووزەیەکی لێوە هاتووە بۆ کورد!؟ بۆ!؟ خۆ منداڵ نەبوو!!

– کەواتە جێی خۆیەتی ئێستا من پرسیارەکانی لاپەڕە ٨٠ی ناو جوێننامە زەردەکەی (دیدی نەتەوەییو دیدی نانەتەوەیی) ئاڕاستەی خۆی بکەمەوەو بڵێم: ئەرێ کاکە تۆ ئەو زمانە درێژەی دوای راپەڕینت، بۆچی تاکە یەك جاریش بۆ کوردو کوردایەتی نەخستە کارو لەو هەموو ساڵانەی کوردستان

تیا بندەستبووە، کورد بەخراپترین شێوە ئەچەوسێنرایەوە، ئەو هەموو کیمیابارانەی ناوچەکانی هەڵەبجەو قەرەداغو بادینانی تیا ئەکرا، ئەو ئەنفالانەی روویاندا، ئەو هەموو کوڕە کوردەی بەدەستی داگیرکەرەکە لەزیندانە تاریکەکانی دەوڵەتی عێراقدا لەسێدارە ئەدرا، ئەو هەموو پێشمەرگە ئازایانەی کوردستان لەسەنگەری کوردایەتیدا بەگوللەی دوژمن ئەپێکران! ئاخۆ لەو ساڵانەدا، تۆ لەکام دیسکۆی مۆسکۆو ستۆکهۆڵمدا سەرچۆپیی دانسو هەڵپەرکێت کێشابێ!؟ خۆ ناشتوانی ئەو چەند رۆژەی دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول، چوویتە پاڵ پاسۆك لەشاخ (بەقسەی خۆت!) بکەی بەماڵ بەسەرمانەوە، چونکە تۆ ئاسەر نە لەگەڵ پاسۆك مایتەوەو نە لەشاخەکانی کوردستان ئارامت گرت بۆ خەباتێکی چەکدارانە. لەشارەکانی کوردستانیشدا، وەك ئێمە، نەمایتەوە بۆ خەباتی ژێرزەمینی دژی ئەو رژێمە. زۆر کەس وەك تۆ، شاخەکانی کوردستانیان کرد بەپەیژە بۆ هەڵاتن لەکوردستانو بۆ خۆگەیاندنە سەرچۆپیکێشان لەدیسکۆکانی ئەورووپای ئەرمونیاندا! دیسان ناشتوانی بڵێیت لەپێناوی راژەی نەتەوەکەتدا، بۆ تەواوکردنی خوێندن چوویت بۆ یەکێتی سۆڤێت، چونکە دوای دوکتۆراکەت لەوێ، لەجیاتی ئەوەی رووبکەیتەوە کوردستان (شاخەکانی یا شارەکانی) هەوارت گواستەوە بۆ وڵاتی سوید!! ئینجا ئەوا ئەمڕۆ چواردە ساڵێك بەسەر راپەڕیندا تێئەپەڕێ، کەچی هێشتا زاتی هاتنەوە بۆ کوردستان ناکەیت، لەکاتێکدا کە زانکۆکانی کوردستان، پێویستییەکی زۆریان بەئێوەو مانان هەیە، بەتایبەتی پێویستییەکی زۆر بەخاوەن بڕوانامەیەکی دوکتۆرا لە (پەتاتە)دا، ئیتر تۆ چ قارەمانێتییەك بەئێمە ئەفرۆشێت لەکوردستانی سویدەوە!؟

* ئەڵێ: (ئەندامانی سەرکردایەتی ئەو کاتەی پاسۆك، ساڵی ١٩٧٩ ویستیان بتکوژن، بەڵام چانست هەبوو، لەشار نەبووی، هەروەها ئەڵێ: هەرچەندە ئەو کاتە ئەیناسیویت، بەڵام حەزی نەدەکرد، نەتەوەییەکانی کورد دەستیان بەخوێنی یەکدی سووربێ. لەبەر ئەوە ئاگاداری عەبدوڵا ئاگرینی کردووە، ئاگات لەخۆت بێ ٨٢..

— هەویری ئەم قسەیە چەند جامێك ئاو ئەکێشێ:

١-ساڵی ١٩٧٩ لەشاربوومو بەبست لێی دوورنەکەوتومەتەوە، هەمیشە بەکراسێکو پانتۆڵێك، یا ئەوپەڕی چاکەتێکەوە ئەگەڕام، نەچەکداربووم، نەچەکدار ئەیپاراستم، چونکە نەئەگوزەم درابوو، نەناوم زڕابوو، ئێستاش نە بەکەسوەڕم، نەشاربەدەرم!

٢- ئاگرین لەو بارەیەوە هیچی پێنەوتووم، دووریش نەبوو لێمەوە، منو هاوبیر ئاگرینو هاوبیر مژدە تایەر، لەناو شاری سلێمانیدا، هەمیشە هاوبیرو هاوکاری یەکدی بووین تا راپەڕین، دوای راپەڕین، مەکتەبی سیاسیی پاسۆکمان ئاشکرا کرد کە پێکهاتبوو لەمولازم کەریمو مولازم شوانو ئێمە، ئەو سیانە.

* ببوورە، با من تەولوی بکەم:

٣- چۆن ئەڵێ ئەو کاتە ئەیناسیویت!؟ ئەی خۆی لەلاپەڕە هەشتی پەڕاوەکەیدا ناڵێ:

(ئەو زێرەی کەرەسەی دیدو بۆچوونەکانی سەردەمێکی مێژوویی بیرکردنەوەو کارکردنی من بوو)!؟

٤- ئەو کە ئەڵێن: (حەزم نەدەکرد نەتەوەییەکانی کورد، دەستیان بەخوێنی یەکدی سووربێ) ئایا ئەمە دڵنیایانان نیە، لەلای ئەوەوە، کە تۆ نەتەوەییەکی کورد بووی؟ ئایا ئەم قسەیەی هەموو ئەو بوختـان و تۆمەتانـەی نـاو قسەکانی پێشووی پووچـەڵ ناکاتـەوە بەرامبـەر بـەتۆ، ئایا ئـەکرێ (بەعسییەك!) بە نەتەوەییەکی کورد ناوبرێ!؟

٥- من لەو باوەڕەدا نیم ئەو سەرکردایەتییە، بیری لەشتێکی واکردبێتەوە، بەڵکو ئەوەی من بیستوومە، سەرکردایەتیی پاسۆك زوو لەو گەیشت و لەریزەکانی خۆی دووری خستەوە.

- سەرکردایەتی پاسۆك لەدەورویەری ئەو ساڵەدا، دووجار نامەی بۆ من نووسی، بۆ ئەوەی هەرەوەزیان لەگەڵدا بکەم، هەردوو نامەکە، مەلا شوان بۆی هێنام، منیش هەرەوەزییەکەم کرد، ئیتر مەلا شوان بەردەوام سەری ئەدام و چاپەمەنییەکانی ئەوانی بۆ ئەهێنام و منیش نووسین و هەڵبەستم بۆ ئەناردن. ئەوانەی ئێستا لەبیرمن: هەڵبەستی (گوندەکان)م بەهاوبیر حەمە ساڵح هۆشمەندا بۆ ناردن، ئەوانیش کتێبی (الأسس ـ للدكتور عصمت سيف الدولة) یان بـەهاوبیر فریادی زنبرامدا بۆ ناردم کە بۆیان وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی، منیش دوای وەرگێڕانی، هەر بەودا بۆم ناردنەوە، ساڵی ١٩٨٠ تا ١٩٨٢ بەڕێوەبەری لقی کۆمپانیای مەولەدی ئینشائی بووم لەسلێمانی، یوسفە لچە، پاسەوان بوو لامان، زوو زوو داوای مۆڵەت (اجازە)ی ئەکرد، ئەمزانی کاری تەتەری بۆ پاسۆك ئەکات. ڕۆژێك پێم وت: ئەزانم تۆ ئەچیت بۆ سەرکردایەتی پاسۆك! یوسف زۆر ترسا! وتم مەترسە منیش هەوم. ئیتر کە لەیەك ئاشکرا بووین، ئەویش هەموو جارێ نووسراوەکانی ئەوانی بۆ ئەهێنام و راسپاردەکانی منـی ئەگەیاند، لـەناو شـاریش، وەك پێشتر وتم، لەگـەڵ هـاوبیر ئەنـدازیار مـژدە تابـەر کـە لێپرسـراوی پاسـۆك بـوو لەسلێمانی و هاوبیر ئاگرین، یەکترمان ئەبینی و هاوکاری یەکبووین، هاوبیر مـژدە، پێشتر کاژێـك بـوو. ساڵە ١٩٧٤ بۆ ١٩٧٥ لەگەڵ فەتاح ئاغای ئامر هێزی خەبات چەند جار سەردانی ماڵی ئێمـەو مامۆسـتا هـەردی (کـە لەیـەك خـانوودا بـووین لەنەغـەدە) ئـەکرد وەك پابەندییـەك بەکاژێکـەوە، دوای راپـەڕین، لەسلێمانی هەموو یەکمان گرتـەوە. دوای رەوەکـەش سـەرکردایەتی پاسـۆکمان گواسـتەوە بـۆ بیـارە، دوایی بۆ قەڵاچوالان، کە ئیدارەی حکومەتیش لەکوردستان کشایەوە، گەڕاینەوە سلێمانی.

* ئـەڵێ دوای هەرەسـی ١٩٧٥، بەهانـدانی دوو کـوردی پەرپـدەی ئـەوروپا، ویـستووتانە بـەناوی کاژێکەوە، گفتوگۆ لەگەڵ بەعس بکـەن لەسـەر مافـە رەواکـانی گـەلی باشـووری کوردسـتان. تـا چـەند هاوبیرێکی دیکە بەهۆشیان هێناونەتەوەو دەستیان پێ لەو کارە هەڵگرتوون ٨١ و ٨٢.

-راستییەکەی ئەوە بیرۆکەیەك بوو، نەك ئێمە ویستبێتمان گفتوگۆ لەگەڵ بەعس بکەین نە لەسـەر مافی کوردو نە لەسەر هیچ شتێك.

ئەو کاتە، لەئەندامانی سەرکردایەتیی کاژێك، تەنیا من و هاوبیر فایەق عـارف لەسـلێمانی مـابووین. ئێمە ئاگامان لە هیچ شتێکی لەو جۆرە نەبوو، بیرۆکەکەشمان زۆر بەلاوە سەیر بوو، لەگـەڵ ئەوەشـدا، ژمارەیـەك لـەکادیرە پێشکەوتووەکانی کاژێکمـان کـۆکردەوەو بیرۆکەکـەی ئـەو دوو برادەرەمـان پـێ راگەیاندن. لەئەنجامدا هەر هەمووومان ئەو بیرۆکەیەمان رەتکردەوەو ئەوانیش گەڕانەوە بۆ ئەوروپا، جا

ئەوە چیە!؟ ئەوە بیرۆکەی ئەو کەسبوو کە رەتکرایەوە، ئەو بۆ یەخەی ئەو حیزبانە ناگریَ کە لەگەڵ بەعس، دژی شۆرشی کورد، چوونە یەك سەنگەرەوە!؟

* ئەڵێ ژیرو هاوبیرەکانی، کەیو لەکویَ نوسیویانە، بلۆکی سوسیالیستی مارکسییانە لەجیهاندا هەرەسدێنیَ؟! ٨٢. ئەم پێشبینییەی لەکویَ کردووە، تۆ بلێی خەوی دیبیَ ٨٢.

– من خەوم دیوە؟ یا ئەو لەخەوی غەفڵەتدا نووستووە!؟ با سەیرێکی وتارەکەی من (مەحوی هەستیارێکی نەتەوەیی بووە) بکات لەپەراوی (لەبارەی مەحوی لوتکەوە) کە ساڵی ١٩٨٥ نوسیبووم‌و لەلاپەرە ١٣٦ دا بلاوکراوەتەوە کە وتوومە: (دەربرینی زانستانە، چ بەوەی بخرێتە پاڵ پیرەو، یا چ بەوەی بخرێتە پاڵ سوشیالیستی، لەرۆژێکدا باوبور کە زانست پێشنەکەوتبوو، بەلام ئەمڕۆ، دوای ئەوەی زانست پێشکەوت‌و بیردۆزەی واهانە ئاراوە کە سەلماندی: مادە ناکۆك نیەو لەناو ناخی مادەدا پێچەوانەبەتی‌و دژایەتی‌و ناکۆکی نیەو دوای ئەوەی بەخستنە کار (التطبیق) دەرکەوت کە سوشیالیستی مادی سوشیالیستیەکی زانستانە نیەو ئەنجام وەك پێشبینی‌و بیردۆزەکەیان دەرناچی‌و لەهەر ولاتیکی سوشیالیستی مادیانە، ئەنجام جۆرێکی جیاوازە لەوانی ترو پاشەکشەو گەڕانەوەش، رۆژ لەدوای رۆژ زیاتر ئەبیَ).

ئایا ئەو قسانە ئەوە ناگەیەنن کە ئەو سوسیالستییە هەرەس دێنیَ؟ خەتای من چیە ئەو مێشتا پێویستی بەوە هەبیَ هەموو شتێکی بۆ حونجە بکریَ!؟، بەڵیَ هەر دیاردەیەك لەم گەردوونەدا ئەگەر بنچینەیەکی زانستی نەبیَ، ئەنجامەکەی هەرەس ئەبیَ. ئەمە راستییەکی بەلگەنەویستە، بلۆکی سوسیالیستیش لەجیهاندا، چونکە لەسەر ئەو سوسیالیستیە نازانستییانەیە دروستکرابوو، ئەوا دیاربوو ئەمیش هەر هەرسی ئەهێنا، چونکە ئەوەی لەسەر بۆش دروست بکریَ، ئەویش هەر بۆشە. ئەو پاشەکشەو گەڕانەوەی رۆژ لەدوای رۆژە لەسویالیستی مادیانەیە، ئەوە بەلگەی ئێمە بوو بۆ هەرەسی ئەو سوسیالیستی مادیانەو مارکسیانەیەو بۆ هەرەسی بلۆکەکەشی. سەلماندنی نازانستیی ئەو سۆسیالیستییەش، هاوکێشەیەکی ئەوەندە گران نەبوو، ئەنجامی بیردۆزەی ئەو سوسیالیستییە مارکسیانەیە، دوای نزیکەی حەفتا ساڵ خستنەکار، چەند جار دەرکەوت کە لەهەموو کاتو هەموو جێگەیەك، نەیەکسان بوو، نە سەرکەوتووش بوو، بیردۆزی زانستیانە، ئەبیَ ئەنجامەکەی نەگۆڕیَ، کە گۆڕا، ئەوە زانستیانە نیە. کە سەرکەوتووش نەبوو، ئەبیَ (بیردۆزەکە) چارەسەر کەیت، نەك (ئەنجامەکانی)، کە بیردۆزەکەشت دەسکاری کرد، ئەوە واتا بیردۆزەیەکی تازەت هێنایە ئاراو ئەوی پێشوو نەما.

*ئەڵێ: (ئەگەر ئەو سوسیالیستەی کۆمۆنیستەکان، زانستانە نەبووبیَ، ئەدی سوسیالستی زانستانە کامەیە؟ ٨٢.

– ئەڵێم تا ئێستا هیچ سوسیالیستیەکی زانستانە نەهاتوتە ئاراوە لەجیهاندا، بەسوسیالستییەکەی کاژیکیشەوە، من زوو لەو سوسیالستییەش کەوتمە گومان‌و وتوومە: ئێمەی ئەوەی ئەمڕۆ، بۆمان نیە لەئێستاوە سیستمێکی ئابوری بسەپێنین بەسەر ئەوەکانی دوارۆژماندا کە بێگومان ئەوان لەئێمە پێشکەوتوتر ئەبن، بەپێی بیردۆزی گۆڕان (تطور). ئەوەی نویَ، با خۆیان رژێمی ئابوری بۆ خۆیان

دلێن. بۆ ئەمڕۆش (قسەکە هی پێش زیاتر لە ٣٠ ساڵە) فەرمانڕەوایەتیی کوردستان، بەدەست کورد خۆیەوە نیە تا سیستمی ئابوورییەك بۆ خۆی دیاری بکا. لەجیهانیشدا، ئەوە بەچاوی خۆمان ئەمانبینی ئەگەر گەنم و برنجی ڕۆژئاوای پیشەسازو ئابوریی ئازاد نەبوایە یەکێتی سۆڤێتی کشتوکاڵو سوشیال بەهیلاك ئەچوو! من هەمیشەش سەرنجی ئەوەم ئەدا کرێکارێك ئەگەر بەپارچە کاربکات، یا کارێك بۆ خۆی بکات، بەهەرمێکی زیاتری ئەبێ وەك لەوەی بەکرێیەکی دیاریکراو کار بکات. کەواتە ئابوریی ئازاد، لەو سوسیالستییانەیە باشترە. بەلام بۆ ئەوەی مرۆڤی هەژارو بێدەسەلاتو بێدەرەتانیش، کەمترین رادەی ژیانی دابین بێ، جۆرێك لەدادو زامنکردنی کۆمەلایەتی پێویستە.

من پێشتریش لەسەرکردایەتی پاسۆکدا، لەو جۆرە قسانەم بۆ کردن، قسەکانیان بەهەند وەرگرتو ولزیان لەبیرۆکەی سوشیالستی هێناو لەکۆنگرەکەی قەلاچوالاندا ساڵی ١٩٩٢، درێژەی ناوی پاسۆکیان لە (پارتی سوشیالستی کورد)ەوە، گۆڕی بۆ (پارتی سەربەخۆیی دیموکراتی کورد).

من بەهەڵبەستیش ئەوەم پیشانداوە کە لەئاستی نەتەوەی کوردا، جیاوازییەك نیە لەنێوان (دارو پەردوو)دا کە مەبەستم هەردوو زلهێزەکەی دنیابووە، هەروەها بەبەرەی چەپم وتووە: پێڕەوەکەتان پێڕەوێکی زانستی نیە، چونکە سەرەتاکەی لەگەڵ ئەنجامەکەیدا جیاوازە، کە زانستیش نەبێ، دیارە هەرەس ئەهێنێ، ئەو هەڵبەستەشم ساڵی ١٩٧٦ وتووە*. ئەمە بەشێکە لەو هەڵبەستە:

ئەی خەڵکو خوا مرۆڤەکان: لەلاتان
ئاشکرایە (دەستی درێژی تاوان!!)
دەرببێنن دەفتەری رەشکراوە
بەو وشانەی گوایە هی ئێوەی پیاوە!
کوا مافی مرۆڤی چەرخی ئەستێرە؟
کوا چارەنووسی ئەو خەلکەی لەژێرە؟
خۆشەویستەکەم، ئەو شاگوڵە شەنگە
ناوهێنانی لەلای ئێوەش بۆ نەنگە!؟
چونکە بەناوهێنانی ئەو دڵی دێو
داڵەخورپێو ئەپەنجێ: جنۆکەو خێو!؟
ئەی ئافەرین پشتو پەنای لاولزان!
بۆ قسەی رووتی بێکردار کە ئازان!!
نەخێر ئێوەش دێوو خێوێکن تەواو
گورگە بۆرەن بەپێستی مەڕ داپۆشراو!
منی رەجاڵ خەڕو نابم بەئێوە
رێڕەوێکتان هەیە ئێوەش هی دێوە

* بڕوانە: ژێر – هەڵبەستەکانی ژێر – دەزگای چاپەمەنیی رۆژ لەسوید ل٩١ و ٩٢.

لەلای من دارین یا پەرەو، یەکسانە
دۆستایەتی لەلای ئێوەش، سامانە
پێڕەوی ئێوە خەرەکی سواوە
بەپینەی ئاگرو ئاسن وەستاوە
ناوی ئەنێن زانستی زانستەکان
خەرەکێکە ناوی زلو دێی ویران!
زانستی چی!؟ ئامێرێکی ناسازە
سەرەتای لەگەڵ ئەنجامدا جیاوازە!

*ئەڵێ: زۆربەی زۆری (کاژێکنامە) زادەی بیری ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەر (مەبەستی دەستەی دامەزرێنەری کاژێکە) نەبووە، چونکە، بەشێکی زۆری، لەسەرچاوە مێژوویی‌و نوسینەکانی نووسەرە نەتەوەییەکانی عەرەبو خۆرئاواوە وەرگیراون ٨٣.

– بابچین کتێبەکەی دوکتور جەمال نەبەز بخوێنینەوە (بیری نەتەوەیی کوردی، نە بیری قەومیەتی رۆژهەلاتی‌و نە بیری ناسیۆنالیزمی رۆژئاواییە). هەرچەندە لەو باوەڕەدام کە خوێندبێتییەوە. چونکە ئەو کتێبە وتارێکی سمیناری بوو لەرۆژی ١٨/٨/١٩٨٤دا لەستۆکهۆڵم ـ سوید خوێندراوەتەوە بەبۆنەی بەستنی کۆنگرەی سێیەمی رێکخراوی خوێندکارانی سوسیالیستی کورد لەئەورووپا ـ سوکسە Sokse وە کە لە ١٨ و ١٩ ئابی ١٩٨٤دا لەستۆکهۆڵم بەسترا. چاپی یەکەمی هەر هەمان ساڵ ١٩٨٤ لە ستۆهۆڵم کرا. چاپی دووەمیش لەلەندەن ساڵی ٢٠٠٢ کرا. کە بەڕێز دوکتۆر نەبەز بە (٢٢٠) لاپەڕە راڤەی ئەو راستییەی کردووە. پێویست ناکا من لێرەدا ئەو راستیانەی ناو ئەو پەڕلوەی د. نەبەز دووبارە بکەمەوە، هەر کەس ئەو پەڕلوە بخوێنێتەوە، تێئەگا کە کاژێکنامەو هەموو دیدوبۆچوونە نەتەوەییانەکانی ئێمە، زادەی بیری خۆمانە. سوسیالیستییەکەی کاژێکیش، هەر تایبەت بوو بەکورد، ئەگەرچی من پارێزگاریم بەرامبەر بەوەش هەبوو، تەنیا سوسیالیستییەك کە من پەسەندم ئەکرد، دادی کۆمەلایەتی بوو، وەك سوسیال دیموکرات.

* وترلوە: (کورد بدوێنە، شەرعی خۆی ئەکا!) ئەم نووسەرە تازەکوورەیە، دوای ئەوەی چەردەیەك بەپەسەندکردنی یەکێتی سۆڤێت‌و سوسیالیستییەکەی‌و بەخشینی ماف بەکەمینەکانی‌دا هەڵئەدا، ئینجا ئەڵێ: ئەوەی لەوێ نەبوو: (ئازادیی رادەربڕین‌و دیموکراسی بوو) ٨٤.

– جاچی مایەوە!؟

* لەوەش سەیرتر ئەڵێ: (دیکتاتۆری‌و نان، لەئازادی‌و برسێتی باشترە) ٨٥.

– ئەی نەمانوت ئەوەی بەگەورەیی فێری پڵاوخواردن بێ، دەس ئەبا بۆ لووتی، ئەمیش چونکە بەگەورەیی سواری نووسین بووە، ئەوەتا وڕێنەی وائەکا!

* نوکتەیەکی تر! ئەڵێ: (بریا، کوردیش لەبندەستی دەوڵەتێکی کۆمۆنیستی وەك یەکێتی سۆڤێتدا بووایە، جا ئەو کاتە دەمانبینی، چۆن دەژیاو ئازاد دەبوو)٨٥.

– ئەمەیە ئەڵێن لەگوێی گادا نووستووە! ئەی بەشێك لەنەتەوەی کورد لەبندەستی یەکێتیی سۆڤێتی کۆمۆنیستدا نەبوو!؟ ئەی نەمانبینی چۆن ژیاو، چۆن نەك هەر ئازاد نەبوو، بەڵکو چۆن ئەشکەنجە دراو پەرتوبڵاو کرانەوەو زۆریەی زۆریان توێنرانەوە؟

* لەلاپەڕەکانی ٨٦ تا ٨٩ دا بەراوردی وڵاتانی سۆسیالیستیو سەرمایەداری ئەکاتو یەکەمیانی لەدووەمیان زۆر زۆر لاباشترە!.

– ئەی ئەگەر وایە بۆچی خۆی بەهەشتی سۆڤێتی سۆسیالیستی بەجێهێشتو رووی کردە دۆزەخی سویدی سەرمایەدار!؟

* ئەمەیان سەیرە! باسی چاوو گوێی خۆی ئەکا!! ئەڵێ: (با لێرەدا، دەربارەی یەکەمین دیداری منو ژیر، چیرۆکێکی کۆن بگێڕمەوە، کە پێوەندیی بەزارلوەی نەتەوەوە هەیە، پێش ئەوەی لەنزیکەوە ژیر بناسم، لەدوورەوە ناوم بیستبوو. هۆنراوەی نێو دێوانە بچکۆلە خنجیلانەکەی ـ کوردایەتی ـ م، چەند جارێ خوێندبووەوە، زۆر سەرنجی راکێشابووم، بەشێوەیە زۆربەشیانم لەبەر کردبوو، بەکوردیی کوشتەی بیروباوەڕو رێبازەکەی بووم، جاروباریش، لەسەرجادەو لەکۆڕە وێژەییەکاندا دەمبینی، بەسەرسامییەوە تێمدەڕوانی. هێشتا نەمدەناسیو حەزم دەکرد، لەنزیکەوە بیبینمو بیناسم، قسەی لەگەڵ بکەم، پتر لەمەستو سۆزی تێبگەم، تا بەتەواویی بیناسمو دەربارەی بیری نەتەوەیی، زانیاریی پتری لێ وەرگرم. کاتێ لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٠ دا، تێکەڵاوییەکی لەڕێکخستنەکانی کاژیك بووم، ژیرم هێندەی دیکە خۆشویست، ئیدی وام لێهاتبوو، بێ ئەوەی بەباشی بیناسم هیچ شتێکی دیاریکراو، لەبارەی باوەڕ، هەڵوێست، رەوشتو ژیانی تایبەتیی خۆیەوە بزانم، بەچاکو بەخراپ، لای ئەندامانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق، داکۆکیم لێ دەکرد، رەنگە چەن جارێ لەسەر ژیرو باوەڕەکەی لەگەڵ ئەو هەڤاڵو هاوڕێیانەدا، تووشی دەمقاڵێ، ساردیی و گرفت بوویم.. لەگەڵ دکتۆر کاوس عەزیزی هاوڕێمدا، پێکەوە خوێندکار بووینو لەزانکۆی سلێمانیی دەمانخوێند. پاش نیوەڕوان، ناوبەناو، سەردانی مامۆستا شاکیر فەتاحمان دەکرد) تا ئەگاتە ئەوەی ئەڵێ: (رۆژێکیان سەرەتای ساڵی خوێندنی ١٩٧٢ ژیر لەوێ دانیشتبوو، ویستی باسێکی رامیاریی نەتەوەیی بکاتەوە. لەنێوان قسەکانیدا گوتی: نەتەوە شتێکی هێندە پیرۆزە تەنانەت خواش لەقورئاندا، چەن جارێ باسی کردووە ـ منیش زۆر سەیرم لێهاتو دەسبەجێ گوتم: ئەو نەتەوەیەی خوا لەقورئاندا باسیکردووە، لەگەڵ ئەو نەتەوەیەی وەك زاراوەیەکی ئیتنیك بەکاردێنرێ، زۆرجیاوازییان هەیە، بەچەن دێڕێکی کورت باسمکرد، ئیدی هەردووکیان بێ دەنگبوون. دوایی ناوی دوو پەرتوکی نووسەری عەرەب دوکتۆر کەمال یوسف ئەلحاجم بۆ ژیر نووسیو گوتم: حەز دەکەم ئەوانە بخوێنیتەوە، ئەویش بەخۆشییەوە وەریگرت، بەو جۆرە لەسەر قسەکانی ئەڕوا تا ئەگاتە ئەوەی ئەڵێ: (بەڵام هەر ئەو جارە بەسبوو، ئیدی بەتەواوی لێی تێگەیشتم، زانیم، ئەو ژیرەی چەن ساڵێ بوو، بەئاواتەوە بووم، بیبینم ئەوە دەرنەچوو کە من چاوەڕێمدەکرد، چونکە هێندێ جار گوێ پێش چاو دەکەوێ، بەتەڵەو فاقەی ناووناوبانگی روناکبیر، نوسەر، هونەر، هونەرمەند، رامیارەکانەوە دەبێو بەخۆڕایی خۆشیدەوێن!)٩٦،٩٧.

– ڕاستە سەیرە! سەیرەکەشی لەوەدایە، لەو چیرۆکە کۆمیدییەدا، خۆی تێکەوتووە! بابزانین چۆن؟:

١– چیرۆکێکی هەڵبەستراوەو من تا ئێستاش ئەوم ڕووبەڕوو نەبووە، هەرگیز قسەیەکی لەو جۆرەشم نەکردووە. گریمان کردبێتیشم، ئایا بەتەنیا قسەیەکی وا کە من گوایە وتبێتم (نەتەوە شتێکی هەندە پیرۆزە، تەنانەت خواش لەقورئاندا، چەن جارێ باسی کردوە)، بەوە هەموو نهێنییەکانی منی بۆ دەرکەوت و بەتەواوی لێم تێگەیشت؟! ئەمە ئەبێ چ قاوەگرەوەیەك بێ!؟

٢– دیارە ئەم کۆنە قوتابیە نازیزەکەی من، ئێستاش جیاوازی لەنێوان چاوو گوێو بیردا ناکا. بەبەڵگەی ئەوەی هەر دوای ئەو قسانەی ئەڵێ: (هێندێ جار گوێ پێش چاو دەکەوێ)! ئەم قسەیەی ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەو بەگوێ (هۆنراوەکانی منی خوێندبێتەوە) نەك بەچاو، هەروەها بەگوێ هۆنراوەکانی منی لەبەرکردبێ و سەرنجی ڕاکێشرابێ، نەك بەبیر، یا قسەکەی ئەوە ئەگەیەنێ کە بەچاو یا گوێ، کوشتەی بیروباوەڕو ڕێبازەکەی من بووبێ! نەك بەبیر.

٣– ئەگەر وایە ئەو ساڵی ١٩٧٢ بەهۆی تەنیا ئەو قسەیەوە: (بەتەواوی لەمن گەیشتبێ و زانیبێتی ئەو ژیرەی چەند ساڵی بوو، بەئاواتەوە بوو، ببینێ، ئەوە دەرنەچوو کە ئەو چاوەڕوانی ئەکرد) ئەی بۆچی هەتا کوردستانیشی بەجێهێشت ساڵی ١٩٨١ هەر لەسەر بیروباوەڕەکەی من مایەوە ـ ١٠٧ ئەوەندەش دڵسۆزم بوو، کە خۆی وتەنی، ساڵی ١٩٧٩ ئاگاداری عەبدوڵا ئاگرینی کردووە کە ئاگام لەخۆم بێ ـ٨٢. نەك هەر ئەوە، ئەو تا ساڵی ٢٠٠٢ یش لەنوسینەکەیدا هەر مەستی (هۆنراوەی نێو دێوانە بچکۆلە خنجیلانەکەی ـ کوردایەتی ـ منە) وشەی خنجیلانە، بۆ مەتحو سەرسام بوون بەکاردێ، نەك بۆ زەم.

٤– خۆی وایپیشان ئەدا، کە لەحەفتاکاندا، ئاستی ڕۆشنبیرییەکەی ئەوەندە بەرزبووە، کە ئامۆژگاریی منی کردووە لەبارەی ئەو کفرە گەورەیە کە گوایە وتوومە: (نەتەوە ئەوەندە پیرۆزە خواش لەقورئاندا باسی کردووە). هەروەها سەرنجی بۆ دوو پەرتووکی یوسف حاج ڕاکێشاوم.. کەچی هەر خۆی ئەڵێ: (کاتێ لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٠ دا، تێکەڵاوی ڕێکخستنەکانی کاژیك بووم، ژیرم هێندەی بیکە خۆشویست، ئیدی بێ ئەوەی بەباشیی بیناسم، هیچ شتێکی دیاریکراو، لەبارەی باوەڕ هەڵویست، ڕەوشتو ژیانی تایبەتی خۆیەوە بزانم، بەچاکو بەخراپ، لای ئەندامانی پارتی کۆمۆنیستی عێراق، داکۆکیم لێ دەکرد ٩٦)! ئەم دوو قسە ناکۆکە چەندی بەچەندە!؟ ئەو ئەگەر لەئاستێکی ڕۆشنبیریی ئەوەندە بەرزدا بووبێ، چۆن وا کوێرانە داکۆکیی لێکردووم!؟ کە ئەوەندەش نەزان و نامۆ بووبێ بەبیری نەتەوەیی و حەزی کردبێ لەنزیکەوە بمناسێ و دەربارەی بیری نەتەوەیی زانیاریی پترم لێ وەرگرێ، چۆن ئەوەندە زانا بوو کە بەو جۆرە هەڵە بۆ من ڕاست بکاتەوەو ئامۆژگاریم بکاو منیشو شاکیر فەتاحیش بێدەنگ بکا!؟ کە لەڕاستیدا ئەو قسانەی لەچیرۆکێکی خەیاڵی بەولاوە چیتر نیە، من بەهیچ جۆرێ باسی نەتەوەم بەو جۆرە نەکردووەو نایکەم، خۆ ئەبوو، ئەگەر وابوایە جارێك لەنووسینەکانمدان قسەیەکی لەو جۆرەم بکردایە، ڕاستە من جارجار لەدوکانەکەی خوالێخۆشبوو شاکیر فەتاح دائەنشتم. خەڵکی تریش ئەهاتن، ڕەنگە ئەویش هاتبێ، بەڵام ئەو ئەوەندە جێگە بایەخم

نەبووە کە ئێستا بێتەوە یادم دیبێتم، لەهەموو بارێکدا، ئەوە چیرۆکێکی هەڵبەستراوو درۆیەکی زلە، بەڵگەی نوسراویش بۆ ئەو درۆیە، ئەوەیە خۆی لەلاپەڕە ٨٢ی کتێبەکەیدا ئەڵێ: (ساڵی ١٩٧٩ ویستیان بیکوژن.. هەرچەندە ئەو کاتە نەمدەناسی.. بەڵام حەزم نەدەکرد نەتەوەییەکانی کورد، دەستیان بەخوێنی یەکدی سووربێ، لەبەر ئەوە ئاگاداری عەبدوڵلا ئاگرینم کرد، ئاگای لەخۆبێ) واتا تا ساڵی ١٩٧٩ش، ئەو منی نەناسیوە، ئەی چۆن ئەڵێ ساڵی ١٩٧٢ منی لەدوکانەکەی شاکیر فەتاح ناسیوەو ئەو هەموو قسانەش لەنێوانماندا بووەو (ئیدی!) بەتەواوی لێم تێگەیشتوە!؟

٥- لەڕووی زمانەوانییەوە، ئەڵێ: (بەکوردیی: کوشتەی بیروباوەڕو ڕێبازەکەی بووم) ئەبوایە بیوتایە (بەکورتی) نەك بە (کوردیی)، چونکە مەبەست لەقسەکە (بأختصار)ە، نەك بەزمانی کوردی، لەهەموو بارێکیشدا، یای دووەمی (بەکوردیی) یەکە زیادەیە.

* هەر لەو لاپەڕەیەدا، لاپەڕەی ٩٦، جارێك ئەڵێ: (بێ ئەوەی هیچ شتێکی دیاریکراو، لەبارەی باوەڕەکەیەوە بزانم - دێڕی ١٩ و ٢٠) جارێکی تر ئەڵێ: (کوشتەی بیروباوەڕو ڕێبازەکەی بووم - دێڕی١٢).

- لێی مەگرە. بەگەورەیی فێری نووسین بووە.

* لەلاپەڕە ١٠٨ دا ئەڵێ (زۆر بەڕاشکاوی دەڵێم: زۆر لەمێژە، باوەڕم بەخەباتی چەکداریی نەماوە - دێڕی ٢٠ و ٢١) کەچی هەر لەو لاپەڕەیەدا تانە لەتۆ ئەداو ئەڵێ: (هەرگیز بۆ گەلە بندەستەکەی، چەك بەدەست نەبووە - دێڕی ٧ و ٨)، هەر لەو لاپەڕەیەدا ئەڵێ: (بەکردەوەش، نەك هەر هیچی بۆ کورد نەکردووە، بگرە هێندێ جاریش، زیانی پێگەیاندووە! - دێڕی ٤ و ٥).

- ئەگەرچی من پێویستیم بەوەڵامی ئەو قسانە نیە، بەڵام بۆ ئەوەی خوێنەرەوەی بەڕێز بزانێ ئەم کابرایە لەگوێی گادا نوستووە ئەڵێم:

١- لەناوەڕاستی مارتی ١٩٧٤ەوە تا نسکۆی شۆڕشی ئەیلول، چەکی پێشمەرگایەتیم لەشاندا بوو، لەهەمان کاتدا، کاری پشکنەری دادم لەناو شۆڕشدا ئەنجام ئەدا، هەندێ جاریش ئەبوومە ئەندامی دادگای سەربازیی شۆڕش. لەماوەی ئەو ساڵەدا، بەپێ و بەسواری ولاخ، هەموو دادگاکانی شۆڕشم پشکنی، لەو پێناوەدا، چەند جارێك بەر مەترسیی کوشتن کەوتم. بەتایبەتی جارێکیان دوو فڕۆکەی میگی عێراقی لەنزیك سەری حەسەن بەگەوە کەوتنە دەزرپێزکردن لەمنو عوسمان برایمی (پ.م) کە لەگەڵمدا بوو، ئەو دوو فڕۆکەیە، چەند جارێك دەزرپێژیان لێکردین، بەڵام بەهۆی جۆگەیەکەوە بەرنەکەوتین کە خۆمان تیا پاراست. دوای ئەوە، بەردەوام بووین لەسەر پشکنینەکە، جارێکیش بومبایەکی ناپاڵم درای بەبەر ژوورەکەماندا لەچۆمان. ئەم قسانەم بۆ بەرپەرچی وشەی (هەرگیز)ەکەی ئەوە، ئەگینا پێویست نەبوو بەسەرهاتی وا بگێڕمەوە، کەسێك کە بوو بەپێشمەرگە، ئەبێ دەیان مەترسیی وا رووی تێبکا، بگرە ئەبێ بەتەمای ژیانی خۆی نەبێ ئینجا ئەگەر من، بەیەکێك لەو رووداوانە، گیانم لەدەس بدایە، ئێستا ناوم لەلیستی شەهیداندا ئەبوو، ئەویش لەجیاتی جوێننامەکەی، سروودی ئەی شەهیدانی بۆ ئەوتم!! ئەمەیە مردوو پەرستی زیندوو کوژ!!.

ئەولە، سەرباری ئەو چەکەی لەکاتی رەوەکەدا کرمەوە شانم، کاتی رەوەکە زۆرینەی خەڵك بۆ ئەوبەر سنورەکانی کوردستان ئەکشان، ئێمەی پاسۆك لەبیارەو قەلاچوالان‌و زۆر شوێنی تر، سەنگەری بەرگریمان لێداو یەکەم مەفرەزەیەك کە پەلاماری سەربازەکانی رژێمی دا، پاسۆك بوو کە لەنزیك عەربەت ئەفسەرێك‌و چەند سەربازێکی بەدیل گرت.

٢- خەبات بۆ نەتەوە، تەنیا خەباتی چەکداری نیە. خەباتی ژێرزەمینی‌و نهێنی، ئەولەی لەشارەکانی ژێر دەستی رژێمدا بوون، زۆر لەخەباتی چەکداری شاخ سەختو پڕ بەمەترسیتر بوو، من بەش بەحاڵی خۆم، لەتەمەنی چواردە ساڵیمەوە، واتا لەساڵی ١٩٤٨ ەوە، وابەستەی خەباتی سیاسی بووم، سەرەتا بۆ ماوەی دە ساڵ، واتا تا ساڵی ١٩٥٨ لەرێکخستنەکانی قوتابیان‌و گەنجان‌و کرێکارانی حیزبی شیوعی عێراقیدا بووم سەرباری شانەکانی حیزب خۆی، لەو پێناوەدا زۆرجار زیندانی کراوم، دوای هەمو خۆپیشاندانێك لەسلێمانی، من یەکێك بووم لەولەی بۆ ماوەی چەند رۆژێك، یا چەند هەفتەیەك، یا چەند مانگێك ئەگیرام، ئەو سەردەمە، بەزلراوەی میری، بەئێمەو مانانیان ئەوت (مەشبوه!)و ئەبوایە هەموو جارێ بگیرابنایە، ساڵی ١٩٥٤ هەموو قوتابیە مەشبوهەکان، گیراین‌و ناردیانین بۆ شوعەیبە، لەوێ نزیکەی هەشت مانگ، بەناوی سەربازییەوە، زیندانی بووین، ناوەراستی ١٩٥٧ دیسان نەفی کرام بۆ ئەبوغرێب، تا چواردەی تەموزی ١٩٥٨ لەوێ دەسبەسەر بووم، ئەو دە ساڵ خەباتە، بەلای خۆمەوە، بۆ کورد بوو، چونکە ئەو کاتە منو هەزارانی وەك من، وامان ئەزانی، نەتەوەی کورد لەرێگەی شیوعێتییەوە رزگاری ئەبێ، کاتێ زانیم وانیە، وازم لەشیوعێتی هێنا. ئەوەبوو لە ١٩٥٩/٤/١٤ دا لەگەڵ شەش هاوبیری ترمدا، کاژێکمان دامەزراندو تا هەڵپساردنی چالاکییەکانی کاژێك لەهاوینی ١٩٧٤دا، وەك ئەندامی سەرکردایەتی کاژێك خەباتی ژێرزەمینیم ئەنجام ئەدا. دوای ئەوە لەهێڵی نهێنی پاسۆکدا بووم، ئەولە، زۆر بەکورتی، وەك کردەوە، خەباتی سەختو ترسناکی من بوو بۆ کورد. ئەو رێکخستنانەش، لەپێناوی رۆژەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردو سەربەخۆیی کوردستاندا بوون. ئینجا ئەو رێکخستنانە، تا چ رادەیەك سەرکەوتوو و ئەنجامدار بوون، یا نەبوون؟ ئەوە پەیوەندیی بەکۆمەڵێك هۆکاری تایبەتی‌و گشتییەوە هەیە کە لێرەدا ئەو بوارە نیە بۆ شیکردنەوەیان. لەهەندێ نوسینی ترمدا، لەو بارەیەوە دواوم، گرنگ ئەوەیە ئێمە لەو پێناوەدا گیانفیداییمان کردووەو هیچ چرکەیەك بەتەمای ژیانی خۆمان نەبووین، خەڵکی لەسەر داواکردنی تۆتۆتزمییەك قەلاچۆ ئەکران. ئێمە دروشمی سەربەخۆییمان هەڵگرتبوو. دەسدانە کارێکی لەو جۆرە لەدەست هەموو کەس نایەت، بەتایبەتی ئەولەنەی لەدوای راپەرینەوە زمانیان پڕاوەو ئێستاش ناوێرن هەواریان بگوێزنەوە بۆ کوردستان، تەنیا جارجارێك، خۆیان ئەکەنەوە بەناو شارداو کە هەست بەمەترسییەك ئەکەن، فرتەی بۆ ئەکەنەوە بۆ دەرەوەی وڵات!.

لەرێگەی پێنوسەکەشمەوە، کە هەمیشە شیشێکی سوورەوەکراو بووە بۆ چاوی دوژمنانی کورد، هەزاران لاوی کوردم خستۆتە سەر رێبازی کوردایەتی، یەکێك لەو لاوانە، نوسەری ئەو جوێننامە زەردە بووە (بەقسەی خۆی) ئەگەرچی ئێستا لەکونی خۆی هەڵگەڕاوەتەوەو وازی وازی بەمامۆستای خۆی وازی، ئەوەش هەر ئەبێ، مرۆڤ کە کێلگەیەکی ئاودا، گوڵیشی لێ ئەڕوێو دڕکیش.

٣- هەرگیز لەژیانمدا، زیانم بەکورد نەگەیاندووە، بەڵکو هەر خزمەتگوزارو گیانفیدابووم بۆ کورد. لەگەڵ ئەوەشدا، بەلای خۆمەوە، وەك پیرەمێردی هەستیار ئەڵێ: من چیم کردووەو هێشتا لەکوێمە، تازە وا میللەت ئومێدی پێمە.

٤- من کە لەخاڵی (٢)ی سەرەوەدا، لەگرنگیی خەباتی ژێرزەمینیو نهێنی دوام، هەرگیز خەباتی چەکداریی شاخم رەت نەکردۆتەوە، بەڵکو هەمیشە هێزی چەکم بەپێویستییەکی زۆر زانیوە بۆ بەرگری لەنەتەوە. بەتایبەتی نەتەوەیەکی دیلو داگیرکراو بەش بەشکراوی وەك کورد. ئێمە کە سەرەتا لە ١٩٥٩/٤/١٤دا کاژیکمان دامەزراند، نەخشەو پیلانمان ئەوە بوو کە لەپاڵ خەباتی سیاسیدا، هەمیشە بنکەی چەکداریشمان هەبێ لەشاخو لەشارەکانیشدا هێزێکی چەکداری دەسوەشێن لەداگیرکەرانی کوردستانو نۆکەرەکانیان، پێویستە. واتا پێمان وابوو، هەردوو جۆرە خەباتەکە پێویستەو یەك تەواوکەری ئەوی ترە، لەراستیشدا هەر وامان کرد، ئەوە بوو هێزی خەباتی شۆڕشی ئەیلولمان کردە بنکەی چەکداری خۆمان.

لەراستیدا، نەك هەر بۆ نەتەوەیەکی وەك کورد، بەڵکو بۆ نەتەوە ئازادە خاوەن دەوڵەتەکانیش، بەزلهێزو بچووکهێزەوە، هێزی چەکدار پێویستە، هەر هیچ نەبێ لەم بارودۆخەی ئەمڕۆی جیهاندا، بۆ ئایندەش، نەوەکانی ئایندە خۆیان خاوەنی بڕیاری خۆیان ئەبن‌و کەس بۆی نیە لەئێستاوە خۆی بکاتە کوێخای ئەوان.

ئەو کە ئەڵێ: (زۆر بەراشکاویی دەڵێم: زۆر لەمێژە، باوەڕم بەخەباتی چەکداریی نەماوە)، بەم قسەیەی هونەرێکی نوێو بیرۆکەیەکی تازەی نەهێناوەتە ئاراوە بۆ نەتەوە ستەمدیدە داگیرکراوەکەمان. نەتەوەکەمان، ئێستاو دوای رزگاربوونیشی، ئەوەندەی پێویستی بەنانو ئاوە، ئەوەندەش پێویستیی بەهێزی چەکدارە.

* دوای ئەوە ئەڵێ: (بۆیە، حەز دەکەم، نەك هەردوو دەستم، بەڵکو هەر دە پەنجەکەشم، وەك پێنووسی لێبێو گوڵی وشەی رەسەنو ریالیزمانە بگرێ ١٠٨.

- ئافەرین. ئەشێ خۆیشی نیشانەی سەرسوڕمان (!)ی لە دوای ئەم قسەیەی خۆیەوە دانابێ، وەك بڵێ: ئەستی (لاشعوری) پێی وتبێ: ئەمە قسەیەکی سەیرو سەرسوڕهێنەرە بۆ ئەو، بەلای منەوە ئەو خەریکی کارێکی تایبەت بەپسپۆریی دوکتۆراکەی بێ، باشترە، نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب. ئەوە کاری ئەو نیە، ئێستا نەتەوەکەمان پێویستی بەرووەکی (پەتاتە)* زیاترە وەك لەو نوسینە سیاسییە هەڵەقومەلەقانەی ئەو!

* قسەکانی ناو لاپەڕە ١١٢ی، ئەوە ئەگەیەنێ کە تۆ کەسێکی لووت بەرزیت؟

- ئەشێ وابێ، کەسێك سەری بەرزبێ، ئەشێ لووتیشی بەرزبێ، بەڵام لەئاستی هەموو کەس نا، لووتی من وەك سۆنەر، ئاخی بەرامبەرەکەی ئەبینێو ئەگەر نزم بوو، ئەو بەرزئەبێتەوە. هەروەها ئەشێ ئەم لووتەی من وەك تای ترازووبێ، ئەگەر تاکەی بەرامبەری نزم بوو، ئەم بەرز ئەبێ.

---

* ئەڵێن لەپەتاتەدا، کاندێتێکی هێناوە.

* باس لەتێکەڵبوونی ئێوەو پارتی ئەکات، گوایە نەتەوەییەکانی کورد، هەندێ جار لەپارتی نزیک ئەبنەوە، یا تێکەڵاوی ئەبن، هەندێ جاریش لێی دوور ئەکەونەوە. ئەمەش بەهەڵبەزو دابەزی سیاسیو هەلپەرستیو بەرژەوەندیی تایبەتی ئەداتە قەڵەم ٢١٦-٢٢١.

– ئەوە کاری ئەو نیە، وتمان نان بۆ نانەواو گۆشت بۆ قەساب، ئێمە وا ساکارانەو نەزانانە ناڕوانینە سیاسەتو نەتەوایەتی، بەلای ئێمەوە، هیچ کام لەپارتییە کوردستانییەکان نەچوونەتە بەرەی دوژمنەوە، ئەنانەت یەکێتی نیشتمانیی شەستو شەشو پارتی دیموکراتی سیو یەکی ئابیش. ئەوانە بارودۆخێکی تایبەتی ناچاری کردن بۆ ئەو دوو هەڵوێستەیان، هەرچەندە ئەو دوو هەڵوێستە دور لەکەی زەقە پێیانەوە، بەلام پارسەنگی هەڵوێستەو ئاڕاستە نیشتمانیو نەتەوەییەکانی ئەو دوو پارتییە، زۆر سەنگینترە لەو دوو هەڵوێستەیان. لەبەر ئەوە ئێمەی نەتەوەیی کورد، هیچ کات هەوڵمان نەداوە، هیچ کام لەپارتییە کوردستانیەکان لاواز بکەین، یا زیانیان پێبگەیەنین، بەپێچەوانەوە هەمیشە هەوڵماندلوەو پێمان خۆشبووە کە بەهێزتر بن. هەوڵەکانمان شێوازی رەخنەو ئاڕاستەو هاوکاریو تێکەلاوبوونیان گرتۆتە خۆی. رەخنەمان لەکارە هەڵەکانیان گرتووە، بۆ ئەوەی دووبارەی نەکەنەوە. ئاڕاستەمان کردوون. بۆ ئەوەی نەکەونە هەڵەوە. هاوکاریمان کردوون بۆ ئەوەی بەهێزترین، تێکەلاویان بووین، بۆ ئەوەی بەکردەوەش بەهێزیان بکەینو بەلای نەتەولیەتیدا ئاڕاستەیان بکەین. لەهەموو ئەو هەولانەشماندا، خۆمان زەرەرمەندو ئەوان سوودمەندبوون. پێشەکیش ئەوەمان زانیوە، بەلام دەربەستی ئەو زەرەرمەندییەی خۆمان نەبووین، چونکە ئێمە هەمیشە بەرژەوەندیی فراوانی نەتەوەی کوردمان لاچاکتر بووە وەك لەبەرژەوەندیی تەسکی پارتایەتی خۆمان.

من پێشتر لە نوسینەکانمدا کە لەزۆر رۆژنامەو گۆڤارو کتێبەکانمدا بلاوم کردونەتەوە، بەلگەبەستی ئەو قسانەی سەرەوەم کردوە. بەتێکەڵبوونی پاسۆکو پارتیش، قوتابخانەی بیری نەتەوەیی کورد، دلنەخراوە، لەمبارەیەشەوە زۆرم نووسیوە.

* لەبارەی مەحوییەوە، هەمان قەوانە کۆنەکانی لێئەداتەوە، بەلام بەچەند ئاوازێکی ناسازی تازەوە..

– مەحوی کێوێکە، بەو ناڕووخێ، ئەوانەی من لەبارەی مەحوییەوە وتوومە، لەویژدانو لەباوەڕمەوەیە، هیچ بەرژەوەندییەکم لەو دیدوبۆچوونانەدا نیە، بنەماڵەکەی مەحویش ئەوەندە دەسڕۆیشتوو نین تا قسەکانی من بەرووپاڵی لێکبدرێتەوە بۆیان، مەحویش هی هەموو کوردە، نەك هەر بنەماڵەکەی، ئینجا مەحوی ئەگەر هەستیارێکی نەتەوەیی بێ، یا نەبێ، ئەوە کاری ئەو نیە. لەبەر ئەوە، ئەو بایی ئەوە نیە، لەو بارەیەوە، وەلامێکی زیاتری بدەمەوە.

* ئەڵێ: ژیر چۆن توانیویتی، بنوسێ، موسوڵمانێکی راستەقینە، وەك کوردێکی نەتەوەیی بیر دەکاتەوە ل١٥١.

دوای ئەوە لەسەر ئەم قسەیەی، بەشێکی زۆری نووسینەکەی ئەجوێتەوەو شیکردنەوەو بەراوردێکی دوورودرێژی لەسەر ئەکات.

– من کەی وام وتووە؟! ئەوەی من لەنێرەکانی (٥،٦،٧)ی لاپەڕە ٢٨ی گۆڤاری ئاینده ـــ ژمارە ١٨ دا وتوومە، بەمجۆرەیە: «ئەکرێ موسوڵمانێکی ڕاستەقینە وەك کوردێکی نەتەوەیی بیربکاتەوە) ئەو قسەکەی شێواندووە، وشەی (ئەکرێ)ی لابردووە، وشەی (بیربکاتەوە)شی گۆڕیوە بە (بیر ئەکاتەوە) ئەو دوو گۆڕینەش، گەلێ لەواتای ڕستەکە ئەگۆڕێ. ئەوەش ناڕاستیو نامتمانەیی ئەگەیەنێ. قسەگۆڕین لەدیدی کۆمەڵایەتییەوە شوورەییەو ئەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی بەچاوی سووك سەیری ئەو قسە گۆڕە بکەن. لەدیدی یاساییشەوە تاوانەو سزای هەیە. بنەمایەکی یاساییش هەیە ئەڵێ: ئەوەی لەسەر ناڕاستی دروست بکرێ، ئەویش هەر ناڕاستە (ما يبنى على الباطل فهو باطل ايضاً) لەبەر ئەوە من بایەخێك بەهیچ لێکدانەوەیەکی ئەو نادەم لەو ڕووەوە، بەڵکو ئەوانە شایانی خوێندنەوەش نیە، نەك وەلام.

* قسەکانی تری ناو کتێبەکەی ٢٢٢ لاپەڕەی پێگرتۆتەوە، ئەوانیش هەر شایانی خوێندنەوەو وەلامدانەوە نین، ئەگەرچی من سەری خۆمم پێوە ئێشان، بەگشتی زۆرێك لەدیدو بۆچوونە نەتەوەییەکانی ناو ئەدەبیاتی کاژیکو نووسینەکانی د. نەبەزو تۆزێ وەرگرتووەو بەشێوێنراوی پێتاننەفرۆشێتەوە.

ئینجا ئەڵێ: (بۆ ئەوەی ژێر دڵنیابێ، نەشپرزە بووم، کاتێ گوتارەکەم نووسیوە، نەخۆشم تووشی گەلێ دیدو بۆچوونی پێچەوانەو دژ بەیەك کردووە ٢٤٤) کەچی لەراستیدا لەمەشدا هەر تێشکاوە، بابزانین چۆن؟

– پەلاماری مامۆستا محەمەد حەمە باقی ئەدا لەسەر ئەوەی ناگەڕێتەوە کوردستانو ئەڵێ: بۆ بەیەکجاری نەگەڕاوەتەوە، لەنزیکەوە، ئاگای لەباری نالەباری گەلەکەی بێ، قوژبنی پڕکاتەوەو سەرەگوریسێ بگرێ؟ ئەدی، لەئێران چی دەکاو چۆن دەژی؟!! ٢٩١.

* دژەکە ئەوەیە: ئەی ئەو خۆی بۆ بەیەکجاری ناگەڕێتەوە کوردستان، لەکاتێکدا زانکۆکانی کوردستان پێویستییان بەوە کە قوژبنێکیان بۆ پڕکاتەوە، نەك بەکاك محەمەد، کاك محەمەدیش لەدەرەوەی کوردستان نیە، بەڵکو لەرۆژهەلاتی کوردستانەو ئاگای لەباری نالەباری گەلەکەیەتی. ئینجا ئەو لەپەراوێزی هەمان لاپەڕەدا، نەگەڕانەوەکەی بەوە پاساو ئەداتەوە کە گوایە هەڵوێستی بەرامبەر پارتیو یەکێتی هەیە!!

لەوەلامی ئەو پاساوەدا، ئەڵێین: ئەوەش درۆیەکی تریەتی، چونکە ئەو جارجار هاتۆتەوەو پارتیو یەکێتیش، نەك هەر هیچیان لێنەکردووە، بەڵکو ڕێگەیاندلوە لەتەلەفیزیۆنەکانیشیانەوە قسە بکات، ئینجا ئەگەر مەسەلە هەڵوێست بێ، هەڵوێستەکانی ئێمە بەرامبەر پارتیو یەکێتی هەمیشە لەکوشتن نزیکمان ئەخاتەوەو لەکوردستانیش هەڵنەهاتووین.

– هیچ بایەخێکی نەتەوەییو نیشتمانیو ڕامیاری بۆ مەحوی دانانی کە تۆز زۆر نووسەری کەی وەك م. مەلا کەریم، م. خاڵ، م. باقیو ك. غەمبار لەبارەیانەوە دوانو بەڵگەبەستتان کردووە. کەچی بەخۆی ئەڵێ (ناسیونالیست) لەکاتێکدا خۆی بەکوڕی سۆفیتو سوید ئەزانێو بیرۆکەی کوسموپولیتیانە ئەچێنێ، وەك ئەوانەی لەکتێبە زەردەکەیدا نووسیونی. هیچ شەرمیش ناکات.

لەلاپەڕە ٣١٢ی کتێبەکەیدا ئەڵێ: (ناسیونالیستی ڕاستەقینە ئەوانەن، لەگەڵ ئازارو ئاواتی نەتەوەکەیاندا دەژین، لەنێو شارو گوند، لەسەر لوتکەی چیا بەرزەکان، چەك لەسەر شانو گیان لەسەر دەستان، ڕۆژانبازی لەگەڵ مەرگدا دەکەن. دژی داگیرکەران، دریژە بەخەباتی خۆیان دەدەن، نەك ئەوانەی لەدڵی خۆیاندا کوردنو سروودی ئاگرە سوورە لەخۆم بەدوورە، فێری منداڵەکانیان دەکەن. لەهەموو کەسێکیش دەمیان گەرمترو پێنووسەکانیشیان نووکتیژترە). بەرامبەر بەم قسانە، پرسیارەکان ئەشێ ئەمانەبن: تۆ لەگەڵ ئازارو ئاواتی کام نەتەوەتدا ئەژیت، سۆفێت یا سوید؟ لەسەر چیای کام ناوچە چەك لەسەر شانیت، مۆسکۆ یا ستۆکهۆلم؟ ئاخۆ تۆ بۆ ئەوەی لەئاگرە سوورە دوورکەویتەوە، ئەو هەڵاتنەی هەڵاتووی، تا هەزاران کیلۆمەتر، دوور لەکوردستان، نەوەستاویتەوە، ئێستاش نەك هەر لەداگیرکەرانی کوردستان، لەدوو پارتیی نیشتمانی وەك (پ.د.ك) و (ی.ن.ك)یش ئەترسیت. دەی تۆ کە ئاوایت، ئیتر ئەم دەمە گەرمەو ئەو پێنووسە کولەو ئەو جوێنفرۆشییەت لەچی!؟ هەر وازی وازی، بەڕیشی مامۆستای خۆت وازی!؟ تۆ بۆچی زووتر گەوهەرەکەی خۆتت دەرنەخست، وەك لەلاپەڕە ٣١٥ی کتێبەکەتدا نووسیوتە: (هەمیشە لەیەزدان دەپاڕێمەوە، ئەو کەمە سەربەستیو سەربەخۆییەی ئەوڕۆ، لەبەشێکی باشووری کوردستاندا هەیە، سەراپای کوردستانی مەزن بگرێتەوە) ئافەرین ئەمە بابەتی تۆیە. تۆ بۆ خۆت لەکوردستانی سویدەوە لەئاگرە سوورە بەدوور بەو وەك ئەو مەلایانەی پرسە هەڵئەسێنن، هەر دوعا بکە، ئاگرەکە بەجێبێڵە بۆ ئەو خەڵکی کوردستانەی بەرەو ڕووی هەموو مەترسییەکان ئەبنەوەو هەڵنایەن!

* ئەڵێ: ئەژیرو ئەقوتابخانە نەتەوەییەکەی کاژیك ڕۆژێ لەڕۆژان توانیویانە من پەروەردە بکەن ل٧٤.

– دژەکانی ئەو وتەیەی: قسەکانی لاپەڕە ٨ی هەمووی، بەکورتی، ئەوە ئەگەیەنێ کە تۆ ڕێی پڕ لەشەوەزەنگی کوردایەتیت بۆ ڕوونکردۆتەوە.. بەبیری وردی بەپیتو پیتۆڵانەی هۆنراوەکانی تۆ، کێڵگەی خاکی کوردستانت بۆ خاوێنکردۆتەوە.. تۆوی بیری کوردایەتی ڕاستەقینەت لەزەویی بەیاری خەباتی نەتەوەیی‌و ڕامیاریی کوردا بۆ وەشاندووە.. کەرەسەی بیدو بۆچوونەکانی سەردەمێکی مێژوویی بیرکردنەوەو کارکردنی ئەو بوویت.. هتد، ئینجا دوای ئەو قسانەی هەر بەدوای هەمان لاپەڕەدا، لەو قسانەی خۆی هەڵئەگەڕێتەوەو ئەڵێ: (ئەو پیاوە نەکامیلو نەژیریشە.. لەدڵی خۆمدا گوتم گەر کامیلو ژیریش بێ، یا نەبێ، من هەر وەڵامی ئەدەمەوە ل ١٥) .. (خۆ ئێستاش سەرەتای ساڵەکانی حەفتای سەدەی پێشوو نیە، مێشکم بەبیدو بۆچوونە نەتەوەییەکانی کاژیك جەڕێندرابێ ٧٦) .. (١٩٦٢ – ١٩٦٤ ئەندامی ڕێکخراوی یەکێتی لاوانی نەتەوەیی کورد بووم ٧٤) .. (لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٠ وە تا ١٩٨١/٧/١٢ سەرەتا لەکاژیكو پاشتریش لەپاسۆکدا وەك ئەندامێکی هەرە چالاکی ئەدوو ڕێکخراوە نەتەوەییە ١٠٧) کاریکردووەو..هتد.

وردبوونەوە لەو ڕستانەی سەرەوە، ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەم بیریارەی دوای ڕاپەڕین لە ١٩٦٢ وە تا ١٩٨١ پەروەردەی بیروباوەڕەکانی ژیرو قوتابخانە نەتەوەییەکەی کاژیك بووە، واتا ١٨ ساڵ، ئینجا لەساڵی ٢٠٠٢ دا، لەکامیل ژیرو کاژیك گەیشتووەو ئەو جوێننامەیەی نووسیوە کە بەهەمووی ئەکاتە

٣٩ ساڵ!! واتا دوای ٣٩ ساڵ لەژێرو کاژێك گەیشتووەو قەریحەی ئەو جوێننامەیەی کراوەتەوە!.
ئەوەیە زیرەکی! ئافەرین!!

* ئەشێ ئەویش بەمن بڵێ: ئەی تۆ بۆچی دوای دە ساڵ وازت لەشیوعێتی هێنا یا تێی گەیشتیت؟ لەوەڵامی ئەگەرێکی وادا ئەڵێم: من، وەك چەندجار لەنووسینەکانی ترمدا وتوومە، هەرگیز وەك بیروباوەڕ شیوعی نەبووم، وەك ڕێکخستنیش لەتەمەنی ١٤ ساڵیمدا تێکەڵاو ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی بووم، ئەو تەمەنەش چەقۆی لەسەر نیە، دە ساڵەکەش بەمجۆرە بوو:

١٩٤٨ تا ١٩٥٣ حیزبی شیوعی خۆی دوچاری ئیعترافەکانی سەرکردەکانی خۆی بوبوو، لەکەرتبوون و سڕبوون و نەبزووتندا بوو. من هەر بەناو لەسەر میلاکی ئەوان بووم. ١٩٥٤ تا ١٩٥٨ زۆربەی ئەو ماوەیەم بەزینداني و دوورخستنەوە لەسلێمانی و شوعەیبەو ئەبوغرێب بەسەربرد. جەوامێریش نەبوو بەو گرتن و زینداني و دوورخستنەوانە واز لەو حیزبە بهێنم. لەرۆژێکدا وازم لێهێنا کە ئەو حیزبە هەندەی نەمابوو بێتە سەر حوکم!

– ئەڵێ: مەحوی هەرگیز نەتەوەیی نەبووە، وەك کوردێکی نەتەوەیی بیری نەکردۆتەوە، چونکە هەرگیز ناکرێ و نابێ و ناگونجێ، مەحویی، لەیەك کاتدا، موسوڵمانێکی ڕاستەقینەو نەتەوەییەکی کوردبوو بێ ٣١.

* دژەکانی ئەو وتەیەی ئەڵێ: سەعیدی نەورەسی، هەم خواپەرستێکی ڕاستەقینەو هەم کوردێکی نیشتمانپەروەر بوو ١٢٨.. ئەڵێ: شێخ عوبێدولای نەهری، شێخ عەبدولسەلامی بارزانی، شێخ سەعیدی پیران و شێخ ئەحمەدی بارزانیی، ئەم کەڵە پیاوە کوردە خواپەرستە ئاینپەروەرانە، هەم کوردێکی نیشتمانپەروەرو هەم ڕێبەری ڕێبازی نەقشبەندیش بوون ٢٥٥.. دوای ئەوە ئەڵێ شێخەکانی هەورامان خۆیان لەکاری نەتەوەیی و ڕامیاری بەدوور گرتووە ٢٥٥. کە تێگەیشتنی ناوەڕۆکی قسەکە ئەوەیە، کارەکانی چوار شێخەکەی سەرەوە، نەتەوەییانە بووە. واتا لەیەك کاتدا، موسوڵمانێکی ڕاستەقینەو نەتەوەییەکی کوردیش بوون.

– ئەڵێ: خۆم بەناسیونالیست دەزانم ٧٢.. من وەك ناسیونالیستێکی کورد ١٥٨.

* دژەکانی ئەو وتانەی ئەڵێ: خۆم بەکوڕی ئەو سێ وڵاتە دەزانم ١٤٢ مەبەستی لەیەکێتی سۆڤێت و سویدو کوردستانە.. دیسان ئەڵێ: بیری ناسیونالیزم لەبیری ئینتەرناسیونالیزم نزیکبێتەوە، بەو بیرە موونوربە کرێ و گەشەی پێ بدرێ ١٤٢ کە لەڕاستیدا ئەمانە قسەی کوسموپولیتیەکانن، نەك هی نەتەوەیی یا ناسیونالیستێك. ئەم قسانە چ جیاوازییەکیان لەگەڵ سەردەمی مارکسیتییەکەی پارتیدا هەیە کە جاران ئەیانوت (سوود لەمارکسی لینینی وەرئەگرین)؟ دوای ئەوە، ئەم مرۆڤە پڕ لەناکۆکییە، جیاوازی لەنێوان زاراوەی ناسیونالیزم و کوردایەتیدا ناکات. ناسیونالیزم لەو ڕۆژئاوایەی ئەوی تیا ئەژی، بۆتە مۆرکێك بۆ نازیتی، بەلای ئێمەوە بیری نەتەوەیی کوردی (کوردایەتی) نەناسیونالیزمی ڕۆژئاواییە، نە بیری قەومیەتی ڕۆژهەڵاتیە.

ئینجا لەکاتێکدا بەخۆی ئەڵێ ناسیونالیستێکی کوردو منەتباری ڕۆژانی کاژێك و پاسۆکێتی و ئەڵێ زۆر کەڵکم لەو ئەزموونە وەرگرتووە ٢١١، هەرچی ترفێکی لەناوەڕۆکی جوێننامە زەردەکەیدا

هاویشتووه، لەبەرگی دواوەیدا ئەیداتەوە بەڕووی خۆیدا. لەنیوەی ئەو بەرگە بچووکەدا، شەش جار بەنانەتەوەییەکاندا هەڵئەداو بەپاڵەوانو جەوامێر ناویان ئەبات. شەش جاریش پێچەوانەی ئەوانە ئەدات بەڕووی نەتەوەییەکانداو سووکایەتیان پێئەکا. وەك خۆی ٣٩ ساڵ شاوی لەکانیی نەتەوەییەکان نەخواردبێتەوە (بەقسەی خۆی) ئاشکرایشە مرۆڤی مەردو بەئەمەك، بەرد فڕێنادات کانیەکەوە کە ئاوی لێخواردبێتەوە.

– ئەڵێ: تا بەچاوی خۆم بەکێتی سۆڤێتم نەدی، منیش وەك زۆرو هێندێکی دیکە بڕوام دەکردەوە.. نەتەوە جیاجیاکان مافی جیابوونەوەیان سەلمێندرابوو ٨٤.

* دژەکانی ئەو وتانە، ئەڵێ: (تەنیا ئەوەی نەیانبوو، ئازادیی ڕادەربڕینو دیموکراسی بوو)، ئافەرین بلیمەتی دوای ڕاپەڕین، نەتەوەیەك ئازادیی ڕادەربڕینی نەبێ، ئەتوانێ دلوای جیابوونەوە بکات!؟ ئەوە نیە ئێستاش ڕوسیای باوکی سۆڤێت، مافی جیابوونەوە بەچیچان ئەدات؟!

– بەر لەوەی کۆتایی بەوتووێژەکەمان بهێنین، با شتێك لەبارەی ئەم خاڵانەشەوە بڵێین: ئەڵێ: هەمیشە هەوڵمداوە لەلقە دیالێکتی سولەیمانی دوورکەومەوەو پێڕەوی لقە دیالێکتی موکریی بکەم.

* کورد ئەڵێ: سلێمانی، نەك سولەیمانیی، واتا لەنووسینی ئەم وشەیەدا، سێ هەڵەی کردوە، یەکەم، ولوەکە زیادەیە، دووەم: لەنێوان لامو باکەدا، بزوێن نیە. سێیەم: یای کۆتایی، یەك یایە، هەروەها یای کۆتایی موکریش، هەر یەك یایە. ئێستاش ئەوەی، تارادەیەك، بۆتە دیالێکتی کرمانجیو زۆربەی میدیا کرمانجییەکان بەکاری دێنن، ئەوە لەدیالێکتی سلێمانی دەرچووەو بۆتە زمانی ئەدەبی هەموو ئەو لقە دیالێکتانە.

جگە لەوە، ئەوەی ئەو خۆی پێوە هەڵئەکێشێ، ئەگەر وشەکانی (یەکدی، ئیدی، دیکە) لەنووسینەکانیدا دەربهێنی، هەر ئەوە ئەمێنێتەوە، کە ئەو، پێی ئەڵێ دیالێکتی سلێمانی.

– ئەڵێ: تا لە ئەورووپابم، کوردایەتی ناکەم ٢٣٢.

* وەی خەم!

– ئەڵێ: گەر نەتەوەیەك، لەنێوان زمانو ئازادیدا سەرپشك بکرێ، گومانی تێدا نیە، دەبێ هەمیشە ئازادی هەڵبژێرێ ٢٠٧.

* ئەوە بۆیە لەئەورووپای ئازادا، وازی لەکوردایەتی هێناوە، ئینجا ئەو قسەیەش، کەس بەپوولێك نایکڕێو هیچ نەتەوەیەکیش بەوە ڕازی نابێ، بۆ نمونە، ئەگەر نەتەوەی کورد لەباکوورو لەباشووردا وازی لەزمانەکەی خۆی بهێنایە، ئەویش هەمان ئازادیی تورکو عەرەبی ئەبوو، ئەوەش، بمانەوێو نەمانەوێ، واتای تواندنەوەی کوردی ئەگەیاند لەناو تورکو عەرەبدا، دیارە ئەوە ئەنجامێکە کە ئەو پێی ڕازییە. ئەوە نیە خۆی کردووە بەکوڕی سویدو وازی لەکوردایەتی هێناوە!؟

– خۆی وا پیشان ئەدا کە لەکۆتایی ١٩٧٠ تا ١٩٧٥-٧-١٢ سەرەتا لەکازێکو پاشتریش لەپاسۆکدا، وەك ئەندامێکی هەرە چالاکی ئەو دوو ڕێکخراوە نەتەوەییە بووە ١٠٧، پاشان ئەڵێ: نەتەوەییەکان.. کازێکو پاسۆك.. حەشری سەگ بەیەکدی دەکەن ١٢٩.

* واتا خۆی بەخۆی ئەڵێ سەگ.

– ئەوەی من بیستوومە، ئەو قورساییەکی نەبووە لەناو ئەو دوو ڕێکخراوە بووە.

* هیچ توفێکی تری پێماوە بیداتەوە بەڕووی خۆیدا؟

– لەنێوان لیکی هەندێ لەجوێنەکانیدا، کاژێکو پاسۆک بەترسنۆک ناو ئەبا.

* لەناو هەموو کۆڕو کۆمەڵێکدا، ئازاو ترسنۆکیش هەڵئەکەوێ، بەگشتی گەڕەنی ئەو کوردانەی لەشارو شاخەکانی کوردستاندا، لەژێر باری خەم و مەترسیو تۆقاندنەکانی ڕژێمی بەعسدا، مانەوەو نەنەوین، لەکێوی بێستوون مەحکەمتر بوو، ئاخۆ ئەو ئەندامی کاژێکو پاسۆکانەی لەڕەشترین ڕۆژانی کوردا، بەتایبەتی لەهەشتاکانی چەرخی پێشوودا، هەڵاتنو لەکاتی ڕاپەڕینیشدا نەگەڕانەوەو ئێستاش هەر ناوێرن بەتەواوی بێنەوە، ئەوانە لەئازاکانن یا لەترسنۆکەکان؟؟

– ئەڵێ: هەمیشە حەز دەکەیو دەتەوێ لەگەڵ کەسو لایەنی بەهێزو دەسەڵاتدارو سەرکەوتوودابی ٢٠٨.

* ئەشێ لەخۆیەوە بڕوانێ، لەهەشتاکاندا، کە زۆرو ستەم ئەوژمی سەند، ئەو پشتی کردە خاتو کوردستانی دایکی لیقەوماویو خۆی هاویشتە باوەشی باوکە سۆفێتییەوە، کە سۆفێت ڕماو تلێی ئەوی تیا نەما، بەڕۆکی باوە پیارە سویدی گرتو وتی من کوڕی تۆمو خۆی سەپاند بەسەریا.. منیش لەسەردەمی پاشایەتیدا، وەك ئەندامێکی حیزبی شیوعی، دژی ئەو دەسەڵاتی پاشایەتییە بووم، ساڵی ١٩٥٨ حیزبی شیوعی بەڕادەیەك بەهێزبوو کە هەندەی نەمابوو دەسەڵات بگرێتە دەست، لەو کاتەدا وازم لەو حیزبە هێنا، دوای ئەوە بەنهێنیو بەئاشکرا دژی هەموو ڕژێمو دەسەڵاتەکانی بەغداد کارم ئەکرد تا ڕاپەڕین. دوای ڕاپەڕین، نەچوومە پاڵ هیچ کام لەدوو حیزبە گەورە بەهێزو خاوەن دەسەڵاتە کوردییەکە. دوای ئەوەی پاسۆکو پارتیش تێکەڵاوی یەك بوون، من ولزم لەپارتی دەسەڵاتدارو سەرکەوتوو لەهەڵبژاردندا هێنا. ئەوەتی خێری دنیاش بەسەر پارتیو یەکێتیدا ڕژاوەو پلەو سامانو زەوییو شتی تریش بەسەر باشو جاشدا تەخشانو پەخشان ئەکەن، هیچ لەوانە بەمن نەبڕاوەو داواشم نەکردوون. لەساڵی ١٩٨٢شەوە تا ئێستا، پارێزەرێتییەکەی خۆمم لەوەزیریو گزیری لاباشترە.

– ئەڵێ: عەلی سام ئاغلو فایەق عارفو غەفور ئەمینو عومەر شەمەیی، لای ئەو وتویانە هۆی سەرەکیی هەڵوەشاندنەوەی پاسۆك، تۆو ئاگرین بوون، بۆ بەرژەوەندیی خۆتان ٢١٧.. من لەو چوار بەڕێزەم پرسی، وتیان درۆ ئەکا.

* ئەگەر ڕاستیش بێ، مرۆڤ ئازادە لەبیرکردنەوەو لێکدانەوەدا، گرنگ: پێکانی ڕاستییە، چارەنووسی پاسۆك، لەکۆنفراسێکدا بەزۆریەی ٩٦٪ دەنگ دیاریکرا، منیش هیچ بەرژەوەندییەکم لەوەدا نەبوو، لەو بارەیەشەوە، زۆرم نوسیوە.

– لەپەراوێزی لاپەڕە ٢٢١دا، ئەڵێ تۆ دلوای ئەدرەست لێکردوە.

* ئەشێ خەوی دیبێ!

– زۆر خۆی بەوەوە ماندوو کردووە کە گوایە تۆ ویستووتە کوردایەتیو ئاینی ئیسلام تێکەڵاوکەیت، بەبەڵگەی ئەوەی لەدیوانی کوردایەتییەکەتدا وتوتە: کوردایەتی خواپەرستییە.

* دیاره ئەو نازانێ خواپەرستی شتێکەو ئیسلام شتێکی ترە، راستە هەموو موسوڵمانێك خواپەرستە، بەڵام هەموو خواپەرستێك موسوڵمان نیە، ئەوە مەبەستێکە، ئەو تەقەی سەری دێ لەبارەیەوە!

– ئەڵێ زانیاریی نهێنیم لایە، دەتوانم بڵاوی بکەمەوە ١٢.

* چاوەڕوانی چی ئەکا؟ ئەمە ئەرزو ئەوە گەز.

– ئەڵێ گوایە پاسۆك جێی ئارەزووەکانی دەروونی چڵێسو بەرژەوەندییە گڵاوەکانی تۆی تێدا نەبۆتەوە٢٠٧.

* ساڵەکانی ١٩٤٨ تا ٢٠٠٤ ئەکاتە (٢٠٤٤٠) ڕۆژ، باوەڕ ناکەم ئەو ئەوەندە تووك بەسەریەوەبێ، دەی من لەتووکی سەری ئەو زیاتر، لەو ماوەیەدا، نەك هەر بەبێ بەرژەوەندی، بەڵکو بەزیانێکی زۆریشەوە، لەگیرفانو لەوچانی خۆمو بەنزیکبوونەوە لەمەرگیشەوە، کوردایەتیم کردوە، نووسینو هەڵبەستەکانمو کارکردنم لەحیزبەکانی شیوعیو کاژێكو پاسۆکو ڕۆژانی نەفیکردنو زیندانیو خەباتی شاخو تێکڕا هەڵوێستەکانم بەرامبەر دەسەڵاتە جۆربەجۆرەکانو..هتد شایەتی ئەو ڕاستییەن، من هەمیشە بەرەنجی شانی خۆم، نانی مەردایەتیم خواردووە، ڕۆژانی لاویم وەك رەنجدەرێك بەسەربرد. هەموو قۆناغەکانی خوێندنم بەئێوارانو بەدەم رەنجدەرییەوە تەواوکرد، هەمیشە بەکوێرەوەری پەیدام ئەکردو بۆ کوردایەتی بەختم ئەکرد، ئێمەی دلەمەزرێنەرانی کاژێك، سەرباری موجازەفە بەژیانمان، حەفدە ساڵ ئەو ڕێکخراوەمان لەسەر گیرفانی خۆمان ژیاند، تەنانەت لەڕۆژانی وەزیفەشمدا کە هەندێ جار بەڕێوەبەرایەتی هەندێ فەرمانگە، بەخەیان ئەکرتم، نەك خۆم خوازیاریان بوویم، ئەو ڕۆژانە ترسناکترین ڕۆژانی ژیانم بوو، چونکە ئەگەر ڕژێم بەوەی بزانیایە لەو ڕۆژانەدا پەیوەندیم بەکاژێك یا پاسۆکەوە هەیە، پێستیان ئەبردم بۆ دەباخانە.. ئێستا ئەشێ بپرسین: کام ئارەزووی دەروونی چڵێسو بەرژەوەندیی گڵاو؟؟

تۆزێك شەرم، تۆزێکیش چاوەڕوانی، مەگەر دەستی ڕەوا بۆ ساردکردنەوەی دەمی پڕ لەجوێن نیە!؟

– ئێستاش ئەشێ بپرسین: ئەم جوێننامەیە لەپای چی؟

ئەو کە ئەڵێ: (هەرگیز ڕۆژێ لەڕۆژان، بیرم لەوە نەکردۆتەوە، لەگەڵ هونەرێکی وەك کامیل ژیردا لەسەر یەکدی بنووسین، یا ڕاستتر وایە بڵێم: رەخنە لەیەکدی بگرینو وەڵامی یەکدی بدەینەرە ٨) تێگەیشتنی ئەم قسەیەی ، ئەوە ئەگەیەنێ، کە ئەو تا ساڵی ٢٠٠١ کە من رەخنەیەکم لەوتارێکی ئەو گرتووە لەگۆڤاری ئایندەی ژمارە ١٨ ساڵی ٢٠٠١دا، هیچ باری سەرنجێکی خراپی بەرامبەر من نەبووە کە ببێتە پاڵنەرێك بۆ ئەوەی لەسەرم بنووسێ، یا رەخنەم لێ بگرێ. بەڵکو خەمخۆریشم بووەو نەیهێشتووە بکوژرێم بەقسەی خۆی، کەواتە جوێننامەکەی لەپای ئەو رەخنەیەی من بووە. ولتا ئەگەر من ئەو رەخنەیەم لەو وتارەی ئەو نەگرتایە، ئەو نەك هەر ئەو جوێننامەیەی نەئەنووسی، بەڵکو لەوانە بوو، هەر بەمامۆستاکەی جارانی خۆی بزانیمایەو پیاهەڵدامایە! لەڕاستیشدا رەخنەکەی من، رەخنەیەکی بابەتیانە بوو، ئەویش ئەیتوانی بەوەڵامێك، یا رەخنەیەکی بابەتیانەو زانستیانە بەرپەرچی

رەخنەکەی من بداتەوەو ئا بەو جۆرە خۆی نەکردایە بەساتیریست (Satirist)ێکی لێنەهاتوو کە هەموو تۆفەکانی رووی خۆی بگرێتەوەو ساتیرەکەی ببێتە ساتێر.

* ئەو هەر بەتۆوە نەوەستاوە. وەك تووشی هیستریا بووبێ، هەرچی هاتبێتە رێگەی، یا هەرچی بەخەیاڵی کاتی هیستریاکەیدا هاتبێ، پەلاماری داون، لەوانە: کازیك، پاسۆك، پارتی، یەکێتی، د. جەمال نەبەز، د. عەبدوڵا ئاگرین، ئەحمەد هەردی، محەمەدی عەزیزو شێخ محەمەدی هەرسین.

سەیر ئەوەیە، دوای ئەوەی لەجوێننامەکەی بۆتەوە، فیستیڤاڵی مەحوی ۲۸–۳۰ ئابی ۲۰۰۱ سازدراو هەموو بابەتەکانی، دوای یەك رۆژ، لەناميلكەيەکدا چاپکرا، نووسەری جوێننامەکە سەیری کردووە، ژمارەیەك لەبابەتەکانی فیستیڤاڵەکەو نامیلکەکە، راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، هەمان باری سەرنجی وەك تۆیان هەیە بەرامبەر مەحوی کە هەستیارێکی نەتەوەیی‌و نیشتمانی‌و خەباتکەرێکی رامیاری بووە. بەوە، مایەکەی بۆتە مایەی پیازفرۆش، بەتایبەتی کاتێ کە کاك محەمەدی حەمە باقی، لەژێی هەستەوەری ئەوی داوە، بەوەی وتوێتی: مەحوی، وەك ئەوانی تر هەڵنەهاتوە بۆ دەرەوەی وڵات!! ئیتر ئەو هیچی بۆ نەماوەتەوە، ئەوە نەبێ پەلاماری ئەوانیش بدا، بەکاك محەمەدی مەلا کەریمیشەوە.

– لەکۆتاییدا ئەڵێم: کێڵگەی رەسەنی کوردایەتی، کوردستانە*، ئەوانەش خەڵکی کونە ماسیی کوردستانن‌و پاسی جرتاوای سوفێت‌و سوید ئەکەن‌و خۆیان بەکوڕی ئەو وڵاتانە ئەزانن، ئەوەش ئاشکرا ئەکەن کە ئیتر کوردایەتی ناکەن، بۆیان نیە بەدەمی پڕ لەجوێنیان، بیرو بزاڤی پیرۆزی کوردایەتی لەکەدار بکەن.

*پێوانەکەش بۆ ئەم مەبەستە بۆ پێش نەمانی رژێمی بەعسە. ئەگینا دوای ئەوە، گەڕانەوە بۆ کوردستانی بێ‌ترس‌و پڕ دراو، ناکرێ شانازی پێوەبکرێ.

**لەوەڵامی سێ پرسیاری مامۆستا سیروان کاوسیدا ـ سەرنووسەری گۆڤاری ڕێزداری کۆنگرە**

## عێراق و هەڵبژاردن و ریفراندۆم

* دامەزراندنەوەی دەوڵەتی نوێی عێراق، چ کاردانەوەیەکی بۆ دۆزی کورد لەباشوور و هەموو کوردستان هەیە؟

– کاردانەوەی ئەرێنی و نەرێنیش هەیە، ئەرێنییەکان: ١– بۆ یەکەمجار لەدەستورە کاتییەکەیدا دان بەفیدراڵیدا ئەنرێ، ئەگەرچی فیدراڵییەکی تەواویش نیە، چونکە سنووری تەواوی باشووری کوردستان دیاری ناکا. ئەنجومەنی هەرێمەکانی تێدا نیە، دان بەمافی جیابوونەوەشدا نانێ. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم فیدراڵیە، زەنگێکی ترسناکە بۆ ئێران و تورکیا و سوریا. ٢– وەرەو گوڕێکی نوێ بەجەماوەری کورد لەباشوور و هەموو کوردستان ئەدا. ٣– قەوارە سیاسیەکەی ئێستا باشووری زیاتر چەسپاند. ٤– ڕێز و پلەو گرنگیەکی زیاتری دا بەنەتەوەی کورد و دۆزە ڕەواکەی.

نەرێنییەکان: ١– جارێکی تر باشووری لکاندەوە بەعێراقەوە کە ئەوە کێشەی کێشەکانی باشوورە. ٢– هەڵ ئەگەری سەربەخۆبوونی قەوارە سیاسییەکەی باشووری لەئێستادا لەدەستدا. ٣– ئەگەری لەدەسدانی دەسکەوتەکانی ڕاپەڕینی دروستکرد لەکاتی کشانەوەی هاوپەیمانان و ڕوودانی کودەتایەکی نەتەوەییانەی عەرەبی لەبەغداد. ٤– ئەگەری ڕوودانی شەڕی کورد و نەتەوەکانی تر و دووبارە بوونەوەی مەرگەساتەکانی نوێ کردنەوە.

**• هەڵبژاردنی نوێ، چ دەسکەوتێکی ئەبێ و دەستەبەری داخوازیەکانی کورد ئەکا؟**

– ئەوە بەندە بەجۆری ئەنجامی هەڵبژاردنەکەوە. جارێ هەر لەئێستاوە پیلانێکی دژ بەکورد لەئارادایە، بەوەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان و هی عێراق و هی ئەنجومەنی پارێزگاکان، لەیەک ڕۆژدا ئەکرێ. ئەمەش بۆ ئەوەیە، دەنگدانەوەی هەڵبژاردنی کوردستان بکرێ بەژێر هی عێراقەوە لەئاستی نێودەوڵەتی و ناوخۆشدا. بەر لەو هەڵبژاردنە، ئەگەر عەرەبە هاوردەکان دوورنەخرێنەوە لەکوردستان و شارۆچکەو ناوچەکانی جارانی کەرکوک نەخرێتەوە سەر پارێزگای کەرکوک، کورد زیانێکی گەورە ئەکات، لەبەر ئەوە، ئەگەر ئەوانە نەکران، پێویستە کورد خۆی دابڕێ لەو هەڵبژاردنە لەعێراقدا، لەهەموو بارێکدا یەکدەنگی کورد، مەرجێکی سەرەکیە بۆ هەندێ دەسکەوت و داخوازیی کورد.

**• پرۆژەی ریفراندۆم بۆ ناچێتە پێش لەباشووری کوردستان وەك داوایەکی یاسایی نێودەوڵەتی؟**

– لەبەر ئەوەی ئەو پرۆژەیە، هەر لەسەرەتاوە بەسەقەتی لەدایکبوو، چونکە هەندێکیان ئەیانوت لەپێناوی سەربەخۆییدایە، هەندێکیشیان ئەیانوت بۆ چەسپاندنی فیدراڵیە، واتا بۆ جارێکی تر بەستنەوەی باشوورە بەعێراقەوە. شێوازی پێشکەشکردنی داخوازیو واژۆکان هەڵەبوو، ئەبوایە سەرەتا بدرانایە بەپەرلەمانی کوردستان، لەپەرلەمانەوە بۆ حکومەتی هەرێم، لەحکومەتی هەرێمەوە بۆ UN و هاوپەیمانان و پەرلەمان و حکومەتەکانی زلهێزەکان. ئەوانەش بەپێی مادەکانی (١١ بڕگەی ٢

لەپەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان، هەروەها مادەی ٣٥ بڕگەی ٢ لەهەمان پەیمان، چونکە بەپێی ئەودوو بڕگەیە، UN، ئەبێ دەوڵەتێك، داخوازی، یا کێشەیەك، بخاتە بەردەمی ئەگەرچی ئەو دەوڵەتە ئەندامیش نەبێ تیایدا، دەوڵەتیش دوو جۆرە: دێ ژوور (De Jure)، (De Facto) دێ فاکتۆ. باشووری کوردستان، دەوڵەتی دێ فاکتۆیە، هەموو زانیارانی یاساش لەسەر ئەوە کۆکن کە دەوڵەت بریتیە لە (گەل، هەرێم، حکومەت) ڕۆژی ٢٠٠٤/١٠/٢ ریفراندوم خۆپیشاندانێکی سازدا، لەمەشدا هەمان دوو داخوازی پێچەوانەی یەك، دووبارەبووەوە، هەندێك بانگەشەی سەربەخۆییان ئەکرد، هەندێکی تر فیدرالی!

ڕۆژی ٢٠٠٤/٤/٢٩ لەکۆڕێکدا کە زانکۆی سلێمانی ئامادەی کردبوو بۆ مزو د. فەرەیدون رەفیق حیلمی، بەدوورو درێژی لەبارەی (چارەسەرکردنی کێشەکانی کورد لەڕێگەی یاسای نێودەوڵەتیەوە) دوام*.

---

* لەجێگەیەکی کەی ئەم پەرتووکەدا، دەقی وتەکانی ئەو کۆڕە، بڵاوکراوەتەوە.

# معاریفی کوردستان
# هەوڵێکی نەتەوەییانەی هاوبیرانی کوردایەتی بوو

لەپەراوێزی وتاری (وەڵامێکی دۆستانە بۆ بەڕێز د. کوردۆ عەلی)دا، سەرنجی خوێنەرەوەی بەڕێزمان راکێشا بۆ خوێندنەوەی (بەدواداچوونێک و بەڵگەنامەیەک لەبارەی معاریفی کوردستانەوە). بەڵگەنامەکە نووسراوێکی زۆر نهێنیی و کەسینەی سەرکردایەتی فرقەی دووەمە بۆ بەڕێوەبەرایەتی استخباراتی عەسکەری کە لەخوارەوە دەقەکەی و دەقی یاداشتێکی مامۆستایانی کورد، هەروەک خۆی بەعەرەبی، بڵاوئەکەینەوە، بۆ راستی و بۆ مێژوو، وەک ئەوەی لەلاپەڕە ٢٥٦ تا ٢٦٩ ی یاداشتەکانی (طبقچلی) منشورات المکتبە العصریە ـ صیدا ـ بیروت ١٩٦٩ بڵاوکراوەتەوە.

شایانی وتنە، ئەو یاداشتە گرنگە، لەلایەن هەشت مامۆستای هاوبیری کوردایەتیەوە، واژۆ کراوە، کە سیانیان لەدامەزرێنەرەکانی کاژیکن، نووسەری یادداشتەکەش هاوبیری هێژامان مامۆستا جەمال نەبەز بوو، ئەم یاداشتە، وەک پرۆژەیەکی نەتەوەیی، بۆ ئەو ساڵی (١٩٥٨)ە، گرنگیەکی زۆرو کاردانەوەیەکی جۆراوجۆری، بەئەرێنی و ئەرێنی، هەبوو.

گرنگیی یاداشتەکەی مامۆستایان، لەم بوارانەدا کۆبووبوەوە: پانۆرامایەکی باری ناهەمواری نەتەوەیی بەگشتی و باری رۆشنبیریی کورد بوو بەتایبەتی، سەرەتای بیرۆکەیەک بوو بۆ دروستکردنی قەوارەیەکی سیاسیی کوردی، نەخشەیەکی سنووری باشووری کوردستان بوو کە لیواکانی سلێمانی و هەولێرو کەرکوک و خانەقین و قەزا کوردییەکانی موسڵی ئەگرتەوەو ناوەندی قەوارەکەش شاری کەرکوک بوو، تێکڕا بانگێکی هوشیاریی نەتەوەییانە بو، بۆ هەژاندنی جەماوەری مامۆستاو قوتابی و رۆشنبیر. سەرباری بابەتە سیاسییەکان (یاداشتەکە)، پرۆژەیەکی چاکسازیش بوو لەبواری فێرکاریدا. **ئەم یاداشتە وەڵامێکیشە بۆ ئەوانەی بەکەمبایەخی هەوڵەکانی هاوبیرانی کوردایەتی ئەنرخێنن.**

کاردانەوە نەرێنییەکانی یاداشتەکە، سەرەتا لەشیوعیەکانی ئەوسای ناو کوردستانەوە سەری هەڵدا.

لەئەنجامی ئەم یاداشتەوە بوو کە ئەو شیوعیانە کەوتنە گاڵتەکردن بەمعاریفی کوردستان و بەمعاریفی قلیاسان ناویان ئەبرد. سەرکردایەتی ئەوسای پارتیش بەلاڵووت و ساردوسڕییەوە ئەیڕوانیە یاداشتەکە. ئەوانەش هەمووی بەڵگەی نزمیی ئاستی هوشیاریی نەتەوەیی بوو لەناو کوردا کە ئێمە لەگەڵ لەنووسینەکانماندا هێمامان بۆ کردووەو داوامان کردووە هەوڵی بەرزکردنەوەی ئەو ئاستە، بکرێتە هەوڵە لەپێشەکانی رووناکبیران و کاربەدەستانی کوردستان. جگە لەوانە، کە یاداشتەکە رۆژی ١٩٥٨/٧/٢٦ لەرۆژنامەی (البلاد) لەبەغدا بڵاوکرایەوە، رۆژنامەکەی لەسەر داخرا.

بەپێچەوانەی ئەوانەوە، یاداشتەکە کاریگەرێتی و کاردانەوەیەکی ئەرێنی هەبوو لەناو جەماوەری کورد بەگشتی و جەماوەری مامۆستایان بەتایبەتی. ئەو کاریگەرێتی و کاردانەوەیە، بۆ ناو هەندێ ناوەندی عەرەبیش تێپەڕی کرد، لەوانە نوسەرو مێژوونووسی ناسراوی نەتەوەیی عەرەب (منذر

الموصلی) لەکتێبەکەیدا (عرب وأكراد ـ رؤية عربية.. للقضية الكردية ــ الأكراد في وطنهم القومي وفي الجوار العراقي ـ التركي ـ الإيراني.. وفي سوريا و لبنان ـ دار الغصون ـ بيروت ــ چاپی یەکەم ١٩٨٦ لەلاپەڕەکانی ٣٢١ تا ٣٢٦ ئەو یاداشتە بەرز ئەنرخێنێ و ئەڵێ: (ولقد ثبتنا اسماء موقعي المذكرة هنا تقديراً واجلالاً لهم، لأن مطاليبهم تنم عن نظرة تربوية متقدمة، كما تدل على نضج واستيعاب صحيح لدور رجل التربية والتعليم والمهام الملقاة على عاتقه، وكان الأجدر لو أن الحكومة بادرت آنذاك لأصلاح شؤون التربية والتعليم بعد ثورة ١٤ تموز وفق التصورات التي تضمنتها المذكرة) دوای ئەوە نووسەر لەبارەی سەرجەم داواکارییەکانی یادداشتەکەوە ئەڵێ: (وهذه المطالب كلها محقة كما نرى، ومشروعة من كل وجه) پاشتر نووسەر هێما بۆ ژمارەیەك دەسکەوتی زمانەوانیو رۆشنبیری ئەکات وەك ئەنجامی ئەم یادداشتە.

دەقی بەڵگەنامەکەو یادداشتەکە

الصراع في منطقة الفرقة ٢

مذكرات ووثائق

قيادة الفرقة الثانية

الاستخبارات                                        سري للغاية وشخصي

الرقم ح – ش ٣-٥-٩١٤

التأريخ ٩-٩-١٩٥٨

الى

مدير الاستخبارات العسكرية

الموضوع مذكرة المدرسين الأكراد الى وزارة المعارف

حول رفع مستوى الثقافة في كردستان خاصة

بطية نسخة من المذكرة اعلاه للاطلاع

ورد في الصفحة (١٥) تحت عنوان (ب ـ التطبيق) المادة (١) مايلي:

(تحديد منطقة المعارف الكردية بالوية السليمانية وأربيل وكركوك وخانقين وأقضية الموصل الكردية)،

نود أن نلفت النظر الى خطورة التحديد اعلاه حيث نبدي المطالعة التالية.

١- أن أقرار حدود معارف كردستان معناه ضمنا الاعتراف بالخطوة التي يهدف اليها المدرسون الأكراد وهو اعلان كيان كردستان السياسي.

٢- ان زج كركوك ضمن منطقة المعارف الكردية وهي ليست بكردية بالمعنى الذي فسرته المذكرة. اذ فيها أكثرية (عربية وتركية ومسيحية) فالتعبير يبطن في طياته روح الرغبة في الأستيلاء عل (النفط) وهي الثروة الوطنية للجمهورية العراقية التي حررت هذا المصدر الحيوي لحياة ومستقبل العراق. كما أن ادعاء المذكرة بكردية كركوك معناه صهر القوميات الأخرى في اللواء وهذا ما ينافي روح دستور الجمهورية العراقية.

٣- ليس من المصلحة تأسيس مديرية معارف كردستان وليس من الصحيح أن يكون مركزها في مدينة كركوك.

٤- يجب اسناد منصب مدير المعارف في كركوك دوما (وأبداً) الى شخص عربي شرط أن تتوفر فيه صفة الحياد ويعمل للمصلحة وخدمة التعليم دون تميز لقومية أو عنصرية.

٥- أما ما جاء في بقية المذكرة فنترك أمرها لوزارة المعارف لانها فرضت شروطا وليس اصلاحا.

أرجو اطلاع الجهات المعنية لخطورة المذكرة المبرقة باسم الاصلاح.

اننا لاننكر على لخواننا الأكراد حقهم في المطالب المنوه عنها على أن تتفق والمصلحة العامة التي هي رائد المخلصين لهذا الوطن.

توقيع

الزعيم الركن

قائد الفرقة الثانية

مذكرة المدرسين الأكراد الى وزارة المعارف

حول رفع مستوى الثقافة في كردستان خاصة والعراق عامة

سيادة وزير المعارف المحترم

تحية واجلالا

وبعد.. فقد جاء عهد الحرية والنور، جاء عهد الحق والعدل، ومضى دون رجوع عهد الذل والاستعباد. مضى ذلك العهد البغيض الذي كان فيه المسؤولون يأتمرون بأوامر اسيادهم المستعمرين ويمثلون مصالحهم في طول البلاد وعرضها. نعم، لقد جاء اليوم الذي يخضع فيه المسؤولون لارادة الشعب ويعملون بوحي من مصالحه، فقد أن الأوان أن نصارح المسؤولين بما يخالج نفوسنا المعذبة من أمان وأمال طيلة هذه السنين الطوال.

ياسيادة الوزير..

لاتخفى على سيادتكم التضحيات الجسام التي قدمها الشعب الكردي على مذبح الحق والحرية. ووقوفه بجانب الشعب العربي الشقيق في أحلك الساعات وأسوأ الظروف. كما لاتخفى عليكم ما قامت به زبانية الأستعمار في العهد البائد من اضطهاد شعبنا الكردي وضرب حركاته التحررية بأساليبهم الوحشية وزج أفواج من شبابه وشيوخه في السجون والمعتقلات وتشريد المئات منهم واقامة مجازر رهيبة في كردستاننا العزيزة ونصب المشانق للمناضلين الأحرار وتجويع آلاف العوائل الكردية. ثم تحريم شعبنا الأبي من كافة أوجه النشاط السياسي بل وحتى الأدبي بأسماء موهومة كمكافحة المبادىء الهدامة وحفظ الأمن والسلام وغير ذلك.

أجل.. لقد قام عملاء العهد البائد بكل ذلك ولم يكتفوا بها. بل شنوا حربا اجرامية ضد ثقافة الشعب الكردي المجاهد فوصدوا أبواب المدارس في وجه الجماهير المتعطشة للعلم والثقافة بحجج واهية واختلاقات كاذبة وحرموا الأكراد من التثقف والتعلم بلغة آبائهم واجدادهم. ذلك الحق البسيط الذي لم تحرم منه الشعوب الواقعة تحت نير الأستعمار المباشر، كما ومنعت دراسة تاريخ الأمة الكردية في المدارس. ذلك التأريخ الحافل بالبطولات والأمجاد. فقد كان الطالب الكردي يدرس تأريخ مختلف الشعوب والقوميات وحتى العربي الذي كان يقرأ الشيء الكثير من التأريخ نفسه يبقى جاهلاً بتأريخ أخيه الكردي الذي يشاركه في الجهاد وفي الوطن.

أما وقد انقضى العهد البائد وزال ذلك الكابوس الجاثم على صدر شعبنا الأبي. فالشعب الكردي لايسعه الا أن يقف مرة أخرى بجانب شقيقه في النضال الشعبي العربي المجاهد ليحقق انتصارات أكبر وأكبر مدافعاً عن جمهوريتنا الفتية ومحتفظا بالمكاسب القومية التي احرزها شعبنا العراقي عربا وأكرادا. وفي الوقت عينه يصارح المسؤولين بكافة الحقوق الطبيعية التي حرمها عليه العهد البائد وأكدها الدستور الجديد وفي مقدمتها الحقوق الثقافية.

هذا ولما كنا نتشرف بالانتساب الى الأسرة التعليمية الموقرة ورغبة منا في محاربة الجهل رأينا من واجبنا أن نقدم لسيادتكم بعض المقترحات الأساسية لرفع مستوى الثقافة بين افراد الشعب الكردي آملين ان تلقي اهتماما وقبولاً من قبل سيادتكم.

وتفضلوا بقبول فائق الاحترام.

جمال نبز ـ المدرس في متوسطة الزبير (بصرة)
فائق عارف ـ المدرس في ثانوية السليمانية (سليمانية)
احسان عبدالكريم ـ المدرس في ثانوية السليمانية (سليمانية)
نجم الدين المفتي ـ المدرس في ثانوية اربيل (اربيل)
عبدالله محمد الحاج الياس ـ المدرس في مدرسة سوسينان (السليمانية)
احسان عبدالحميد ـ المدرس في المتوسطة الشرقية (كركوك)
عبدالرحيم رضا ـ مدرس ثانوية المصلى (كركوك)
مصطفى سيد احمد (نه‌ريمان) ـ مدرس القلعة العراقية (كركوك)

* * *

أ ـ المقترحات

١- اللغة الكردية:

لما كانت اللغة القومية أهم وسائل الاتصال بين الطالب والبيئة التي يعيش فيها، وعن طريق اللغة يكتسب الطالب خبراته ومعارفة ويعبر عن مشاعره الخاصة وأفكاره الشخصية لذا كان الاهتمام بلغة الأم أمراً ضرورياً لرفع مستوى الثقافة وخاصة في سني الدراسة الأبتدائية. الأمر الذي يجعلنا أن نقترح بشأن اللغة الكردية مايلي:

أ- جعل اللغة الكردية لغة التعليم في كافة المناطق الكردية.

ب - تدريس اللغة الكردية وآدابها في جميع المراحل الدراسية (الأبتدائية والثانوية والعالية) أسوة باللغة العربية.

ج- جعل اللغة الكردية لغة اجبارية في دار المعلمين العالية ودور المعلمين والمعلمات. ذلك لان المعلم يتعرض للنقل من منطقة الى أخرى ومن لواء الى آخر. الأمر الذي يحتم عليه تعلم هذه اللغة.

د - تخصيص كرسي اللغة الكردية وآدابها في كلية الآداب بجامعة بغداد المنوى تأسيسها في المستقبل.

ه - فتح مدارس باللغة الكردية في المناطق العربية التي تقطن فيها جاليات كردية وكذلك في المناطق الكردية الواقعة في جنوب العراق. ونخص بالذكر منها الأكراد الفيليين في بغداد والحبانية ومركز لواء الموصل وجماهير الأكراد في لوائي الكوت والعمارة (بدرة وجصان وزرباطية وعلي غربي). هذا وأن الاهتمام بتطبيق هذه المادة في المدارس المتوسطة أمراً ميسوراً. ذلك لان مرحلة الدراسة الابتدائية مرحلة تربوية لا تعليمية.

٢- اللغة العربية:

يعتبر تعلم اللغة العربية بالنسبة الى الطلبة الأكراد أمراً ضرورياً الا أن الطريقة التي اتبعت سابقا في تدريس هذه اللغة كانت عقيمة وغير مجدية للغاية. حيث كان المنهج المقرر للغة العربية يشكل العرب والأكراد على حد سواء. علما بأن طريقة تعلم لغة الأم يجب أن تختلف عن طريقة تعلم لغة أخرى غير لغة الأم. لذا نقترح مايلي:

١- وضع كتب جديدة باللغة العربية تحت اشراف لجنة من المربين وعلماء النفس واللغويين. تراعي فيها الأساليب التربوية والاستدراج ويراعي فيها التقارب بين اللغة الفصحى والمصطلحات العامية. ليتمكن الطالب أن يقرا بلغة سليمة قريبة من اللغة الدارجة. كالكتب التي الفت تحت اشراف منظمة اليونسكو.

ب- أن تدريس اللغات الاخرى بجانب لغة الأم في السنوات الأولى من الدراسة الأبتدائية تحدث الارتباك عند الطالب وبالتالي عدم الحصول على الفوائد المتوخاة من الدراسة في هذه المرحلة. لذا نقترح عدم تدريس اللغتين العربية والانكليزية في الصفوف الأولى من الدراسة الأبتدائية والاقتصار على تدريس اللغة الأولى اعتباراً من الصف الخامس واللغة الثانية ابتداء من الصف السادس. وهذه حقيقة ثابتة طبقت في مصر وسوريا وتركيا وايران فافلحت بالنجاح حيث لاتدرس اللغات الأجنبية في مدارسها الأبتدائية.

ج فتح دورات خاصة للمعلمين الذين يناط بهم تدريس هاتين اللغتين.

٣- التأريخ:

يدرس الطالب الكردي تأريخ الأمم والأقوام القديمة وحتى المنقرضات والبائدات منها. كما ويدرس تاريخ مختلف الشعوب الحاضرة دراسة تفصيلية ويحفظ أسماء الملوك والطوائف والمعارك بصورة ببغاوية الا انه يحرم من دراسة تأريخ امته والاطلاع على مفاخر آبائه واجداده. ثم ان الطالب العربي الذي يهتم بنفس الدراسة العقيمة يبقى جاهلاً بامجاد شقيقه الكردي والأدوار التأريخية المشتركة التي مر بها الشعبات العريقان.

هذا ورغبة منا في توطيد لواصر الأخوة والصداقة عن طريق التفاهم المتبادل نقترح مايلي:

أ- دراسة تاريخ الأمة الكردية دراسة تفصيلية في كافة مدارس كردستان.

ب - دراسة مجملة عن تأريخ الأكراد في مدارس المتوسطة والثانوية من قبل الطلاب العرب.

ج - جعل التاريخ الكردي مادة اجبارية في دور المعلمين والمعاهد والكليات التي تعنى بمادة التاريخ.

د - ترك الأساليب القديمة في دراسة علم التأريخ ووضع مناهج جديدة له تحت اشراف اخصائيين من علماء التأريخ. اذ ان التأريخ ليس هو ذكر الأشخاص والحوادث الطارئة بل هو سجل الشعوب ونضالها من أجل التحرر والانعتاق من الذل والعبودية والتقدم نحو مستقبل أفضل ثم أن التأريخ فيه دروس وعبر وتجارب وخبرات يستهدف من دراستها غرس بذور الروح الوطنية والقومية واذكائها في النفوس لا الاهتمام بحفظ اسماء الملوك والسلاطين وعدد الجواري والغلمان.

٤- جغرافية كردستان:

الغاية من دلسة علم الجغرافية هي الالمام بحدود الوطن القومي ومعرفة أحوال سكانه وأوجه نشاطهم المختلفة وثرواته الطبيعية وخيراته الزراعية والحيوانية وظروفه المناخية وكذلك العوارض الطبيعية من جبال وتلال وأنهار وسهول، ولما كان الاستعمار البغيض حرم الطلاب الأكراد من معرفة جغرافية بلادهم. لذا نقترح مايلي:

أ- دراسة جغرافية كردستان بصورة تفصيلية في المدارس الكردية بوجه عام والاهتمام بجغرافية كردستان العراقية بوجه خاص.

ب- دراسة موجزة لجغرافية كردستان في المدارس العربية كبحث متمم لجغرافية العراق والأقطار المجاورة.

ج- جعل جغرافية كردستان مادة اجبارية في دور المعلمين والمعاهد والكليات التي تعني بهذه المادة.

٥- البعثات:

لم تكن البعثات في العهد البائد تخضع لنظام يحقق العدل والمساواة بين المواطنين كافة. فكان الطالب الذي يحرز معدلا عاما يبلغ حدا معينا يبعث الى الخارج، بغض النظر عن لوائه وحاجة منطقته الأمر الذي يشكل ظلما وعدوانا بحق البعض من الطلاب. فلو أخذنا مركز لواء الموصل والأقضية الكردية التابعة له مثالا لذلك لرأينا عدد الطلاب الذين يتخرجون سنويا من الصف الخامس في مركز الموصل لايقل عن (٢٠٠) طالب في حين لايتخرج من سكان تلك الأقضية أكثر من عشرة طلاب في السنة الواحدة. بل نستطيع ان نقول ان عدد الطلاب الأكراد الذين يتخرجون من الصف الخامس في جميع انحاء العراق لا يبلغ هذا العدد عن (٢٠٠ طالب) خلال خمس سنوات لقلة عدد المدارس في المناطق الكردية وسد معظمها أيام العهد البائد لاقتراضات سياسية. ولما كان الطالب يبعث للخارج على أساس المعدل دون أن يكون للواء الذي ينتمي ليه أي اعتبار، لذا فان الطلبة الأكراد الذين يشتركون في البعثات يقل عددهم بل يتضاءل بالنسبة الى غيرهم، هذا ومن أجل أن يأخذ العدل مجراه الطبيعي نقترح مايلي:

أ- أن تكون البعثات حسب نفوس الألوية، أي يجب ان لاتقل نسبة طلبة الأكراد عن ربع مجموع المبعوثين الى الخارج ولو كانوا دون المستوى؟!

ب- ان ترسل البعثات الى جميع أقطار العالم دون الارتباط باقطار معينة، اذ ان العلم لا موطن له.

ج- ان تكون البعثات حسب حاجة الشعب العراقي من الخبراء والاخصائيين وان تعني عناية خاصة بالنواحي الصناعية والتكنيكية.

د- لن تراعي في قبول الطالب للبعثة درجات دروس الاختصاص والدروس الضرورية للبعثة فقط لا المعدل العام، كما هو متبع الان.

هـ- ان يطبق نفس الشروط المذكورة أعلاه على طلاب البعثات من خريجي الكليات والمعاهد من خريجي الكليات والمعاهد العالية.

٦- توزيع الكليات والمعاهد العالية:

لن حصر الكليات والمعاهد العالية ببغداد له تأثير سيء على مستوى الثقافة في البلاد. فالدراسة في بغداد بالنسبة الى طلاب بقية الالوية تكلف غاليا وتضع شتى العراقيل والعقبات امامهم وخاصة من الناحية الاقتصادية الأمر الذي يؤدي الى حرمان عدد من الطلاب من مواصلة الدراسة. لذا نرى من الأوفق توزيع بعض الكليات على بعض الألوية. لان القيام بهذا العمل ـ على ما نعتقد ـ يحل مشكلة هذا الحرمان الى حد كبير. فمثلا انشاء كلية كدار المعلمين العالية أو كلية الهندسة في لواء كركوك تسهل الدراسة لطلاب الوية (كركوك و موصل والسليمانية واربيل) كما ان انشاء كلية ككلية الطب أو الصيدلة في (البصرة) متبعة في كثير من الأقطار الاوروبية والأقطار الشقيقة.

٧- شروط القبول في الكليات والمعاهد العالية:

نقترح ان تراعي في قبول الطلاب والمعاهد العالية العراقية الشروط التالية:

١- نسبة نفوس الالوية.

٢- دروس الاختصاص لا المعدل العام.

٣- عدم الالتفات الى سنة التخرج.

٤- عدم الالتفات الى عمر الطالب.

٨- فتح المدارس:

رغم قلة المدارس (المتوسطات والثانويات بوجه خاص في كردستان قامت حكومة العهد البائد بسد بعضها متذرعة في ذلك بشتى الاعذار السخيفة! لذا نرى من الضروري اعادة فتحها جميا ونخص بالذكر منها ثانويتي( حلبجة وكويسنجق).

ثم هنالك بعض المناطق الأخرى تحتاج الى متوسطات وثانويات اذ ان معظم الطلاب ينقطعون عن الدراسة بعد تخرجهم من المدارس الابتدائية بسبب فقرهم وعدم تمكنهم من السفر الى مناطق أخرى. لذا نقترح فتح المدارس الضرورية لهم وخاصة مدارس البنات.

٩- الأقسام الداخلية:

يحرم الكثير من الطلاب وخاصة طلاب القرى والارياف من مواصلة الدراسة المتوسطة والاعدادية وذلك لعدم وجود تلك المدارس في قراهم. ولعدم تمكنهم من السفر الى المدن أو المناطق التي توجد فيها تلك المدارس وتحثهم على مواصلة الدراسة بلهف واهتمام.

١٠- اكمال نواقص المدارس:

نقترح بشأن ذلك مايلي:

١- سد الشواغر بالمدرسين الاختصاصيين أو المحاضرين ذوي الكفاءات.

٢- الاهتمام بالنواحي العملية ووسائل الايضاح وتجهيز المدارس بالمختبرات والمكتبات.

٣- توجيه الطلاب نحو النشاطات المختلفة، أي تشكيل اللجان المدرسية التي منعها العهد البائد وذلك تحت اشراف المدرسين الذين لهم مؤهلات خاصة.

٤- تشجيع الطلاب على القيام بسفرات مدرسية داخل القطر العراقي وخارجه.

٥- الاعتناء بالمدارس المسائية بما يكفل للطالب المسائي التعلم والتقدم وعدم فسح المجال بالتدريس لبعض المحاضرين الذين لاهم لهم سوى سد الشواغر.

٦- مد يد المعونة للمدارس الأهلية العراقية أسوة بالمدارس الرسمية.

٧- عدم تحديد الاجور التي يتقاضاها المدرسون من المحاضرات التي يلقونها بنسب رواتبهم بخلاف العهد البائد.

حيث كانت لجور المدرس من المحاضرات التي يليها لاتتجاوز نسبة معينة من راتبه فان زادت عن ذلك قطعت عنه في حين كان المحاضر غير المنتمي الى الأسرة التعليمية يقبض من الاجور ما شاء له ان يقبض.

١١- تطهير جهاز المعارف:

قام رجال العهد البائد بشن حملات ارهابية ضد الوطنيين والمناوئين للاستعمار والرجعية فشردوا وعذبوا وفصلوا وعاثوا في الارض فسادا ما طلب لهم ان يفعلوا. لذا نقترح:

١- تطهير جهاز المعارف من الخونة واذناب العهد البائد الذين سببوا فصل وتشريد الغياري والاحرار من المدرسين والطلاب وزجهم في السجون والمعتقلات.

٢- تطهير جهاز المعارف من الذين ليست لديهم كفاءات تؤهلهم للقيام بواجباتهم، ليحل محلهم ذوو المؤهلات والقابليات الممتازة.

١٢ قضية التنقلات ومراعاة حقوق الأسرة التعليمية:

كانت مسألة التنقلات بين المعلمين والمدرسين في العهد البائد امرا يسوده الفوضى ويعمه الاضطراب. لذ انها لم تكن تخضع لنظام يحمي لافراد الأسرة العليمية حقوقهم. فحتى ذلك القانون الشكلي الذي وضعه المسوولون في عهدهم المشؤوم لم يكن يطبق. فقد كان من بين المعلمين جماعة سكنوا في المدن زهاء (٢٠ سنة) ولم يروا القرى مطلقا وعلى العكس فمن بينهم جماعة اخرى بقوا في القرى سنوات وسنوات ولم ينقلوا الى المدن رغم طلباتهم الملحة ثم ان التنقلات كانت خاضعة لمشيئة المتصرفين والادارات المحلية. فكان المعلم المسكين ينقل اداريا بجرة قلم من منطقة الى اخرى وفي أي وقت كان الأفتراضات سياسية بحتة ومن لجل ذلك نقترح مايلي:

١- وضع نظام خاص يؤمن الحق والمساواة لمعلمي الابتدائية من حيث نقلهم من القرى الى المدن وبالعكس.

٢- اخضاع التعليم الابتدائي لاشراف وزارة المعارف وعدم تسليمه الى الادارات المحلية بتاتا اذ ان الغرض من ذلك في العهد البائد لم يكن الا مراقبة المعلمين في القرى والأرياف مراقبة بوليسية.

٣- اعادة النظر في قضايا المدرسين الذين نقلوا وشردوا من لواء الى آخر بأوامر ادارية دون أي مبرر شرعي فلحقت أضراراً كثيرة من جراء ذلك.

٤-اعادة النظر في قضايا المعلمين الذين أصابهم الظلم والجور نتيجة للتصرفات الكيفية التي قام بها بعض المتصرفين ورجال الأدارة في العهد البائد.

٥- منح مخصصات محلية كافية للمعلمين الذين ينقلون الى القرى والارياف والعمل على تأمين دور ـ السكنى لهم كامتيازات خاصة تحثهم على القيام بواجبهم في مناطق متأخرة لا تتوفر فيها اسباب العيش كالمدن.

٦- مراعاة حقوق الاسرة التعليمية كالسماح لهم بتأسيس نقابة خاصة بهم وتقليل ساعات الدروس لهم.

ب- التطبيق

من الأهمية بمكان ان نضع بعض الخطوط الاساسية امام المسؤولين حول تطبيق المقترحات السابقة، أما تلك الخطط التي نحن نرتأيها القيام بتطبيق ماسبق هي:

١- ان تنظيم امور المعارف في المناطق الكردية وحل المشاكل المتعلقة بها يتطلب منا ان نفكر في ربط تلك المناطق بادارة معينة تكون لها بعض الصلاحيات الخاصة. لذا نرى من الاوفق ان تنظم شؤون المعارف في كردستان. (وهي الوية السليمانية واربيل وكركوك وخانقين والقضية موصل الكردية) تحت اشراف دائرةواحدة تدعى

(مديرية معارف كردستان) يرأسها مدير يدعي (مدير معارف منطقة كردستان) يكون مسؤولا امام وزير المعارف مباشرة. وانا نعتقد ان تطبيق المقترحات السابقة منوط الى حد كبير بتأسيس هذه الادارة الخاصة.

٢- من الاوفق ان يكون مقر هذه المديرية مركز لواء كركوك لكونه وسطا بين جميع الالوية والمناطق الكردية.

٣- ان يكون لهذا المدير معاونون في مراكز الالوية الأخرى، مسؤولين امامه مباشرة.

٤- اننا نعتقد جازمين بان السيد (رفيق حلمي) هو الشخص الذي يصلح لهذا المنصب لكونه مربيا قديرا وخبيرا ماهرا في شؤون الثقافة الكردية.

٥- تأليف لجان مختلفة من المدرسين والادباء والمؤرخين الأكراد تقوم كل لجنة حسب اختصاصها (بتأليف وترجمة الكتب العلمية والادبية الى اللغة الكردية) تحت اشراف وزارة المعارف.

٦- جعل التدريس باللغة الكردية في المدارس الابتدائية اعتبارا من هذه السنة وتطبيق نفس المادة في المدارس المتوسطة والثانوية حالما يتم اعداد الكتب المقررة باللغة الكردية.

٧- الايعاز الى مدرسي المتوسطات والثانويات باستعمال اللغة الكردية في الصف أثناء شرح الدروس ابتداء من هذه السنة والاستعانة بالكتب القديمة كمصادر ريثما يتم اعداد الكتب المقررة باللغة الكردية.

٨- اعادة المطرودين والمشتتين من المعلمين والمدرسين الى مناطقهم للاستفادة منهم في التدريس باللغة الكردية.

٩- منح مكافئات مادية ومعنوية للمشتغلين بقضايا التاليف والنشر والترجمة وتشجيعهم على القيام بالبحوث العلمية والأدبية.

١٠- فتح دورات خاصة للمعلمين والمدرسين الأكراد الذين لايتقنون اللغة الكردية قراءة وكتابة لكي يتمكنوا من القيام بواجباتهم على الوجه الاكمل.

**ڕۆژنامەی (چاودێر) ژمارە (١٥) ڕۆژی ٢٠٠٥/٢/٧**

**بەڕێز مەلا بەختیارو**

# حەویجەو نەخشەی نوێی تیرۆرو تەعریب

وتارەکەی بەڕێز مەلا بەختیار، بەو ناونیشانە، لەڕۆژنامەی بەڕێزی (چاودێر)ی ژمارە ١٢ ڕۆژی ٢٠٠٤/١٢/٢٧، وەك مەلا بەختیارێکی نووسەرم بەرز نرخاند، چونکە نووسەر بەوردیڕا دەستی خستۆتە سەر ئەو خاڵە ترسناکانەی لەحەویجەوە بەرەو ڕووی کورد ئەبنەوە. بەڵام وەك مەلا بەختیارێکی ئەندامی سەرکردایەتی (ی.ن.ك) کە ئەرکی جێبەجێکردنی رای گشتی لەئەستۆدایە، وتارێکی لەو جۆرە، ئەشێ هەڵوێستەیەکی لەسەر بکرێ!! بابزانین چۆن؟

مەلا بەختیار خۆی دەرکەوتوترین سەرکردەی ئەو لەشکرە کوردییە بوو کە خانەقینی لەعەرەبی داگیرکەرو تەعریب پاککردنەوەو هەر لەڕۆژانی یەکەمی ئەو داستانە شکۆدارەوە، لەکاتی جەنگی ڕزگارکردنی عێراقدا ساڵی ٢٠٠٣، مندالانی خانەقینی بەسروودی ئەی رەقیب گۆشکرد، نەئەبوو لەو وتارەیدا ئەوە بۆ سەرکردایەتی کوردستان بەکارێکی چاك بژمێرێ کە (ئەو سەرکردایەتییە، هەتا ئێستا دانی بەخۆیدا گرتووە، بەرامبەر کوشتنی ڕۆژانەی کوردو ناچارکردنی کورد بۆ کۆچکردنو بەجێهێشتنی ناوچەکە!!) ئەوە چ لێکدانەوەیەکە کە دوای چەندین سەدە، سەرکردایەتی کوردستان، بەئەزموونە دۆڕاوەکەی مەسیحدا بچێتەوە کە ئەیوت: ئەگەر شەپازلەیەکیان سرەواندە ڕوومەتی ڕاستت، ڕوومەتی چەپت ئامادەکە بۆ شەپازلەی دووەم! ئەوە بوو ئەو ئەزموونەی مەسیح، بەلەخاچدانی خۆی کۆتایی هات، بۆیە لەو ڕۆژەوە دنیای مەسیحیتان بەرامبەرو شەپازلەیەك، دەیان شەپازلەی کوشندە ئەوەشێننەوە که دواهەمینیان ئەو شەپازلە کوشندانانەیە ئەمریکا ئەیسرەوێنێتە تیرۆرستان.

ئاخر ئەزمونگەری کە ئەمڕۆ ئەنگی بەفەلسەفەو بیرۆکەوە هەڵچنیوە، بۆ ئەوە نیە کە ئەزموونە سەرکەوتووەکان پەیرەو بکرێنو ئەزموونە سەرنەکەوتووەکان وازلێبهێنرێن؟ ئەزموونەکەی خانەقین ئەزموونێکی سەرکەوتوو بوو، ئەبوایە لەکەرکوكو حەویجەو ناوچە بەعەرەبکراوەکانی تریشدا هەمان ئەزموون پەیرەو بکرایە، نەك پێچەوانەی ئەو ئەزموونە، ستایش بکرێ!! یا ئەوە بەڕەوا بۆ سەرکردایەتی کوردستان بژمێردرێ کە چاوەڕوان بکا، تا (تیرۆرستان نەخشەی تالەو دوو دوو تیرۆرکردنی هاوڵاتی بگۆڕن بۆ کوشتنی بەکۆمەڵو قەتلوعامی کورد) ئەوسا سەرکردایەتی کوردستان، کەپەنکی دوای بارانێکی لەو جۆرە لەسەر کات! یان ئێستا تەنیا بەوە دابین بێ کە (هەنگاوی ڕاگەیاندنو داوای یاسایی تۆمار بکا هەتا بێگوناهی کوردو تاوانی تیرۆرستەکانو پشتیوانەکانیان، باشتر بچێتە ناو ڕای گشتییەوە!!) یا (کاتێ تیرۆرستان بیگەیەننە ئاستی تاوانی گەورەترو پێویستی کرد کورد دەستبکاتەوە، با لای ڕای گشتیو دەزگا یاساییەکان ساغ کرابێتەوە کورد ناچاری بەرگری کراوە) وەك ئەو ڕستانەی ناو کەوانەکان کە لە وتارەکەدا هاتوون!!

ڕاستییەکەی، وەك عەرەب خۆیان ئەڵێن: (لایفل الحدید الا الحدید ـــ ئاسن نەبێ ئاسن ناچەمێنێتەوە) یا وەك فەرموودەکەی یەزدان: (ومن اعتدی علیکم فأعتدوا علیه بمثل ما اعتدی علیکم ـ ئەوەی دەستدرێژی کردە سەرتان، بەهەمان جۆر دەستدرێژی بکەنەوە سەر) یا (و جزاء السیئة

سینة مثلها ـ سزای خراپە خراپەی وەك خۆیەتی)، ئەمڕۆ ئەرکی سەرکردایەتی کوردستان، ئەوەیە: بەر لەلافاوی قەتلوعامێکی تری کورد، بەربەستی ئەو لافاوە بکا ـ ئەمڕۆ کە بەشێك لەفەرمانڕەوایانی بەغدلو کەرکوك، لەئەندامەکانی سەرکردایەتی کوردستانن‌و ژمارەیەك لەدەزگاکانی ئاسایش‌و پۆلیس‌و سەرباز سەربەو سەرکردایەتیەن، سەرباری هێزی پێشمەرگە لەرۆژێکی ئاوادا ئەو سەرکردایەتییە نەتوانێ، یا نەیەوێ بەربەستی کوشتنی تاك تاکو دوو دووی کورد بکا، یا تۆڵەیان بسەنێ، سبەی چۆن ئەتوانێ بەری قەتلوعامێکی لەو جۆرە بگرێ یا تۆڵەی بکاتەوە!؟ بەتایبەتی وەك لەتێگەیشتنی تێکڕای وتارەکەدا دەرئەکەوێ، ئەو سەرکردایەتییە تا ئێستا بۆ ئەو مەبەستە هیچ نەخشەو پلان‌و بەرنامەیەکی نییە!! حکومەتی عێراقیش، وەك لەوتارەکەدا هاتووە (هیچ هەنگاوێکی لەجێبەجێکردنی مادەی ٥٨ دا نەناوەو پێ ناچێ بشیەوێ جێبەجێی بکا).

ئەوە هیچ شانازییەك‌و جەوامێرییەك نیە کە (هەتا ئێستا یەك هێرشی کورد لەبەرامبەر هێرشەکانی ئەواندا، بەبەرنامە جێبەجێنەکراوە) لەکاتێکدا ئەوان بەنەخشە بەردەوامن!! خۆپاراستن لەشەڕی تایەفەگەری‌و شەڕی ناوخۆ، هیچ بیانوو و پاساوێك نیە بۆ ئەم (هێمنی‌و پشوو درێژییەی سەرکردایەتیی کوردستان!!) ئەوەش ناگونجێ خۆمان بەراورد کەین بەئەمریکاو بڵێین: ئەو چاری تیرۆری بۆ ناکرێ، ئێمە چۆن؟ ئەشێ ئەمریکا بەپای پیلان‌و بۆ بەرژەوەندی مەبەستەکانی خۆی، گەلێ چاوپۆشی بکا، یا بیەوێ درێژە بەم باروودۆخەبدا، یا نەشارەزاو نابەڵەدبێ بەناوچەکەو بەتیرۆرستان، بەڵام کورد هیچ بەرژەوەندییەکی لەوەدا نیە، وەك مەڕی قوربانی، چاوەڕوانی چەقۆی عەرەبی تەعریب بێ، یا بەبارمتە بیرێ، یا کوردەکان ناچار کرێن شوێنەکانیان چۆڵ بکەن، کورد نەشارەزلو نابەڵەدیش نیە بەو تیرۆرستانە، بەتایبەتی لەکەرکوکو حەویجەدا، کوردەکانی ئەم ناوچەیە، یەك بەیەکو ماڵ بەماڵی بەعسیەکانی دوێنێ ئەزانن کە ئەمڕۆ هەر ئەوانن ئەنجامدەری تیرۆری ئەم ناوچەیەو کێشەی ئەم کوردانە (هێمنی‌و پشودرێژی) سەرکردایەتی کوردستانە. ئێستا پرسیارەکە ئەوەیە: ئاخۆ ئەم سەرکردایەتی کوردستانە، ئەو هەموو چەك‌و لەشکرو سامانەی بۆ چ کاتێکی تەنگانە هەڵگرتبێ!؟ بریا سەرکردایەتی کوردستان، ئەو هێمنی‌و پشوودرێژییەی بۆ شەڕی ناوخۆی کوردستان هەبوایە، کێشەکانی ئەمڕۆی کورد، بەتایبەتی تیرۆر لەدژی کورد، پێویستی بەچارەسەری کوتوپڕو تەمێ کردن هەیە، نەك خەمساردی‌و چاونووقاندن.. ئافەرین بۆ ئەزموونەکەی خانەقین‌و شەرم بۆ ئەزموونی کەرکوکو حەویجە.

سلێمانی ٢٢/١/٢٠٠٥

هەڵبژاردنەکەی ٢٠٠٥/١/٣٠ بۆ ڕۆژنامەی هاوبیر ژمارە ٢١ ڕۆژی ٢٠٠٥/١/١١

## کامیل ژیر:

# دەنگ دەدەین بەو لیستەی بیرو بەرنامەیان لەئێمەوە نزیکە

**هاوبیر: دەنگ وا بوو کە هاوبیرانی کوردایەتیش لەخۆئامادەکردندا بوون بۆ هەڵبژاردنەکان، کەچی کەلیستەکان ئاشکرا کران، لیستی ئێوەی دیار نەبوو!!**

**کامیل ژیر:** ئێمە بەتەنیا بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان لەخۆئامادەکردندا بووین، لەدوای کەوتنی ڕژێمی سەددامەوە، ئەگەری هەڵبژاردنی دووەم پەرلەمانی کوردستان دروست بوو، ئێمەش لامان باشبوو لیستێکمان هەبێ، بۆ ئەو مەبەستە، چەندین کۆبوونەوەمان کرد. پەیوەندیمان بەژمارەیەك لەهاوبیرانی دەرەوەی وڵاتیشەوە کرد، ڕۆژی ٢٠٠٤/٤/٢٩ لەهۆڵی کۆلیجی پزیشکی زانکۆی سلێمانی، کۆڕێکمان بەست، کۆڕەکە، ئەگەرچی بەناونیشانی (چارەسەرکردنی کێشەکانی کورد لەڕێگەی یاسای نێودەوڵەتییەوە) بوو، بەڵام لەدەرگای هەڵبژاردنیشمان دا. لەم دوایەشدا لیستێکمان گەڵاڵە کرد، لیستەکە سەرەتا بریتی بوو لەهەشت پارێزەرو چوار مامۆستاو پرۆفیسۆری زانکۆو دوو مامۆستاو یەك ئەندازیارو دوو فەرمانبەرو دوو نوسەرو ڕۆژنامەنووس‌و یەك هونەرمەندو یەك بەڵێندەرو یەك پزیشك‌و نۆ خوشکی هاوبیر لەخاوەن پیشەو توانا جۆربەجۆرەکان. بەتەما بووین بەشداربوولنی لیستەکەمان چەندین جار زیاتر کەین، بەڵام بەهۆی هەندێك ئاستەنگیەوە، هەڵوێستەیەکمان بۆ کرد.

**هاوبیر: ئاستەنگەکان چی بوون؟**

**کامیل ژیر:** یەکەم: دانانی بڕی پێنج هەزار دۆلار! لەڕاستیدا ئێمە ئەو بڕە پارەیەمان لەدەستدا نەبوو، دووەم: ماوە نەدان بەکوردانی هەندەران بۆ دەنگدان بۆ پەرلەمانی کوردستان! ئەوە ئەگەر بۆ هەموان زیانێك بێ، بۆ لیستەکەی ئێمە زیانێکی زیاترە، چونکە ژمارەیەکی زیاتر دەنگی لەکیس ئەدلین. سێیەم: ئەو مەرجە کە لەسەرەتاوە وتیان ئەبێ پێشەکی هەموو کەس خۆیان لەناوەندەکاندا ناونووس کەن. ئەمەش ئەبووە هۆی ئەوەی خەڵکی ناحیزبی کە جێگە هیوای ئێمە بوون دەنگمان بدەنێ، ئەو (خۆناونووسە) نەکەن‌و ڕۆژی هەڵبژاردن مافی دەنگدانیان نەبێ‌و دەنگدانەکە پاوان بێ تەنیا بۆ حیزبەکان.

**هاوبیر: ئایا هیچ پەیوەندیەکتان بەلیستەکانی ترەوە کردووە؟**

**کامیل ژیر:** ئێمە لەو هەڵوێستەو بیرکردنەوەو لێکدانەوانەدا بووین، مامۆستا بەهادین نوری پەیوەندی پێوەکردین‌و وتی ئێمەش، چەند کەسێکی بێلایەن، لیستێکمان هەیەو پارەکەشمان داوە. داوای لێکردین هاوکاری یەك بکەین. بۆ ئەو مەبەستەو بۆ زیاتر لەیەکتر گەیشتن، ژمارەیەك کۆبوونەوەو دانیشتمان کرد. کاتێك گەیشتینە ئەو ئەنجامەی ئێمەو ئەوان پێکنایەین، ماوەی ئەوە بەسەرچوو لیستەکەی خۆمان پێشکەش کۆمیسۆنی هەڵبژاردنەکان بکەین، لەلایەکی تریشەوە، یەکێك لە حیزبەکان، داوایان لێکردین، بەناوی بێلایەنەوە، بەشداری لیستەکەیان بین. لەوەڵامدا وتمان ئێمە وەك تاك ئامادە نین بەشدارییەکی لەو جۆرە بکەین لەگەڵ هیچ حیزبێکدا، بەڵام ئەشێ وەك (إئتلاف) هاوکاری بکەین بەو مەرجەی لەپەرلەماندا کەسایەتی لیستەکەمان بمێنێ‌و مافی ڕای جیاوازمان هەبێ، ئیتر ئەو حیزبە نەهاتەوە بەلاماندا.

**هاوبیر: بەرنامەی لیستەکەتان چی بوو؟**

**کامیل ژیر:** بەرنامەیەکی گشتگیری فرە بابەت بوو، لێرەدا تەنیا هێما بۆ چەند خاڵێکی ئەو بەرنامەیە ئەکەم:

١- وەستان دژی هەر کەرتبوونێکی قەوارە سیاسیەکەی باشووری کوردستان، یا بەستنەوەی بەداگیرکەرانی کوردستانەوە بەجۆرێك کە ژێردەستەیی و کۆیلەیەتی گەلەکەمانی لێبکەوێتەوەو فراوانکردنی ئەم قەوارەیە تاڕادەی ناوچە کوردستانیەکانی موسڵ و کەرکوك و دیالەو کوت.

٢- کۆتایی هێنان بەپاوانکردنی ئەو جۆرە حیزبایەتییەی بوە هۆی شەڕی ناوخۆو لەتکردنی کوردستان و تالانکردنی سامانی کوردستان و دروستبوونی گەندەڵی کارگێڕی و دارایی و سیاسی و یاسایی و رەوشتی و چاوپۆشین لەبەعسی و ناپاکان.

٣- داڕشتنی دەستورێك بۆ قەوارە سیاسیەکەی باشووری کوردستان کە حوکم و سەروەریی یاسا لەو دەستورەوە سەرچاوە دەگرێ.

٤- نوسینەوەی مێژووی کورد لەدیدێکی نەتەوەییانەوە.

٥- هەموو داهاتەکانی کوردستان بچنە گەنجینەی حکومەتی کوردستانەوەو دەستی حیزبەکان لەسەر ئەو داهاتانە هەڵگیرێ و بنەمای (ئەمەت لەکوێ بوو؟) پەیڕەو بکرێ.

٦- دامەزراندنی سوپایەکی بەرگری یەکگرتوو بۆ کوردستان.

٧- کورد یەك نەتەوەیەو کوردستان یەك نیشتمانەو هەموو دەستکەوتێکی سیاسی ئاڕاستە ئەکەین بۆ یەکێتی کوردو سەربەخۆیی و یەکگرتنەوەی پارچەکانی کوردستان.

٨- مانەوەی باشووری کوردستان، لەم قۆناغەدا بەدەوڵەتی عێراقەوە، بەندە بەوەوە کە پەرلەمان و حکومەتی ناوەندی لەبەغدا، دان بنێ بەفیدراڵی راستەقینەو دیاریکردنی سنووری سروشتی کوردستان و فراوانکردنی هەرێمی کوردستان تا رادەی ئەو سنورە سروشتییەو دان بنێ بەمافی نەتەوەکەمان لەدیاریکردنی چارەنوسی خۆیدا بەڕەهایی و بەبێ مەرج.

ئەوە بەگشتی هەندێك لەو خاڵانە بوون کە ئەشێ جیاکەرەوەی لیستەکەی ئێمە بێ لەلیستەکانی تر. ئەگینا ئێمەش لەبارەی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و شارستانی و ئازادی و مافی کەمینەکان و یەکسانی هەردوو رەگەز و عیلمانی و یەکسانی و دادی کۆمەڵایەتی و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و ئابوری وڵات و نەوت و ئاوو ژینگەو رۆشنبیری و زانست و وەرزش و.. هتد وە باری سەرنجی خۆمان هەبوو. ئەم پەرلەمانەش، وەك ئەڵێن ئەگەر ماوەکەی یەك ساڵ بێ، ئەوا بۆ هەڵبژاردنێکی تر زۆری نامێنێ و ئەوسا هەڵوێست و قسەی ترمان ئەبێ.

**هاوبیر: ئەی ئێستا دەنگ بەکام لیست ئەدەن؟**

**کامیل ژیر:** لایەنگری لیستێك ئەبین کە زیاتر بیرو بەرنامەیان لەئێمەوە نزیك بێ، بۆ هەڵبژاردنی عێراقیش، ئێمە ئەگەرچی بەگونجاوی نازانین خۆمانی بۆ کاندید بکەین، بەڵام وەك دەنگدەر، دەنگ ئەدەین بەلیستی کوردیی هاوبەش، بەمەرجی ئەم لیستە تێکەڵ بەهیچ لیستێکی ناکوردی نەبێ.

# تیرۆرو غافڵ کوژی لە کوردستان دا
# کێ لێی بەرپرسیارە...
# چۆن بنـــەبڕ دەکرێ؟

**گفتوگۆیەك لەگەڵ سیاسەتمەدارو ڕووناکبیران**

هەر کە گوێبیستی وشەی تیرۆر دەبین ڕاستەوخۆ کۆمەڵێك حاڵەتی ناخۆش لە هەستو نەستدا جێگر دەبێتو مرۆڤ لە بارێکی ئاساییەوە دەچێتە بارێکی دەروونی خراپو سەرجەم کارە دزێوەکانی وەك ترسو هەڕەشەو نەمان... هتد دەچنە بیرو هۆشییەوەو تووچاری شەکەتبوونی جەستەیی دەبێت. هەر بۆیە ئەو کەسانەی یان ئەو لایەنانە کە ڕەفتاری تیرۆرستانە ئەنجام دەدەن، کەسانی نەخۆشو دژ بە ئاسودەیو ئاسایشی خەڵکین کەسانێکن کە بوونەتە دڕدەستی کۆمەڵە تێکدەرێك کە حەز بە هیچ گۆڕانێکو بەرەوپێش چوونێك ناکەن، بە عەقلیەتێکی دوگما بیردەکەنەوەو تەماشای دەورووبەر دەکەن. جا هەر لەم ڕوانگەیەشەوە ئاشکرایە کە تیرۆر لە کوردستاندا تا ئەندازەیەك پەرەی سەندوە.

ئەم جۆرە ڕەفتارە دژ بە مرۆڤایەتیو دزێوو ترسناکە ئەگەر سنوورێکی بۆ دانەنرێتو کارێکی جدیانەی لە لایەن دەزگا بەرپرسەکانەوە بۆ نەکرێت ئەوا پشێوی سەرانسەری کوردستان دەگرێتەوەو دەبێتە ڕێگر لەبەردەم پیادەکردنی دیمکراسیەتو ئەرکە نیشتمانییەکانی ئەمڕۆ و سبەینێ.

جا بۆیە بە چاکمان زانی کە کەسانی سیاستمەدارو یاسا ناسو دیموکراتیخوازبانگیشە بکەین تا ڕاوبۆچوونی خۆیان لەسەر ئەم دیاردە تێکدەرو ترسێنەرە بخەنە ڕوو. بەو ئومێدەین کە ئەم ڕاوبۆچوونانە ببێتە هاندەرێك بۆ چارەسەرکردنو بن بڕ کردنی ئەم دیاردەیە.

**ئا/ بەشی ڕیپۆرتاژ**

**بەڕێز کامیل ژیر/ پارێزەر:**

ئەگەر فەرمانڕەوایان لەوڵاتێکدا خۆیان ڕێزی یاسا نەگرن، یاخود توانای ئەوەیان نەبێ کە دەستورێك بۆ وڵات دابنێنو کۆمەڵێك یاسا لە چوارچێوەی ئەو دەستوورە دا نەبێ، ئیتر چۆن چاوەڕوان دەکەن خەڵکی سادەو نەزان ڕێزی یاساو مافی مرۆڤ بگرێت، کەواتە بۆ ئەمڕۆی ئەم تاقیکردنەوەیەی هەرێمی کوردستان پێویستیمان بەدەستوورێك هەیە بۆ وڵات. ئینجا کۆمەڵێك یاسا کە لەگەڵ بارودۆخی ئەمڕۆی کۆمەڵگای کوردەواریدا بگونجێ.

ئەگەر حکومەتی هەرێمی کوردستان، گیانی بەبەردا نەکرێ، واتە هەموو دەسەڵاتێکی جێبەجێکردنویاساکاریو دادوەری تەواوی نەبێ، بەبێ دەستێوەردانی حیزبەکان، ئەوا ئەو حکومەتە هەر بەئیفلیجی ئەمێنێتەوەو نەیاسا جێبەجێدەکرێ، نە ڕێزی مرۆڤیش ئەگیرێت. وەك ئەبینین ئەمڕۆ

تیرۆر گەیشتۆتە رادەیەك كە دەستدرێژی ئەكرێتە سەر تەنانەت پیاولنی یاساو دادوەرو پارێزەر، كە ئەمانە پیشەو كاریان تەنیا جێبەجێكردن‌و چەسپاندنی یاسایە. بەرای من باشترین چارەسەر ئەمرۆ بۆ هەرێمی كوردستان ئەوەیە كە مل ملانێی حیزبەكان، جارێ دوابخرێ تا كاتی ئەم تاقیكردنەوەیەمان ئەگاتە قۆناغێك كە تەولو خۆی بگرێ‌و ئەو مەرجانەی كە بۆ قەوارەی حكومەتێك پێویستە دابینكرێ، ئەوساكە مەترسی هەرەس‌و رووخانێكی ترمان نەما، ئەوسا مل ملانێی حیزبایەتیش كارێكی خراپ نابێ. خالێكی تر ئەوەیە كە بەگورجی دیاردەی چەكداری نەمێنێت‌و هەموو دەستەلاتێك بدرێتە حكومەتی هەرێم. بۆ ئەمەش پێویست بەوە دەكات كە كەسی یەكەمی ئەو حیزبانەی كە بارستاییەكی دیاریان هەیە، بەشداری فەرمانرەوایەتی ببن. هەر بۆ رێزگرتن لەدیموكراتیەت‌و یاساو مافی مرۆڤ، پێویستە میللەت پرچەك بكرێت بە خوێندەواری‌و رۆشنبیری‌و هوشیاری. چونكە ئاشكرایە نەتەوەیەك ئەتوانێ رێزی یاسا بگرێت هەروەها بایەخی دیموكراتیەتی بزانێ كە هوشیارو رۆشنبیربێت.

ڕۆژنامەی بەرێزی کوردستانی نوێ ژ ١٦٨٧ دووشەممە ١٩٩٨/٨/٣١

# بڕیاری ٦٨٨
# لە دیدی یاساناسانی کوردستانەوە

ئامادەکردنی/ پارێزەر: چینەر عەلی جۆلا

پاش داگیرکردنی کوێت لەئابی ١٩٩١دا بارودۆخێکی سیاسی ئاڵۆز لەناوچەی کەنداودا هاتەگۆڕێ؛ کە لەپێناو گێڕانەوەی سەروەرێتی بۆ دەوڵەتی کوێت بەپشت بەستن و گەڕانەوە بۆ ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، وڵاتان کەوتنەخۆو چەندین بڕیاری گرنگ لەلایەن ئەنجومەنی ئاسایشەوە دەرکران... بەڵام دوای کۆڕەوی کورد، بۆ ڕێگرتن لەپێشێلکردنی مافی مرۆڤ لەکوردستان و عێراق لەپاش کۆتاییهاتنی جەنگدا لە ١٩٩١/٤/٥ ئەنجومەنی ئاسایش بڕیاری ٦٨٨ی نێودەوڵەتی دەرکرد، کە بۆ کورد ئاوڕدانەوەیەکی نێودەوڵەتی گرنگ بوو. دوای خامۆشیەك ئێستاو جارێکیتر ناوی ئەم بڕیارە هاتەوەگۆڕێ.

بۆ تاووتوێکردنی مەغزا یاساییەکانی ئەم بڕیارەو کاریگەری لەسەر ئایندەی ئەزموونەکەمان، کردنەوەی بەم پرسیارانە بەپێویست دەزانین.

پرسیاری یەکەم:

❖ ئایا بڕیاری ٦٨٨ بڕیارێکی (ملزمە) لەڕووی یاسای نێودەوڵەتی؟ یاخود تەنها توصیەك بوو بۆ بارودۆخێکی تایبەتی؟

پرسیاری دووەم:

❖ ئایا جێبەجێنەکردنی بڕیارەکە دەگەڕێتەوە بۆ کەموکوڕی بڕیارەکە لەڕووی (یاسایی)یەوە یاخود خەلفیەی سیاسی هەیە؟

پرسیاری سێیەم:

❖ تاچەند دەتوانرێت ئەم بڕیارە وەکو مەرجەعیەتێکی قانونی دەولی پشتی پێببەسترێت بۆ بەدەستهێنانی دەسکەوتی سیاسی لەئاستی نێودەوڵەتی لەلایەن گەلی کوردەوە؟

پرسیاری چوارەم:

❖ لەداهاتوودا ئەم بڕیارە جێبەجێ دەکرێت؟ یاخود وەکو چەندین بڕیاریتر دەکرێت بەقوربانی بەرژەوەندی تایبەتی دەوڵەتان؟

**بڕیاری (٦٨٨) ەی نیسانی ١٩٩١**

**ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی:**

١. سەرکوتکردنی خەڵکی مەدەنی عێراقی‌و ناوچە کوردنشینەکانی مەحکوم دەکات.

٢. داوا لەعێراق دەکات ئەو سەرکوتکردنە راگرێت.

٣. سوورە لەسەر ئەوەی کەدەبێ رێکخراوە نێودەوڵەتیەکان رێگەیان پێبدرێ بۆ ئەوەی یارمەتییە مرۆییەکان بگەیەننە هەموو جێیەکی عێراق.

٤. داوا لەسکرتێری گشتی دەکا کە راپۆرتێك لەسەر مەینەتیەکانی دانیشتووە مەدەنییە عێراقییەکان‌و بەتایبەت دانیشتووە کوردەکان ئامادەبکات.

٥. داوا لەسکرتێری گشتی دەکا تا بەپەلە پێداویستییەکانی ئاوارەو دەربەدەرە عێراقییەکان دابین بکات.

٦. بانگەشەی وڵاتانی ئەندام‌و هەموو رێکخراوە مرۆدۆستەکان دەکا تا لەم هەوڵە فریاگوزارییە ئینسانییەدا بەشداربن.

٧. داوا لەعێراق دەکرێ لەپێناو جێبەجێکردنی ئەم مەبەستانە هاریکاری سکرتێری گشتی بکات.

٨. بڕیاردەدرێ کە ئەو مەسەلەیە لەژێر لێکۆڵینەوەدا بمێنێتەوە.

**پارێزەر کامیل ژیر:**

**بڕیاری ٦٨٨ بڕیارێکی مولزەمە**

١. بۆ وەڵامی پرسیاری ئایا بڕیاری ٦٨٨ لەرووی یاسای نێودەوڵەتییەوە مولزەمە؟ دەشێ سەرەتا بپرسین ئایا یاسای نێودەوڵەتی خۆی لەخۆیدا یاسایە؟ بەلای یاساناسێکی وەك Austin لەئینگلتەرا یاسانیە، بەڵکو ئەوە ژمارەیەك رەوشتی نێودەوڵەتی داترلوەو ناوی یاسایان لێناوە، لەئەلمانیاش Lasson و لەفەرەنسا Ferrandiere و لەئەمریکاش Sterling Edmunde لەسەر هەمان رابوون، بیانووی ئەمانە لەپێناسەی (یاسا)وە هاتبوو کەدەڵێ: یاسا کۆمەڵێك فەرمانە، دەستەڵاتێکی بەرزی یاسایی دەیسەپێنێ‌و چەسپاندن‌و جێبەجێکردنیشی دەکەوێتە سەر هەندێك دەستەی دادوەری‌و سەر سزایەك کەخەڵکی ناچاردەکا پەیڕەوی بکەن. جا لەبەرئەوەی یاسای نێودەوڵەتی ئەو دەستە دادوەری‌و سزاییەی نیە، بەیاسا ناژمێردرێ. دیارە کە بەیاساش نەژمێردرا مولزەم نابێ.

ئەم رایە زوو رەتکرایەوە، چونکە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هەمیشە پەیڕەوی ئەو یاسایانەی کردووە کە لەئەنجامی عورف‌و رێککەوتننامەوە هاتوونەتە ئاراوە، واتا مەرج نیە هەموو یاسایەك دەستەڵاتێکی یاسادانان دایبنێ. ئێستاش هەروایەو هەندێجار عورف یا رێککەوتننامە یا بڕیاری پێشووی دادگاکان، بەیاسا دەژمێردرێ‌و پەیڕەوییدەکرێ. لەبارەی دەستەڵاتی چەسپاندنیشەوە، ئەوەبوو ساڵی ١٨٩٩ دەزگای ناوبژیکردن لەلاهای‌و دادگای دادی نێودەوڵەتی هەمیشەیی ساڵی ١٩٢٠ و دادگای نێودەوڵەتی بەپێی پەیماننامەی نەتەوەیەکگرتووەکان ساڵی ١٩٤٥ دانران. لەم ساڵیشدا دادگایەکی هەمیشەیی لەلاهای دانرا بۆ دادگایی کردنی تاوانکارانی جەنگ.

لەبارەی مەرجی جێبەجێکردنی سزاکانیشەوە، بەکردەوە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، گەلێ سزای سیاسیو سەربازیو ئابووری سەپاند، وەك ئەوەی بەرامبەر عێراق کرا دوای شەڕی کوێتو سزای جینائی وەك دادگاییکردنی تاوانکارانی جەنگ.

کەواتە ئێستا هیچ گومانێك لەوەدا نەماوە کەیاسای نێودەوڵەتی یاسایەکی تەواوە. کەیاساش یاسای تەواوبێ، ئەوا بێگومان مولزەمە بۆ هەمووان.

لەو گۆشەنیگایەوە، بڕیاری ٦٨٨ بڕیارێکی یاسایی‌و مولزەمە. راسپاردە (توصیە)ش نیە. چونکە بڕگەی (١)ی بڕیارەکە دەڵێ: (ئەنجومەنی ئاسایش ئیدانەی ئەو داپڵۆسینە دەکات کەبەرامبەر دانیشتوانە شارستانیە عێراقیەکان دەکرێ لەزۆر بەشی عێراقداو لەم دواییەشدا ناوچەی دانیشتوانی کوردی گرتۆتەوەو ئەنجامەکەشی هەڕەشە لەئاشتی‌و ئاسایشی نێودەوڵەتی‌و ناوچەکە دەکات.

لێرەدا وشەی (ئیدانە) هیچ گومانێك لەوەدا ناهێڵێتەوە کەعێراق بەتاوانکار زمێردراوە، بۆیە ئەو بڕیاری (٦٨٨)ی بەسەردا دراوە. ئەوەش ئەوە دەگەیەنێ کەکۆمەڵگای نێودەوڵەتی بەم بڕیارە خۆی ئیلزام کردووە بۆ جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە. واتا بۆ سەرکوتکردنی عێراق هەرکات لەو بڕیارە لابدا، ئەمەش مەسەلەیەکی کاتی نیە، بەڵکو درێژخایەنە ئەگەر هەمیشەیی نەبێ.

٢. بۆ وەڵامی پرسیاری دووەم ئایا جێبەجێنەکردنی بڕیارەکە تائێستا دەگەڕێتەوە بۆ کەموکوڕی بڕیارەکە لەڕووی یاساییەوە یاخود پێشینەی سیاسی هەیە؟ لەوەڵامدا دەڵێم ئێوە بۆچی ئاوا بەرەهایی دەڵێن بڕیارەکە جێبەجێنەکراوە؟! ئەی هێڵی ٣٦و چەکوشی ئامادەو ناوچەی ئاسایش‌و هەرێمی ئەفرین‌و سزای سەربازی‌و ئابووری بەرامبەر عێراق‌و ئەو هەموو رێکخراوە مرۆییەو ناچارکردنی عێراق بۆ رێبێدانیان‌و بڕیاری ٩٨٦و...هتد چین؟ بێگومان ئەوانە بەشێکی گرنگن لە ئەنجامی بڕیارەکە، بڕیارەکەش لەڕووی یاساییەوە وەك لەسەرەوە رۆشنمانکردەوە کەموکوڕییەکی یاسایی تێدانیە، وەك ئەنجامیش ئەو بڕیارە هەرنەوەندەی لێهەڵدەکرێ.

٣. من لەناواخنی وەڵامی یەکەمدا، ناڕاستەوخۆ وەڵامی پرسیاری سێهەمیشم داوەتەوە، لێرەشدا دووپاتی دەکەمەوە کە لەرووی یاساییەوە ئەو بڕیارە سەرچاوەیەکی نێودەوڵەتیەو پشتی پێدەبەستێ لەو هەوڵو تەقەللایانەی گەل کوردستان بۆ بەدیهێنانی دەستکەوتی سیاسی لەئاستی نێودەوڵەتیدا دەیدات.

٤. لەوەڵامی پرسیاری چوارەمدا دەڵێم: دواڕۆژی ئەم بڕیارە بەندە بەخۆمانەوە ئێمەی کورد، ئێمە ئەگەر خۆمان رێکوپێك بین، نرخی ئەو بڕیارەو کۆششی دۆستەکانمان بزانین، ئاسایشی کوردستان‌و ناوچەکە نەخەینە مەترسییەوە بەشەڕی ناوخۆو کوردستان نەکەینە گۆڕستان بۆ کوردو دۆستانی کورد، گوێ لەقسەی ئەوانە نەگرین کەلەسای سێبەردلو لەپشتی لووتیانەوە فەلسەفەی سیاسیمان پێدەفرۆشن‌و دەڵێن ئەمانە بۆ بەرژەوەندی خۆیان هاتوون‌و دەمانپارێزن‌و یارمەتیمان دەدەن‌و...هتد، ئەوا دواڕۆژی بڕیارەکە درێژەی دەبێ‌و ئەنجامدەردەبێ.

من تێناگەم بابایەکی نەرویجی، سویدی، نەمسایی کەهەزاران فرسەخ رێگەیان بڕیوە بۆیارمەتی ئێمەو هیچ کام لەو وڵاتانەش بەئیمپریالیزم نەناسراون، دەبێ چ بەرژەوەندییەکیان هەبێ لەکوردستاندا؟ ئینجا ئەم دنیایەش خۆ هەمووی بەرژەوەندی دەبیزوێنێ، چی تیایە ئەگەر بەرژەوەندیەکی هاوبەش دوولا بەیەك بگەیەنێ؟

لەلایەکی ترەوە راستە لەو بڕیارەدا ئەوە هاتووە کەهەموو دەوڵەتە ئەندامەکان جەخت لەسەر ئیلتزام دەکەن بەرامبەر سەروەریی عێراق‌و هەموو دەوڵەتەکانی ناوچەکەو ئاسایشی هەرێمیان‌و سەربەخۆیی سیاسیان. بەڵام لەڕووی کردەییەوە ئەم بەشە ئازادەی کوردستان، ئەوە هەشت ساڵە هەموو مەرجێکی سەربەخۆیی تێدایە وەك سنوورێکی دیاریکراو، دەستەڵاتەکانی جێبەجێکردن‌و یاسادانان‌و دادوەری، هێزی سەربازی‌و پۆلیس‌و ئاسایش، سێ زانکۆ...هتد کەئەمانە هەمووی واتای سەربەخۆیی دەگەیەنن لەم بەشەدا ئەگەرچی نەتەوەی کورد چاوی لەسەربەخۆیی هەموو بەشەکانی تریشەوەیە، تاکە خاڵێك کە دەشێ پرسیاری لەبارەوەبکرێ، ئەوەیە کەئێمە ئەندام نین لەکۆمەڵی نەتەوەیەکگرتووەکاندا؟ ئەوەش هیچ مەرجێك نیە بۆ قەوارەیەك. دەکرێ میللەتێك دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی هەبێ‌و ئەندامیش نەبێ لەو ڕێکخراوەدا، وەك سویسرا کە تا ئێستا ئەندام نیە لەکۆمەڵی نەتەوەیەکگرتووەکاندا.

٥. خاڵێکی لاوازو گومڕا لەبڕیاری ٦٨٨ دا تەنیا خاڵی هەشتەمە کەدەڵێ ئەنجومەنی ئاسایش بڕیاردەدا ئەم مەسەلەیە لەبەر تێڕوانیندا بهێڵێتەوە. دیارە ئەوەش مافێکی خۆیانەو خۆ هەتا دنیا دنیایە پاسەوانی ئێمە نابن. ئێمە پێویستە ئەم هەلە لەدەست نەدەین‌و بەخێرایی ناوماڵی خۆمان ڕێکخەین‌و بگەڕێینەوە سەر ڕێبازی پیرۆزی کوردایەتی‌و واز لەحیزبایەتی بهێنین‌و یەکێتی کورد بخەینە سەروو هەموو بەرژەوەندیەکی تایبەتی‌و خۆییەوەو کاری گونجاو بسپێرین بەکەسی گونجاوو لەماوەیەکی کەمدا سوپایەکی یەکگرتووی کوردستانی‌و ئەنجومەنێکی ئاسایشی نەتەوەیی‌و دەستورێك‌و کۆڕێکی زانستی‌و گەلێ هەنگاوی تر ئەنجام بدەین‌و دەرگای مافیایەتی‌و گیرفانبڕکردن دابخەین‌و ریزەکانی گەل‌و فەرمانگەکان پاك بکەینەوە لەخراپەکاران‌و ئاشتبوونەوەی گشتی بەدیبهێنین‌و هەڵبژاردنێك بەشێوەی دانیری نەك ڕێژەیی بکەین‌و ئەوانەی میللەت هەڵیان دەبژێرێ ئەوانە ببنە فەرمانڕەواو کاری وڵات بگرنەدەست‌و ئیتر حیزبایەتی‌و هۆزایەتی‌و بنەماڵەیەتی قەدەغەبکرێ تا ڕۆژگارێك کەئاستی ڕۆشنبیری کوردیش دەگاتە ئاستی ڕۆژئاوا، ئەوسا فرەحیزبیش لەسەرچاوان، لەم بارەیەوە فەیلەسوفی گەورەی ئەڵمان (تریتشکە) دەڵێ: "ئەو نەتەوەیەی هێشتا لەپێناوی سەربەخۆییدا خەبات دەکات، بۆ فرەحیزبی دەست نادات" ساڵی ١٨٥٩ ش لەبیدمونت لەژێردەستی کافوردا حیزبایەتی کۆتایی پێهات. گرنگوێرەی کوردیش بەنەهێشتنی حیزبایەتی دەگرێتەوەو هیوادارم لەباسێکی تردا لەم مەسەلەیە زیاتر بدوێم.

# ووردە ڕازێـــــــــــــك

# لە باری ڕۆژنامەنووسییەوە

**بۆ ڕۆژنامەی بەرێزی ڕێبازی ئازادی ژ ١٦٠ پێنج شەمە ١٩٩٩/٩/٢**

٥. گومان لەوەدا نییە کە ڕۆژنامەنووسی، خۆی لە خۆیدا پیشەو پەیامێکی مەزنو پیرۆزە، ڕاگەیەنەری دەنگی مرۆڤە بۆ مرۆڤ، دیاردەیەکی شارستانییە، ڕوخسارێکی دیموکراتیانەیە، دەستەڵاتی چوارەمە. بەڵام ئەم پیشەیەش وەك زۆر پیشەو دیاردەی تر، کاری خراپی تێکراوەو ئێستا ناتوانین بەو ڕەهاییەو بەو جۆرە پێناسەی بکەین.

٦. ئەمڕۆ ڕۆژنامەنووسی چەند شێوازێکی گرتۆتە خۆی:

٧. شێوازی زمانحاڵی حکومەتو حزبەکان کە ئەمانە تەرخانن بۆ خزمەتی لایەنەکانیانو تەنیا لە گۆشەنیگای بەرژەوەندی ئەو لایەنانەوە ئەڕواننە گێتیو ، عەرەب واتەنی (أنصر أخاك ظالما أو مظلوما) واتا پشتگیری براکەت بکە، زۆرداربێ یا زۆرلێکراو. ئەوانیش هەر پشتگیری دیدو بۆچوونو کارو کردەوەی لایەنەکانیان ئەکەن.

٨. شێوازی بەکرێگیراوی کە ئەمانە کێ شاباشی بداتێ بۆ ئەوان بلوێر ئەژەنن.

٩. شێوازی بازرگانی کە ئەم جۆرەیان وەك کارو کاسبیەك دەستیان داوەتە ڕۆژنامەنووسیو هەمیشە حسابی قازانجو زەرەر ئەکەن، بە دووی ئیعلان بڵاوکردنەوەو پروپاگەندەدا وێڵن، هیچ جۆرە ئایدۆلۆجیەك بە ڕەوتی کارەکانیانەوە دیار نیە.

١٠. شێوازی خزمەتگوزاری کۆمەڵو مرۆڤایەتی کە ئەمەیان خاوەنی پیشەو پەیامە پیرۆزەکەنو ئەکرێ پێیان بوترێ دەستەڵاتی چوارەم یا زمانحاڵی میللەت.

١١. لە مێژووی ڕۆژنامەنووسی کوردیدا زیاتر ئەم شێوازی دواییەیان ئەبینرێت، وەك کوردستانەکەی میقداد بەدرخان تا ئەگاتە هەوڵەکانی پیرەمێردو حوزنیو گیوو مووسا عەنتەرو بەڕێوبەرانی گۆڤارەکانی گەلاوێژو شەفەقو هیواو ڕووناکیو ڕۆژی کوردستانو گەلێ ڕۆژنامەو گۆڤاری تر کە ئەسەر بە هیچ لایەنێك بوونو نە لە دەرباری کەسدا بوون.

١٢. هەرچۆنێ بێت ئەرکی ڕۆژنامەنووس، وەك کار، ئەرکێکی سەختو گرانە لە دوو ڕووەوە. لە ڕووی بیرمەندیەوەو لە ڕووی بازوو ئامێزییەوە.

١٣. لە ڕووی بیرمەندییەوە، پێویستی بە ڕۆشنبیریو زانیارییەکی فراوان هەیە.

١٤. لە ڕووی بازو ئامێزیشەوە، پێویستی بەشەونخونیو ماندووبونێکی زۆرو کاتێکی فراوان هەیە.

١٥. وەك ئەنجامیش، ژیانی ڕۆژنامەنووس، لە ژیانی گەلێ کارمەندی تر زیاتر لە مەترسیدایە.

١٦. بە تاقیکردنەوەی ساڵانی ڕابردوو دەرکەوتووە، ڕۆژنامەنووس، وەك ڕێژە، لە هەموو کارمەندی تر زیاتر تووشی گرتنو ئەشکەنجەو کوشتنو ناکاوکوژی بووە.

١٧. لە ڕووی یاداشتیشەوە، لە باشترین باردا، یادلشتەکەی بە پەڕێزی ئەرکو ماندووبوونەکەیو مەترسی ژیانەکەیدا ناچێ، ئەوە جگە لەوەی ڕۆژنامەنووسانی شێوازی خزمەتگوزاری کۆمەڵو مرۆڤایەتی، سەرباری ماندووبوونو کوێرەوەرییو مەترسی ژیانیان، هەمیشە لە ماڵو موڵکو لە دەمی خۆیان گێڕلوەتەوە بۆ ئەوەی پەیامە پیرۆزەکەیانی پێ بگەیەننە ئەنجام.

١٨. لە یاسمە سالانی ١٩٥٧ و ١٩٥٨ کاتێ زۆربەی ئەرکی دەرکردنی گۆڤاری (هیوا)ی یانەی سەرکەوتن لە بەغدا کەوتبووە سەرشانی من لەگەڵ ڕێزم بۆ خوالێخۆشبوو مامۆستا (کەریم زلنستی) و مامۆستا (محمد نوری عارف) و مامۆستا (نەسرین فەخری) کە هەریەکەیان بۆ ماوەیەکی کاتیو دیاریکرلو یارمەتیان ئەدام، بێوچان بوومو یاداشتەکەشی نەی ئەژیانمو کاری ترم بەدەمەوە ئەکرد بۆ بژێوی. سالی ١٩٥٩ش لە بەغداد سەرپەرشتی دەرکردنی هەفتەنامەی پاشکۆی (ڕۆژنامەی خەبات) بە کوردی، بە من سپێردراو سەرەتا تەنیا خوالێخۆشبوو مامۆستا (حیلمی عەلی شەریف) یاریدەی ئەدام، لەو ماوەیەدا، بە ڕۆژ ئامادەکردنو شەوانیش تا درەنگ کاتو شەوانی کۆتایی هەفتەش لە چاپخانەدا ڕۆژم ئەکردەوە. ئینجا سەرباری ماندووبوونی خۆم، زۆریش بەزەییم بە خوالێخۆشبوو (جەواهیری) شاعیری گەورەی عەرەبدا ئەهاتەوە کە ئەویش شەو تا بەیانی لەو چاپخانەیەدا، کە هی خۆی بوو، ڕۆژی ئەکردەوە بە دیار ڕۆژنامەکەی خۆیەوە، ئەگەر چی ئێستا یەکێك لە یادەوەریە خۆشەکانم، ئەو شەوانەن کە ناوبەناو لەگەڵ جەواهیریدا باسوخواسی وێژەییو سیاسیمان پێکەوە ئەکرد، ئێستا زوو زوو یادی ئەو شەوانە ئەکەمەوە بە هۆی ئەوەوە کە پەیکەرەکەی جەواهیری نزیك ماڵی ئێمەیە لە سەرچنارو ڕۆژانە چەندجار بە لایا تێپەڕ دەکەمو جارجاریش ئەپرسم ئەڵێم تۆ بڵێی دوای مردنم کەللەسەرێکی تر نەبێتەوە بە ئاوەڵی کەللەسەرەکەی جەولهیری لە سەرچنار؟!

١٩. سالی ١٩٩١ یش وەك ئەندامێکی مەکتەبی سیاسیو لێپرسراوی ڕاگەیاندنی پاسۆك، سەرپەرشتی دەرکردنی ر ۆژنامەی (سەربەخۆیی) کەوتە ئەستۆی منو لە کاتی ڕەوەکەشدا لە بەرزاییەکانی بیارەو ماوەیەکیش لە قەلاچوالانو دوای گەڕانەوەشمان بۆ سلێمانیو تا کۆتایی سالی ١٩٩٢ ، بە تایپو بە ئامێری لەبەرگرتنەوە، بەردەوام بووم لەسەر ئەو کارە بە یارمەتیو هاوکاری ژمارەیەك لە هاوبیرانی وەك مامۆستایان ئازاد (ئازادە ڕیشە)و ئازاد عەلیو نزار محمدو کاندێشو سەلام عەبدولو دلێر. لە کۆتاییدا ئەڵێم ڕۆژنامە، ئەگەر چی کارێکی سەختو گرانە، بەلام لایەنی خۆشیشی تێدا هەیە. من بەش بە حالی خۆم لە دوای دەرچوونی هەر ژمارەیەك لەو گۆڤارو ڕۆژنامانە، هەستم بە وچانێکو جۆرە بەختیارییەك ئەکرد.

**ڕۆژنامەی ڕێزداری برایەتی ژ ٣٤٧٧ دووشەممە ٢٠٠١/٩/٣**

# شیعری کوردی ئەمڕۆ لە مەرگەساتێکی هەقیقی دایە

**دیمانە: بوکان جلال**

لە پەنجاکاندا، لە پاڵ شاعیرانی وەك عبدللا گۆران وەدموش و کامەران موکری و هەردی و دیلان، شاعیرێکی دیکەی لاو، بەڵام بە ئەزموون و لێهاتوو لە ڕیزی ئەو شاعیرانە سەری هەڵداو بەرهەمەکانی کەوتنە بەر دیدو دڵی هەوادارانی شیعرەوە، ئەویش مامۆستا (کامیل ژیر)ی شاعیرە، کە لەو چەند ڕۆژەی ڕابردوودا لە هەولێر ببوە میوانی فیستیڤاڵی مەحوی شاعیر، لە هوڵی ئوتێلی چوارچرا پێی شاد بووین و ئەم گفتوگۆیەشمان لەگەڵدا ڕەخساند:

❖ **وەچەی ئێوە چ ئیزافەیەکی خستوتە سەر کاروانی شیعری کوردیمان!**

- بە هۆی کاریگەرێتی شیعری تورکیو ئینگلیزیەوەو لە سەر دەستی مامۆستا (شێخ نوری شێخ ساڵح)ی شاعیرەوە، دواتریش گۆران و هاوەڵانی، کە منیش یەکێك بووم لەوانە، کودەتای فۆرمی شیعری نوێی کوردیمان چەسپاند، تا ئەمڕۆکەش ئەو ڕێبازە شیعرییە لە ڕووی تەکنیکی فۆرمەوە پەیڕەوی دەکرێ و بەردەوامە.

❖ **بەڵام زیاتر وا زانراوە کە مامۆستا (گۆران) سەرکردەی ئەو کودەتایە بوبێت!**

- نەخێر، زۆر بەدڵنیاییەوە دەڵێم سەرەتا (شێخ نوری شێخ ساڵح) فۆرمی نوێخوازی لە شیعری کوردیدا هێنایە ئاراوە.

❖ **سیمای ڕۆمانسیەت بەسەر زۆربەی بەرهەمە شیعرییەکانتا زاڵە!**

- سەرەتای دەست پێکردنم بە شیعر کەوتبوومە ژێر کاریگەری شیعرە ناسکەکانی (ئەحمەد هەردی) شاعیرەوە، لە پاڵ ئەو هێزە لاساییکەرەوەیە، عەشقی جوانی ئافرەت و سنااتیکای سروشتی کوردستان خەیاڵی شیعری منیان دەوڵەمەند کرد، کە نەدەکرا لە هیچ هەڵبەستێکمدا ئەو هەقیقەتە بشارمەوە، دیوانی (نازەنین) و (جوانی)یش شایەدی ئەو قوناغەی شیعری منن.

❖ **کەم و زۆرێك شێوازی شیعری کلاسیك لای نەتەوە دراوسێکانمان تا ئەمڕۆکەش بەکار دێت، بەڵام لای ئێمە خەریکە ون دەبێت!**

- فەلسەفەی ژیان هەر وایە. هەموو شتێك دەبێ لە گۆڕان و جوڵاندا بێت، سروشتی مرۆڤیش هەمیشە حەزی لە گۆڕانکاریو تازەکردنەوەیە، ئەگەر تاکەتاکەیەك شیعری کلاسیك لەناو عەرەب و فارسەکان تا ئەمڕۆ مابێت و پەیڕەوی بکەن، بەڵام لەناو ئەوانیشەوە خەریکە بەرەو کۆتایی دەچێت.

❖ **بە لەناو چوونی شیعری کلاسیك لە ئەدەبدا، زیان بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ناکەوێت!**

- سەبارەت بە شیعری کلاسیکی کوردیەوە دەڵێم (٤٠٠) ساڵ لەمەو بەر شیعری کوردی زۆر لە ئێستاکە بەرزترو بەچێژترو ماناداترو هونەریەتریش بوو، شیعری سەردەمی نالیو جزیریو مەحویو سالم و کوردی، لە ئاستێکی ئەوەندە بەرزدا بوون کە هەمیشە بە زیندوویەتی ماونەتەوە و وەچە سوودو چێژی لێ وەردەگرن، بەڵێ بەکزبوون و لەوتانی شیعری کلاسیکی ڕەسەن زەرەرمەند دەبن.

❖ نوێخوازی لە شیعری کوردیدا چۆن دەبینن؟

- شیعر کە زۆر بوو بۆر دەبێ، شیعری کوردی ئەمڕۆکە لە مەرگەساتێکی هەقیقی دایە، چونکە شیعری نوێ لایەنە سەلبیەکانی زۆر زیاترن لە ئیجابیەکانی، لەسەرەوەی هەمووشیانەوە هونەرییەتی لە شیعری ئەمڕۆدا نابیندرێت. بۆیە من نوێکارییەکی ئەوتۆ نابینم.

❖ هەست دەکرێ لەجیاتی ڕەخنەنووسان، شاعیرو نووسەرەکان خۆیان بەو ئەرکە هەڵدەستن؟

- دەبوایە کوردیش خەڵکێکی پسپۆڕو زانای لە بواری ڕەخنەسازیدا هەبوایە، ئێمە یەك ڕەخنەگری ڕاستگۆمان هەبوو ئەویش بەهەشتی (د.کامیل بەسیر) بوو کە ڕەخنەسازێکی بێ لایەن بوو، بەڵام بەداخەوە زوو جێی هێشتین. لەبەر ئەوەی سروشت دژی بۆشاییە، بۆیە دەبینین بە ناچاری شاعیران و نووسەران خۆیان ئەو بۆشاییە پڕ دەکەنەوە.

❖ کامیل زیر دوور لە ئەدەب؟

- شانۆکار بووم، لە چەند شانۆگەرییەکدا بەشداریم کردووەو چەند شانۆگەرییەکیشم نووسیوە.

❖ سیاسەت؟

- بێ لایەن دانیشتووم، لەگەڵ ئەوەی لە سیاسەت دوور نەکەوتومەتەوە.

❖ وێرای ئەدەب ئارەزووت لەچیە؟

- وەرزش.

❖ ئەو چەشنە کتێبەی حەز لە خوێندنەوەیان دەکەیت؟

- زیاتر مێژوو.

❖ جگە لە نووسینی ئەدەبی؟

- وەك پارێزەرێك، چەندین کتێب و لێکۆڵینەوەی یاسایم نووسیوە.

❖ باشترین شاعیری نوێی ئەمڕۆی کوردستان؟

- فەرەیدون عەبدول بەرزنجی.

❖ ڕۆژنامەوانی؟

- لەگەڵ ئەوەی ڕۆژنامەنووس بووم و سەرپەرشتی چەند گۆڤارو ڕۆژنامەیەکیشم کردووە، لەبەر سەرقاڵی ناپەرژێمە سەر کاری ڕۆژنامەنووسی ئەگینا زۆری حەز لێ دەکەم.

❖ هەولێر؟

- ئێستا چ لە ڕووی هەستی نەتەوایەتییەوە چ لە ڕووی بواری بنیادنان و ئاوەدانکردنەوەدا زۆر بەرەوپێش هەنگاوی ناوە.

❖ ئەو قسەیەی دەمێکە دەتەوێت لەسەر ڕووی لاپەڕەیەکی ڕۆژنامەدا بیڵێیت؟

با ژمارەی گۆڤارو ڕۆژنامەکان کەم بکرێنەوە، زۆربەی ئاژاوە ڕۆشنبیرییەکانی کوردستان و قەیرانی نەمانی خوێنەرو لاوازیی بەرهەمە ئەدەبیو ڕۆژنامەوانییەکان، لە دەرئەنجامی زۆریی گۆڤارو ڕۆژنامەکانەوە سەریان هەڵداوە.

## " ئەبێ چارەنووسی کەرکوک، خەڵکی کەرکوک خۆی دیاریی بکات"

## لەساڵیادی شەهیدی بیروبزاڤی کوردایەتی جەمیل ڕۆژبەیانی دا

دەسەلاتێکی سیاسی، کە پەنا ئەباتە بەر ناکاوکوشتن (إغتیال) ی کەسێك، ئەوە بەڵگەی ئەوەیە، ئەو کەسە، مەترسییەکی زۆری هەیە بۆ ئەو دەستەلاتە. ئەوەش، بەزۆری، دوای چەندین گوشار دێت بۆ سەرنەویکردنی ئەو کەسە. وەك ترساندنی، زیندانیکردنی، نانبڕینی یا هەر جۆرە گوشارێکی تر. کە ئەوانە سوودیان نەبوو، ئنجا ناکاوکوشتنەکە ئەنجام ئەدرێ.

بەو پێوانەیە، ڕۆژبەیانی، کەسێتییەکی گەلێ گەورەو زۆر ترسناك بووە بۆ سەر ڕژێمی بەعس، بۆیە بەو جۆرە ناکاوکوژی کرد. گەورەیەتی و ترسناکیەکەش، لە خودی تاکەکەسی ڕۆژبەیانی خۆیدا بوو. ئەو نە بەرپرسێکی حیزبی، نە سەرەك هۆزێ، نە فەرماندەی هێزێکی چەکدار بوو. لەراستیشدا، ڕژێمە یەك لەدوای‌یەکەکانی عیراق، هەموو هۆکارەکانی ترساندن و زیندانیکردن و نانبڕینیان لەگەڵ ڕۆژبەیانیدا بەکارهێنا. بەلام ئەوانە هەموو، بەناستەمێکیش، لە گەورەیەتی و کەسێتی و جەولمێری و کوردایەتییەکەی ڕۆژبەیانیان کەمنەکردەوە.

من وەك یەکێك لەنزیکترین ئاوەڵ و هاوبیری ڕۆژبەیانی، ئاگام لەو ڕاستییانە هەبوو، بەدەنگیەوە ئەچووم. کاتێ سەرنووسەری گۆڤاری هیوا بووم ١٩٥٧و ١٩٥٨، وتارە توندرەوەکانی ڕۆژبەیانیم بلاوئەکردەوە. ساڵی ١٩٥٩ ڕۆژبەیانی، لەسەر وتارێك کە دژی حکومەت نووسیبووی، درا بە دادگاو حکوم درا بە ساڵێك زیندانی یا (٢٠٠) دووسەد دینار تاوانە (غرامە). ئەو برە پارەیە ئەوسا زۆر بوو. نە من هەمبوو نە ئەو. لەبەر ئەوە ویستم پەنا بۆ کۆکردنەوەی بەرم، بەلام هەموو پارەکە، پیاوچاك و نیشتمانپەروەری کورد عەلی کمال دای.

یادگارەکانی من لەگەڵ ڕۆژبەیانیدا زۆرن. چونکە ساڵانێك، ڕۆژانە لە بارەگای بەشیر موشیر لە بەغداد یەکتریمان ئەدی و بیروڕامان ئالوگۆر ئەکرد و گەیشتبوومە ئەو ئەنجامەی کە ڕۆژبەیانی خۆی بۆ کوردایەتی: قەلایەکی لە ڕووخان نە هاتووە. بیروباوەرەکەی: هەمیشە بە برشتە بۆ ڕازەی نەتەوەکەی. پێنووسەکەشی: ڕمێکی کوشندەیە بۆ سەر دڵی داگیرکەرانی کوردستان.ئەو سامانە بیرمەندییە زۆرەشی بۆی بەجێهێشتووین، بەڵگەی ئەو ڕاستیانەیە. لەبەر ئەوە، بەرێزەکان:

کەپرسیان ڕۆژبەیانی
بەچ کێش و پێوانەیەك
زۆر گەورە بوو، گەلێ مەزن؟
بڵێن بەوەی بەرەی دوژمن
بەرادەیەك لێی ئەترسان
لەترسانا، ناردیان کوشتیان.

خۆشەویستان: ڕۆژبەیانی یەکێك بوو لە ڕۆڵە بەئەمەکەکانی کەرکوك. ئەو کەرکوکەی ئێستا بەرەو چارەنووسێکی نادیار بۆتەوە بە هۆی ئەوەوە کە ژمارەیەك سیاسەتکاری کورد، دوای کوردستانیبوونی کەرکوك لە لایەن و کەسانێك ئەکەن کە نە خاوەنی کەرکوکن نە دەسەلاتدارن بەسەر کەرکوکدا!!.

خاوەنی کەرکوك و پاشخان (مرجعية) بۆدیاریکردنی چارەنووسی کەرکوك، خەڵکی کەرکرك خۆیەتی، نەك یاسا لاوازو کاڵوکرچەکەی ئیدارەی دەوڵەتی عیراقی کە خەڵکی کەرکوك دەستێکیان نەبوە لە دانانیدا. دەستەلاتداریش بەسەر کەرکوکدا، ئەمڕۆ هاوپەیمانان و ئەنجومەنی هەڵبژێردراوی کەرکوك خۆیەتی، نەك شیعەو سونەی عەرەب. ئەگەر بیانوو ئەوەبێ، فلان لیست و فلان لیست بە زۆری ئەوەندە دەنگ لە عیراقدا هەڵبژێردراون، ئەوا ئەوانە لە ناوچەکانی خۆیاندا زوریە، یا ئەو ژمارانەی دەنگیان هێناوە، نەك لە کەکوکدا!. لەبەر ئەوە، ئەبێ چارەنووسی کەرکوك، خەڵکی کەرکوك خۆی دیاری بکا. کەرکوك منداڵێکی ناکام (قاصر) نیە تا ئەم و ئەو ببن بەسەرکار (وصی) بەسەریەوە. کەرکوك یەکێکە لە شارە دێرینەکانی جیهان وئێستا شیاوترین شارە کە ببێتە پایتەختی کوردستان، کە بەوە ماف ئەگەڕێتەوە بۆ خاوەن ماف و گیانی ئەمری ڕۆژبەیانیش شاد و ئارام ئەبێ.

**کەرکوك**

**٢٠٠٥/٢/٢٧**

وشەی کۆتایی

# کوردایەتی بیرو بزاڤە

مەبەست لەو سەرناوە، کە ناونیشانی ئەم بەرهەمەشمانەن ئەوەیە: کوردایەتی دوو لایەنی هەیە کە پێویست بەیەکو تەواوکەری یەکنو بێ یەک، نامەی پیرۆزی کوردایەتی، وەك پێویست، مەبەستەکە ناپێکیو ناگاتە ئەنجام، ئەویش لایەنی بیرو لایەنی بزاڤە.

## یەکەم: لایەنی بیر

لێرەدا وشەی بیر، وەك کورتکراوەی (بیروباوەڕ) بەکاردێنم کە بەواتای (عقیدە)ی عەرەبیو (Creed یا Faith)ی ئینگلیزی دێت، بۆ ئەم لایەنە، بیریارانی کورد، لەهەستیارانو چیرۆكو ڕۆماننوسانو جوگرافیو مێژووکارانو زمانەوانانو نوسەرانەوە تا ئەگاتە هونەرمەندان، زۆریان وتووەو زۆریان کردووە، هەوڵەکانی ئەوانە هەمووی کە بەمەبەستی ڕازەی نەتەوەی کورد بووە یا ئەبێ، لەهەر کام لەو بوارانەدا، ئەچنە خانەی کوردایەتیەوە. بەڵام ئەوانە هیچیان کوردایەتییەکە ناگەیەننە ئاستی بیر. وەڕ (عقیدة). ئەوەی بۆ یەکەمجار گەیاندی، قوتابخانەی بیری نەتەوەیی کورد (کاژیك) بوو کە لەنامە ەی کاژیکنامەدا بەدیارکەوت. دیارە ڕاستیی ئەم بۆچوونە، لەخوێندنەوەو هەڵسەنگاندنی ئەو نامیاك ەدا دەرئەکەوێ. بەتایبەتی دروشمە سەرەکیەکەی (کوردستان بۆکورد، یەکسانی بۆ گەل) واتا کوردستان تەنیا موڵکی نەتەوەی کوردە. لەمەوە هەموو داگیرکارییەکی کوردستان، تاڵانکردنی هەموو سامانێکی سەر زەویو ژێر زەویی کوردستان، پێکەوەژیان لەگەڵیاندا بەهەر شاوێکی وەك برایەتیو ئۆتۆنۆمیو فیدراڵیو.. هتد نادروستو نارەوان، ئینجا ئەو کوردستانەش ئەبێ کوردستانێکی یەکسانبێ بۆ گەلی کوردستان، مەبەست لەگەلی کوردستانیش، نەتەوەی کوردو هەموو ئەو کەمینە نەتەوەییانەن کە بەشێوەیەکی سروشتیو ڕەوا لەکوردستاندا ئەژین، ئەو یەکسانییەش، یەکسانییە لەبەردەم یاسادا، لەبەردەم هەموو مافێکی مرۆڤدا، لەبەردەم چەمکی ئازادیدا، بەواتا لەکوردستانێکی سەربەخۆدا، هاوڵاتی پلە یەكو پلە دوو نیە، هەر لەو کوردستانەدا، لەڕووی ئابورییەوە، جۆرێکی گونجاو لەدادی کۆمەڵایەتی ئەبێت، بەکورتی هەموو هاوڵاتییەکی کوردستان، چونیەك ئەبن لەئەركو لەمافدا. لەناوەڕۆکی ئەم پەرتووکەدا، زیاتر لەبارەی کاژیکەوە دواوین*. لێرەدا ئەوەی پێویستە، وەك پێناسەیەك، بیڵێین، ئەوەیە: بیری کوردایەتی، باوەڕکردنە بەبوونی نەتەوەی کورد لە کوردستاندا، وەك یەکەیەکی لەیەکنەپچڕاو. ئەو دابڕانو پارچەپارچەکردنەش، سرووشتینەبنو بەویستی کورد نەبووە، بۆیە ئەبێ ئەو نەتەوەیە لەکوردستانێکی سەرتاسەریداو لەسایەی یەك دەوڵەتدا،

---

* مەبەستی سەرەکی لەو بابەتانەی لەم پەرتوکەدا لەسەر کاژێك پاسۆك هاتوون، سوود وەرگرتنە لەو دوو تاقیکردنەوە نەتەوەییانەیە بۆ ڕێنمایی لەداهاتوودا.

یەکبگرێتەوەو گەشەبسەنێ و ببێتە خاوەنی پایەی شیاو بەنەتەوەیەکی زیندووی هاوچەرخ لەکۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا بۆ رازەی خەڵکی کوردستان و سەرجەم مرۆڤایەتی.

### دووەم: لایەنی بزاڤ

هەموو هەوڵەکانی کۆمەڵانی کوردو تاکەکانی، وەك: دروستکردنی میرنشینەکان، بەرپاکردنی شۆڕشەکان، دامەزراندنی پارتو رێکخراوە سیاسییەکان بۆ رازەی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، پاراستنی سامان و ژینگەی کوردستان و.. هتد ئەچنە خانەی کوردایەتییەوە لەمەودا فراوانەکەیدا.

لێرەوە ئەگەڕێمەوە سەر مەبەستی ناونیشانەکە (کوردایەتی بیرو بزاڤ)و ئەڵێم:

تا ئێستا ئەو دوو لایەنەی کوردایەتی، بیرو بزاڤ، وەك پێویست تێکەڵو ناوێتەی یەك نەبوون، کاژێك، یا راستتر قوتابخانەی بیری نەتەوەیی کاژێك، لایەنی یەکەمی کوردایەتییەکەی گەیاندە ئاستی بیروباوەڕ، بەڵام نەیتوانی ئەو بیروباوەڕە بەتەواوی تێکەڵ بەبزاڤێکی تونددوتۆڵو سەرتاسەری بۆ هەموو کوردستان بکات بەبەردەوامی.

هەڵبەت خوێنەرەوەی بەڕێز، لەبەشەکانی ئەم پەرتوکەدا، سەرنجی ئەو خاڵانەی داوە کە هێنام بۆ کردوون بۆ هۆی بەئەنجام نەگەیشتنی کاژێك کە سەرەکیترینیان نزمیی ئاستی هوشیاری نەتەوەیی بوو، واتا کاژێك وەك رێکخستن پێش رۆژگارەکەی کەوت، ئەگەرچی وەك بیر لەکاتو جێی خۆیدا بوو. ئەبوایە سەرەتا کاژێك هەر وەك قوتابخانەیەکی بیرمەندیانە خۆی بەدیار بخستایەو بەلای رێکخستندا نەچوایە تا زەمینە تیۆرییەکەی بۆ رێکخستنەکە ئامادە ئەکرد. هەر کاتێکیش ئەوە ئامادە ببوایە، یا ببێ، ئەوا پێویستە رێکخستنەکە لەڕووی کردەیشەوە، سەرتاسەری بێ بۆ هەموو کوردستان.

هەرچۆنێ بێ، ئەوە رۆژگارێکی جیاواز بوو لەئێستا، ئێستا ئەو بیرۆکانەی کاژێك کە ئەوسا بەکۆنەپەرستی و نامۆو خەیاڵ ناوئەبران لەلایەن نەیارەکانیەوەو لەلایەن بەشێکی زۆر لەخەڵکی ساویلکەشەوە، ئێستا ویردی سەرزمانی زۆربەی جەماوەری کوردو زۆربەی ئەندامانی بنکەکانی ئەو لایەنانەشە.

لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا زەمینەکە بۆ هاتنەوەکایەی کاژێك یا پارتێکی هاوشێوەی کاژێك نەڕەخساوە، بۆیە هیچ کام لەو پارتانەی ئەمڕۆ بەناوی نەتەوایەتییەوە، بەتەنیا لەبەشێکی کوردستاندا کار ئەکەن، فراوانبوونێکی ئەوتۆیان بەدەست نەهێناوە کە شان لەشانی پارتییەکی وەك (پ.د.ك) یا (ی.ن.ك) بدەن، بێجگە لە PKK کە ئەویش بەهۆی روخانی سەرکردەکەیەوە، تووشی نوشوستی بووە، بۆیە ئەرکی ئەمڕۆی هاوبیرانی نەتەوەیی کورد لەم خاڵانەدا کۆئەبێتەوە:

١- هەموو گروپە نەتەوەییەکان، لەهەر بەشێکی کوردستان یا دەرەوەی کوردستان، لەیەك رێکخراوی بەرەیی، یا کۆنگرەییدا کۆببنەوە بەهەر ناوێکەوە بێ کە بێگومان ئەبێ ناوەندەکەی لەکوردستاندا بێ.

٢- ئەو رێکخستنە، نابێ شێوەی پارتایەتی بگرێتە خۆی، چونکە لەلایەك پارتایەتی، بەهۆی کردەوەو رەفتارە شەرئامێزەکانی هەندێك لەپارتییە کوردییەکانەوە، چارەگران بووەو لەبەرچاوی خەڵکی کەوتووە، لەلایەکی تریشەوە، زیادکردنی پارتییەکی کە، پچڕانی پارچەیەکی تری جەستەی

نەتەوەیە، لای سێیەمیش ئەوەیە، پارتایەتی بەهەموو جۆرەکانیەوە، هەر بەرژەوەندیی تەسکی تایبەتی خۆیان لامەبەستترە وەك لەنەتەوە، مەگەر دەگمەن. ئینجا ئەو ڕێکخستنە ئەبێ چۆن بێ کە جیاوازبێ لەشێوەی پارتایەتی!؟ ئەوە هەوێرێکی ئاوکێشەو لێرەدا ئەو ماوەیەمان نیە، بەلام ئەکرێ هێمایەك بۆ هەندێك لەبنەماکانی بکەین، وەك:

أ- سەرکردایەتییەکی بەکۆمەڵی هەبێ نەك سەرۆك یا سکرتێری گشتی.

ب- ئەندامەکانی ئەو سەرکردایەتییە دوای ماوەیەکی دیاریکراو وەك سێ تا پێنج ساڵ بگۆڕدرێن و ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاریان لێ پێکبهێنرێ.

ج- مەرج نیە گروپەکان تەولوی قەوارەی خۆیان لەدەس بدەن، هەرچەندە توانەوەیان لەیەکتردا باشترە.

د- ڕێکخستنەکە گروپەکان و تاکەکانی کۆمەڵیش بگرێتە خۆی. هەروەها ڕێکخراوە پیشەییەکان و سەندیکاکان و هەر تاکو کۆمەڵێکی تر کە باوەڕ بە پرۆگرامو پەیڕەوەکەی بهێنێن، واتا هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی زیاترین بەشی جەماوەر.

هـ- ڕێکخراوەکە سیستمی شانە بەکارنەهێنێ.

و- ئەوەندەی گرنگی بەلایەنی باوەڕو ڕێکخستن ئەدات، ئەوەندەش گرنگی بەلایەنی سەربازی بداتو ئەبێ هەر لەسەرەتاوە ڕەنگی سوپایەکی ڕزگاری کوردستان بڕێژێ.

ز- ڕێکخستنەکە سەرتاسەری بێ بۆ هەموو کوردستان، بەلام بۆ هەر بەشێك سەرکردایەتیەکی هەرێمی هەبێت و..هتد.

جگە لەوانە، ڕێکخستنێکی لەو جۆرە، ئەبێ زیاتر پشت بەنەوەی نوێ ببەستێت، بێریارە نەتەوەییەکانیش، ئیتر وازبێنن لەئامۆژگاری بێ هوودە بۆ ئەو پارتی و دامودەزگایانەی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان لەنەتەوە لامەبەستترە. ئەوانە لەوسەری هاتوونەتەوەو گاڵتە بەو ئامۆژگاریانە ئەکەن، با ئێمە خۆمان بەکردەوە، بیرو بڕاڵەکە ئاوێتەی یەککەین، دنیاش ئەوەی ماوێتی زیاترە لەوەی ڕۆییوە.

حکومەتی هەرێمی کوردستان
Kurdistan Regional Government

MINISTRY OF CULTURE | وەزارەتی ڕۆشنبیری

# ڕێزنامە

بەڕێز/ ...کامل ژیر.........................

لەگەڵ چوونە نێو ساڵێکی نوێ و بەردەوامبوون لەسەر جێبەجێکردنی بڕیاری سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران ژمارە( ٨٦)ی تایبەت بەپێزانینی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەنووسەران و هونەرمەندان، خزمەتی بەرچاوی بەڕێزتان لەبواری برەودان بەڕۆشنبیری کوردی بەرز دەنرخێنین و هیوای سەرکەوتن و بەردەوامیتان بۆ دەخوازین.

فەلەکەدین کاکەیی
وەزیری ڕۆشنبیری
سەرۆکی لیژنەی ڕێزلێنان لە نووسەران و هونەرمەندانی کوردستان

---

بۆ کاک کامل ژیر

[illegible]

[illegible]

[illegible]

[illegible]

ئێمە بە شانازییەوە ...

(بۆکان)

[illegible]

١٩٩٦.٩.٠٨

جامعة بغداد

بناءً على ما عرضه مجلس كلية الحقوق وأقره مجلس جامعة بغداد منح

كاظم نظام الدين

إجازة الدراسات العالية بكالوريوس في الحقوق بدرجة جيد

بتاريخ ٢٢ حزيران ١٩٦٦ وبهذا يمنح له حق التمتع بكل ما يخوله إياه هذه الإجازة من

حقوق وامتيازات

# بارودۆخی کوردستان لە لیدس LEEDS

**ئامادەکردنی: أ.ژ**

بە بۆنەی سەردانییەوە بۆ بەریتانیا، نوسەر و سیاسەتکاری کورد پارێزەر کامیل ژیر لەسەر داخوازی کۆنگرەی نیشتمانی کوردستان و کۆمەڵگەی کوردی لە بەریتانیا، ئێوارەی ٢٠٠٥/٩/٢٥ کۆڕێکی بۆ کوردانی شاری Leeds و دەوروبەری بەست.

:

لە کۆڕەکەدا کە سەرۆکی کۆنگرە د. جەواد مەلا و ژمارەیەکیش لە کوردانی دانیشتووی هەرێمی Yorkshire ئامادەی بوون، مامۆستا کامیل ژیر، بارودۆخی ئێستای کوردستانی لە هەردوو رووی ئەرێنی و نەرێنییەوە بۆ ئامادەبوان وێناکرد کە رووەگەشەکانی لەهەندێ خاڵدا پیشاندا وەك: ناوچەی ئارام، بوونی قەوارە سیاسیەکەی باشوور، سیستمی تازەی جیهان، جەنگی دژ بەتیرۆر، پەرەسەندی هوشیاری نەتەوەیی، هێڵە ئاسمانییەکانی کوردستان، نوێنەرایەتی کورد لە UN و هەندێك رۆشنایی لە ئاسۆی سەربەخۆییەوە. رووە تاریکەکانیشی لە رووکردنەوە بەغداد و گەندەڵیەکاندا چڕکردەوە.

لەبارەی پرۆژەی رەشنووسی دەستوورەکەی عیراقەوە وتی: ئەگەرچی فیدراڵی چارەسەرنیە بۆ کێشەی نەتەوەیەکی داگیرکراو بەشبەشکراوی وەك کورد، ئەو دەستورە، فیدراڵیش دەستەبەر ناکات. چونکە گەورەترین کۆڵەکەی سیستمی فیدراڵی، بوونی دوو ئەنجومەنە یاساکارەکەیە، ئەنجومەنی نیشتمانی (پەرلەمان) و ئەنجومەنی هەرێمەکان. ئەو دەستوورە ئەنجومەنی دووەمی نەگرتۆتە خۆی، بەڵکو بەجێی هێشتووە بۆ یاسایەك کە لە ئایندەدا پەرلەمان دەریکات و تایبەتیش بێ بۆ کاروباری هەرێمەکان! کەلەراستیدا ئەنجومەنی هەرێمەکان زۆر گرنگتر و باڵادەسترە لە پەرلەمان و ئەو ئەنجومەنە بۆ هەموو کاروباری دەوڵەتیشە نەك تەنیا بۆ هەرێمەکان. ئاوا بەپێی ئەو دەستوورە چارەنووس و بەرژەوەندییەکانی کورد، دەکەوێتە دەست بڕیاری زۆرینەی پەرلەمان کە ئەو زۆرینەیە هەمیشە لایەنە عەرەبییەکەیە. بەوەش فیدراڵی بوونی نابێ و ناوێکی بێناوەرۆك دەبێ. ئەوە سەرباری ئەوەی هەموو ئەوخاڵانەی لەو دەستوورەدا دواخراون بۆ ئایندەو بۆ راپرسی و بۆ یاسای تایبەت، نایەنەدی و بۆ تەفرەدانە. ئنجا بۆ چارەسەر، هێمای بۆ لایەنێکی گرنگ کرد کە ئەویش لایەنی (هێز)ە و وتی لەسەرەتای مێژووەوە تائێستاو تا هەتاش، هێز پارێزەری مافەکان بووە بە ماڵ نەتەوایەتیشەوە. کورد ئەگەر لە رابوردوودا هەلی هێزێکی چەکداری کاریگەری بۆ نەڕەخسابێ بۆ بەرگری لەخۆی، ئێستا بەهۆی داهاتی زۆری قەوارەکەی باشوورەوە، ئەو هەلەی بۆ رەخساوە.

دوای ئەوە، وتووێژێکی چڕوپڕ لەسەر بابەتی کۆڕەکە کراو وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە و کۆڕەکە ١٠,٣٠ شەو کۆتایی هات. شایانی وتنە، مامۆستای ناوبراو ٢٠٠٥/٧/٢٧ هاتە بەریتانیاو ٢٠٠٥/١٠/٦ گەڕایەوە بۆ کوردستان. لەو ماوەیەشدا، بەشداری پێنجەمین کۆنفرانسی کۆنگرەی نیشتمانی کوردستانی کرد کە ٢٠٠٥/٧/٣٠ لە لەندەن بەسترا. ژمارەیەك دیمانەی لەگەڵ هەندێ سایتی ئەنتەرنێتو ڕۆژنامەی کوردی کرد. چەندین وتارو بابەتی سیاسیشی وەبەرهەم هێناو لە میدیا کوردییەکانەوە بڵاوی کردنەوە. کە لە مەودایەکی فراواندا لە ناوەندە ڕۆشنبیرییەکاندا دەنگیان دایەوە. وەك: دۆزی کوردو چاوەڕوانییەکەی گوڵبەهار، کوردستانی دزراو، گەندەڵی، کۆنگرەی دەسەڵاتەکان، ئەفسەریەریوەبەر و بەڕێوەبەرتێکۆشەر.

# لێدوانێکی بابەتیانە لەسەر دەستوورەکەی عیراق لەدیدی یاسایی و دیدی نەتەوەییەوە

لەبارەی ئەو دەستورەوە کە بۆ راپرسییەکە و بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی ئامادەکراوە:

مادەی (١) هەرچەندە هەردوو وشەی فیدرالی و ئیتحادی لە ئەژادا یەك واتایان هەبوە, بەلام بەرەبەرە, هەریەك بوتە زاراوەیەکی واتاجیاواز بەسەر یەکەوە. فیدرالی بەزۆری بۆ جۆرە سیستمی دەوڵەتێك بەکاردێت. بەلام ئیتحادی بۆ مەبەستێکی تر. وەك ئیتحادی ئەورووپی, ئیتحادی لاوان, ئیتحادی وەتەنی, کەئەوانە بەواتای فیدرالی نایەن. لەمادەی یەکەمی دەستوورەکەدا, گۆڕینی زاراوەی یەکەم بە دوەم, ئەوەسەرەتای پاشەکشەکردنە لە فیدرالی. ئەوە جگە لەوەی ناوی دەوڵەتەکەش بە کۆماری عیراق هاتووە نەك کۆماری عیراقی فیدرالی.

مادەی (٢) عیراقی کردوتە بەشێك لە جیهانی ئیسلامیوگەلی عەرەبیشی بەبەشێك لە نەتەوەی عەرەب ناوبردوەوناوی کوردستانوکوردی تێدانەهاتوە. ئەوەش سووك سەیرکردنی کوردستانوکوردە. ئەومادەیە ئەبوایە هەر نەبوایە, کەبو, ئەبوایە ئینتیمای کوردستانو کوردیشی دیاری بکردایە.

مادەی (٤-رابعاً) زمانی تورکمانیو سریانی بەدوزمانی رەسمی دلناوە لەو یەکە ئیداریانەدا کەبوونێکی چڕیان هەیە تیایدا. لەو دەستورەشدا کە پێشکەش بە کۆمەڵەی نیشتمانی ئەکرێ ئەڵێ لەوناوچانەدا کەبوونیان هەیە! ئەمە سەرباری ئەوەی پیلانێکە بۆ دابڕینی هەندێك ناوچە لەکوردستان, لەڕوی یاساییشەوە گونجاونیە. چونکە:

١- ئەوبڕگەیە دژو ناکۆکە لەگەڵ بڕگەی یەکەمی هەمان مادەدا کە ئەڵێ: زمانی عەرەبیو زمانی کوردی زمانی رەسمی عیراقن. کەچی لەوبڕگەی چوارەدا, دووزمانی تریشی کردوە بە زمانی رەسمی بۆ هەندێ ناوچە!.

٢- رستەی دانیشتوانێکی چڕ (كثافة سكانية) واتایەکی روون نادات. کوردیش لە بەغدلو لەهەندێ شارێتر, بوونو بوونی چڕی هەیە. ئینجا لەو یەکە ئیداریانەدا, جگە لە تورکمانو سریان, ژمارەیەکی زۆر کوردو عەرەبیش هەیە!

٣- لە رووی کردەییەوە, ئەوە ناگونجێ. چونکە زمانی رەسمی لەهەرێمکدا یا لە پارێزگایەکدا, ئەبێ هەمووی هەر یەك زمانبێ. چونکە ئەوە زمانی فەرمانگەکانە. چۆن ئەکرێت هەر ناوچە, یا گوندێك, زمانێکی جیاوازی رەسمی هەبێ!؟

٤- ئەم قسانەی ئێمە, لاریبوون نیە لەماف تورکمان‌و سریان. ماف ئەوان لە هەمان ئەو برگەی یەکەمەدا دیاری کراوە کە ئەڵێ: (ماف عیراقییەکان دابین کراوە لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان بە زمانی دایك وەك تورکمان‌و سریان‌و ئەرمەن لەدەزگا فێرکارییە حکومەتی‌و تایبەتییەکانیشدا. ئەوە سەرباری مادەی (١٢٢).

مادەی (٩-ب) ئەڵێ: (میلیشیای سەربازی لەدەرەوەی چێوەی هێزی چەکداردا رێگەنادرێ) دەستوورەکەش بەگشتی لەئاستی هێزی پێشمەرگەدا بێدەنگە کەوەك هێزێکی چەکداری تایبەت بمێنێتەوە بۆ کوردستان. کەواتە بەپێی ئەم برگەیە, پێشمەرگە رەولیەتی نامێنێ. یا ئەبێ هەڵوەشێتەوە, یا ئەبێ ببێتە بەشێك لە هێزی چەکداری عیراقی‌و بەفەرمانی ئەوان بجووڵێتەوە, کە لەهەردوو بارەکەدا پێشمەرگە بوونی نامێنێ.

مادەی (٤٧) ئەڵێ: (دەسەلاتی یاسادانان لە ئەنجومەنی نائیبەکان و ئەنجومەنی ئیتحاد پێکدێ) ئینجا بۆ ئەنجومەی نائیبەکان, بەدرێژی چۆنیەتی‌و دەسەلاتەکانی دیاری کردوە. کەچی بۆ ئەنجومەنی دوەم, لەمادەی (٦٢)دا دروستبوون و مەرجەکانی دولخستوە بۆ ئاینده کە بەیاسایەك ئەنجام بدرێ! کەلەراستیدا ئەم ئەنجومەنە لەئەنجومەنی نائیبەکان کەمتر نیە. بەڵکو لە هەندێ باردا لەویش گرنگترە. بەگشتی ئەو دوو ئەنجومەنە تەواوکەری یەکترن. ئەبوایە ئەمیش هەر لە دەستورەکەدا دیاری بکرایەو رای گەلی لەسەربوایە چونکە ئەوە بابەتێکی دەستوورییە نەك یاسایی. لەراستیدا ئەوە پەراوێزکردنی ئەم ئەنجومەنەیە کەتاکە گەرەنتییەکە بۆ مافەکانی هەرێمەکان‌و بەبێ ئەم ئەنجومەنەو دەسەلاتە دەستوورییەکانی, فیدراڵی بوونی نابێ. ئەم راستییەش لەبرگەکانی (أ, ب, ج- خامساً-مادەی ١٢٥) دەرئەکوێ کەتیایدا دەسەلاتەکانی ئەم ئەنجومەنەی داوە بەئەنجومەنی سەرۆکایەتی! بەوەش دەسەلاتی یاسادانان‌و دەسەلاتی جیبەجێکردن تێکەلاو کرلوە کەئەوە دژو پێچەوانەیە لەگەڵ بنەمای جیاکردنەوەی سێ دەسەلاتەکەی یاسادانان‌و جێبەجێکردن‌و دادوەری. لەو دەستوورەشدا کەپێشکەش ئەنجومەنی نیشتمانی کراوە, دەسەلاتەکانی ئەنجومەنی ئیتحادی تەواو بچوك کردوتەوەو ئەڵێ تەنیا سەیری ئەو پرۆژە یاساییانە ئەکات کە پەیوەستن بە هەرێم‌و پارێزگاکانەوە!

مادەی (١٠٧) ئەڵێ: (دەسەلاتەکانی ئیتحاد پارێزگاری لە یەکێتی عیراق ئەکات) بەوەش ئەم مادەیە, دەرگا بەرووی ماف چارەی‌خۆنوسین‌و بوختانی یەکێتی ئارەزوومەندا دائەخات!.

مادەی (١١٠) داهاتەکانی نەوت‌و غاز گولیە بە ئینسافەوە, بەپێی رێژەی دانیشتوان لەهەموو ولاتدا دابەش ئەکات! ئەوەش وەك لەگەڵ بنەمای فیدراڵیدا ناگونجێ, تالانکردنێکی نائینسافانەی سامانی کوردستانە.

لە ولاتانی فیدراڵدا, سامانی هەر هەرێمێك بۆ خۆیەتی جگە لە رێژەیەکی کە ئەدرێ بەناوەند یا بە هەرێمەکانی تر. هەر بۆیە ئەوترێ فلان هەرێم لە هەرێمەکانی‌کە دەوڵەمەندتر یا هەژارترە. بۆ

کوردستان، هیچ نەبێ، بادادهاتی نەوتو غازەکەش ٢/٣ بۆ خۆی بێ. ئەوتو غازی شارەکانی تریش هەر بەوجۆرە ٢/٣ بۆ خۆیانبێ.

نائینسافییەکی کە، ئەوەیە کە ئەو ناوچانەی دیجلەو فوراتیان پیا تێپەڕ ئەکات، داهاتەکانی بەروبوومی دارو درختەتو کشتوکاڵیان زۆر زیاترە لە هی کوردستان. کەچی دەستوورەکە بۆ ئەومیان بێدەنگە !.

مادەی (١٢٩) ئەڵێ: (دەوڵەت قەرەبووی خێزانی شەهیدانو بەرکەوتوانی تیرۆر ئەکات) بەڵام خێزانی شەهیدانو زیانلێکەوتوانی ئەنفالو کیمیاباران لە کوولەکەی تەڕی ئەودەستورەدا باسیان نیە !.

جگە لەوخاڵانە، دواخستنی مادەی (٥٨)و نەگێڕانەوەی قەزاکانی کەرکوکو دیارینەکردنی سنوری کوردستانو نەگێڕانەوەی ناوچە کوردییەکانو گەلێ لایەنێکە کە دەستوورەکە لێیان بێدەنگە، ئەوە سەرباری ئەوەی هەموو دەسەڵاتە گرنگەکانی داوە بەسەرەك وەزیران کە هەمیشە یەکێك ئەبێ لەو شیعانەی دووجار بەچاوی کینەوە سەیری ئێمە دەکات. جارێك وەك کوردو جارێکیش وەك سوننە. بێجگە لەم خاڵانە، مێما ئەکەم بۆ ئەو باری سەرنجانەی ژمارەیەك رۆشنبیری بەرێز لە رۆژنامەکاندا لەم بارەیەوە پیشانیان داوە، بەتایبەتی دیدو بۆچوونەکانی بەرێزان: د. جەمال نەبەز، د. نوری تاڵەبانی، غەفور مەخموری، سەلام سەعدی لە رۆژنامەی ئازیزی میدیای ژمارە (٢٠٦) دا. ئەوانە هەموو ناچارمان ئەکات بیر لە رێگەچارەیەکی کە بکەینەوەو پشت بەو دەستوورە نەبەستین. رێگە چارەش ئەشێ لەم خاڵانەدا خۆی ببینێتەوە:

یەکەم: گریمان هەر دەستوریکی عیراقی، هەموو خواستو ویستەکانی ئێمە بگرێتە خۆو سیستمە فیدرالیەکەی عیراق لەسەر کاغەز وەها دابڕێژێ کە چاکترین فیدرالیبێ، ئەوە چ بایەخێکی ئەبێ لەئاستی هەڵکەوتەی عیراقی دەسکردو ناسروشتیو تێکەڵە نەتەوەییو ئاینییە بەزۆرلکێنراوەکان بەیەکەوەو لەئاستی رووبارێك خوێن لەنێواندابو لە ئاستی بیری بەستەڵوکی ئاینیو بیرۆکەی رەگەزپەرستیو شۆفێنیو ئەقڵی تیرەگەرێو کلکایەتی وڵاتانی دراوسێو زەبری تیرۆر! ؟ راستییەکەی، دەستورێك بۆ تێکەڵەیەکی پڕ لەناکۆکیی لەو جۆرە، هەرچۆنێ بێ، لەمەرەکەبی سەرکاغەز بەولاوە، چیی تر نابێ، چونکە لەهەر هەلێکدا، پاشەکشەی لێئەکرێو کاردانەوەی ئەو پاشەکشەیەش، لەئەنجامدا بەسەر لایەنە لاوازەکاندا ئەشکێتەوە بەجۆرێك کەهەزار رەحمەت بچێت بۆ کفن دز!.

لەبەر ئەوە، بۆ خۆپاراستنی کورد لەم زەلکاوی عیراقەدا، چاکترین گەرەنتییەك، خۆبەهێزکردنە. هێزیش بە یەکێتیو باوەڕو زانستو مەشقو زیرەکیو سامانو چەك دروست ئەبێ. بەڵگەنەویستیشە کە لە سەرەتای مێژووەوەو تا ئێستاو تا هەتاش، هەر هێز برلوەی زۆرنبازییە جۆراوجۆرەکان بووەو

نەبێ. ئەگەر هێزت بوو، فیدرالیش بۆ خۆی ئەبێ بە میوانت. سەربەخۆییت بوێ، دوژمنەکان لەپێش دۆستەکاندا دانت پێدا دەنێن، هەلی خۆبەهێزکردنیش، ئەگەر جاران بۆ کورد نەرەخسابێ، ئێستا بۆ قەوارە سیاسسەکەی باشووری کوردستان رەخساوە بەهۆی جۆرێک لە سەربەخۆیی قەوارەکەو ئەو هەموو سامانەی بەسەریدا رژاوە.

دووەم: بۆ ئەوەی کاتو ماوەیەکی زیاتر دەستەبەر بکەین بۆ بەخۆداچوونەوەو کۆکردنەوەو بەدەستخستنی هێز، بەتایبەتی هێزی سەربازیو بۆ ئەوەی ئەم دەستوورە خراپە نەسەپێ بەسەرماندا، چاك وایە هەرهەموو، بەلاگرو لانەگری حیزبە کوردییەکانەوە، بەخەڵکی هەردوو ئیدارە کوردییەکەوە، دەنگ بە بەڵێ بۆ ئەو دەستوورە خراپە نەدەین لە راپرسییەکەدا، بەوەش دەستورەکە نابێتە بڕیارو حکومەتە دژبەکوردەکەی جەعفەری ئەکەوێتو هەل بۆ دەستوورێکی تر نەڕەخسێ بۆ ئەوانەی بەدووی کڵاوی بابردووی فیدرالیدا وێڵن. ئنجا لەماوەی ئەم کەینوبەینەدا، پەرلەمانی کوردستان دەستورەکەی خۆی بڕیاردات و ئەو دەستوورە ببێتە بنکەی گەڕانەوە (مرجعیە) بۆ نێردراوانی کورد بۆ وتوویژ لەبارەی دەستووری ئایندەی عیراقەوە.

سێیەم: هەموو بەڵگەکان ئەوە دەگەیەنن کە ئەگەر ئاشتیو ئارامی دەستەبەر نەبێ، ئەوا عیراقی یەکگرتوو هەڵئەوەشێتەوەو هەریەك لە شیعەو سوننەو کورد، بەشی خۆی ئەخاتە بندەستی خۆی، چونکە هیچ کام لەو سێ رەگەزە توانای داگیرکردنی ئەوانی تری نیە. ئەوکاتە هاوپەیمانانیش مل بۆ باروبۆخی سەپاو ئەدەنو بەرژەوەندییەکانیان بەلای کەرتی ئارامو دەوڵەمەندو بوتنی خۆشی ئەوتدا رایانئەکێشێ. هەڵبەت بۆ کەسێکیش کەسە، ئەلفێکی بەسە.

لەندەن: ٢٠٠٥/٩/١

jeerkamil@yahoo.com

## کۆڕە تەلەفیزیۆنییەکەی بەڕێزان نەوشیروان - عیماد و چارەسەری ڕاستەقینەی گەندەڵی

مرۆڤ کە هاوکار (زمیل) ی دز بوو، بیەوێ و نەیەوێ، شانی ئاردلوی دەبێ و ئەکەوێتە بەرپرسیاری لەمجۆرە:

ئەگەر تۆش هەو نیت، ئەی بۆچی ڕێگە بەهاوکارەکانت ئەدەی گەنجینەی ئاردەکە تالانکەن؟ کە ناشتوانی ڕێگەیان لێبگریت، بۆ لێیان دوورناکەویتەوە تا شانی تۆش ئاردلوی نەبێ؟ ئەگەر دەریەستی پەزەکەیشیت، بۆچی بەرەیەکی بەرهەڵستکار دروست ناکەیت؟ کە هەڵوێست هەر قسەی ڕووت بێ، قسە ناچێتە ناو گیرفانەوە. کێ لەگوڵ کاڵتر بەخۆی دەڵێ؟ ئەی کورد نەیوتوە: تا خاوەن ماڵ دزی گرت. دز خاوەن ماڵی گرت؟.

بەو جۆرە، ڕاستییەکان لەناو کۆمەڵێ گوماندا، ون دەبن و ڕەش و سپی تێکەڵاو دەبن.

هەرچۆنێ بێ، قسەی بەڕێزان نەشیروان مستەفاو عیماد ئەحمەدو هاوکۆڕەکانیان لەشەوی شەمەی ٢٠٠٦/٣/٤ دا لە کەناڵی PUK وە، لەدڵسۆزیەوە بووبێت، یا بۆ مژینی رقی خەڵکی، لایەنی بوێریو ڕوونیو ڕاستیی زۆری تێدابوو. بەڵام وەك چارەسەر؟ کۆڕەکە، ئامانجەکەی نەپێکا. چونکە پێشنیارەکان کەبریتی بوون لە: (١- سوودوەرگرتن لەپارتییە سوسیال دیموکراتەکان ٢- لەشارەزایانی دارایی ٣- ئاڵوگۆڕی دەسەڵات یا بەرپرسەکان) ترازوە لاسەنگەکە ڕاستناکاتەوە. چارەسەری یەکەم: شیردا بۆ دڵپیرە. بۆ وەڵامی دوەم: یاسا دارایی و سزاییەکانی ئێستامان، کەموکوڕییان تێدا نیە. بۆ خاڵی سێیەم: کێ ئەڵێ لە ئەنجامی ئاڵوگۆڕەکەوە ماری مارخۆر پەیدا نابێ و ناڵێین ڕەحمەت لە کفن دز؟.

کەواتە چارەسەرییەکان ئەبێ ڕیشەیی بن. سەرەتا هۆکارەکان دەستنیشانکەین، ئنجا یەك یەك چاریانکەین، بەمجۆرە:

١- پەرلەمانەکەمان، بۆیە کارنۆنیە، چونکە پەرلەمانی تەنیا پارتییەکانەو ئەندامەکانی لەداشی دامەو مورچەخۆری پارتییەکان زیاتر، چیتر نین و ئەوەی لای ئەوان گرنگبێ، ئەوەیە پارتییەکان لێیان ڕازیبن!.

ئاشکرایە لەکۆمەڵگایەکی دیموکراتیدا، بەردی بناغەی هەموو دیوارەکان، پەرلەمانە. بنەما یاسایە گشتییەکەش ئەڵێ (ئەوەی لەسەر بۆش دروستبکرێ، ئەویش هەر بۆشە) کەواتە ئەبێ لەپەرلەمانێکی پتەوەوە دەستپێبکەین .پەرلەمانی پتەویش ئەوەیە نوێنەری ڕاستەوخۆی دەنگدەرانی بێت نەك سەپێنراوی لیستی پارتییەکان و شێوازی ڕێژەیی بێت، وەك ئەم پەرلەمانەی ئێستا کە پێویستە کۆتایی پێبهێنرێ و هەڵبژاردنێکیتر لەسەر شێوازی بازنەیی ئەنجامبدرێت. بۆ ئەوەی هەر ناوچەیەو نوێنەری خۆی بناسێ. ئەوسا پەرلەمانتارەکان، هەست ئەکەن زیاتر نوێنەری دەنگدەرەکانیانن، با ئەو پەرلەمانتارە حیزبیش بێت. ئیتر ئەو هەوڵ ئەدات زیاتر جەماوەرەکەی لێی ڕازیبێ. جەماوەرەکەش، جارێکیتر دەنگی ناداتێ ئەگەر لەئاستی کارەکەیدا نەبێت.

پەرلەمانێکی لەو جۆرە، لەدیاردەی پەنجا بە پەنجاش ڕزگارمان دەکات. چونکە خەڵکی بێلایەنیشی تێدەکەوێت. دوایی لەوپەرلەمانەوە، حکومەتێکی یەکگرتوو بۆ هەموو هەرێمی کوردستان، دەستبەکاربێت. ئەو حکومەتەش، ئەبێتە حکومەتی یاسا، نەك هی حیزبێك. چونکە هەمیشە لە

مەترسی ئەوەدا نەبێ کە پەرلەمانەکە باوەڕی لێبسەنێتەوە. وەزیریش هەمان ترسی ئەوەی دەبێ ئەگەر کەموکووڕیی هەبێ، یا گەندەڵبێ، یا وەزارەتەکەی گەندەڵکاریی تێدا بێ، یاتێدا مابێ. واتا پاکتاوکردنی گەندەڵکاران لە حکومەتدا دەستپێدەکات و ئەنجامیشی دەبێت.

٢- هۆی گەندەڵیی دارایی و ئاژاوەی دارایی پارتییەکان، ئەو پارە مفتە زۆرەیە کە ناڕەوا ئەچێتە گیرفانی ئەو پارتییانە، یا گیرفانی سەرکردەکانیان. بۆیە ئەبێ بەبڕیارێکی پەرلەمان، هەموو داهاتەکانی دەوڵەت، بچنە گەنجینەی حکومەتەوە. هەر وەك لە هەموو دەوڵەتێکی یاسادا وایە. دوایی لە حکومەتەوە، ئەوەندەی پێویست خەرجی ڕۆژانەی پارتییەکان، دەرماڵەیەك وەرگرن. ئەویش تەنیا بۆ ئەو پارتییانەی ڕێژەیەکیان ئەبێ لە پەرلەماندا. کە ئەو پارە مفتە زۆرەش نەما، ئیتر بەڵگەنەویستە گەندەڵی دارایی ناو پارتییەکان نامێنێت.

٣- ئێستا بۆیە حکومەت دەستەوستانە لە ئاستی گەندەڵییەکاندا، چونکە سامانو زۆربەی هێزە چەکدارەکان و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، لەدەستی پارتییەکاندایە. بۆیە ئەبێ هەموو ئەوانە ببنە هی‌حکومەت، وەك هەر دەوڵەتێکی یاساو دەستور.

ئەو چارەسەریانە. ئەشێ سەرەتا وا بنوێنن کە پارتییەکان لاواز دەکەن. لە ڕاستیدا پێچەوانەی ئەوە ڕاستە. ئەو پارتیانە کە ئێستا گەندەڵی تێیداون. ئەو گەندەڵیە وەك خۆرە لاوازیان دەکاتو دەیانپوکێنێتەوە. هەڵەن ئەوانەی وا ئەزانن کە پارەو چەكو هۆکاری زۆری ڕاگەیاندن، ئەو پارتیانە، لە مەرگێکی چاوەڕوانکراو ڕزگار دەکەن.

ئەولنە بە گشتی، لەبارەی گەندەڵیەوە. ئنجا بۆ بەهێزکردنی قەوارەسیاسییەکەشمان، سەرباری نەهێشتنی ئەو گەندەڵیە زۆرە، ئەم هەنگاوانەش پێویستن:

أ- متمانەکردن بەقەوارە سیاسییەکەی خۆمان، زیاتر لە متمانە بە دەسەڵاتی حوکم لە بەغداد.

ب- پڕچەککردنی هێزی بەرگری کوردستان لەنزیکترین کاتدا، ئەوە سەرەکیترین گەرەنتیە بۆ پاراستنی قەوارەکەونەتەوەکەمان. پەندە کوردییەکەی خۆمان (کوتەك ئەزانێ قۆناغ لە کوێیە ) لە سەرەتای مێژووەوە تاەەتا، هەر دروستو کاریگەرە. ئێمە ئەگەر ئێستا ئەو سامانە لێشاوو زۆرەی بۆمان ڕژاوە، لەجیاتی گەندەڵیەکانو پرۆژە ڕووکەشو ناپێویستەکان، هێزێکی بەرگری مودێرنی پێ پڕچەك بکەین، ئەوا نەك فیدراڵی، بەڵکو سەربەخۆییش تا ئەوپەڕی سنوورە سروشتییەکانی کوردستان لەئامێزماندا دەبێت.

ج- هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێم لەلایەن میللەتەوە ڕاستەوخۆ.

د- دروستکردنی ئەنجومەنێکی ئاسایشی نەتەوەیی بەهەموو دەسەڵاتەکانیەوەو دوور لە دەسەڵاتی پارتییەکان.

هیوادارم توانیبێتم خشتێکم خستبێتە سەر خشتێك بۆ نەهێشتنی گەندەڵیو بە ئەنجامگەیشتنی کاروانی ڕزگاریخوازی نەتەوەکەمان.

## هەوڵەکانی شێخ مەحمود بۆ ئەنجامدار نەبوون ؟

بەمەبەستی توێژینەوە لەحوکمەت و شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی نەمر ، وەزارەتی ڕۆشنبیری کوردستان لەهەولێر ڕۆژانی ١١- ١٤/٤/٢٠٠٦ فیستیڤالێکی لەهۆڵی وتێل خانزاد سازدا . وتەکەی من ، کورت و پوخت ، بریتی بوو لەو پرسیارەی سەرەوە کە وەڵامەکەی لەسێ تەوەردا دایەوە :

یەکەم : ئینگلیز نەیویست کورد قەوارەیەکی سیاسی هەبێت لەوسەردەمەدا . ئەونیمچە قەوارانەش کەخۆیان ئەنواند لەحوکمدارییەکەی (١/١١/١٩١٨ ) وە مەلیکێتیەکەی (٣/١١/١٩٢٢ )یدا ، لەگەمەیەکی سیاسی و بەکارهێنانی شێخ وەك کارتێکی گوشار بۆ سەر تورك و عەرەب بەولاوە ، چیتر نەبوو . پەیمانی سیڤەریش (کەلەڕاستیدا ، نەبوو بەپەیمان ، چونکە بەپێی هەندێ سەرچاوە ، واژۆ نەکرابوو ) ئەویش هەرگەمەیەکی سیاسی کارتێکی گوشاربوو بۆ سەر تورکیا ، تاناچاری بکات دەستبەرداری ویلایەتی موصل ببێ‌و ملبدات بۆ پەیمانی دیاریکردنی سنوری تورکیاو ئێراق .

کێشەکە لەلای شێخ مەحمود لەوەدابوو کەنەیئە زانی هەموو ئەوگەمە سیاسیانە ، بۆ ئەوە بوو ئینگلیز دەس بەسەر نەوتی ویلایەتی موصلدا بگرێت کەلە ساڵی ١٩١٢ ەوە نەخشەی بۆ کێشابوو کۆمپانیای نەوتی تورکی T.P.C بەریتانی - هۆڵەندی - ئەڵمانی بۆ دروست کردبوو .

دووەم : نزمی ئاستی هۆشیاری نەتەوەی لەلای کورد لەوسەردەمەدا کەبوە هۆی ئەوەی شێخ محمود تەنیا باڵبی لەشۆڕشەکانیدا ( جگە لەهەندێ نیمچە لایەنگری لەژمارەیەکی کەمی هۆزە کوردیەکانەوە ) کەنەبوونە هۆی یەکدەنگی و گشتگیری شۆڕشەکان .

سێیەم : چەمکی شۆڕش لەلای کورد کەهەمیشە ، بەدوای تێکچوونی دەوڵەتی ماندەوە ، ناتەواو بوون . یابەدەربڕینێکی تر : شۆڕشەکان ، سەقەت بوون ! . چوونکە هەموویان ، شۆڕشی سەرنەکەوتوو بوون ، کەچی هەرلەوبارەکردنەوەی یەکتربوون بەهەمان شێواز . ڕوی هەڵەو ناتەواوی سەقەتیەکەش ، لەوەدایە کەئەو شۆڕشانە لەسنوری کوردستان تێپەڕیان نەکردووە ، بگرە بەزۆری ، لەشارەکانی کوردستانیش کشاونەتەوە بۆ شاخەکانی و لەوێ شۆڕش گێڕەکان تەنها بەرگریان لەخۆیان کردووە ! گەلێ جاریش بوونەتە هۆی ئەوەی ، دانیشتوانی شارەکان ، ببن بەژێر دەست و پێی دوژمنەوە .

ڕاست وانەبوو پرژی شۆڕشەکان ، پایتەختەکانی دوژمنی هەڵتەکاندایە و نەیهێشتایە ئەو دوژمنانە لەماڵەکانی خۆشیاندا ئارام بوونایە . بەوە پشتی دوژمن دەشکێ ، نەك تەنها بەشە ڕێ ناوشاخەکانی کوردستان ، ئەوەش یەك لەسەر سەدی قوربانیەکانی ناو شاخ و شارەکانی کوردستانی ناوێت .

( ئەنجام )

١- ئێستاش ، هەندێ لەهێماکان ئەوە دەگەیەنن کەهاوپەیمانان ، هەرئێراقی یەکگرتوو ئامانجیانبێ ! بەرامبەر ئەرکێکی وا ، ئەرکی کورد ئەوەیە کەنەک هەرنەبێتە هاوپەیمانێکی ئەوپەککگرتووییە ، بەڵکو هۆکاری یەکنەگرتنیشیبێ .

٢- بنەمایەکی یاسایی گشتی دەڵێ : ئەگەر ڕێگر نەما ، ڕێلێگیراوە دەگرێتەوە ( لۆ زال المانع ، عاد الممنوع ) ڕێگرەکەش بۆ دروست نەبوونی قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ بۆ کورد تائێستا نەوتەکەی کرکوک بووە کەڕۆژئاوای مسۆ گەرکردنی ئەونەوتە بۆ خۆی ، لەعێراقێکی یەکگرتوودا دەبینێت . بەرامبەر بەوە ، ئەرکی کورد ئەوەیە کە نەیەڵێ ئەونەوتە بەئاسانی بچێت بەگەرووی ڕۆژئاوادا . ئەویش بەوەی کورد خۆی دەستبگرێ بەسەرکرکوکدا . کەئەوەش ڕەواو ئاساییە چونکە شارێکی کوردستانیە. ئەگەر ئەوەشی بۆ نەکرا ، ئەوسا ببێتە ڕێگری ڕۆشتنی ئەونەوتی بۆ هەرهۆکارێك .

٣- کورد پێویستی بەهێزی چەکدارە . لەم قۆناغەی ئەمڕۆماندا ئەبێ بەشی شێری داهاتەکانی کوردستان بۆ ئەومەبەستە تەرخان کرێ و قەدەغەی بەفیڕۆدان و گەندەڵی بکرێت .

٤- کورد ستراتیجی خۆی ئاشکرابکات کەسەر بەخۆیی کوردستانە . هەردەسکەوتێکی لەوەکەم تر ، تەرخان بکات بۆ ئەومەبەستە .

دوای تەواوبوونی وتەکە ، وتووێژ بەم جۆرە دەستی پێکرد :

د. هۆگر محمود : شۆڕشەکان هەموویان سەقەت نەبوون .

وەڵام : بەلای منەوە ، هەموویان وەك یەك سەقەت و ناتەواو بوون . چونکە هەموویان دووبارە کردنەوەی یەك بوون . هیچ کات دوژمن بەشۆڕشی شاخەکان ناڕوخێ و دەست لەکوردستان هەڵناگرێ . کام لەوشۆڕشانە ، چەند کردەوەیەکی سەربازی لەپایتەختی دوژمندا ئنجام دا ؟

د. ناصح عبدول غفور : قسەکان ئاوەژوون ، پەیمانی سیڤەر ئیمزا کرابوو ، شۆڕشەکان هیچی خراپ نەبووە . ئەودەست کەوتانەی ئەمڕۆ ، بەرهەمی ئەوشۆڕشانەیە . واقیعی ئەمڕۆ جیایە لەگەڵ خەیاڵدا .

وەڵام : پەیمانی سیڤەر واژوو نەکرا . من بەڵگەم هەیە ئەوە میستەر ئەنتۆنی کیگلەر دلنیشتومو ئەڵێ هەموویان بەڵگە نامەکانی زمانی کۆمەڵی نەتەوەکانم سەیر کردوە لەجنێف و پەیمانی سیڤەر بەبێ ئیمزایە . بەڵگەی دووەمم ئەوەیە کەکورد خۆی نوێنەرێکی نەبووە لەوپەیمانەدا . کەی کورد ئەوەندە بەختەوەربووە بەبێ نوێنەرێکی خۆی ، پەیمانێکی وای بۆ واژوو بکرێ !؟ ئەگەر تۆ بەڵگەت هەیە فەرموو من نەم ووتوە شۆڕشەکان خراپ بوون . من خۆم هۆنراوەم بۆ شۆڕشەکان وتوە . من ئەڵێم : ناتەواو بوون سەقەت بوون .

د. ناصح : یانی شەل بوون ! ؟

وەلام: شەل بوون گژج بوون ، هەرچی ناوبنێنیت .. من نالێم شۆڕشەکان هیچ کاریگەریەکیان نەبووە . لەبارەی خەیاڵ و واقعیشەوە ؟ من ئەڵێم : فیدراڵی نەك سەربەخۆی . فیدراڵی لەگەڵ کێ ؟ لەگەڵ مقتەداو جەعفەریو سوونەی تیرۆرست ؟ ئینجا ئەوەی ئێستا پێیدەوترێ فیدراڵی ، ئەوە فیدراڵی نیە ، چونکە دەستورەکە ئەنجومەنی هەرێمەکانی بەجێ هێشتووە بۆ یاسایەك کەپەرلەمان دەری دەکات ! لەکاتێدا ئەنجومەنی هەرێمەکان ئەبێ بالادەستی بەسەر پەرلەماندا هەبێ نەك بەپێ چەوانەوە .

د. حوکمەتەکەی شێخ محمود ، ئەزموونە ب ۆ ئەمڕۆ

وەلام : پێویستە ئەزمونبیت ، بۆ ئەوەی هەڵەکان دووبارە نەبنەوە .

د. حەسەن جاف : شۆڕشی ئەمڕۆ ، هەموولنی کۆکردەوە شۆڕشی هێنایە ناوشارەکانی کوردستانەوە .

وەلام : بەلام دەستی نەگەیشتە پایتەختی داگیرکەر !

لەدەرەوەی هەولەکەش ، وتوو وێژ درێژەی هەبوو وەلامەکانیش بەمجۆرەبوون :

ئێوەبزانن کەسێکی وەك بنلادن ، چۆن دەستی گەیشتە ژێر ئەرز !؟ تۆ وازبێنە لەمەبەستەکەی بنلادن ، چاکە یاخراپە ، من وەك نمونەیەك ئەڵێم . ئەی کورد بۆ دەستی نەگەیشتە پایتەختی ئەو داگیر کەرانەی شەڕی قەلا چۆکردنیان لەگەڵ دەکردین ؟ ئاخر کەسێکی وەك زەعیم صدیق چی پێ نەکردین ؟ کەچی کەخانە نشین بوون ، لەبەغدا بەجۆتێ نەعل و دزدلشەیەکەوە لەچاخانەکاندا ، تاوڵەی دەکرد ! بێ ئەوەی شۆڕش هیچی لێ بکات . ئەی نەئەوترا ئەوەی لەگەڵ عوسمان فایەق کرا ، کەکوردێك بوو لەگەڵ ئەرو وێنەکانی وەك ئەویکرایە ؟

جگە لەولنە ، شۆڕشەکان ، بەپێی نەخشەو پلانی زانستیانەی پێشەکی نەبوون هەریەکە و شۆڕشی ناوچەیەك بوو . ناوچەکانی تر ، ئەگەر جاش نەبوو بن ، سەیر کەربوون !! یابەولتایەکی تر وەك مەڕی دلبەستە، چاوەڕوان بوون تاچەقۆی قەصابیان دەگاتێ !!! .

٢٠٠٦/٤/١٣

* زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە ، لەکتێبی کوردلیەتی و سەربەخۆر – کامیل ژیر – ٢٠٠٢ وتاری (حکومەتەکەی شێخ محمود بۆ سەرکەوتوو نەبوو ؟) پیشاندراوە .

# ناوەڕۆك

# کوردیەتی بیرو بڕاوە

ژێر دوەلام و پەرچدانەوە

## پەرچدانەوەکان بۆ بەڕێزان:

١- فریاد رەواندزی
٢- د. کوردۆ عەلی
٣- شێرکۆ بێکەس
٤- رێبین هەردی
٥- د. کەمال مەزهەر
٦- ئەحمەد حامید
٧- د. حسەین عەزیز

## وەلامەکان بۆ بەڕێزان:

١- شۆڕش قادر
٢- هیمدادی حسەین
٣- گۆڤاری تایم
٤- گۆڤاری جەماوەر
٥- پەیامی مرۆڤایەتی
٦- رۆژنامەی هاوبیر
٧- د. جەمال نەبەز
٨- عەتا قەرەداغی
٩- د. عوسمان بەرزنجی
١٠- زانیار قرگەیی
١١- ئاسۆس هەردی
١٢- کاندێش
١٣- رۆژنامەی هەواڵ
١٤- راية الحرية
١٥- سیروان کاوسی
١٦- مەلا بەختیار
١٧- چێنەر جۆلا
١٨- بۆتان جەلال
١٩- نەوشیروان مستەفاو عیماد ئەحمەد

## لەگەڵ شەش بابەت:

١- بارزانی و کاژیك
٢- خاوەن فایلەکان
٣- گەمەی عێراق
٤- دەستوری عێراق و کوردستان
٥- کێشەی کوردو یاسای نێودەوڵەتی
٦- خۆپیشاندانەکەی ٢٠٠٤/٢/١٤و شتی تریش

نرخی ٣٠٠٠ دینارە